ئەلیف شەفەق

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە
جەلیل کاکەوەیس

# چل ڕێساکەی عەشق

ڕۆمانێکە دەربارەی جەلالەدینی ڕۆمی





# چل ڕێساکەی عەشق

(ڕۆمانێکە دەربارەی جەلالەدینی ڕۆمی)

ئەلیف شەفەق

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە:

جەلیل کاکەوەیس

زنجیرەی کتێبی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ژمارە (٧٣٢)
سەرپەرشتیاری گشتیی زنجیرە
ئازاد بەرزنجی



www.sardem.org

سەرچاوە:
قواعد العشق الأربعون
إليف شافاق
ترجمة: خالد الجبيلي
الطبعة الأولى ٢٠١٢
دار طوى للثقافة والنشر والإعلام ـ لندن

■ چل ڕێسلکەی عەشق

نووسینی: ئەلیف شەفەق

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە: جەلیل کاکەوەیس

بابەت: ڕۆمان

هەڵەچنی و ڕێنووس: دەریا غەفوور

دیزاینی ناوەوە: ڕەوشت محەمەد

دیزاینی بەرگ: ئاکار جەلیل کاکەوەیس

تیراژ: ١٥٠٠ دانە

نرخ: ٩٠٠٠ دینار

چاپی یەکەم: چاپخانەی (تاران) ساڵی ٢٠١٥

■ لەبەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (١٧٩٨)ی ساڵی ٢٠١٤ی پێدراوە

که منداڵ بووم، خودام بینی،
فریشتەکانم بینی؛
ڕازەکانی هەردوو دنیای سەروو و ژێریم بینی. پێم وابوو ئەوەی من دیتوومە هەموو پیاوانیش بینیویانە، وەلێ هەر زوو تێگەیشتم کە ئەوان هیچیان نەبینیوە...

**شەمسی تەورێزی**

## ناوەرۆک

## بەر لە خوێندنەوەی ئەم ڕۆمانە

ڕۆمانی (چل ڕێساکەی عەشق) شۆڕبوونەوەیەکە بەرەو ناخ و گەڕانێکە بەنێو ئەو سووچ و کەلەبەرانەی کە بوونەتە حەشارگەی چەندین نهێنیی کەسانی ئاسایی و نائاسایی. کاتێ ئەو نهێنییانە بۆ کەسەکە ئاشکرا دەبێت، ئیدی ململانێیەکی بەردەوام لە خودی کەسەکەدا بەردەوام دەبێت و وردەوردە ململانێکە دەبێتە پێداچوونەوە و بەراوردکردن و لە ڕەفتار و ئەتواری ئەو کەسەدا ڕەنگ دەداتەوە. زۆر جار ئەم هەڵگەڕانەوەیە لە خود بۆ کەسانی تر قووت ناچێت و نامۆییەک یان بۆشاییەک دەکەوێتە نێوان ئەو خودە و کۆمەڵەوە تا دەگاتە ئەو ڕادەیەی کەسەکە تووشی نەفرەت دەبێت و بەهەستەم دەتوانێت سرووتەکانی خۆی جێبەجێ بکات. ئەم لووتەلاییەی کۆمەڵ لەو کەسە بەلەسە بووە، لە هەموو سەردەمەکاندا دووبارە دەبێتەوە. هەندێ جار بە ناوی فەلسەفەوە و برێ جار بە ناوی بیری لە ڕەوتدەرچووی دیدگای کۆمەڵەوە و جارجاریش بە ناوی سۆفیگەرێتییەوە ئەو کەسانە تووشی سزای دابونەریتی کۆمەڵ یان سزای کەسانی توندڕەوی ناو کۆمەڵ دەبن و کەسی گەڕیدەی ناو خود فریای گەیاندنی پەیامەکەی ناکەوێت، یان بە نیوەچڵی پەیامەکەی جێدەهێڵێت و بۆ هەتاهەتایە بە جەستە سەردەنێتەوە، بەڵام دەوسی ڕەفتار و کردار و وتنەکانی بە زیندوویی دەمێنێتەوە.

ئەم ڕۆمانە دەربارەی ژیانی کۆمەڵایەتی و پایەی زانستیی جەلالەدینی ڕۆمییە، بەڵام دوای ئەوەی لەگەڵ شەمسی تەوریزیدا بەیەک دەگەن، ئیدی جەلالەدینی ڕۆمی دەست لە هەموو تەماحێکی دنیا هەڵدەگرێت و دەبێت بە جەلالەدینێکی دیکە و بەرەو ناوەوەی خۆی شۆڕدەبێتەوە و ڕواڵەتەکانی دنیا دەکاتە قوربانی ڕامانە قووڵەکانی خۆی و عەشقی خودایی دەکاتە ئامانجی

سۆفییەکی بێنیاز و پشت لەدنیاکردوو، جگە لەوەش ئەم ڕۆمانە لە شێوەی تەکنیکێکی هونەریی ناوازەدا لە دوو ڕۆمان یان لەگێڕانەوەی دوو ڕووداو کە هەر یەکەیان لە سەردەمێکی جیا و دوور لە یەکتر ڕوویان داوە، پێک دێت و مەودای نێوانیان نزیکەی 800 ساڵە، بەڵام لەدواییدا لە یەک نوختەدا یەک دەگرنەوە کە ئەویش شۆڕبوونەوەیە بەرەو ناوەوەی نەفس و هەوڵدانێکە بۆ پاککردنەوەی خود لە خڵتەی ڕواڵەتبازی، بەڵام هەریەکەیان بە کەرەسە و ناو و زاراوەی سەردەمی خۆی. ئەو ڕووداوانەی کە لە سەدەی دوانزەهەمی زاینیدا ڕوویانداوە و باسی جەلالەدینی ڕۆمی و شەمسی تەوریزی دەکەن، لە ڕۆمانەکەدا شوێن و کۆڵەکەکانی فێربوون و زانست لە سەدەی دوانزەهەمدا بە قوتابخانە و قوتابی و مامۆستا ناو دەبات، بەڵام من پێم وایە لەو سەردەمە زووەدا ئەم ناوانە بەو جۆرە بەکار نەهێنراون، بۆیە لەبری (قوتابی) وشەی (فەقێ) و لەبری (قوتابخانە) وشەی (سوختەخانە)م بەکار هێناوە. لەکاتێکدا وەک من پێم وایە قەوماوی دووەم کە باسی (ئێلا) و عەزیز ز. زاهارایە و لە سەرەتای سەدەی بیستویەک ڕوودەدەن، ناوەکان هەمان ئەو زاراوە تەکنۆلۆژییانەن کە ئێستا بەکار دەهێنرێن.

لە هەندێ شوێنی ئەم ڕۆمانەدا هەستم بە جۆرە غافڵبوونێک کردووە و بە بۆچوونی خۆم پەراوێزم بۆ ڕێکخستوون، هەروەها لە لێکدانەوەی ئایەتەکانی قورئاندا پرسم بە مامۆستای ئایینیی شارەزا کردووە، لە هەندێ شوێن سوودم لە وەرگێڕانەکەی هەژاری موکریانیش وەرگرتووە. لەگەڵ ئەو زەحمەتە زۆرەی لە وەرگێڕانی ئەم ڕۆمانەدا بینیم، چێژێکی ڕۆحیی زۆریشم وەرگرتووە، ئومێدم وایە خوێنەرانی ئەم ڕۆمانە بە زیادەوە ئەو چێژە وەربگرن و نووسەرەکەیشیم ڕەنج بەخەسار نەکردبێت. ئەم ڕۆمانە خالید ئەلجبێلی لە ئینگلیزییەوە کردوویەتێ بە عەرەبی.

**جەلیل کاکەوەیس**

**٢٠١٤-٧-١٤**

## دەستپێک

بەردێک لەنێو ئەنگوستەکانت هەڵبگریت و بەرزی بکەیتەوە، ئینجا فڕێی بدەیتە نێو ئاوێکی خوڕەوە. ڕەنگە بینینی ئەوە ئاسان نەبێت، چونکە شەپۆلۆکەیەک لەسەر ئەو ئاوەی کە بەردەکەی تێکەوتووە درووست دەبێت و پرژەی ئاوەکە پەرت دەبێت، لێ ئاوی خوڕی ڕووبارەکە کپی دەکات. هەموو شتەکە ئا ئەمەیە.

بەردێک باوێژە نێو دەریاچەیەک، کاریگەرییەکەی تەنها بینراوێک نییە، بەڵکو بەردەوامییەکەی زۆرترە، چونکە بەردەکە ئارامی ئاوە وەستاوەکە دەشڵەقێنێت و لەو شوێنەی کە بەردەکەی تێکەوتووە، بازنەیەک دروست دەبێت و لە چاوترووکانێکدا ئەو بازنەیە فراوان دەبێت و بازنە لە دوای بازنە چێ دەبێت. ئیدی زوو ئەو وردە شەپۆلانەی کە لە دەنگی تێکەوتنی بەردەکە پەیدا دەبن و لەسەر ڕووی ئاوەکە دەردەکەون، لە هاوێنە دەچێت. ئیدی ئەم بازنەیە تا نەگاتە کەنار، نە دەوەستێت و نە ون دەبێت.

ئەگەر بەردێکت هاویشتە نێو ڕووبارێکەوە، ئەوا ڕووبارەکە لە ڕەوتی هاژەهاژکەری تێکچڕژاوی خۆیدا بەردەکە بە جووڵەیەکی تری لرفەلرف دادەنێت.

خۆ ئەگەر بەردەکە کەوتە نێو دەریاچەیەکەوە، ئەوا جارێکی دی دەریاچەکە هەمان کپیی نامێنێت. ژیانی ئێلا ڕۆبنشتاین بە درێژایی چل ساڵ وەک ئاوێکی وەستاو -بریتی بوو لە زنجیرەیەک خووپێوەگرتن و پێویستبوون و بەهەند وەرگرتنی شتە دەقگرتووەکان. هەرچەندە ئەو ژیانە لە چەندین ڕووەوە ژیانێکی ڕێکخراو و خواسایی بوو، لێ ئێلا بە تاقەتپڕووکێن و بێزارکەری نەدەزانی. لەم بیست ساڵەی دواییدا، هەر ئارەزوویەک هەڵی

پێچابا یان هاوڕێیەتیی لەگەڵ هەر کەسێکدا کردبا، یان هەر بڕیارێکی بدایە، لە دیدگای ژن و مێردایەتییەوە تەماشای دەکرد. دەیڤیدی مێردی پزیشکێکی سەرکەوتووی ددان بوو، چەندین سەعاتی دوورودرێژ، کاری دەکرد و سامانێکی زۆری پێکەوە نابوو. خۆ دەیزانی کە پەیوەندییەکەیان قووڵ نییە، لێ بە خۆی دەوت لە ژیانی ژن و مێرددا گرینگ نییە پەیوەندیی سۆزداری لە ریزی پێشەوە بێت، چجای ژن و مێردێک ماوەیەکی زۆر بەسەر ژن و مێردایەتییەکەیاندا تێپەڕی بێت. لە ژیانی ژن و مێردایەتیدا شتگەلێ هەن لە سۆز و ئەڤینی گرینگترن، وەک خۆشەویستی و بەزەیی، ئاخر ئەو شتە خوداییانەی کە ڕەنگە مێردێک پەیڕەوی بکات، لێبووردەییە، بەڵام خۆشەویستی بەچاو هەموو ئەم شتانەوە لاوەکییە، مەگەر بنیادەم لە دووتوێی ڕۆمانەکان یان فیلمە ڕۆمانسییەکاندا ئەوە ببینێت، کە هەمیشە کارەکتەرەکان لە ژیانی خواسایی خۆیان گەورەتر وێنا دەکرێن و لە ئەفسانەیەک دەچێت.

ئێلا منداڵەکانی لە ریزبەندی پێشەوەی بایەخەکانی بوون. کچێکی جوانیان بە ناوی جانێت هەبوو لە زانکۆ دەیخوێند، هەروەها کچ و کوڕێکی جمکی هەرزەکاریان بە ناوی ئۆرلی و ئافی هەبوو، سەگێکی زەردیشیان بە ناوی سپیرێت هەبوو کە تەمەنی دوانزە ساڵ بوو و ئێلا لە پیاسەی بەیانیاندا لەگەڵ خۆی دەیبرد و هەر لە گوجیلەییەوە خۆشەویسترین هاوڕێی بوو، وەلێ ئەمێستا پیر بووبوو و کێشی زیاد بووبوو و گوێی کەڕ بووبوو و خەریک بوو کوێریش بێت. بێگومان ژیانی سپیرێت بەرەو کۆتایی دەچوو، وەلێ ئێلا دەیهەویست باوەڕ بە خۆی بێنێت کە هەتا هەتایە دەژی. لە ژیانیدا مەرگی هیچ شتێکی نەدیتبوو، ئیدی مەگەر وەک دەقپێوەگرتنێک یان قۆناغیک یان وەک ژن و مێردایەتی بە بەرچاوییەوە بە ڕووونی ڕووی دابا.

خێزانی ڕۆبنشتاین لە نۆرتامبتۆن لە ولایەتی ماساشۆستس لە خانوویەکی گەورە و لەسەر شێوازی ڤیکتۆری دەژیا. هەرچەندە خانووەکە حەوەجەی بە هەندێ بیرازکردنەوە هەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا خانوویەکی نایاب بوو، پێنج ژووری نوستن و سێ گەرماوی تێدابوو. زەوییەکەی بە دارێکی پتەو و درەوشاوە مۆکێت کرابوو. گەراجێکی تێدابوو جێگەی سێ ئۆتۆمبیلی لێدەبووەوە، دەرگای شووشەی فراوانی هەبوو، هەروەها لە

باخچەکەیدا جاکوزی هەبوو. خێزانەکە زیانبژێری ژیان و زیانبژێری ئۆتۆمبیلی هەبوو، بەرنامەی خانەنشینی و پلانی پاشەکەوتی لە زانکۆ هەبوو، هەروەها ژمێرەی هاوبەشیی بانکیشی هەبوو. جگە لەو خانووەی کە تێیدا نیشتەجێ بوون، خێزانەکە دوو شوقەی نایابی دیکەیان هەبوو: شوقەیەک لە بۆستن و ئەوی دی لە ڕۆدئایلاند. خۆی و دەیڤید لەپای وەدەستهێنانی هەموو ئەوانەدا دەوانێکی زۆریان دا.ماڵێکی فراوانی پڕ منداڵ و پڕ لە کەلوپەلی نایاب، لەگەڵ ئەوەی بۆنی نانی هەلاتە ماڵەکەی پڕ دەکرد، ڕەنگە بە لای هەندێ کەسەوە شتێکی دووبارەوە بووبێت، بەڵام وێنەی ژیانێکی نموونەییش بوو. لەسەر ئەم دیدگا هاوبەشە ژیانی ژن و مێردایەتییان پێکەوە نا و گەر هەموو خەونەکانیشیان بەدی نەهێنابێت، ئەوا زۆربەیان بەدی هێنابوو.

لەدوا جەژنی ڤالانتایندا، شووەکەی ملوانکەیەکی ئەڵماسی شێوە دڵی لەیەل کارتێکدا پێشکەش کرد کە ئەمەی لەسەر نووسرابوو:

بۆ ئێلای ئازیزم

**ئەو ژنە تەبیات هێمن و دڵ باشە، کە ئارامی قەدیسەیەکی هەیە. سوپاست دەکەم، چونکە تۆ منت وەک چۆن هەم قەبووڵە. سوپاست دەکەم، چونکە تۆ هاوسەرمیت.**

**خۆشەویستت**

**دەیڤید**

ئێلا پێشتر لە لای دەیڤید هیچی نەدرکاندبوو، لێ کاتێ کارتەکەی خوێندەوە، هەستی کرد شینێک دەخوێنێتەوە. بە خۆی گوت: کاتێ کە دەمرم هەر ئەمە دەنووسن، خۆ ئەگەر لەمەش زیاتر دڵسۆز بن، ئەوا دەکرێ ئەم پەرەگرافەیشی بخەنەسەر:

لەگەڵ ئەوەی ئێلا بەشێکی زۆری ژیانی خۆی بۆ شووەکەی و منداڵەکانی تەرخان کردبوو، کەچی شارەزایی لەو شێوە ژیانە نەبوو کە ڕەنگە هەر بایی ئەوەی یارمەتیی دابا تا بەسەر ئاستەنگەکانی ژیانی خۆیدا زاڵ بێت. ئاخر خۆ

لەو کەسانەش نەبوو کە حەز لە سەرکێشی دەکەن، چونکە گۆڕینی جۆری ئەو قاوەیەی ڕۆژانە دەیخواردەوە، بۆ ئەو ئەرکێکی گەورە بوو.

لە سۆنگەی هەموو ئەمانەوە کەسێک نەیتوانی تەنانەت بە ئێلا خۆیشییەوە لەو شتە بگات، کە دوای بیست ساڵی ژن و مێردایەتی، لە ساڵی ٢٠٠٨دا داوای لێک جیابوونەوە بکات.

* * *

بەڵام هۆیەک هەبوو، ئەویش خۆشەویستی بوو.

خۆ ئەوان لە هەمان شار پێکەوە نەدەژیان، تەنانەت لە هەمان کیشوەریش نەبوون و چەندەها میل لە نێوانیاندا بوو، بەڵکو بەقەد جیاوازیی شەو و ڕۆژ لە یەک جیابوون. شێوازی ژیانیان بە جۆرێ جیا بوو، هیچیان ئەوی تری پێ قووت نەدەچوو، ئیدی چۆن یەکتریان خۆش بوێ. کەچی ئەوە بەڕاستی ڕووی دا، زۆر بە خێراییش ڕووی دا، بە خێراییەکی وا ئێلا خۆیشی بواری ئەوەی نەبوو تا لەو خۆشەویستییە ئاگادار بێتەوە و لێی تێبگات.

ئەوە بوو لەناکاو مینا کەسێک لە شوێنێکەوە بەردێکی فڕێدابێتە ناو گۆمی مەنگی ژیانی، ئاوها عەشق زۆری بۆ ئێلا هێنا.

# ئێلا

## نۆرتامبتۆن، ١٧ی ئایاری ٢٠٠٨

باڵندەکان لەو ڕۆژە بەهارییە فێنکەدا لەودیوی پەنجەرەی نانخانەکەوە دەیانخوێند. ئێلا دوای ئەوەی لە یادەوەریی خۆیدا نەک هەر دیمەنەکەی وەک بەشێک لە ڕابردوو زیندوو نەکردەوە، بەڵکو وای بە خەیاڵدا هات کە لە شوێنێکی تری ئەم بوونەوارەدا چرکەساتێکی بەردەوام لەئارادایە.

لە عەسری ڕۆژی شەممەدا، هەموو ئەندامانی خێزانەکە بەدەوری مێزەکەدا کۆببوونەوە و نیوەڕۆژەیان دەکرد. شووەکەی قاپێکی لە ڕانەمریشکی کوڵاو پڕکردبوو، کە بە لایەوە خۆشترین خواردن بوو. ئافی وەک ئەوەی چەقۆ و چەتاڵەکەی دوو شووڵ بن و دەوڵیان پێ لێبدات، گەمەی پێدەکردن، لە کاتێکدا ئۆرلیی خوشکە جمکانەی هەوڵی دەدا ئەو پاروانە بژمێرێت کە دەیخواردن تا ڕۆژانە ٦٥٠ کالۆری دەست بکەوێت و سستەمی وزەی تێک نەچێت. جانێت کە هێشتا لە قۆناغی یەکەمی زانکۆی ماونت هۆلیۆک بوو، وا دیاربوو لە فکران ڕۆچووبوو و خەریک بوو پەنێرێکی سپی و تازەی دەخستە ناو پارچە نانێکەوە، هەروەها پوورە ئیستریش کە هاتبوو تا قاڵبێک کاتۆیان بۆ دروست بکات کە لە دروستکردنیدا دەسترەنگین بوو، مابووەوە تا نانیان لەگەڵدا بخوات، چونکە ئێلا کاری ناوماڵی زۆر بوو و پێی باش بوو یارمەتییان بدات. ئاخر لەم دواییەدا نەدەهاتنەوە تا پێکەوە نان بخۆن، ئیدی ئەمەی بە هەل زانی تا سەرلەنوێ پێکەوە لەسەر مێزەکە نان بخۆن.

"ئیستر، ئایا ئێلا هەواڵی خۆشی پێ ڕانەگەیاندوویت؟"، دەیڤید لەناکاو پرسیاری کرد، "کارێکی گرینگی دۆزیوەتەوە".

لەگەڵ ئەوەی ئـێلا دەرچـووی زانکـۆ بـوو و بڕوانـامەی لە ئەدەبیـاتی ئینگلیزیـدا بەدەسـت هێنـابوو و حەزی لە خوێنـدنەوەی ڕۆمـانیش بـوو، بەڵام دوای دەرچـوونی لە بـواری پسپۆڕییەکەی خۆیـدا کـاری نەکردبـوو، تەنهـا هەندێ کورتەگوتاری بۆ هەندێ گۆڤاری ئافرەتـان نووسـیبوو و بەشداریی لە چەند یانەیەکی کتێبدا کردبوو و ناوبەناویش وتاگەلێکی بۆ چەند ڕۆژنامەیەکی ناوخۆ نووسیبوو، ئیدی هەموو شتەکە هەر ئەوەندە بوو. بڕێ جار تەماحی ئەوەی هەبوو کە ببێتە ڕەخنەگرێکی بەناوبـانگی کتێبـان، لـێ دوای ئەوە بەو دۆخە قایل بـوو کە ژیـان بەرەو شـوێنێکی دیکەی بـردووە و کردوویەتـی بە کابـانێکی بەهۆڵەوەبـووی مـاڵ و گەرەکە بـایەخ بە هەرسـێ منداڵەکەی بـدات، چونکە ئەرکی لەڕادەبەدەری بەڕێوەبردنی ماڵەکەی کەوتووەتە ئەستۆ.

بێزاریـی دەرنەدەبـڕی. ئـاخر ئەو دایـکە و هاوسـەرە، بەزۆری مژوولـی کاری ماڵەوەیە، بەیانیـان لەگەڵ سـەگەکەیدا پیاسـەی دەکرد و بەرپرسیاریتیی بژێـوی خێزانیـشی لە ئەسـتۆ نەبـوو. هەرچەنـدە دەستەخوشـکەکانی تـری لە زانکۆی سمیت، بە تایبەتی ئەوانەی لاگری یەکسانیی ژن و پیاو بوون، لەگەڵ ئەم هەڵبژاردنەیـدا نەبـوون، کەچـی ئەو بەوە قایـل بـوو وەک دایکێـک مـاڵ جێنەهێڵێت و ئاوهاش هەستی بە ڕەزامەندی دەکرد، چونکە توانیبووی لەگەڵ شـووەکەیدا ئەو ئەرکە هەڵبگرێت، بەڵام دەسـتبەرداری ئـارەزووی خوێندنەوە نەدەبوو و هێشتا خۆی بە خوێنەرێکی بەپەرۆش دادەنا.

بەڵام ئەوە چەنـد سـاڵێکی کەمە خەریـکە شـتەکان دەگـۆڕێن: منـداڵەکان گەورە بوون و خۆیان وا پیشان دەدەن کە ئیدی وەک جاران ئاتاجی ئەو نین. ئێلا کە زانیـی کـاتێکی زۆری دەسـتبەتاڵیی هەیە، ئیدی کەسـێکیش نییە کـاتی لەگەڵدا بەسەر ببات، بیری کردەوە کە لە کارێک بگەڕێت، لەمەدا دەیڤید هـانی دا. هەرچەنـدە لەم بـارەیەوە قـسەیان کردبـوو، لـێ ئەو هەلەی کە بـۆی هەڵدەکەوت، بە کەمی هەولّی دەدا بیقۆزێتەوە. کە کارێکی دەدۆزییەوە، خاوەن کـارەکە پێـی دەگوت کە ئەوان منەی کەسێکی لەو تەمەن کەمتر دەکەن، یـان کەسـێکیان دەوێ شـارەزاییەکی فراوانتـری هەبێـت. جـا لە ترسـی ئەوەی بەردەوام دەستیان بە ڕوویەوە دەنا، شتەکەی پشتگوێ دەخست.

لە ئایاری ٢٠٠٨دا، هەموو ئەو ئاستەنگانە نەمان کە بە درێژایی ئەم هەموو ساڵە لە بەردەمیدا ڕێگربوون. ئەوەبوو نزیکەی دوو هەفتە لەمەوبەر لە چلەمین جەژنی لەدایکبوونیدا، کاتێکی زانی وا بۆ پەخشکارێکی ئەدەبی کار دەکات کە بنکەکەی لە بۆستنە. شووەکەی لە ڕێگەی یەکێ لە مەعمیلەکانییەوە ئەم کارەی بۆ دۆزییەوە- دووریش نییە لە ڕێگەی یەکێ لە ئافرەتە دۆستەکانییەوە بووبێت.

ئێلا وتی: "ئەوە کارێکی ئەوەندە گرینگ نییە، ئاخر من جگە لە خوێنەرێکی خۆتەرخاننەکردووی کارە ئەدەبییەکانی پەخشکارێکی ئەدەبی پتر نیم".

وەلێ دەیڤید وا دیاربوو پێی لەسەر ئەوە دادەگرت کە نەهێڵێت لە نرخی کارە نوێیەکەی کەم بکاتەوە، ویستی بە هاندانەوە پێی بڵێت،"دەی پێیان بڵێ کە ئەوە پەخشکارێکی ئەدەبیی بەنێوبانگە"، لێ کاتێ ئەمەی نەوت، بە سووربوونەوە گوتی: "ئێستر، ئەوە پەخشکارێکی ئەدەبیی سەنگینە. گەرەکە ئەوەش ڕەچاو بکەیت کە ئەو کوڕ و کچانەی تازە لە زانکۆ دەرچوون، ئێلا لە نێویاندا تاقە ئافرەتێکە دوای ساڵانێکی زۆر تەنها کابانی ماڵ بووە! ئایا ئەمە شتێکی گرینگ نییە؟".

ئێلا لە خۆی پرسی ئاخۆ شووەکەی لە دڵەوە هەست بە تاوان دەکات کە لە ماوەی ئەو ساڵە دوورودرێژانە لە کارکردن دووری خستووەتەوە، یان غایەنەتی لێدەکات. ئیدی بەوای زۆر پەرۆشییەوە کە لە ئێستادا کاربکات، ئەوەندە ئەم دوو گریمانەیەی بەهەند هەڵنەگرت.

دەیڤید کە کۆتایی بە قسەکەی هێنا، هێشتا زەردەخەنە بە لالێوییەوە بوو "هەر ئەمەشە من ناوی لێدەنێم باوەڕبەخۆبوونی ڕەها، هەموومانیش شانازی بەوەوە دەکەین".

وەک ئەوەی ئێلا بۆ هەتاهەتایە مێزەکە جێ بهێڵێت، پوورە ئێستر بە دەنگێکی بەسۆز و ناسکەوە وتی: "ئەمە خەڵاتکردنە، بەڕاستی ئێلا شایستەی ئەوەیە".

هەموویان بە خۆشەویستی و نیانییەوە تێیانڕوانی. ئافی وەک پیشەی هەمیشەیی سەرنجی بێزاریی دەرنەبڕی، ئۆرلیش وا دیاربوو بۆ یەکەم جارە جگە لە دیمەنی خۆی بایەخ بە شتێکی تر دەدات. ئێلا خۆی ناچارکرد کە

ڕێزی ئەم چرکەساتی نیانی و ناسکییە بگرێت، لێ هەستی بە شەکەتییەکی زۆر کرد کە لەوەوبەر هەستی پێ نەکردبوو. ئیدی خواخوای بوو یەکێکیان بابەتەکە بگۆڕێت.

بێگومان جانێتی کچەگەورەی گوێی لە خواستەکەی بوو، بۆیە لەناکاو وتی: "منیش هەواڵێکی نوێم پێیە".

هەموو سەرەکان بە لایدا وەرسووڕان، ڕوخسارگەلێ بە زەردەخەنەیەکی چاوەڕوانکراوەوە گەشانەوە.

"مــن و ســکۆت بڕیارمــان دا هاوســەرگیری بکەیــن"، جانێــت لەگەڵ جاڕدانەکەدا وتی: "دەزانم چی دەڵێن! گوایا هێشتا خوێندنمان تەواو نەکردووە و شتی لەم بابەتە، وەلێ گەرەکە ئەوە بزانن ئێمە ئامادەین دواتر هەنگاوی گەورە بنێین".

دوای ئەو گەرموگوڕییەی کە پێش چەند چرکەیەک دەوری دابوون، بێدەنگییەکی تەنگەتاویئامێز جێی گرتەوە و باڵی بەسەر مێزەکەدا کێشا. ئۆرلی و ئافی نیگایەکی ئاڵۆزیان ئاڵوگۆڕ کرد، میمکە ئیستر کە پەرداخێ خۆشاوی سێوی بە دەستی توند گرتبوو، لە جێی خۆی وشک بوو، دەیڤیدیش وەک ئەوەی لەپڕ دڵی لە خواردن تۆرابێت، چەتاڵەکەی خستە لاوە و بە چاوە مەڕییەکانی تەماشای جانێتی کرد، وەک ئەوەی قومێ سرکەی خواردبێتەوە، لە زەردەخەنە کەوت و لێوەکانی هەڵقرچان.

"جوانە! پێم وابوو کە ئێوە بەشداریی شادمانییەکەم دەکەن، جگە لەم ساردوسڕییەتان هیچی دیکەم پێ نەبڕا". جانێت بەدەم قسەوە دەستی بە گریان کرد.

دەیڤید وەک ئەوەی بیهەوێ لە قسەکەی جانێت دڵنیا بێت، پرسیی: "ئەرێ وتت گوایا ئێوە هاوسەرگیری دەکەن؟". "

"باوکە، وا دیارە پێتان وایە کە ئەمە هێشتا زۆر زووە، بەڵام چەند ڕۆژێ لەمەوبەر سکۆت داوای لێکردم کە شووی پێ بکەم، منیش قایل بووم".

ئێلا پرسیی: "بەڵام بۆچی؟".

لە نیگای جانێتەوە، ئێلا زانیی کە دوێتەکەی چاوەڕێی پرسیارێکی ئاوهای لێ نەدەکرد، بەڵکو دەبوو بپرسێت"کەی؟"یان" چۆن؟" لە هەردوو باردا ئەوە

مانای وایە بە دوای جلی بووکێنیدا دەگەڕێت، بەڵام پرسیاری (بۆچی) تەواو تووشی سەرسوڕمانی کرد.

"چونکە پێم وایە خۆشم دەوێ"، جانێت ئەمەی بە ڕیتمێکی خۆبەدەستەوەدانەوە وت.

"ئازیزم، مەبەستم ئەوەیە بڵێم ئەم پەلەکردنە بۆچی؟"، ئیلا پێی لەسەر داگرت، "بۆ نموونە ئایا تۆ دووگیانیت؟".

میمکە ئیستر لەسەر کورسییەکەی ڕاپەڕی و دەموچاوی گرژ بوو، دیارە ئازارێکی هەبوو. بۆ هێورکردنەوەی دڵەکزێکەی حەبێکی لە گیرفانی دەرهێنا و دەستی بە کرۆشتنی کرد.

ئافی بە پێکەنینەوە گوتی: "دەبم بە خاڵۆ". ئێلا دەستی جانێتی گرت و بە نەرمی گوشی و گوتی: "دەتوانیت بەردەوام لەگەڵماندا ڕاستگۆ بیت. خۆت ئەوە دەزانیت، شتەکە هەرچییەک بێت، ئێمە یارمەتیت دەدەین".

"دایکە، تکایە واز لەوە بێنە!"، جانێت ڕاپەڕی و دەستی کێشایەوە و وتی: "ئەمە پەیوەندیی بە دووگیانبوونەوە نییە. تۆ شەرمەزارم دەکەیت".

ئێلا بە هێوری بەرسڤی دایەوە: "تەنها دەمەهەوێ کۆمەکت بکەم". دوایی هێوربوونەوەیەک خەریکبوو دەربکەوێت کە نیشانەی ئەوەبوو شتەکە هەستەمە سەربگرێت.

تۆ دەتەوێ سووکایەتیم پێ بکەیت. وا دیارە لە شووکردنم بەسکوت لە سک لێ پڕبوونمی زیاتر نابینیت! ئایا بیرت لەوە کردووەتەوە کە ڕەنگە خۆشم بوێ؟ ئاخر دەمەوێ شوو بەم پیاوە بکەم، چونکە خۆشم دەوێ. ئەوە هەشت مانگە ئێمە چاومان بە یەکتر دەکەوێ".

ئێلا بە تەوسەوە وەڵامی دایەوە: "ئێ ئێ، بەڵی، لە تۆ وایە بە هەشت مانگ دەتوانیت کەسایەتیی پیاوێک بناسیت! ئەوە بیست ساڵە من و باوکت ژن و مێردین، کەچی هێشتا ناتوانین لافی ئەوە لێبدەین کە هەریەکەمان دەربارەی ئەوی تر هەموو شتێ دەزانێت. ئاخر بۆ ئەم جۆرە پەیوەندییە، هەشت مانگ هەر هیچ نییە".

ئافی بە زەردەخەنەوە گوتی" خودا لە شەش ڕۆژدا ئەم بوونەی دروستکرد"، وەلێ ئەو زەردەخەنە ساردوسڕەی ئەوانەی سەر مێزەکە

ئاراستەیان کرد، بێدەنگیان کرد. کە زیادە شلەژانێکیش باڵی کێشا، دەیڤید هاتە قسە و هەردوو چاوی لە کچە گەورەکەی بڕی، بڕۆی تێک نا و وتی: "ئازیزم، ئەوەی دایکت هەوڵدەدات پێتی بڵێت ئەوەیە کە بەڵێن بەیەکتردان شتێکە و هاوسەرگیری شتێکی دیکەیە".

جانێت لێی پرسی: "بەڵام باوکە، ئایا تۆ پێت وایە کە ئێمە هەتاهەتایە دەبێ هەر خەریکی بەڵێن بەیەکتردان بین؟".

ئێلا هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و گوتی: "لە ڕاستیدا ئێمە چاوەڕێی ئەوەمان دەکرد کە لاوێکی باشتر بدۆزیتەوە. ئاخر تۆ هێشتا لەوە منداڵتری تا بتوانیت پەیوەندییەکی ڕاستەقینە ببەستیت".

"دایکە، ئایا دەزانیت؟"، جانێت بە دەنگێکی نزمی وا هەر ئەوەتا بیسترا وتی: "پێم وایە تۆ لە ڕوانگەی پەیوەندییەکەی خۆتەوە دەڕوانیتە پەیوەندییەکەی من. تۆ لەبەر ئەوەی لە تەمەنێکی زوودا شووت کرد و هەر لە تەمەنی مندا بوویت دووگیان بوویت، ئەمە وا ناگەیەنێت کە منیش هەمان هەڵە بکەم".

دەموچاوی ئێلا وەک ئەوەی زللەیەکی لێدرابێت، سوورهەڵگەڕا. بە وردی ماوەی سەختی دووگیانییەکەی خۆی بیرکەوتەوە، کە بوو بەوای ئەوەی جانێت بەنەبەکامی لەدایک ببێت. منداڵەکەی هێز و بڕستی لەبەر بڕیبوو، بۆیە لێبڕا شەش ساڵی تر چاوەڕێ بکات ئینجا دووگیان ببێت.

"ئازیزم، ئێمە شادمانین کە پەیوەندیت لەگەڵ سکۆتتدا بەستووە"، دەیڤید ئەمەی بە وریاییەوە گوت و هەوڵی دا شێوازێکی جیا بەکار بهێنێت،" ئەو لاوێکی ناسکە، بەڵام دوای دەرچوونت لە زانکۆ کێ دەزانێت بۆچوونەکانت ناگۆڕێن؟ ڕەنگە بەتەواوی بگۆڕێن".

جانێت کەمەکێ سەری بادا و جۆرە پاساوێکی ڕەخنەگرانەی دروستکراوی هێنایەوە، ئینجا پرسیی: "ئایا ئەمە هەمووی لەبەر ئەوەیە کە سکۆت جوولەکە نییە؟".

دەیڤید لەوەی بیستی وەک ئەوەی باوەڕ بە گوێیەکانی خۆی نەکات، تێی ڕوانی. ئاخر ئەو شانازیی بەوەوە دەکرد کە باوکێکی کراوە و ڕۆشنبیرە و لە ماڵەکەدا دەربارەی نەژاد یان ئایین یان سێکس قەت بۆچوونی خراپی نەبووە.

وا دیاربوو جانێت سووره لەسەر بۆچوونەکانی خۆی، ئەوەبوو لای بە لای دایکیدا کردەوە و لێی پرسی: "ئایا دەتوانیت ڕاستەوخۆ تەماشای چاوەکانم بکەیت و پێم بڵێیت، ئەگەر سکۆت لاوێکی جوولەکە بوایە و ناوی هاروون بوایە، ئەوسا ڕێگریت دەکرد؟"، دەنگی جانێت جۆرە بێزاری و دەردەدڵییەکی تێکەوت و ئێلای لەوە ترساند کە شتهایەک لە دڵیدا پەنگیان خواردووەتەوە.

"ئازیزم. لەگەڵتدا تەواو ڕاستگۆ دەبم، تەنانەت گەر بە قسەکانیشم قایل نەبیت. دەزانم چەند نایابە کە بنیادەم لاو و عاشق بێت. بڕوام پێ بکە، بەڵام شووکردن بە پیاوێک سەر بە پاشخانێکی جیا بێت، قومارێکی گەورەیە. من و باوکتیش دەمانەوێ دڵنیابین کە تۆ پیاوێکی شیاوت هەڵبژاردووە".

"تۆ چوزانیت کە هەڵبژاردنی شیاو لە دیدی تۆوە بۆ من هەڵبژاردنێکی شیاوە؟".

پرسیارەکە ئێلای تووشی هەندێ سەرەگێژکە کرد. وەک ئەوەی تووشی ژانەسەر بووبێت، هەناسەیەکی هەڵکێشا و دەستی بە تەوێڵیدا هێنا.

"دایکە، دایکە من خۆشم دەوێ، ئایا پێت وایە ئەمە شتێکی تێدایە؟ ئایا وشەی خۆشەویستیت لە شوێنێکدا بیر ناکەوێتەوە؟ ئاخر ئەم وشەیە بە توندی دڵم دەخاتە خورپە و ناتوانم بەبێ ئەو بژیم".

ئێلا گوێی لە خۆی بوو بە بێدەنگی پێدەکەنێت. قەت نیازی نەبوو گاڵتە بە هەستی کچەکەی بکات، لێ ڕەنگە پێکەنینەکەی بەوای شتگەلێکەوە بن و خۆی پەی پێ نەبات، بۆیە ئاوها شڵەژاوە. خۆ ئەو و جانێت زۆر بەگژ یەکدا چوون، بەڵام ئەمڕۆ وا هەست دەکات بەگژ شتێکی دیکەدا دەچێت، شتێکی گەورەتر.

"دایکە، ئەی تۆ لە ژیانتدا کەسێکت خۆش نەویستووە؟"، جانێت بە ڕیتمێک کە کەمرێزیی تێدابوو، وەڵامی دایەوە.

"نەختێ ڕاوەستە. ئەرێ واز لە خۆنوقمکردن لەنێو زیندەخەون ناهێنیت تا بگەڕێیتەوە دۆخی ڕاستەقینەی خۆت؟ تۆ بوویت بە...". چاوەکانی ئێلا بەرەو پەنجەرەکە هەڵیانڕوانی و لە وشەیەکی کاریگەر دەگەڕا، تا لە کۆتاییدا وشەی (ڕۆمانسی)ی بە خەیاڵدا هات.

'چیی تێدایە ببمە ڕۆمانسی؟'، جانێت پرسیاری کرد و لە ڕیتمی دەنگیدا ئەوەی دەرخست کە سووکایەتیی پێکراوە.

بەڕاستی چیی تێدایە کە ببێتە ڕۆمانسی؟ ئێلا پرسیی ئەوە لە کەیەوە وشەی ڕۆمانسی بێزاری دەکات؟ کە نەیتوانی بەرسڤی ئەو پرسیارە متبووانەی لێواری مەژگی بداتەوە، درێژەی بە قسەکانی دا، 'دەی، ئازیزم. تۆ لە چ سەدەیەکدا دەژییت؟ ئەوە بخە بن سەرت کە ئافرەتان شوو بەوانە ناکەن کە خۆشیان دەوێن، بەڵکو ئەو پیاوە هەڵدەبژێرن کە دەبێتە باوکێکی باش و مێردێکی وا کە پشتی پێ ببەسترێ. خۆشەویستی هەستێکی جوانە و دێت، بەڵام زوو ون دەبێت'.

کاتێ ئێلا لە قسەکەی بووەوە، ئاوڕی لە مێردەکەی دایەوە. دەیڤید مینا دەستەکانی لەنێو ئاودا تێکپەڕێنێت، بەکاوەخۆ لە بەردەم خۆی دەستەکانی تێکپەڕاند و وەک ئەوەی لە ژیانیدا بۆ یەکەم جار بیبینێت تەماشای کرد.

جانێت وتی: 'دەزانم بۆ وا دەکەیت، ئێرەیی دەبەیت، چونکە من جحێڵ و دڵخۆشم. دایکە دەتەوێ وەک تۆ بم؟'.

هەستێکی نامۆ وەک بەردێکی گەورە کەوتبووە هەناوی ئێلا. ئایا کابانێکی شادمانی ماڵ نییە؟ یان لە نیوەی تەمەندا لە تۆڕی ژن و مێردایەتییەکی سەرنەکەوتوودا گیری خواردووە؟ تۆ بڵێیت منداڵەکانی ئاوها تەماشای بکەن؟ هەروەها شووەکەیشی بەو گوێرە؟ ئەی هاورێ و دراوسێکانی چی دەڵێن؟ لەناکاو بیرکردنەوەیەکی بەسەردا زاڵ بوو، هەستی کرد وا هەموو ئەوانەی دەوروبەری شینی بۆ دەگێڕن. ئەم گومانەی لە ڕادەبەدەر ئازاربەخش بوو و هەناسەیەکی سارد لە دەمی دەرپەڕی.

دەیڤید بە ڕووگرژییەوە ئاوڕی لە جانێت دایەوە و گوتی: 'گەرەکە داوای لێبوردن لە دایکت بکەیت'.

ئێلا بە مەلوولییەوە گوتی: 'گرینگ نییە. من چاوەڕێی هیچ تەوازۆیەکی لێ ناکەم'.

جانێت نیگایەکی ناوێلی دایکی کرد و کورسییەکەی بەرەو پشتەوە پاڵ نا و سەرکۆشەکەی خستە لاوە و بە تووڕەیی لە نانخانەکە دەرچوو. دوای چەند چرکەیەک ئۆرلی و ئافی بە بێدەنگی دوایکەوتن. جا ئەم ڕەفتارەیان لە

پشتگیریکردنێکی نائاسایی خوشکە گەورەکەیانەوە بوو، یان لە قسەی گەورەکان بێزار بووبوون، ئینجا میمکە ئیستر بە بیانگێکی لاواز ڕۆیشت و دوا دەنگی حەبی دژە دڵەکزەی کرۆشت.

دەیڤید و ئێلا بە دەوری مێزەکەدا مانەوە، هەستی شڵەژانێک بە توندی لە نێوانیاندا باڵی کێشا. ئەو شتەی ئازاری ئێلای دەدا، وەک خۆیان دەیانزانی ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو بۆشاییەی نێوانیان بوو، پەیوەندیی نە بە جانێتەوە هەبوو نە بە دوو منداڵەکەی دیکەیانەوە.

دەیڤید کە چەتاڵەکەی خستبووە لاوە، هەڵیگرت و قەدەرێک تەماشای کرد و گوتی: "کەواتە دەتوانم بگەمە ئەو بەرەنجامەی کە تۆ شووت بەو پیاوە نەکردووە کە خۆشت ویستووە؟".

"تکایە، مەبەستی من ئەمە نەبوو".

"ئەی مەبەستت چی بوو؟"، دەیڤید کە هێشتا لەگەڵ چەتاڵەکەدا دەدوا، پرسیی: "کاتێ هاوسەرگیریمان کرد، پێم وابوو کە خۆشت دەوێم".

"تۆم خۆش دەویست"، بەڵام ئێلا ئەمەیشی خستە سەر و گوتی: "ئەو کاتە".

دەیڤید بە دەنگێکی بێ دەربڕین پرسیی: "ئەی کەی دەستت لە خۆشەویستی من هەڵگرت؟".

ئێلا مینا ئافرەتێک کە قەت ڕەنگدانەوەی وێنەی خۆی نەدیبێت، بە سەرسوڕمانەوە دیقەتی شووەکەی دا، وەلێ ئەمێستا ئافرەتێک بوو ئاوێنەیەکی هەڵگرتبوو و بەرەو ڕوخساری خۆی بەرزی کردبووەوە. ئەرێ دەستی لە خۆشەویستی مێردەکەی هەڵگرتووە؟ پرسیارێک بوو لەوەوبەر لە خۆی نەکردبوو. دەیهەویست بەرسڤی ئەم پرسیارە بداتەوە، وەلێ ئەو شتەی حەوەجەی بوو پەیڤ بوو. لە ناخەوە دەیزانی گەرەکە هەردووکیان چارەسەری شتەکە بکەن، نەک منداڵەکانیان، بەڵام هەردووکیان لەجیاتی ئەوە تا لە توانایاندا بوو هەوڵیان دا کە: لێگەڕێن با ڕۆژەکان تێپەڕن و شتە دووبارەوەبووەکان بەسەر ژیانیاندا زاڵ بن و ڕۆژگار بە ساردوسڕیی ڕاستەقینەوە ڕێڕەوی خۆی ببرێت.

دەستی بە گریان کرد، نەیتوانی بەر لەو خەمە بەردەوامە بگرێت کە بەبێ ئاگایی هەردووکیان باڵی کێشابوو و بووبوو بە بەشێک لە بوونیان. دەیڤید ڕوخسارە گرژەکەی شاردەوە. هەردووکیان دەیانزانی کە بەقەد ئەوەی ڕقی لەوەبوو کە لە بەرانبەری بگری، ئەویش نایهەوێ ببینێت، دەگری. لە بەختی ئەواندا زەنگی تەلیفۆنەکە ڕزگاری کردن.

دەیڤید تەلیفۆنەکەی هەڵگرت و وتی: "ئەلۆ... بەڵێ لێرەیە. بە یارمەتیت نەختێ چاوەڕێ بکە".

ئێلا خۆی کۆکردەوە و تا لەتوانایدابوو هەوڵی دا وا دەربکەوێت کە لە دۆخێکی دەروونیی باشدایە. دەستی بە قسان کرد: "بەڵێ، ئێلا قسەدەکات".

"ئەلۆ، من میشێلم، ببوورە لەم پشووی کۆتایی هەفتەیەدا بێزارم کردیت"، دەنگی ئافرەتێکی گەنج بوو، "دوێنێ ستیف داوای لێکردم پەیوەندیت پێوە بکەم، بەڵام بیرم چوو. ئایا دەستت بە خوێندنەوەی دەستنووسەکە کرد؟".

"ئۆو"، ئێلا دوای ئەوەی بیری کەوتەوە کە ئەرکێک چاوەڕێی دەکات، هەناسەیەکی هەڵکێشا. یەکەم کارێکە کە پەخشکارێکی ئەدەبی بۆی دەنێرێت، ڕۆمانێکە نووسەرێکی ئەورووپیی نەناسراو نووسیوێتی و دەبێت راپۆرتێکی تێروتەسەلی لەسەر بنووسێت. "پێی ڕابگەیەنە با نیگەران نەبێت، دەستم بە خوێندنەوەی کردووە"، ئێلا ئەمەی بە درۆ گوت . ئاخر ژنێکی بەتەماح و سەرسەخت، نایەوێ لە یەکەم کارێکدا کە داوای جێبەجێکردنی لێکراوە، میشێل بێزار بکات.

"باشە، ئەی شتەکان چۆن دەڕۆن؟".

ئێلا کەمەکێ بێدەنگ بوو و نەیزانی چی بڵێت. ئاخر جگە لەوەی کە دەستنووسی ڕۆمانێکی مێژووییە دەربارەی ڕۆمیی شاعیری سۆفیی بەنێو و دەنگ کە بە (شەکسپیری دنیای ئیسلامەتی)یش دادەنرێ، دەربارەی دەستنووسەکە هیچ شتێکی نەدەزانی.

"ڕۆمانێکی سۆفیانەیە"، ئێلا پێکەنی و ئومێدەوار بوو کە بە شۆخیکردن درۆکەی پەردەپۆش بکات.

بەلام میشێل مژوول بوو و بە کردەبڕی گوتی: "باشە، گوێ بگرە. پێم وایە وەک خۆت پێشبینی دەکەیت کە ڕاپۆرتنووسین دەربارەی ڕۆمانێکی ئاوها کاتێکی زۆرتری گەرەکە...".

کە دەنگی میشێل کپ بوو، لە دووری تەلیفۆنەکە ورەوریێکی ژنەوت. ئێلا وای بە خەیاڵدا هات کە لەیەک کاتدا چەندین کار دەکات- نامە ئەلیکترۆنییەکانی دەخوێنێتەوە، پێداچوونەوەی یەکێ لە نووسەرەکان دەخوێنێتەوە، قەپاڵ لە بابۆڵەیەکی زەلاتەی تونا دەدات، نینۆکەکانی بۆیە دەکات- هەموو ئەمانەش لە کاتی تەلیفۆنکردندا.

میشێل دوای خولەکێک پرسیی: "هێشتا لەوێیت؟".

"بەڵێ".

"باشە، گوێ بگرە، لێرە دۆخەکە ئاڵۆزە. دەبێ بڕۆم. تەنها ئەوەت لە یاد بێت کە دوامۆڵەت بۆ ڕادەستکردنی کارەکە سێ هەفتەی ترە".

لەپڕ ئێلا وتی: "دەزانم"، هەوڵی دا وای دەربخات کە زۆر بە پلانە، "کارەکە لە کاتی دیاریکراوی خۆیدا ئامادە دەبێت".

لە ڕاستیدا ئێلا لە هەڵسەنگاندنی ئەم دەستنووسەدا متمانەی بە خۆی نەبوو، هەرچەندە لە سەرەتادا زۆر پەرۆش و لەخۆ دڵنیا بوو، خۆشحاڵیش بوو، چونکە یەکەم کەس بوو ڕۆمانی نووسەرێکی گومناوی دەخوێندەوە کە هێشتا چاپ نەکراوە و لە دیاریکردنی ئەم نووسەرەدا ڕۆڵێکی دەبێت، با کەمیش بێت. کەچی ئێستا دڵنیا نەبوو کە دەتوانێت لە بابەتێکی وەک سۆفیگەرێتی قووڵبێتەوە کە پەیوەندیی بە ژیانی ئەوەوە نییە و ڕووداوەکانی بۆ سەدەی سیانزەهەم دەگەڕێنەوە.

بێگومان میشێل هەستی بە دوودڵییەکەی کردبوو، بۆیە لێی پرسی: (ئایا کێشەیەک هەیە؟).

. کاتێ وەلامی نەژنەوت، پتر پێی داگرت و پرسیی: (گوێ بگرە، دەتوانیت پێم بڵێیت دەتەوێ چی بڵێیت؟).

ئێلا دوای کەمێ بێدەنگی، بڕیاری دا کە ڕاستییەکەی بڵێت.

" پێم وایە لەم ڕۆژانەدا سەرودڵێکی ئەوتۆم نییە تا لە ڕۆمانێکی مێژوویی وردبیمەوە. مەبەستم ئەوەیە من بایەخ بە ڕۆمی و شتی وا نادەم و هێشتا

بابەتەکە بە لامەوە نامۆیە. کاشکێ ڕۆمانێکی دیکەت دەدامێ - شتێک زۆرتر پەیوەندیی بە خۆمەوە هەبێت."

"وای چ بۆچوونێکی سەیرە!"، مێشێل ئەمەیشی گوت، "تۆ پێت وایە گەر شتێکت خوێندەوە و شارەزایی باشت لێی هەبوو، ئیدی دەتوانیت باشتر کاری لەسەر بکەیت؟ نەخێر، قەت وا نییە! هەر بەوای ئەوەی لەم ولایەتە نیشتەجێیت وات بە خەیاڵدا دێت کە دەتوانیت ڕۆمانگەلێ بنووسیت، ڕووداوەکانی لە ولایەتی ماساشۆستس قەوماون، ئایا ئەمە ڕاستە؟".

"من مەبەستم ئەمە نەبوو..."، ئێلا کە وای گوت دەسبەجێ زانیی دواینیوەڕۆش هەمان ڕستەی دووبارە کردووەتەوە. نیگایەکی شووەکەی کرد تا بزانێت ئاخۆ ئەویش سەرنجی ئەوەی داوە، وەلێ زەحمەت بوو سیمای دەموچاوی دەیڤید بخوێنێتەوە.

"زۆر جار وا پێویست دەکات کتێبگەلێکیش بخوێنینەوە کە پەیوەندییان بە ژیانمانەوە نییە. ئەمە بەشێکە لە کارەکانمان. هەر لەم هەفتەیەدا کتێبێکم خوێندەوە ئافرەتێکی ئێرانی نووسیویێتی کە لە تاران سەرپەرشتیی سۆزانیخانەیەک دەکات، ئیدی ناچاربوو لە وڵات هەڵێت . ئایا دەکرێ داوای لێ بکەم کە دەستنووسەکە بۆ پەخشکارێکی ئێرانی بنێرێت؟".

"بێگومان نەخێر"، ئێلا ورەورێکی کرد و هەستی بە خۆی کرد کە هیچ لەباردانەبوو و تووڕەهاتە.

"ئایا ئاشنابوون بە خاک و کولتووری دوورەوە بە نیشانەی هێزی ئەدەبیاتی باش دانانرێ؟".

"بێگومان. گوێ بگرە، ئەوەی پێم وتیت لە بیری خۆتی بەرەوە. پێش وادەی دیاریکراو ڕاپۆرتێک لەسەر مێزەکەت دەبینی"، ئێلا بەدەم قسەوە ڕقی لە مێشێل هەڵگرت، چونکە بە شێوەیەک مامەڵەی لەگەڵدا دەکات وەک ئەوەی لە هەموو کەس وەڕسکەر و گێلتر بێت، ڕقی لە خۆیشی بووەوە، چونکە بواری دا ئەوە ڕووبدات.

"نایابە، ئەمەیە گیانی بەهۆڵەوەبوون"، مێشێل ئەمەی بە جۆرێ گوت مینا ستران بچڕێت،"خراپ لێم تێمەگە، لێ پێم وایە دەبێ ئەوەت لە یاد بێت کە

دەیان کەس ئاواتەخوازن ئەم کارەی تۆیان دەست بکەوێت و زۆربەشیان لە نیوەی تەمەنی تۆدان، ئەمەش بۆ کارکردن پەرۆشترت دەکات".

کە ئێلا تەلیفۆنەکەی داخست، بینیی دەیڤید تەماشای دەکات و لە ڕوخساریدا نیشانەی پەرۆش و دوودڵی دیاربوو. وا دەردەکەوت چاوەڕێی ئەوەی کردبێت لە کوێ کۆتاییان پێ هێنابوو هەر لەوێوە دەست پێبکات، بەڵام ئێلا ئیدی نەیدەویست دەربارەی دوێتەکەیان قسە بکات، مادام بەر لە هەر شتێک هەردووکیانی نیگەران دەکرد.

دواتر هەر ئەو ڕۆژە خۆی بینی بە تەنها لە بالکۆنەکە لەسەر ئەو کورسییە بزۆکە دانیشتووە کە حەزی دەکرد لەسەری دابنیشێت و بڕوانێتە ڕەنگە سوور و مەیلەو پرتەقاڵییەکەی ڕۆژاوابوون لە نۆرتامبتۆن. وا هەستی کرد کە ئاسمان بە ڕادەیەک لێیەوە نزیک و ئاوەڵایە، لەوەیە بتوانێت دەستی پێ بگات. مەژگی خۆی هێورکردەوە، چونکە وا دیاربوو بەوای ئەو ژاوەژاوەی کە لە ناوەوەی دەخولایەوە، ماندوو بووبێت: دانەوەی خەرجیی کارتی زیانبژێریی ژیان (تامین علی الحیاە)ی ئەم مانگە، خووە تووڕەهاتەکانی ئۆرلی لە کاتی نانخواردندا، نمرە کەمەکانی ئافی لە قوتابخانەدا، میمکە ئیستر و کێکە غەمگینەکانی، خراپبوونی تەندروستیی سەگەسپیرێتی، پلانەکانی جانێت بۆ شووکردن و پەیوەندییە سێکسییەکانی شووەکەی و سەرباری نەمانی خۆشەویستی لە ژیانی خۆیشیدا... ئەمانە هەموو پێکەوە یەک لەدوای یەک لە چەند سندووقێکی بچووکی ئاوەزیدا بەسەر یەکدا داخران. ئێلا لەو دۆخە دەروونییەدا دەستنووسەکەی دەرهێنا و وەک ئەوەی بزانێت کێشی چەندە، بە دەستی بەرزی کردەوە. ناونیشانی ڕۆمانەکە لەسەر بەرگەکەی بە مەرەکەبێکی شینی تۆخ نووسرابوو: "کفری شیرین".

ئێلا زانیی کە کەس دەربارەی نووسەرەکە کە ناوی عەزیز. ز. زاهارایە و لە هۆڵەندا دەژی، شتێکی ئەوتۆ نازانێت. دەستنووسەکە لە ئەمستردامەوە بۆ پەخشکاری ئەدەبی نێردرابوو و لەناو زەرفەکەدا کارتێکیشی لەگەڵدا بوو، دیمەنی پەڵە گوڵەزەنبەقێکی زەرد و ئەرخەوانیی نایابی لەسەر بوو و لە ڕووکاری پشتەوەی تێبینییەک بە دەستخەتێکی جوان نووسرابوو:

**سەیدایێ من – خاتوونا من**
**لە ئەمستردامەوە سلاو.**

ڕۆمانی نێردراوی هاوپێچ ڕووداوەکانی لە سەدەی سیانزەهەمدا لە قۆنیا لە ئاسیای بچووک ڕوویان داوە، بەڵام ڕاستگۆیانە دەڵێم کە ڕووداوەکانی کاریگەرییان بەسەر هەموو وڵاتان و ڕۆشنبیریی هەموو سەدەکانەوە هەیە.

هیوادارم بۆ خوێندنەوەی ڕۆمانی (کفری شیرین) کاتتان هەبێت، کە ڕۆمانێکی باتینیی مێژووییە دەربارەی پەیوەندیی شیرینی نێوان ڕۆمیی شاعیری هەڵکەوتوو و پێشەوای مەزن و هێژای دیرۆکی دنیای ئیسلام و شەمسی تەورێزیی بێهاوتا و ونبوو و لێوانلێو لە سەرکێشی و کاری چاوەڕواننەکراو.

ئومێدەوارم خۆشەویستی بەردەوام یاوەر و سایەبانتان بێت.

**أ. ز. زاهارا**

ئێلا هەستی کرد کە ئەم کارتە پۆستکراوە خۆتێهەڵقورتانێکی پەخشکارە ئەدەبییەکەیە، چونکە ستیف ئەوەندە کاتی بە دەستەوە نییە تا ڕۆمانی نووسەرێکی ئەدەبدۆست بخوێنێتەوە، ئیدی زەرفەکەی داوە بە مێشێلی یاریدەدەری و ئەمیش بە یاریدەدەرە نوێیەکەی داوە. بەم شێوەیە ڕۆمانی (کفری شیرین) کەوتە بەردەست ئێلا. ئاخر ئەو لە کوێ بزانێت ئەم کتێبە هەر ئەوە نییە کە کتێبێکی ئاسایی بێت، بەڵکو کتێبێکە ژیانی دەگۆڕێت و کە دەیشی خوێنێتەوە، چیرۆکی ژیانی خۆی دووبارە دەنووسێتەوە.

ع.ز.زاهارا کاتێ لە سەفەری شوێنە جیاوازەکانی دنیا نەبوایە، ئەوا لە ئەمستردام لەگەڵ کتێبەکانی و پشیلەکانی و کیسەڵەکانی دەژیا. ڕۆمانی (کفری شیرین) یەکەم ڕۆمانێتی و ڕەنگە دوا ڕۆمانیشی بێت. نیازی نییە ببێتە ڕۆماننووس، چونکە ئەم ڕۆمانەی لە سەرسامبوونێکی پەتییەوە نووسی، لە خۆشەویستیی زۆرییەوە بۆ ڕۆمیی شاعیر و سۆفی و خۆرە ئازیزەکەی، شەمسی تەورێزی بوو. چاوەکانی بەرەو دامێنی لاپەڕەکە بۆ دێڕی دواتر نیگایان کرد. ئێلا شتێکی خوێندەوە بە شێوەیەکی سەیر بە لایەوە ئاشنا بوو.

گەرچی وەک هەندێ کەس دەڵێن، عەشق تەنها هەستێکی شیرینی لەچارەنووسراو نییە کە خێرا دێت و دەڕوات.

ئـێلا دەمـی داچەقانـد و هەسـتی کـرد ئەم دەربـڕینە ئـاوەژووی ئەو دەربڕینەیە کە ئەو ڕۆژە لە نانـدینەکە بە کـچەکەی خـۆی وت. چرکەسـاتێک وەسـتا. بیرۆکەیەکـی بە خەیاڵـدا هـات و هەڵـلەرزی، هێزێکـی تەمـاوی، یـان هێزێکی تری ئەم گەردوونە بووبێت، ڕەنگە ئەم کتێبە، یان هەر کەسێکی دی سـیخوڕیی بەسـەرەوە کردبێت، ڕەنـگە نووسـەری کتێبەکە کە ئەم کتێـبەی نووسیوە، پێشتر زانیبێتی یەکەم کەس کێ دەیخوێنێتەوە. بێگومان نووسەرەکە دەزانێـت کە ئەم دەبێـتە یەکەم خـوێنەری . بە هـۆیەکی نادیـار کە خۆیـشی نەیدەزانی چییە، ئێلا بیرۆکەکەی بە بێزارکەر و هاوکات بە وروژێنەر زانی.

لە چەنـدین شـێوەدا سـەدەی بیستویەکەمین زۆر لە سـەدەی سـیانزەهەم جیـا نییە. لە مێـژوودا ئەوە تۆمـار دەکـرێ کە ئەم دوو سـەدەیە سـەردەمی ململانێیەکی ئایینیی ئەوتۆ بوون لەوەپێش وێنەی نەبووە، سەردەمێک بـوون بەدحاڵیبوونی ڕۆشنبیری تیایاندا بـاوبووە، هەروەهـا هەسـتێکی دەسـتەجەمعی بەوای نەبـوونی ئـارامی و لەیەکتـر ترسـان بـاوبووە. لە کـاتێکی ئاوهـادا خۆشەویستی لە هەموو کاتێکی تر پێویستترە.

بایەکی سارد و توند بەرەو ڕووی هەڵیکرد، لاپەڕەکانی لەسەر باڵکۆنەکە پەرت کرد: خۆرەکە بەرەو ئاوابوون شۆڕبووەوە و جوانییەکەی گۆڕاوبوو بە کەشێکی مات و خەمین.

وەک ڕۆمـی بیرمـان دەخـاتەوە، مـادام عەشـق گەوهەری ژیـان و ئامـانجی بـاڵایەتی، کەواتە لە دەرگـای هەمـوان دەدات، بەوانەشـەوە کە خۆیـان لە خۆشەویستی دوور دەگرن - تەنانەت بەوانەوەشە کە پەیڤی (ڕۆمانسی) وەک ئاماژەیەکی ڕەتکردنەوە بەکار دێنن.

ئێلا مینـا (خۆشەویـستی لە دەرگـای هەمـوان دەدات، تەنـانەت لە دەرگـای ئەو کابانی ماڵەش دەدات کە لە ناوەڕاستی تەمەندایە و لە نۆرتـامبتۆن دەژی و ناوی ئێلا ڕۆبنشتاین)ەی خوێندبێتەوە، هەستی بە سەرسوڕمان کرد.

حەز و غەریزە هانیان دا کە دەستنووسەکە بداتە لاوە و بچێتە ژوورەوە و تەلیفـۆن بـۆ مێـشێل بکـات، تـا پێـی بڵێت کە ئەو دەتوانێت دەربـارەی ئەم ڕۆمـانە ڕاپۆرتێـک بنووسـێت، وەلـێ لەبـری ئەوە هەناسـەیەکی هەڵکێـشا و لاپەڕەکەی هەڵدایەوە و دەستی بە خوێندنەوە کرد.

# کفری شیرین

رۆمان

ع.ز.زاهارا

سۆفییەکان دەڵێن نهێنیی
قورئان لە سورەتی فاتیحادایە
نهێنیی سورەتی فاتیحاش لە دەربڕینی
بە ناوی خودای دەهەندە و دلۆڤاندایە
گەوهەری بە ناوی خودای دەهەندە و دلۆڤانیش لە پیتی (ب) دایە
کە خاڵێک لە ژێر ئەم پیتەدایە...
خاڵی ژێر (ب)ێیەکەش هەموو بوونەوارەکە بەرجەستە دەکات...
هەر وەک چۆن مەسنەوی بە پیتی (ب) دەست پێدەکات،
بۆیە هەموو بەشەکانی ئەم ڕۆمانەش بە پیتی (ب) دەست پێدەکەن.

## بەرایيەک

بەردەوام سەدەی سیانزەهەم بە ململانێی ئایینی و ناکۆکیی سیاسی و ململانێ لەسەر دەسەڵات بارگاوی بوو، دۆخێکی شڵەژاو لە ناوچەی ئەنادۆڵ سەری هەڵدابوو. لە ڕۆژاواوە خاچپەرستان قوستەنتینەیان داگیرکرد و بەرەو داگیرکردنی قودس پێشڕەوییان دەکرد و گەندەڵی و خراپەکارییان تێدا دەوەشاند و ئیمپراتۆریێتیی بێزەنتی دابەش بوو. لە ڕۆژهەڵاتەوە سوپای مەغۆل بە سەرکردایەتیی سەرکردەی سەربازیی مەزن جەنگیزخان زۆر بە خێرایی بڵاوبووەوە. لە ناوەڕاستەوە خێڵە تورکە جۆراوجۆرەکان لە نێو خۆیاندا لە شەڕوشۆڕدا بوون، هاوکات بێزەنتینییەکان هەوڵیان دەدا ئەو خاک و سامان و هێزەی لە دەستیان دابوو، بەدەستی بێننەوە. ئیدی سەردەمی ئاژاوەیەکی وا بوو، کە لەوەوبەر وێنەی نەبوو، بە جۆرێ مەسیحییەکان دژی مەسیحی دەجەنگان، مەسیحییەکان دژی موسڵمانەکان شەڕیان دەکرد، موسڵمانەکان دژی موسڵمان دەجەنگان. ئیدی بنیادەم ڕووی لە هەر شوێنێ کردبا، جەنگ و ئازار و ترسێکی ئەوتۆ بوو وێنەی نەبینرابوو. لە گەرمەی ئەم ئاژاوەیەدا زانایەکی ئیسلامیی بێهاوتا دەژیا، کە بە جەلالەدینی ڕۆمی دەناسرا و نازناوی "مەولانا" بوو، لە هەموو ناوچەکە و دەرەوەی ناوچەکە، هەزاران هەوادار و مرید دەوریان دابوو و بۆ هەموو موسڵمانان وەک ڕووگەیەک بوو.

ساڵی ١٢٤٤ی زایینی (ڕۆمی) لەگەڵ (شەمس) بەیەک گەیشتن – شەمس دەروێشێکی گەڕیدە و ڕەفتار سەیربوو و بۆچوونی هەرتەقییانەی هەبوو. ئەم بەیەک گەیشتنەیان ژیانی هەریەکەیانی گۆڕی. ئەو بەیەکگەیشتنە سەرەتای هاوڕێیەتییەکی تۆکمە بوو و لە سەدەکانی دواتردا سۆفییەکان بە یەکگرتنی دوو ئۆقیانووسیان چواند. دوای ئەوەی ڕۆمی بەم هاوڕێ ناوازەیە گەیشت،

له پیاوێکی ئایینیی خواسابییەوە بۆ شاعیرێکی لێوانلێو له سۆز و سۆفییەکی وابەسته و بانگخوازێکی عەشق گۆڕا، سەمای دەروێشانی داهێنا و لە هەموو کۆت و بنەمایەکی کۆنخوازی ڕزگاری بوو. لە سەردەمێکدا گیانی دەمارگیری و ناکۆکیی ئایینی تێیدا تەشەنەی کردبوو، ئەو بانگەوازی ڕۆحانییەتێکی جیهانیی گشتگیری دەکرد و دەرگاکانی لە بەردەم هەموو تیرەی مرۆڤ بە جیاوازیی ئارەزوو و پاشخانیانەوە والا کردبوو. لەبری ئەوەی بانگەوازی جیهادی ڕواڵەتبازی بکات، کە بە (جەنگی دژی خودانەناسان ) دەناسرێ و زۆریک لەو سەردەمەدا بانگەوازیان بۆ دەکرد و تەواو وەک ئەوەی ئەمڕۆ ڕوودەدات – ڕۆمی بانگەوازی بۆ جەنگی ناوەوەی مرۆڤ دەکرد، ئامانجەکەیشی لە جەنگی دژی (منی بالا)دا بەرجەسته دەبوو و له کۆتاییدا دژی (نەفس) و پێشێلکردنی نەفس بوو.

بەلام بیروبۆچوونەکانی لە لایەن هەموو خەڵکەوە پێشوازیی لێ نەکرا و دڵیان بۆ خۆشەویستی والانەکرد. پەیوەندیی پتەوی گیانیی نێوان شەمسی تەورێزی و ڕۆمی بوو بە جێگەی واتەوات و پێوەهەڵبەستان و هێرشکردن. ئەوە بوو خەڵکی خراپ لێیان تێگەیشتن و ئێرەییان پێدەبردن و تانەیان لێدەدان، ئەوەندە بێڕێزییان پێکردن، تا نزیکترین کەسی خۆیان غایەنەتیان لێکردن. ئەوە بوو دوای سێ ساڵ لە بەیەکگەیشتنیان، بە شێوەیەکی کارەساتبار له یەکتر دابڕان.

وەلێ چیرۆکەکە لەوێدا کۆتایی نەهات.

له ڕاستیدا کۆتاییەک لەئارادا نەبوو. دوای نزیکەی هەشتسەد ساڵ، هێشتا ڕۆحی شەمس و ڕۆحی ڕۆمی تا ڕۆژی ئەمڕۆمان قوڵپ بە ژیان دەدەن، له ناخماندا و له شوێنێکدا دەسووڕێنەوە...

# بکوژەکە

**ئەسکەندەرییە، تشرینی دووەم ١٢٥٢**

بنی ئاوێکی لێخنی بیرێک، مردوویەکی تێدا راکشاوە. ئیدی ڕووم لە هەر شوێنێک کردبا، چاوەکانی دوام دەکەوتن، دوو چاوی گەش و بێدار وەک دوو ئەستێرەی تاریک بە بەرزایی ئاسمانەوە کە نوقلانەی شووم لێبدەن هەڵواسرابوون. بەو نیازەوە بۆ ئەسکەندەرییە هاتم تا بتوانم بۆ شوێنێکی دوور سەفەر بکەم و لەم یادگە کونکەرە هەڵێم و ئەو لوورەلوورە بوەستێنم کە لە سەرمدا دەنگ دەداتەوە، لەو دوا هاوارەی هەڵێم کە بەر لەوەی خوێنەکەی بشۆردرێتەوە و چاوەکانی بەقووڵدا بچن و لە هەناسەبڕکێیەکی بێبڕانەوەدا گەرووی دابخات، لێیەوە هەنگاوم نا، ماڵئاوایی پیاوێکی بە خەنجەر دابێژراو، لوورەی گورگێکی بەتەڵەوەبوو.

کاتێ کەسێک دەکوژیت، ئەوا شتێک لەوەوە بۆ تۆ دەگوێزرێتەوە — هەناسەیەک، یان بۆنێک، یان ئاماژەیەک. من ناوم لەوە ناوە (نەفرەتی قوربانی). بە جەستەتەوە دەلکێت و بەنێو پێستەکەتدا ڕۆدەچێت و ڕاستەوخۆ بەرەو دڵت دەخزێت و لە ناوەوەتدا دەمێنێتەوە و هەڵدەپلکێت. ئەوانەی لە شەقامدا دەمبینن، شێوازێکی وا شک نابەن تا ئەوە بزانن، لێ من ڕەوسی هەموو ئەو پیاوانەم لەگەڵ خۆمدا هەڵگرتووە، کە کوشتوومن. وەک گەردنبەندێکی شاراوە بە گەردنی خۆمدا هەڵمواسیون و بە توندی هەست بە قورساییان دەکەم. هەرچەندە هەست بە ئاسوودەیی ناکەم، بەڵام ڕاهاتم لەگەڵ ئەو بارە قورسەدا بژیم و وەک بەشێک لە کارەکەم قەبووڵی بکەم.

لەوساوە کە قابیل هابیلی کوشت، لە هەموو بکوژێکدا ئەو پیاوەی کە کوشتوویەتی هەناسە دەدات. ئەوەی دەیزانم ئەمەیە، شتێکە بێزارم ناکات، بەڵام بۆچی دوای ئەو رووداوە خێرایە، تەزووی هەڵلەرزین دایگرتم؟

ئەم جارە هەر لە سەرەتاوە هەموو شتێ جیاوازبوو. دە تەماشاکەن، بۆ نموونە ئەو شێوازی کارکردنەی دۆزیمەوە، یان ئایا گەرەکە بڵێم ئەو شێوازەی کە منی بۆ کارکردن دۆزییەوە؟ لە سەرەتای بەهاری ساڵی ١٢٤٨دا، لە قۆنیا لە کن خاوەن سۆزانیخانەیەک کارم دەکرد، نێرەمووکێک بوو بە توندوتیژی و تووڕەیی ناسرابوو و لە چاودێریکردنی لەشفرۆشەکاندا یارمەتیم دەدا و ترسم دەخستە دڵی ئەو مەعمیلانەوە کە بە باشی ڕەفتاریان نەدەکرد.

بە ڕوونی ئەو ڕۆژەم لە یادە، دوای لەشفرۆشێک کەوتبووم کە لە سۆزانیخانەکە هەڵاتبوو و لە خودا دەگەڕا. ئافرەتێکی ئەوندە جوان و جحێڵ بوو، لەوەبوو بەندی دڵم بپسێنێت، ئاخر گەر پێی گەیشتبام، بەتەمابووم بە جۆرێ دەموچاوی بشێوێنم، ئیدی هیچ پیاوێک بێزی نەیەت تەماشای بکات. ئەوەندەی نەمابوو ئەو ئافرەتە گێلە دەستگیر بکەم، کاتێ نامەیەکی ئاڵۆزم دۆزییەوە کە لە بەردەم ماڵەکەم فڕێدرابوو. لەبەر ئەوەی نەخوێندەوار بووم و نەمدەتوانی بخوێنمەوە، نامەکەم بۆ سوختەخانە برد و دام بە یەکێک لە فەقێکان تا بۆمی بخوێنێتەوە، لە بەرانبەردا بڕێ پارەم پێی دا.

دوایی بۆم دەرکەوت کە نامەکە لە نەناسراوێکەوەیە و (ژمارەیەک لە خوداناسانی بەئەمەک) واژوویان لەسەر کردووە.

لە نامەکەدا وا هاتبوو: "لە سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراوەوە زانیومانە کە تۆ کێیت و لە کوێوە هاتوویت و لە کوێ کاردەکەیت. تۆ ئەندامێکی پێشوویت لە دەستەی تلیاککێشەکان! هەروەها ئەوەش دەزانین کە دوای مردنی حەسەنی سەباح و دەستگیرکردنی سەرکردەکانی، ئیدی دەستەکە ئەو هێزەی جارانی نەما. دەزانین تۆ لە ترسی سزادان هەڵاتوویت و بۆ قۆنیا هاتوویت، ئیدی لەوساوە خۆت گۆڕیوە و ژیان بەسەردەبەیت".

لە نامەکەدا نووسرابوو کە ئەوان یەکجار حەوەجەی منن و پارەیەکی مۆڵم دەدەنێ. وتبوویان گەر من بەڕاستی دەمەوێ بەدەنگیانەوە بچم، ئەوا

گەرەکە لەو ئێوارەیەدا دوای تاریکـان بەرەو مەیخـانەیەکی بەنێوبانـگ بـڕۆم. کاتێ دەگەمە ئەو مەیخانەیە، لەسەر نزیکترین مێزی لای پەنجەرەکە دانیشم و پشت لە دەرگاکە بکەم و سـەر بەربدەمەوە و چاو ببڕمە زەوییەکە. ئینجا کەسێک یان کەسانێک کە بەکارم دێن، بۆ لام دێن و هەموو ئەو زانیارییانەم پێدەدەن کە پێویستم بە زانینیانە، کاتێکیش دەگەنە جێ، یان دەڕۆن، گەرەکە سەر هەڵنەبڕم و تەماشای دەموچاویان نەکەم.

نامەیەکی سەیر بوو، لێ من ڕاهاتبووم کە چۆن مامەڵە لەگەڵ ئارەزووی مەعمیلەکانمدا بکەم. چەندین ساڵ جۆرەها کەس بەکاریان هێنام و زۆربەیان دەیانەویست ناوەکانیان بە نهێنی بمێنێتەوە. ئەزموون فێری کردم، جاری وا هەبوو مەعمیلەکە چەند هەوڵی شاردنەوەی ناسنامەی خۆی دابا، ئەوا دەبووە نزیکترین قوربانی، بەڵام کـارم بەوە نییە، چونکە ئەرکی مـن تەنهـا کـاری کوشتنە. نابێت لە هۆکارە پەنهانەکانی پشت ئەرکەکەم بپرسم. لەو چەندین ساڵەی کە (ئەڵەمووت)م جێهێشتبوو، ئەو ژیانەم بۆخۆم هەڵبژاردبوو.

لە هەموو بارێکدا مەگەر چۆنها پرسیارم کردبا. بۆچی بپرسم؟ زۆربەی ئەوانەی کە دەیانناسم، لای هەریەکێکیان، یان بە لای کەمەوە یەکێک هەیە کە دەیهەوێ یەکێک لەناو ببات، کاتێکیش ئەوە ناکەن، مانای ئەوە نییە لە کوشتن پارێزراون. لە ڕاستیدا لە ناخی هەر کەسێکدا ئارەزوویەکی پەنهان هەیە کە ڕۆژێ یەکێک بکوژێت . خەڵکی تا دوای ئەوەی شتەکەیان بەسەر دێت، ئینجا ئەوە دەزانن. ئاخر ئەوانە پێیان وایە لە کوشتندا دەستەوسانن، وەلێ شتەکە تەنها مەسەلەی ویژدانە، کەچی بڕێ جار تەنها سەرلەقاندنێک بەسە بۆ دایساندنی تووڕەییان. ئیدی بەدحاڵیبوونێکی ئەنقەست، یان دەمەقاڵێ لەسەر شتێکی تووڕەهات، یان کاتێ بنیادەم لە شوێنێکی هەڵە و کاتێکی هەڵەدا بێت، ڕەنگە نیازێکی تێکشکێنەر لە کەسانێک دەربکەوێت کە لە کاتی خواستاییدا کەسانێکی باش و بەڕێزیش بن. دەکرێ هەر کەسێک، کەسێک بکوژێت، بەڵام لە توانای هیچ کەسێکدا نییە کە کەسێکی غەریب و لایدە بە ئەنقەست و بە مەبەست بکوژێت، ئا لێرەوە دەچمە نێو دیمەنەکەوە.

من کارگەلێکی قێزەونم بۆ کەسانێکی تر جێبەجێ دەکرد، تەنانەت خوداش لە پلانە پیرۆزەکەیدا، کاتێ عیزرائیلی فریشتەی مەرگی بۆ کۆتاییهێنان بە

ژیانی خەڵکی دانا، هەستی بە پێویستبوونی کەسێکی وەک من کردبوو. بەم ئاوهایە خەڵکی لە فریشتە دەترسن و نەفرەتی لێدەکەن و ڕقیان لێیەتی، لە کاتێکدا دەستەکانی خودا و ناوی خودا بە پاکی و بێگەردی دەمێننەوە. لەوەدا ستەمێک لەو فریشتەیە دەکرێ، لێ بۆ دووەم جار دەڵێم کە ستەم هەموو دنیای تەنیوە. ئەرێ وا نییە؟

کە شەو داهات، ڕووم کردە مەیخانەکە. ڕێکەوت وای ویست پیاوێک کە دەوسی کۆنەبرینێک بە دەموچاوییەوە دیاربوو، لەتەک ئەو مێزەی نزیک پەنجەرەکە دابنیشێت و لە پرخەی خەودا بێت. وام بە خەیاڵدا هات بێداری بکەمەوە و داوای لێ بکەم بچێتە سەر مێزێکی تر، بەڵام تۆ نازانیت کاردانەوەی سەرخۆشان دەبێت چۆن بێت، بۆیە دەبوو ئاگاداربم و خەڵکی لە خۆم نەوروژێنم. لەبەر ئەوە لای مێزە بەتاڵەکەی دوای ئەو، بەرانبەر پەنجەرەکە دانیشتم.

دوای کەمێ دوو پیاو گەیشتنە جێ، بۆ ئەوەی ڕوخساریان نەبینم، هەریەکەیان لە لا تەنیشتێکمەوە دانیشت. پێویستم بەوە نەبوو تەماشایان بکەم تا بزانم کە ئەوان دوو گەنجن و ئامادەی ئەو هەنگاونانە نین کە خەریکە هەڵدەهێنرێ.

"ڕاسپاردەیەکی گرینگمان بۆ تۆ پێگەیشتووە"، یەکێکیان ئەمەی گوت و ڕیتمی دەنگی پتر دوودڵی بوو، نەک وریایی"، پێمان وتراوە کە تۆ لێهاتوویت".

شێوەی وتنەکەی پێکەنیناوی بوو، لێ من زەردەخەنەکەم خەفەکرد. دیقەتم دا هەردووکیان دەترسان، ئەمەش کارێکی باش بوو، ئەگەر لە دۆخی ترسدا بن ئەوا لەگەڵ مندا زات ناکەن هیچ هەڵەیەک بکەن.

بۆیە گوتم: "بەڵێ من لێهاتووم، بۆیە ناوی (سەرچەقەڵ)یان لێناوم . ئەو ئەرکە چەند سەخت بوویێت، قەت مەعمیلەکانم نائومێد نەکردووە".

هەناسەیەکی هەڵکێشا و وتی: "باشە، ئاخر ئەم ئەرکە ڕەنگە ئاسان نەبێت".

لێرەدا لاوەکەی تر هاتە قسە و گوتی: "تەماشاکە، ئەم پیاوە دوژمنێکی زۆری بۆخۆی پەیدا کردووە. لەوەتەی هاتووەتە ئەم شارە، جگە لە کێشە، شتێکی تری لەگەڵ خۆیدا نەهێناوە. چەند جارێ ئاگادارمان کردووەتەوە،

بەڵام گوێی لە قسەمان نەگرت و بووە بە مایەی خراپەکاری و کێشە و هیچ هەڵبژارنێکی تری لە بەردەممان نەهێشتووەتەوە".

بەردەوام شتەکان بەم جۆرە دەڕۆیشتن. هەموو جارێ پێش ئەوەی بگەینە رێککەوتنێک، مەعمیلەکان وەک ئەوەی بۆ قایلکردنم مەترسیی کارەکە کەم بکەنەوە، هەوڵیان دەدا پاساوێک بۆ ئەو کارە بهێننەوە کە دەیانهەوێ ئەنجامی بدەن.

لێم پرسین: "لە مەبەستتان تێگەیشتم. پێم بڵێن ئەو کەسە کێیە؟". لە ناوهێنانی راڕابوون و چەندین وەسپ و ناونیشانی ئاڵۆزیان دا.

"پیاوێکی خودانەناسە و هیچ پەیوەندییەکی بە ئیسلامەوە نییە، لامل و سەرکێشە، لە ناخدا خراپەکار و بێباوەڕە. دەروێشێکی لە ئایین وەرگەڕاوە".

کە دوا وشەم ژنەوت، هەستێکی ترسناک بە باسکەکانمدا گەڕا. مەژگم بەلەز کەوتە هزرکردن. منێک جۆرەها خەڵکم کوشتووە، گەورە و بچووک، ئافرەت و پیاو، وەلێ قەت دەروێشێک، پیاوێکی بڕوادارم نەکوشتووە. من بڕوام بە شتی پڕوپووچ هەیە و ئارەزووی ئەوەم نەبووە خودا لە خۆم بکەم، چونکە سەرباری هەموو شتێ، بڕوام پێیەتی.

"پێم وایە داواکەتان ڕەت دەکەمەوە. پێم وا نییە من بمەوێ پیاوێکی ئایینی بکوژم. کەسێکی تر بدۆزنەوە".

کە قسەکەم تەواوکرد، هەستامە سەر پێ و ئامادەی ڕۆیشتن بووم، بەڵام یەکێ لە دوو پیاوەکە دەستی گرتم و بە پاڕانەوەوە گوتی: "تکات لێدەکەم چاوەڕێ بکە: ئەو پارەیە بۆ ئەو ئەرکەی دەیکێشیت گونجاوە، ئێمە ئامادەین بیکەین بە دوو ئەوەندە".

"ئەی ئەگەر سێ ئەوەندە بێت؟"، لێم پرسین و پێم وابوو کە بڕەکە لەوە زیاتر ناکەن.

بەڵام سەرم سوڕما، دوای دوودڵییەک هەردووکیان هەستان. بە شڵەژاوییەوە دووبارە لە شوێنەکەی خۆم دانیشتمەوە. بەم بڕە پارەیە دەتوانم مارەیی ژنێک پێکەوە بنێم و لە دواییدا ژن بهێنم. دەربارەی بەڕێوەبردنی کاروباری ژیانم هیچ پەژارەیەک داینەگرتم. دەروێش بێت یان دەروێش نەبێت، بەرانبەر ئەم بڕە پارەیە هەر کەسێک بێت شایانی کوشتنە.

چۆن بزانم کە من لەو چرکەساتەدا لە ژیانمدا گەورەترین هەڵەم کردووە و لە سۆنگەی ئەو تاوانەی کردوومە، پاشماوەی ژیانم بە پەشیمانی بەسەردەبەم؟ ئاخر چۆن بزانم کە کوشتنی دەرویشەکە دەبێتە شتێک لە ملۆزم ملۆزمتر و دوای مردنیشی بەردەوام بە نیگا تیژ و چەقۆئاساکەی لە هەموو شوێنێک دوام دەکەوێت؟

ئەمێستا وا چوار ساڵ بەسەر ئەو کاتەدا تێپەڕیوە کە لەو حەوشەیەدا بەر خەنجەرم دا و لاشەکەیم فڕێ دایە نێو بیرێکەوە و چاوەڕێی ئەوەم دەکرد کە گوێم لێ بێت دەکەوێتە ناو ئاوەکەوە، ئەوەش شتێک بوو قەت نەمبیست. هیچ دەنگێکی لێوە نەهات. لەجیاتی ئەوەی بکەوێتە نێو ئاوەکەوە، وا دیاربوو کە بەرەو ئاسمان هەڵکشابوو. ئێستاش بەبێ ئەوەی مۆتەکە بێتە کۆڵم، چاوێکم بۆ لێک نەنراوە. کاتێ تەماشای ئاو دەکەم، هەر سەرچاوەیەکی ئاو، بۆ چەند چرکەیەک ئازای جەستەم ترس دایدەگرێت، ئیدی دەڕشێمەوە.

# شەمس

## مەیخانەیەک لە دەرەوەی سەمەرقەند، ئاداری ١٢٤٢

بەدیمەنێکی یەکجار درەوشاوەی ئەم ئێوارەیە لێوانلێو بووم. ڕووناکیی کۆمەڵە مۆمێکی لە شەمێی هەنگ دروستکراو و لەسەر مێزێکی دارینی درزبردوو، لە بەرچاوم پرتەپرتی دەکرد.

ماڵێکی گەورەم دی حەوشەکەی پڕبوو لە گوڵی زەردی شکۆفەکردوو. لە ناوەڕاستی حەوشەکەدا بیرێکی سەرداپۆشراو هەبوو، ئاوەکەی لە هەموو ئاوی دنیا تەزیتر بوو. شەوێکی ساماڵی کۆتایی پایز بوو. مانگی پڕ لە ناوەڕاستی ئاسمانی بێگەرد بوو. لە دوور ڕا گوێم لە دەنگی قیڕە و لوورەی گیاندارانی شەو بوو. دوای کەمەکێک پیاوێکی تەمەن مامناوەندی، ڕوخسار ناسک، ناوشان پان، دوو چاوی تیژ و بادەمی، لە ماڵەکە هاتە دەرەوە و منەی منی دەکرد. دەموچاوی شڵەژاو دیاربوو و چاوەکانی خەمێکی قووڵیان دەنواند.

"شەمس، شەمس، تۆ لە کێیت؟"، بانگی دەکرد و بە ڕاست و چەپدا ئاوڕی دەدایەوە.

بایەکی توند هەڵیکرد، مانگەکە وەک ئەوەی نەیهەوێ ئەوە ببینێت کە ڕووی داوە، لە پشت هەورێکەوە ونبوو. کوندەپەپووەکە وازی لە خوێندن هێنا، شەمشەمەکوێرەش ئیدی باڵەکانیان لێک نەدەدا، تەنانەت ئاگری ناو ئاگردانی ماڵەکەش نەدەئایسا.

خامۆشییەکی تەواو دنیای داگرت.

پیاوەکە لەسەرخۆ لە بیرەکە نزیک بووەوە و خۆی نوشتاندەوە و تەماشای خوارەوەی کرد، بە چپەدوو گوتی: "شەمس، هۆ لە هەموو

خۆشەویستانم خۆشەویستتر، ئەریٚ تۆ لێرەیت؟". دەمم هەڵێنا تا وەڵام بدەمەوە، لیٚ چ دەنگێک لەنێوان لێوەکانمەوە دەرنەچوو.

پیاوەکە پتر خۆی داچەماندەوە و دووبارە تەماشای ناو بیرەکەی کرد. یەکەم جار جگە لە لێڵیی ئاوەکە هیچی تری نەبینی، وەلیٚ دوای ئەوە لە قووڵایی بیرەکەدا هەردوو دەستمی بینی چون بەلەمێک بایەکی بەهێز ڕایماڵێت بەبیٚ هوودە سەر ئاوەکە کەتبوون. ئینجا دوو چاو دەرکەوتن –دوو بیلبیلەی ڕەش دەدرەوشانەوە– تەماشای مانگەکەیان دەکرد کە ئێستا خەریکبوو لە پشت هەورە ڕەش و چڕەکەوە دەخزی. چاوەکانم مینا لە حەناس مانگەکەدا چاوەڕیٚ بن، هۆکاری کوشتنەکەم لێک بداتەوە کەوتنە نیگاکردن.

پیاوەکە بە کڕنۆشەوە چۆکی دادا و لە سەلای گریانی دا، بە هەردوو دەستی سینگی خۆی دەکوتا و هاواری دەکرد: "کوشتیان! شەمسیان کوشت".

ئەوسا سێبەرێک لە پشت ئاوە سەرکردووەکەوە پەیدا بوو و بە جووڵەیەکی بەلەز و پەنهان چون پشیلە کێوییەک بەسەر دیواری باخچەکەدا بازی دا، بەڵام پیاوەکە بکوژەکەی نەدی. ئازاری لیٚ دەچۆڕا و لە هاوار و زایەڵە نەدەکەوت، ئیدی چۆن شووشە وردوخاش دەبێت، دەنگی وردوخاش بوو و بە هەموو لایەکی شەوەکەدا بوو بە پارچەی ورد و تیژ و بڵاوبووەوە.

– هێی لەگەڵ تۆمە! دەڵیی شێت بوویت، واز لە هاوارکردن بێنە.

– .....

– واز لەم هاوارکردنە بێنە، ئەگینا وەدەرت دەنێم.

– .....

– گوتم بێدەنگ بە! گوێت لێمە؟ بێدەنگ بە.

دەنگی ئەو پیاوەی کە ئەم وشانەی لیٚ پەیدا دەبوو، بە شێوەیەکی ترسناک تا دەهات لێم نزیک دەبووەوە. وام پیشان دا کە من نایژنەوم، چونکە باشتر وابوو ماوەیەکی زۆر لەنێو دیدگای خۆم بمێنمەوە. دەمەویست پتر لە چۆنێتیی مردنەکەی خۆم تێبگەم، هەروەها گەرەکم بوو ئەو پیاوە ببینم کە دوو چاوی خەمینی هەیە. ئەو کێیە؟ ئەی پەیوەندیی بە منەوە چییە؟ ئەی بۆچی لە شەوێک لە شەوەکانی پایز شێلگیرانە لێم دەگەڕا؟

بەڵام بەر لەوەی بتوانم دزەنیگایەکی تر بکەم، یەکێک لە دنیایەکی دیکەوە قۆڵی گرتم و بە توندی ڕایوەشاندم و هەستم کرد ددانەکانم لەنێو زارمدا چیرەچیریانە. ئەوەبوو کە دەستی لێ گیرکردم بەرەو ئەم دنیایە پەلکێشی کردم.

لەسەرخۆ و بە دوودڵییەوە، چاوەکانم کردەوە، بینیم پیاوەکە بە تەنیشتمەوە وەستاوە. پیاوێکی پانوپۆڕ بوو، ڕیشی ماشوبرنج بوو، دوو سمێڵی گەورەی هەبوو، شۆڕ و لە هەردوو لاوە بادرابوون. زانیم کە ئەمە خاوەنی مەیخانەکەیە. دەسبەجێ دوو تێبینیم لێ هەڵێنجا: پیاوێکە بە قسە زبر و ڕەوتارە توندەکانییەوە ترس لە دڵی خەڵکیدا دەچێنێت، ئەمێستا لە دۆخێکی یەکجار تووڕەییدایە.

لێم پرسی: "چیت دەوێ؟ بۆچی قۆڵەکانم ڕادەکێشیت؟".

"چیم دەوێ؟"، خاوەن مەیخانەکە بە گرمەگرم و گرژییەوە گوتی،"دەمهەوێ واز لە هاوارکردن بێنیت، من ئەمەم دەوێ... تۆ ترس دەخەیتە دڵی مەعمیلەکانمەوە".

"بە ڕاستیتە؟ ئایا من هاوارم کرد؟"، دوای ئەوەی دەستەکانم لە چنگی ڕەهاکرد بڵمەبڵمێکم کرد.

"گرەو دەکەم کە تۆ هاوارت دەکرد! تۆ وەک ورچێک درک لەنێو لەپی ڕۆچووبێت هاوارت دەکرد. تۆ چیت بەسەرهاتووە؟ ئایا دوای نانی شێوان نوستیت؟ بێگومان دەبێ مۆتەکەیەک، یان شتێ لەو بابەتەت بینی بێت".

دەزانم ئەمە تاقە لێکدانەوەیەکی دروستە، خۆ ئەگەر پێی قایل نەبم، ئەوا خاوەن مەیخانەکە قایل دەبێت و وازم لێدێنێت تا بەبێ کێشە برۆم، بەڵام من نەمدەویست درۆ بکەم".

وتم: "نەخێر براکەم، من نەنوستم و مۆتەکەشم نەبینیوە، بەڵکو قەت خەویش نابینم".

"کەواتە ئەم هاوارکردنەت چۆن لێک دەدەیتەوە؟"، خاوەن مەیخانەکە دەیەویست ئەوە بزانێت. گوتم: "من دیدگایەکم بۆ هاتووە، ئەمەش شتێکی جیاوازە".

به نیگایەکی پڕ لە سەرسامی تەماشای کردم و هەردوو لای سمێڵەکانی لستەوە، ئینجا وتی: "ئێوەی دەروێشی شێتوشوور، بە تایبەتی دەروێشە گەڕیدەکان وەک جرجی ناو کۆگای زەخیرەن . ئێوە هەموو ڕۆژەکە بەڕۆژوو دەبن، نوێژ دەکەن و لەبەر تیشکی سووتێنەری خۆردا ڕێ دەکەن. ئیدی سەیر نییە کە وڕێنە بکەیت – ئاوەزت ژەنگی گرتووە".

زەردەم هاتێ، ڕەنگە قسەکەی ڕاست بێت، ئاخر لە نێوان لەخودا قووڵبوونەوە و ئاوەز لەدەستداندا داوێکی باریک هەیە.

لەو دەمەدا دوو مێردمندالی بەردەست دەرکەوتن، بە هەردووکیان سینییەکی گەورەیان هەڵگرتبوو کە خۆراکێکی زۆری لەسەر بوو: گۆشتی برژاوی بزن، ماسیی خوێکراوی وشکەوەکراو، گۆشتی مەڕی بەهارات پێوەکراو، کێکێکی دروستکراو لە ئاردی گەنم و نۆک، نیسکێنە بە دونگی مەڕ لێنراو. بە هەموو هۆڵەکەدا دەیانگێڕا و خواردنیان بەسەر ئامادەبوواندا دابەش دەکرد و ناو هۆڵەکەیان پڕ لە بۆنوبەرامی پیاز و سیر و بەهارات کرد. کاتێ لە هەردوو لای مێزەکە وەستان، کەمێ شۆربام وەرگرت کە هەڵمی لێ هەڵدەستا، لەگەڵ کەمێ نانی بۆر.

"ئایا پارەت پێیە تا نرخەکەی بدەیت؟"، خاوەنی مەیخانەکە بە جۆرە فیز و لووتبەرزییەوە لێی پرسیم.

وتم: "نەخێر، پارەم پێ نییە، بەڵام بەرانبەر بە خواردنەکە و مانەوە، دەتوانم شتێکت پێشکەش بکەم . دەتوانم خەونەکانت بۆ لێک بدەمەوە".

هەردوو دەستی خستە سەر کەمەری و بە تەوسەوە بەرپەرچی دامەوە: "تۆ ئێستا وتت کە خەون نابینیت".

"ڕاستە من لێکدەرەوەی خەونم، بەڵام خەون نابینم".

خاوەن مەیخانەکە گوتی: "هەر وەک وتم گەرەکە دەرت بکەمە دەرەوە، ئێوەی دەروێشان شێتن".

"ئەمە ئامۆژگارییەکە و پێشکەشتی دەکەم. من نازانم تەمەنت چەندە، وەلێ دڵنیام کە تۆ بۆ هەردوو دنیا بایی ئەوە نوێژت کردووە. بۆخۆت ئافرەتێکی جوانکیلە بدۆزەوە و داکاسرێ. مندال بخەوە. ئەمە یارمەتیت دەدات تا پێیەکانت لەسەر زەوی گیر بکەیت. ئاخر لە دنیایەکدا کە کلۆڵی و بەدبەختی

هەموو شوێنێکی تەنیوە، ئیدی گەڕیدەیی چ دادێکت دەدات؟ هیچ شتێکی نوێ نییە. لە هەموو شوێنێکی دنیادا مەعمیلم هەیە، دوای ئەوەی چەند پێکێک دەخۆنەوە، هەمان چیرۆکیان لێ دەبیستم. بنیادەم لە هەموو شوێنێ هەمان بنیادەمن، هەمان خواردن، هەمان ئاو، هەمان گێلایەتییە کۆنەکە".

گوتم: "من بەدوای شتێکی جیاوازدا ناگەڕێم. من لە خودا دەگەڕێم. دەوانی من گەڕانە بەدوای خودادا".

بەرپەرچی دامەوە و گرییەک کەوتە دەنگییەوە، "کەواتە تۆ لە شوێنێکی هەڵەدا دەگەڕێیت. خودا ئەم شوێنەی جێهێشتووە! نازانین کەی دەگەڕێتەوە".

کاتێ ئەم قسانم ژنەوت، دڵم بەسەر کۆڵەی سینگمدا کەوت و گوتم: "کە بنیادەم بە خراپە باسی خودا بکات، ئەوا بە خراپە باسی خۆی دەکات".

زەردەخەنەیەکی مەکراوی لەسەر لێوەکانی خاوەن مەیخانەکە نەخش بوو، لە دەموچاویدا درژی و بێزارییەکم بینی، شتێکی تریشی پێوە دیاربوو کە لە ئازارێکی ئاشکرای دەموچاوی منداڵێک دەچوو.

ئینجا لێم پرسی: "ئەی خودا نافەرموێت (خودا لە شادەماری لاملی لێمان نزیکترە)؟ خودا لەو دوورە، لە ئاسمانە بەرزەکاندا خۆی نەشاردووەتەوە، بەڵکو لە ناخی هەر یەکێ لە ئێمەیە، بۆیە ئەو دەستمان لێ هەڵناگرێت، ئیدی چۆن دەست لە خۆی هەڵدەگرێت؟".

"بەڵام ئەو دەستمان لێ هەڵناگرێت"، خاوەنی مەیخانەکە ئاوها بەرپەرچی دامەوە و چاوەکانی ساردوسڕ و بەرەنگارکار بوون: "گەر خودا لێرەیە، بۆ بێدەنگە، لە کاتێکدا تا ئەوپەڕی ئازار دەچێژین، ئەی ئەمە چی دەگەیەنێت؟".

گوتم: "براکەم ئەوە ڕێسای یەکەمە: **ئەو شێوازەی کە خودای تێدا دەبینین، هەر ڕەنگدانەوەی ئەو شێوازەیە کە خۆمانی تێدا دەبینین. گەر خودا جگە لە ترس و سام هیچ شتێکی دیکەی بۆ ئاوەزمان نەهێنابا، واتای وابوو برێکی زۆر لە ترس و سام لە ناخی خۆماندا هەڵدەقولا، وەلێ ئەگەر خودامان لێوانلێو لە خۆشەویستی و بەزەیی بینی، ئەوا ئێمەش بە هەمان شێوە دەبین".**

خاوەن مەیخانەکە بە ناقابیلییەوە وەڵامی دامەوە، چونکە قسەکانم تووشی سەرسوڕمانێکی لەناکاویان کرد: "ئەمە چۆن لەو وتەیە جیادەکرێتەوە کە خودا بۆخۆی وێنایەکە لە دەستکردی خەیاڵی خۆمان؟ من تێناگەم".

لە پشت هۆڵی نانخواردنەکەوە ژاوەژاوێک پەیدا بوو و وای لێکردم لە وەڵامدانەوەی بووەستم . کە بە لای سەرچاوەی دەنگەکەدا ئاوڕمان دایەوە، دوو پیاوی ئێسکقورس و سەرخۆشمان بینی بە دەنگی بەرز و ناحاڵی قسەی هەلەقومەلەق و ناشیرینیان دەکرد. جنێویان دەدا و ترسیان خستبووە دڵی مەعمیلەکانی ترەوە، خواردنیان لە قاپەکانیان دەڕفاند و لە پەرداخەکانیان دەخواردەوە. گەر یەکێ نارەزایی دەربڕیایە، وەک دوو منداڵی چەتوونی حوجرە شۆخییان پێدەکرد.

"پێت وا نییە کە دەبێ یەکێ بەر بەم دوو ئاژاوەگێڕە بگرێت؟"، خاوەن مەیخانەکە بە چیرەچیری ددانەکانییەوە بە چپە ئەمەی گوت و لەسەری ڕۆیشت: "بڕوانە ئێستا چی دەکەم".

لە چاوترووکانێکدا گەیشتە ئەوسەری هۆڵەکە، یەکێ لە دوو سەرخۆشەکەی لەسەر کورسییەکەی ڕاکێشا و بە دەموچاویدا کێشا. بێگومان پیاوەکە قەت چاوەڕێی شتێکی وای نەدەکرد، ئیدی وەک فەردەیەکی بەتاڵ لەسەر زەوییەکە تەخت بوو. جگە لە سووکە ئاهێک کە لە نێوان لێوەکانییەوە دەرچوو، دەنگێکی دیکەی لێوە نەهات.

دیاربوو کە پیاوەکەی دیکە لەوەی یەکەم بەهێزتر بوو، بە توندی بە گژیدا چوو، بەڵام خاوەن مەیخانەکە دەسبەجێ بە زەوییدا دا و بە پێلەقە کەوتە لێدانی قۆڵ و باسکی مەعمیلە دەستنەکردووەوەکەی، ئینجا پێی خستە سەر دەستی و لەژێر پێڵاوە قورسەکانیدا شێلای. گوێمان لە قرچەقرچی پەنجەیەکی یان زیاتری بوو دەشکا.

هاوارم کرد: "وازی لێ بێنە. تۆ خەریکە دەیکوژیت. ئەمە بوو کە بەتەما بوویت بیکەیت؟".

لەبەر ئەوەی من سۆفی بووم، سوێندم خواردبوو کە ژیانی خەڵکی بپارێزم و ئازار بە کەس نەگەیەنم. ئاخر لەم دنیا پڕ وەهم و خەیاڵییەی تێیدا دەژیین، خەڵکێکی زۆر هەن ئامادەن بەبێ هۆ شەڕ بکەن، هەندێکی دیکەش هەن لەبەر هۆکارێک شەڕ دەکەن، وەلێ سۆفی لەگەڵ هیچ کەسێکدا شەڕناکات، تەنانەت گەر هۆکارێکیشی بەدەستەوە بێت. هیچ شتێک نییە وام

لێ بکات پەنا بۆ توندوتیژی ببەم، بەڵام دەتوانم وەک پەتۆیەکی نەرم خۆم باوێمە نێوان خاوەن مەیخانەکە و مەعمیلەکەوە تا ناوبژییان بکەم.

"هێی دەروێش، دوورەوە بکەوە، ئەگینا لێدانێکی کوشندە بە تۆش دەگەیەنم"، خاوەن مەیخانەکە هاواری کرد، هەرچەندە دەمانزانی کە شتی وا ناکات.

دوای خولەکێک دوو خزمەتگوزارەکە هەردوو مەعمیلەکەیان هەڵگرت کە پەنجەی یەکێکیان شکا و ئەوی تریش لووتی شکا و بە هەموو لایەکدا خوێن پەرژیبوو. بێدەنگییەکی سامناک باڵی بەسەر هۆڵی نانخواردنەکەدا کێشا. خاوەن مەیخانەکە بەو ترسەی خستییە دڵی هەموانەوە، بەتیلی چاو نیگایەکی کردم و شانازیی دەکرد. کە دووبارە هاتەوە قسە، وەک ئەوەی هەموو ئامادەبووان بدوێنێت و مینا باڵندەیەکی گۆشتخۆر بە بێباکی بە ئاسماندا بخولێتەوە، وەک هاربوویەک دەنگی بەرز کردەوە.

"هێی دەروێش، وەک بینیت کاروبار بەردەوام بەم جۆرە ناڕوات. توندوتیژی قەت ئاکاری من نەبووە، بەڵام وا ئێستا شتەکە ڕووی دا. ئاخر کاتێ خودا لە بیرمان دەکات و لێرە بە تەنها جێمان دێڵێت، ئێمەی بنیادەمی خواسایی ئەرکی ئەوەمان دەکەوێتە ئەستۆ، کە توند بین یان بە دەستی خۆمان دادپەروەری جێبەجێ بکەین، بۆیە لەمەولا گەر قسەت لەگەڵیدا کرد، تکایە ئەوەی پێ بڵێ. منیش پێی دەڵێم کاتێ بەرخەکانی بەرهەڵدا دەکات، ئەوا بەرخەکان بە سەلاری و ملکەچییەوە چاوەڕێی ئەوە ناکەن تا سەربیبڕدرێن، بەڵکو دەبن بە گورگ".

شانەکانم هەڵتەکاند و ئاماژەم بۆ دەرگاکە کرد و وتم: "تۆ هەڵەیت".

"ئایا لە قسەکەمدا هەڵەم کە گوایا ڕۆژێ لە ڕۆژان بەرخ بووم و ئەمڕۆ بووم بە گورگ؟".

"نەخێر، تۆ ڕاست دەکەیت. من وای دەبینم تۆ بەڕاستی بوویت بە گورگ، لێ لەوەدا هەڵەت کرد کە وتت دادپەروەری جێبەجێ دەکەیت".

"چاوەڕێ بکە، من هێشتا لەگەڵ تۆدا تەواو نەبووم"، خاوەن مەیخانەکە لە پشتمەوە بانگی کرد: "تۆ لەجیاتی خواردن و جێکردنەوە قەرزاری منیت، تۆ بڕیاربوو خەونەکانم بۆ لێک بدەیتەوە".

"شتێکی باشتر دەکەم"، پێشنیارم کرد، "ناولەپت دەخوێنمەوە".

سوڕامەوە و بەرەو لای ڕۆیشتم و هاوکات چاوم بڕییە نێو چاوە دایساوەکانی. لەم کاتانەدا بە شێوەیەکی زگماکانە و غەریزەیی و گوماناوی چاوەکانم دەنووقێنم. کاتێ دەستی ڕاستەیم گرت و ناولەپیم بەرز کردەوە، هیچ بەرەنگارییەکی نەکردم. دیقەتی هێڵەکانی ناو لەپیم دا، بینیم قووڵن، درزبردوون، ئاماژە بۆ ڕێچکە و دەربەندی پێچاوپێچ و لێکدابڕاو دەکەن. ڕەنگەکان لەنێو خەرمانەیەکدا وردە وردە دەرکەوتن: قاوەییەکی ڕەنگ ژەنگاوی، شینێکی کاڵی خۆڵەمێشی ئاماڵ. وەک ئەوەی لە هەر هێزێکی خۆپارێزی دنیای دەرەوە بەتاڵ بووبێتەوە، هێزە ڕۆحییەکەی بوو بەناوبەتاڵێکی قووڵ و بە لێوارەکاندا تەنک بووەوە. ئیدی لە ناخی پیاوەکەدا ژیان لە درەختێکی پەژموردە زیاتر نەبوو. بۆ قەرەبووکردنەوەی لەدەستدانی وزەی ڕۆحی، هێزی جەستەیی زیادی کردبوو و زیادەڕۆیی لە بەکارهێنانیدا دەکرد.

دڵم بە پەلە کەوتە خورپە، چونکە خەریک بوو شتێکم دەبینی. لە سەرەتادا وەک ئەوەی لە پشت پەردەوە بیبینم بە کاڵی دیاربوو، ئینجا پتر ڕوونبووەوە، لە پاشان دیمەنێک لە بەرچاوم دەرکەوت.

کچێکی گەنجی قژ مەیلەو سوور، پێخاوس و خاڵێک لەسەر پێیەکی بوو، شاڵێکی سووری نەخشێنراو بەسەر شانیدا دابوو.

گوتم: "تۆ خۆشەویستێکت لەدەست داوە"، بەدەم قسەوە ناولەپیم بە دەستم گرت.

هەردوو مەمکی شیریان لێ دەچۆڕایەوە، زگی ئەوەندە گەورەبوو، لەوەدا بوو بتەقێت. لە کوختێکی گڕتێبەردراودا هەڵواسرابوو. کۆمەڵە جەنگاوەرێک بە سواری ئەسپی زین زیو و زێڕەوە لەوێ دەخولانەوە. بەوای سووتانی داروپەردوو و گۆشتی بنیادەمەوە بۆنێکی تیژ بڵاوبووبووەوە.

ئەوانە سوارەی مەغۆل بوون، لووتیان فس و پان بوو، ملیان ئەستوور و کورت بوو، دڵیان چون بەرد ڕەق بوو. سوپای بەهێزی جەنگیزخان.

"تۆ دوو خۆشەویستت لەدەست داوە"، قسەکەی خۆم ڕاست کردەوە و گوتم "هاوسەرەکەت بە منداڵی نۆبەرەت دووگیان بوو".

خاوەن مەیخانەکە هەردوو بڕۆی لێک دا و چاوەکانی لەسەر پێڵاوە چەرمەکەی گیرکرد و بە توندی لێوەکانی کرژکرد، دەموچاوی وەک نەخشەیەکی بێسەروبەر تێکچوو. لەناکاو لە تەمەنی ڕاستەقینەی خۆی پتر نیشانەی پیریتیی لێ دەرکەوت.

وتم: "دەزانم ئەوەی دەیڵێم تەسەللات پێ نایات، بەڵکو پێم وایە شتێک هەس گەرەکە پێتی بێژم. ژنەکەت ئاگر یان دووکەڵ نەیکوشتووە، بەڵکو تەختەدارێک لە بنمیچەکەوە بەربووەتەوە و بەسەر سەریدا کەوتووە و دەسبەجێ بەبێ ئازار مردووە. تۆ بەردەوام لەو باوەڕدا بوویت کە ئازارێکی زۆری کێشاوە، بەڵام لە ڕاستیدا هیچ ئازارێکی نەکێشاوە".

خاوەن مەیخانەکە بڕۆکانی تێک نا و بە کاریگەریی فشارێک لە خۆی بەولاوە کەس تێی نەگەیی، نوشتایەوە، کە پرسیاری کرد دەنگی گڕتر بوو "تۆ چۆن ئەوەت زانیوە؟".

خۆم لە پرسیارەکەی نەبان کرد و گوتم: "تۆ خۆت سەرکۆنە دەکەیت کە گوایا بۆ ناشتنی ڕێوڕەسمێکی شایانت بۆی نەکردووە. ئەو هێشتا دێتە خەونت و لەو چاڵەی لێی نێژراوە بە زگەخشکێ دێتە دەرەوە، بەڵام ئاوەزت گەمەت پێدەکات. لە ڕاستیدا هاوسەرەکەت و کوڕەکەت لە دۆخێکی باشدان، هەردووکیان لە دنیایەکی بێکۆتاییدا وەک دوو تیشک بە ئازادی دێن و دەچن".

ئینجا لەسەری ڕۆیشتم و ئەوەی دەموت بە وردی لێم دەکۆڵییەوە: "دەتوانیت دووبارە ببیتەوە بە بەرخ، چونکە هێشتا لە ناختدا بەرخەکەت پاراستووە".

کە خاوەن مەیخانەکە ئەوەی بیست، وەک ئەوەی دەستی بە مەقاڵەییەکی داخبوودا چزابێت، دەستی لە دەستم کێشایەوە: "هێی دەروێش، من تۆم خۆش ناوێ. ڕێگەت دەدەم ئەمشەو لێرە بمێنیتەوە، بەڵام دەبێ بەیانی زوو بڕۆیت. نامەوێ جارێکی تر لێرە دەموچاوت ببینم".

ژیان ئاوهایە. کاتێ ڕاستی بە یەکێک دەڵێیت، ئەو ڕقی لێت دەبێتەوە. هەر گاوێ باسی خۆشەویستیت کرد، پتر ڕقت لێ هەڵدەگرێت.

# ئێلا

## نۆرتامپتۆن، ١٨ ی ئایار ٢٠٠٨

بەدوای گفتوگۆکەی نێوان دەیڤید و جانێتدا، توندوتیژییەک سەری هەڵدا، ئێلا هەستی بە ماندوویێتی کرد و بڕیاری دا بۆ ماوەیەک دەست لە خوێندنەوەی ڕۆمانی (کفری شیرین) هەڵبگرێت. هەستی دەکرد مینا سەرقاپی مەنجەڵێکی پڕ لە ئاوی بەکوڵهاتوو لەپڕ بەرز بێتەوە و لە هەڵمە بەرزبووەکەوە ناکۆکیی کۆن و تووڕەی تازە دەربچێت و بۆ بەدبەختیش جگە لە خۆی کەسێکی تر ئەو سەرقاپەی هەڵنەدایەوە، ئەوەیشی لە کاتێکدا کرد کە پەیوەندیی بە ژمارە تەلیفۆنی سکۆتەوە کرد و داوای لێکرد کە کچەکەی نەخوازێت.

دیارە لە ژیانی لەمەولای بۆ هەر وشەیەک کە لەمیانەی ئەم تەلیفۆنکردنەوە کە کردی زۆر نیگەران دەبێت، بەڵام لەم ڕۆژی مانگی ئایارەدا، تەواو لە خۆی دڵنیا بوو کە ناتوانێت لە ئاکامی ئەم خۆتێهەڵقورتانە ترسناکەی باش تێبگات.

"سکۆت، سڵاو. من ئێلام، دایکی جانێتم"، وەک ئەوەی ئاسایی ڕۆژانە پەیوەندی بە هاوڕێی کچەکەیەوە بکات، خۆی خۆشحاڵ پیشان دا، "ئایا دەکرێ خولەکێک قسان بکەین؟".

"خاتوو ڕۆبنشتاین، خزمەتێکت هەبوو؟"، سکۆت بە پچڕپچڕی و واق وڕماوییەوە، بەڵام بە شێوازێکی شارستانییانە ئەمەی گوت.

بە ڕیتمێکی شارستانییانەی هاوتای هینەکەی ئەو ئێلا پێی وت کە شتێکی تایبەتی دژی ئەوی نییە، ئەو کە گەنجێکی منداڵکارە و هێشتا ئەزموونی ئەوەی نییە کچەکەی بخوازێت، لە تەلیفۆنەکەشدا لەوە ئاگاداری کردەوە کە لە بانەڕۆژێکی نزیکدا بە باشی لەوە تێدەگات، بگرە سوپاسیشی دەکات، چونکە لە کاتێکی گونجاودا ئاگاداری کردووەتەوە. ئیدی داوای لێکرد تا ئەو کاتە دێت

بابەتی هاوسەرگیری لەگەڵ کچەکەیدا لە بیر خۆی بباتەوە و ئەم قسەیەش لە نێوان هەردووکیاندا بە نهێنی بهێڵێتەوە.

بێدەنگییەکی چڕ و قورس باڵی کێشا.

"خاتوو ڕۆبنشتاین، پێم وا نییە کە تۆ تێی گەیشتبیت"، سکۆت کە دەنگی ئاسایی بووەوە وتی، "من و جانێت یەکترمان خۆش دەوێ".

بەزمە! ئاخر چۆن دەکرێ خەڵکی بەم ئاوهایە ساویلکە بن و وا بزانن کە خۆشەویستی هەموو دەرگاکانیان بۆ واز دەکات؟ ئەوانە وا تێدەگەن کە ئەڤین داردەستێکی ئەفسووناوییەو دەکارێ بە یەک بەرکەوتنی سەرووی توانا، هەموو شتێ بەدی بێنێت.

وەلێ ئێلا ئەوەی نەوت، بەڵکو وتی: "بڕوام پێ بکە، من ئاگام لە هەستی تۆ هەیە. بەڵام تۆ هێشتا لاوێکی هەرزەکاریت و ژیانێکی درێژ لە بەردەمتدایە. کێ دەزانێت؟ ڕەنگە سبەینێ کچێکی ترت خۆش بوێ ".

"خاتوو ڕۆبنشتاین، نامهەوێ بەرانبەرت بێچاووڕوو بم، وەلێ پێت وا نییە کە ئەم شتە بۆ هەموان چونیەکە، تەنانەت بە تۆشەوە؟ کێ دەزانێت؟ ڕەنگە تۆش کەسێکی ترت خۆش بوێ ".

ئێلا پێکەنینێکی خەفەبووی بە دەنگێکی بەرزتر و درێژتر لەوەی خۆی دەیەویست ڕەها کرد و گوتی: "من ئافرەتێکی مێرددارم و هەڵبژاردەی ژیانی خۆم هەیە، هەروەها مێردەکەمیش وەک من، ئەمەش تەواو ئەو شتەیە کە دەمەوێ بۆتی ڕاڤەبکەم. هاوسەرگیری پێش ئەوەی هەنگاوی بۆ بنرێ، بڕیارێکی بەهۆڵەوەبووانەیە و گەرەکە زۆر بە وردی لێی بکۆڵرێتەوە".

سکۆت لێی پرسی: (ئایا ئەمە وا دەگەیەنێت کە هەر لەبەر ئەوەی ڕەنگە لە بانەڕۆژێکی نادیار و دیارینەکراو کچێکی نادیارم خۆش بوێ، تۆ داوام لێدەکەیت لەگەڵ کچەکەتدا هاوسەرگیری نەکەم کە خۆشم دەوێ؟).

لەم نوختەیەوە گفتوگۆی نێوانیان دەستی بە هەرەسهێنان کرد، ئەو گفتوگۆیەی کە پڕبوو لە تەنگژە و نائومێدی. کە ئێلا لە کۆتاییدا تەلیفۆنەکەی دانا، ڕووی کردە ناندینەکە و بەردەوام کە تووشی پەژارەیەکی سۆزداری بووبا، دەستی بەو کارە دەکرد: چێشتلێنان.

* * *

دوای نیو سەعات مێردەکەی تەلیفۆنی بۆ کرد.

"خەریکە باوەڕ ناکەم کە تۆ تەلیفۆنت بۆ سکۆت کردووە و داوات لێ کردووە کە لەگەڵ کچەکەماندا هاوسەرگیری نەکات. پێم بڵێ چیت کردووە؟).

ئێلا بە قسەکەی سەری سوڕما و بە هەناسەبڕکێوە وتی: "ئای خودایە، چەند بە خێرایی قسە دەگوێزرێتەوە. خۆشەویستم، بوارم بدەیە با بۆت ڕاڤە بکەم".

بەڵام دەیڤید بە شڵەژاوییەوە قسەکەی پێ بڕی و گوتی: "پێویست بە ڕاڤەکردنی هیچ شتێ ناکات. ئەوەی کردووتە هەڵەیە. سکۆت پەیوەندیی بە جانێتەوە کردووە و یەکجار تووڕەیە. ئەو نایەتەوە و بۆ چەند ڕۆژێ لەگەڵ دەستەخوشکەکانیدا دەمێنێتەوە، ئێستا نایەوێ بتبینێت".

کەمێ بێدەنگ بوو، ئینجا لەسەری ڕۆیشت: "من لەسەر ئەوە گلەیی لێ ناکەم".

لەو ئێوارەیەدا تەنها جانێت نەبوو کە بۆ ماڵەوە نەگەڕایەوە، ئەوەبوو دەیڤیدیش نامەیەکی بۆ ئێلا نارد و تێیدا گوتی کە شتێکی کتوپڕ هاتووەتە پێش و چۆنێتیی شتە کتوپڕەکەیشی بۆ ڕوون نەکردەوە.

خۆ خووی دیڤید وا نەبوو، بەڵکو ئەو ڕەفتارەی دژی کرۆکی ژنومێردایەتییەکەیان بوو، لەگەڵ ئەوەشدا لەوەیە هاوجێیی لەگەڵ ئافرەت لەدوای ئافرەتدا بکات، ڕەنگە لەگەڵیاندا بنوێت و پارەشیان لێ خەرج بکات. ئەو کە ئێواران بۆ ماڵەوە دەگەڕایەوە، شوێنی خۆی لە دەوری مێزەکە دەگرت. گەر درزی ناکۆکیش بکەوتایەتە نێوانیانەوە، ئەم چێشتی هەر لێدەنا و ئەویش بەردەوام بە خۆشی و پێزانینەوە بڕی ئەو خواردنەی کە بۆی دەکردە ناو قاپەکەیەوە، دەیخوارد و لە کۆتایی هەر نانخواردنێکدا دەیڤید لە دڵەوە سوپاسی دەکرد . ئێلا هەمیشە بەوای غایەنەتییەکانییەوە ئەو پێزانینەی بە تەوازۆهێنانەوەیەکی شارراوە دادەنا و بەردەوام لێی خۆش دەبوو.

ئەمە یەکەم جاربوو کە مێردەکەی بەم شێوازە بێچاوڕووییە ڕەوتار بکات. ئێلا بۆ ئەم گۆڕانە خۆی سەرکۆنەکرد، بەڵام هەستکردن بە "تاوان" بۆخۆی ناوی سێیەمی ئێلا ڕۆبنشتاینە.

* * *

هەر کە ئـێلا لەگەڵ کـچەکەی و هەردوو منـداڵە جمـکەکەی لە دەوری مێزەکە دانیشتن، ئیدی ئەو هەستکردنەی بە تـاوان بۆ خەمۆکی گۆڕا. گوێی نەدایە پاڕانەوەکانی ئافی کە داوای پیتزای دەکرد، هەروەها هەوڵەکانی ئۆرلی کە نەیدەویست هیچ بخوات، ئەوە بوو ناچاری کردن برنجی خۆماڵی لەگەڵ گـاگۆزی سـەوز و گۆشـتی بـرژاوی مانگـا بخـۆن کە کەمـێ ڕەشـکەی پێـوە کرابوو. لە ڕواڵەتدا وا دەردەکەوت کە هەر ئەو دایکە کارکردە و خەمخۆرەی جـارانە، وەلـێ لە نـاوەوەدا هەسـتی بە شـەپۆلێ نائومێدی دەکـرد و لە زاریـدا هەستی بە تاڵییەکی وەک گوژاڵک دەکرد.

دوای نـانی شـێوان، ئـێلا لە ناندینەکە لە بەردەم مێـزی نـانخواردنەکە بە تەنهـا دانیـشت و خامۆشـییەکی قـورس بـاڵی بەسـەردا کێـشا. لەناکـاو بـۆی دەرکەوت کە ئەو کاری خواردن ئامادەکردنە و ئەو سـەعاتە دووروودرێژانەی بە کاری قورسەوە بەسەری بردووە، بێزارکەر و گێلایەتی بووە. هەستی کرد حەسرەت بۆ خۆی هەڵدەکێشێت. حەسرەتەکەیشی بۆ ئەوە بوو، تەمەنی خۆی لە چـل سـاڵ دەدا و شـتێکی گرینگـی لە ژیانیـدا بەدی نەهێنـابوو و بـێ ئەوەی کەسێک داوای لێ بکات، خۆشەویستییەکی زۆری بە خێزانەکەی بەخشی بوو.

لەپـڕ بیرکـردنەوەی کەوتە سـەر ڕۆمـانی (کفـری شـیرین) کە تێیـدا کەسایەتیی شەمسی تەوریزی سەرنجی ڕاکێشابوو.

"چەند خۆش بوو کە کەسێکی وەک ئەو لێرە بوایە"، بە شـۆخییەوە ئەمەی بەخۆی گوت: "لەگەڵ پیاوێکی وەک ئەودا ڕۆژێک بە ناخۆشی تێناپەڕێت).

ئەو وێنەیەی کە لە خەیاڵی ئەمدا وێنا بووبوو، دیمەنـی پیاوێکی بـاڵابەرز، ڕەشـتـاڵە، مـۆن بـوو، پـانتۆڵێکی چەرم و چاکەتێـک لە شـێوەی ئەوانەی ماتۆڕسـوارەکان لە بەری دەکەن، لە بەری بـوو. پرچێکـی ڕەش بەسـەر شانەکانیدا هاتووەتە خوارێ و سـواری مـاتۆڕێکی هـارلی دیڤیدسـنی سووری بـریقەدار بـووە و لە هەردوو لای سـوکانەکەیەوە گـوڵێنگی ڕەنگاوڕەنـگ شـۆڕبوونەتەوە. بەم وێنـاکردنە زەردەی هـاتێ. ماتۆڕسـوارێکی قـۆز و سەرنجڕاکێشە، سۆفییەک بەسـەر ڕێگەیەکـی تیـژڕەوی و چۆڵدا مـاتۆڕەکەی دەهاژوێت. ئەرێ باشـتر نییە لەگەڵ پیـاوێکی ئاوهـادا سـوار بێت و داوای لـێ بکەیت بتگەیەنێتە جێ؟

ئینجا ئێلا لە خۆی پرسی: گەر شەمس ناو لەپی بخوێنێتەوە، ئاخۆ چی ببینێت، ئایا هۆی ئەوەی بۆ ڕوون دەکاتەوە کە ناوبەناو بیرکردنەوەی دەگۆڕێت و دەبێتە ئەشکەوتێکی تاریک؟ یان بۆچی لەگەڵ ئەوەی خێزانێکی گەورە و خۆشەویستیشی هەیە، هەست بە تەنهایی دەکات؟ ئەی دەربارەی ڕەنگەکانی خەرمانەی بەختی چی؟ ئاخۆ بریقەدار و ڕووناکە؟ ئایا شتێکی بریقەدار و ڕوون لە ژیانیدا هەیە؟

لەو دەمەیدا ئێلا بە تەنها لە بەردەم مێزی نانخواردنەکە دانیشتبوو و تروسکەیەکی ڕۆشنایی کز لە فڕنەکەوە دەردەچوو، زانیی سەرباری ئەوەی نکوڵی لە بیرکرنەوە ئومێدبەخشەکانی دەکات، لەگەڵ ئەوەشدا بە سووربوون و خۆڕاگرییەوە توانای مانەوەی بەرانبەر تەنگژەکان هەیە. لە ناخەوە ئەڵهای خۆشەویستیی دەکرد.

# شەمس

## مەیخانەیەک لە دەرەوەی سەمەرقەند، ئاداری ١٢٤٢

بەسەر چەندین پێی پەتی و دەستی ڕووتی ڕێبوارە شەکەتەکاندا کە ژمارەیان لە دە کەس زیاتر بوو، لە نهۆمی سەرەوەی مەیخانەکە کە هەموو لە خەوێکی قووڵدابوون و هەریەکەیان خەونێکی دەبینی، بەرەو پێش چووم، تا گەیشتمە جێخەوە پووشەکەم کە بۆنی گەڵەخاو و بۆگەنی لێدەهات. لەو تاریکییەدا ڕاکشام و ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژەم بیر خۆم هێنایەوە، لە هەر ئاماژەیەکی خودایی کە بینیبوومن، ورددەبوومەوە، ڕەنگە لە پەلەپەلیی خۆمدا، یان لە نەزانینمەوە بووبێت، هیچیانم نەدەزانی.

هەر لە منداڵیمەوە، خەونم دەبینی و دەنگگەلێکم دەبیست، بەردەوام خودام دەدواند و وەڵامی دەدامەوە. هەندێ ڕۆژ زۆر بە سووکی بەرەو ئاسمانی حەوتەمین هەڵدەکشام، ئینجا بەرەو قووڵترین چاڵ لە زەویدا دادەکشام، سامناک چون بەردێکی نێژراوی ژێر داربەڕووی زەبەلاح و درەختی کەستەنایی شیرین، بۆنی خاکی لێدەهات. ناوبەناو مەیلی خواردنم نەدەما، چەندین ڕۆژ ڕادەبواردن و خواردنێکم نەدەخوارد. ئەم شتانە نەیاندەترساندم، وردەوردە فێربووم بۆ هیچ کەسێک باسیان نەکەم. ئاخر مرۆڤ توانای تێگەیشتنی شتێکی نەبێت، حەز دەکات شۆخیی پێ بکات.

باوکم یەکەم کەس بوو بێزێزیی بەو خەونانەم دەکرد کە دەمبینین. هێشتا لە تەمەنی دە ساڵیدا بووم و برێ ساویلکە بووم، هەموو ڕۆژێ فریشتە پاسەوانەکەم دەبینی، وام دەزانی کە ئەو سەر لە خەڵکانی دیکەش دەدا. ڕۆژێکیان ئەو دەمەی باوکم لە داری ئورز فێری چۆنێتیی درووستکردنی

سندووقێکی دەکردم تا وەک خۆی ببمە دارتاش. ئەوە بوو باسی ئەو فریشتەیەم بۆی کرد کە دەهاتە خەونم.

"ڕۆڵە، خەیاڵێکی سەرکێشت هەیە"، باوکم بە ساردوسڕییەکەوە ئەمەی گوت، "باشتر وایە ئەوە بۆ کەس باس نەکەیت. نامانەوێ لادێیەکان بەم شتانە بێزار بکەین".

زۆری پێ نەچوو هەندێ لە دراوسێکان لە کن دایبابم گلەییان لێ کردم و بەوە خەتاباریان کردم کە گوایا ڕەفتاری نامۆم هەیە و ترس دەخەمە دڵی منداڵەکانیانەوە.

باوکم وتی: "کوڕم من لە ڕەفتارەکانت تێناگەم. بۆچی بەوە داناکەویت کە تۆ جیاوازییەکت لەگەڵ دایک و باوکت نییە؟ ئاخر هەموو منداڵێک بەدوای ڕێچکەی دایبابی خۆیدا دەڕوات و وەک ئەوان دەکات، گەرەکە تۆش وا بکەیت".

ئەو دەمە زانیم لەگەڵ ئەوەی دایبابم خۆش دەوێن و حەز دەکەم پێیانەوە پابەند بم، وەلێ بۆ من نامۆ بوون.

"باوکە، من لە هێلکەیەکەوە دەرچووم جیایە لەو هێلکەیەی کە منداڵەکانی دیکەتی لێوە دەرچوون. تکات لێ دەکەم وام دابنێ مراوییەکم و لەگەڵ مریشکان دەژی. ئەو ئاوەی تۆ دەترسێنێت، ژیان بە من دەبەخشێت، من مەلەوانی دەزانم، بۆیە مەلە دەکەم. ئۆقیانووس نیشتمانی منە، گەر لەگەڵمدایت، وەرە بۆ ناو ئۆقیانووسەکە، خۆ ئەگەر نایەیت، ئیدی واز لە دەستتێوەردانی ژیانم بهێنە و بەرەو کولانەی مریشکان بگەڕێوە".

هەردوو چاوی باوکم کرانەوە، ئینجا بچووک بوونەوە، بە ڕووخۆشییەوە گوتی: "گەر تۆ ئێستا بەم شێوازە لەگەڵ باوکتدا بدوێیت، ئەی کە گەورە دەبیت، دەبێ لەگەڵ نەیارەکانت چۆن قسە بکەیت".

لەگەڵ ئەوەی دایک و باوکم خەم دایگرتبوون، خەوبینینەکانیشم بەردەوام بوون، بەڵکو زۆرتر بووبوون. دایبابم تا دەهات تووڕە دەبوون و دەشڵەژان، بۆیە هەستم بە خەتاباری دەکرد، چونکە خەونەکان بێزاری کردبوون، لێ نەمدەزانی چۆن سنوورێک بۆ ئەو خەونانە دابنێم. خۆ ئەگەر ئەوەشم لە توانادا بوایە، پێم وا نییە هەنگاوم بۆ دەنا. ماوەیەکی زۆری نەبرد ماڵەوەم

جێهێشت و ئیدی نەگەڕامەوە. لەوساوە وشەی تەوریز بوو بە پەیڤێکی شیرین و ناسک، نایاب و بە زەمزەمەیەکی وا لەسەر زمانم دەتوایەوە. سێ بۆنی ئەم شوێنە بوون بە یادەوەریم کە ئەمانەن: داری هەڵپاچراو، نانی لەتۆوخەشخاش دروستکراو، بۆنی بەفری نەرم و تازە.

بەم ئاوهایە بووم بە دەروێش و لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر دەگەڕام، لە جارێ زیاتر لە یەک شوێن نەدەنوستم، لەناو هەمان قاپی چینیدا دوو جار خواردنم نەدەخوارد. وام لێهات لە هەموو ڕۆژێکدا لە دەوروبەری خۆم دەموچاوی جیام دەبینی. کە برسیم دەبوو، بە لێکدانەوەی خەون برێ پارەم دەست دەکەوت. ڕۆژهەلات و ڕۆژاوا دەگەڕام و لە هەموو شوێنێ مەنەی خودام دەکرد، لە ژیانێک دەگەڕام کە شایستەی ژیان بێت، لە زانیاریی نوێ و زانستی شایان دەگەڕام. لەبەر ئەوەی لە هیچ شوێنێ ڕەگوڕیشەم نەبوو، هەموو دنیا بوو بە هی من و لە هەموو شوێنێکی دەگەڕام.

لە میانەی گەشتەکانمەوە هەموو جۆرە ڕێگەیەکم گرتەبەر، ئیدی هەر لە ڕێگەی بازرگانیی میللییەوە بیگرە تا دەگاتە ئەو کوێرەڕێیانەی کە چەندین ڕۆژ ناتوانیت زیندەوەرێکی تێدا ببینیت. لە ڕۆخەکانی دەریای ڕەشەوە بۆ شارەکانی وڵاتی فارس، لە دەشتاییە هەراوەکانی ئاسیای ناوینەوە بۆ تەپۆلکە لمینەکانی دوورگەی عەرەبی. دارستانی چڕ و لەوەڕگای تەخت و بیابانی زۆرم بڕی. لە چەندین خان و لە چەندین حەوانەوەگە مامەوە، لە چەندین کتێبخانەی گشتی و کۆن گفتوگۆم لەگەڵ پیاوانی ئەهلی زانست کرد، گوێم لە مامۆستایانێک گرت کە لە حوجرەکاندا فەقێی منداڵیان فێردەکرد. لەگەڵ فەقێیانی حوجرەکاندا دەربارەی زانستی لێکدانەوە و زانستی لۆژیک گفتوگۆم دەکرد. سەردانی چەندین پەرستگە و مەزارگە و دێر و گۆڕی پیاوچاکانم کرد، لەگەڵ خەڵکانی پشت لە دنیاکردوو لە ئەشکەوتەکانیان تێرامانم جەڕباند. لە کۆڕی زیکردا بەشداریی دەروێشانی دیکەم کرد، لە خزمەت هۆشمەنداندا خۆم کڕدەکرد، لەگەڵ خودانەناساندا شێوم دەخوارد، لەگەڵ کاهینانی ئەفسوونکار لەبەر تریفەی مانگ سەمام کرد. ئیدی لە هەموو نەتەوە و تیرەیەک، لە هەموو تەمەن و پیشەیەک خەڵکانێکم ناسی و ڕووداوی خۆش و ناخۆش و پەرجووی زۆرم دی.

دێهـاتی هەژار و کـێڵگەی سـووتماک و ڕەشـهەڵگەڕاوم دی، شـار و شارۆچکەی داگیرکراو و تالانکراوم بینی کە ڕووبارەکانی سوورهەڵگەڕابوون و نێرینەیەکیان تێدا نەمابوو تەمەنی لە دە ساڵ زیاتر بێت. لە مرۆڤایەتیدا چاک و خراپم دی، بۆیە ئیدی شتێک نەماوە تووشی سەرسوڕمانم بکات.

لەمیانەی ئەم سەفەر و ئەزموونانەوە دەستم بە کۆکردنەوەی لیستێک کرد کە لە هیچ کتێبێکدا تۆمار نەکرابوو، بەڵکو تەنها لە ڕوحی خۆمدا هەڵم کۆڵی بوو. ئەم لیستە تایبەتییەم ناو نا (ڕێسا سەرەکییەکانی سۆفییە گەڕیدەکان لە ئیسلامدا)، من وەک یاساکانی سروشت بە لیستێکی گشتگیر و باوەڕپێکراو و جێگیری دادەنێم.

ئەمە تۆماری (چل ڕێساکەی ئایینی عەشق) پێکدێنێت، کە تەنها لەمیانەی عەشقەوە، تەنها عەشق، بەدی دەهێنرێ. یەکێ لەو ڕێسایانە دەڵێت: "**ڕێگەی بەرەو ڕاستی لە دڵەوە تێدەپەڕێت، نەک لە (سەر). دڵت بکە بە ڕێنوێنیی سەرەکیت نەک ئاوەزت. ڕووبەڕوو ببەوە، مەیدانخوازی بکە، لەئەنجامدا دڵت بەسەر (نەفس)دا زاڵ دەبێت. ئیدی خۆناسین بەرەو ناسینی خودا دەتبات**".

شتەکە چەندین ساڵی خایاند تا توانیم ئەم چل ڕێسایە دابنێم. ئەمێستا دوای ئەوەی لێی بوومەوە، تێگەیشتم لەم دنیایەدا من لە دواقۆناغی زەمەنی خۆم نزیک دەبمەوە. لەم دواییەدا خەونێکی زۆر دەبینم کە هەموویان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن. ئەوە مردن نییە کە پەژارەم دەکات، چونکە من مردنم بە کۆتایی دانەناوە، بەڵکو ئەوەی نیگەرانم دەکات ئەوەیە کە بمرم و کولتوورێکم لەدوای خۆم جێنەهێشتبێت. لە سینگمدا پەیڤەلێک کەڵەکە دەبن، چیرۆکێکی زۆر چاوەڕێن کە بیانگێڕمەوە. من دەمهەویست ئەو زانیارییانەی پێیان گەیشتووم بۆ کەسێکی دی بیانگوێزمەوە، ئیدی کەسەکە مامۆستا بێت یان فەقێ. من منەی هاوتایەک - هاوەڵێک دەکەم.

(هۆ خودایە)، لە ژوورە شێدار و تاریکەکەدا چپەدوویەکم کرد، (من بە هەموو شوێنێکی دنیادا ژیانی خۆم بە گەڕان بردەسەر و ڕێگەکەی تۆم گرتەبەر، هەموانم وەک کتێبێکی کراوە، قورئانێکی گەڕۆک بینی. لە تاوەری بەرزی زانایـان دوورکەوتـمەوە و کـاتی خـۆم لەگەڵ نەفرەتلێکـراوان و دەرکراوان و دەربەدەرکراوان بەسەربرد، من لە هەموو ئەوانە لێوانلێو بووم،

بۆیە یارمەتیم بدە، تا حیکمەتی تۆ بۆ کەسێکی شیاو بگوێزمەوە، ئیدی دوای ئەوە چیت پێ باشە وام لێ بکە).

لەناکاو لەنێو ژوورەکەدا ڕووناکییەکی یەکجار درەوشاوە لە بەرچاوم داکشا، دەموچاوی ڕێبوارە نوستووەکان لەنێو جێگەکانیانەوە بوو بە گڕێکی شین. ئیدی وەک ئەوەی هەموو پەنجەرەکان کرابێتنەوە، لەگەڵ هەوا بێگەرد و بووژێنەرەوەکەدا بایەکی توند هەڵیکرد و لەگەڵ خۆیدا بۆنی گوڵەزەنبەق و یاسەمینی لە باخە دوورەکانەوە هێنا.

فریشتە یاوەرەکەم بە دەنگێکی نەرمی نەئاسا وتی (بۆ بەغدا بڕۆ). لێم پرسی: (لە بەغدا چی چاوەڕێم دەکات؟).

"تۆ داوای هاوەڵێکت کرد و هاوەڵێکت پێ دەبەخشرێ. لە بەغدا ئەو (سەید)ە دەبینی کە بەرەو ڕێگەی ڕاست ڕێنوێنیت دەکات".

چاوەکانم پڕبوون لە عەسری پێزانین. ئەوسا زانیم کە ئەوەی لە خەونەکانمدا دەمبینی، جگە لە هاوەڵی ڕۆحیم، کەسی تر نەبووە. ئیتر لە چارەمان نووسراوە درەنگ یا زوو بەیەک بگەین، کاتێکیش بەیەک دەگەین، ئەو دەمە دەزانم بۆچی چاوە بادەمی و ناسکەکانی بۆ هەمیشە خەمینن و چۆن لە شەوێک لە شەوەکانی سەرەتای بەهاردا کوژرام.

# ئێلا

## نۆرتامبتۆن، ١٩ ی ئایاری ٢٠٠٨

بەر لە خۆراوابوون، پێش ئەوەی منداڵەکان بۆ ماڵ بگەڕێنەوە، ئێلا ئەو لاپەڕەیەی کە لە ڕۆمانی (کفری شیرین) گەیشتبوویێ، نیشانەکرد و خستییە لاوە. هەر وەک حەزێک و ناسینی ئەو پیاوەی کە ڕۆمانەکەی نووسیوە، ئێلا ئینتەرنێتی کردەوە و بۆ دۆزینەوەی ناوی (ع. ز. زاهارا) بە بزوێنەری گوگڵ دەستی بە گەڕان کرد و لە خۆی پرسی ئاخۆ چیی بۆ دەردەچێت، زۆر چاوەڕێی نەکرد، لەپڕ تۆماری کەسایەتییەکی بۆ دەرکەوت.

هەردوو ڕەنگە سەرەکییەکە کە لاپەڕەکەیان ڕازاندبووەوە، دوو ڕەنگی وەنەوشەیی و پیرۆزەیی بوون. لە سەرووی لاپەڕەکەوە وێنەی پیاوێک دەرکەوت کە عەبایەکی سپیی ئاودامانی لە بەر بوو و بە هێواشی بە دەوری خۆیدا دەسووڕایەوە. لەبەر ئەوەی ئێلا لە ژیانیدا کەسێکی نەدیبوو سەمای دەروێشی بکات، بۆیە بە وریاییەوە نیگایەکی وێنەکەی کرد. ناونیشانی تۆمارەکە (توێکڵەهێلکەیەک ناوی ژیانە) بوو و لە ژێریدا شیعرێک نووسرابوو، هەمان ناونیشانی هەبوو:

**با هەریەکەمان ئەوی ترمان بکا بە هاوڕێی خۆی**
**با هەریەکەمان لە خاک و پای ئەوی ترمان چۆک دابدات**
**لە ناخماندا تەباییەکی زۆر هەیە، وا مەزانە تەنها ئێمە دەیانبینین**

لاپەڕەکە لە هەموو لایەکی دنیاوە پڕبوو لە پۆستکارتی شاران و شوێنان. لە ژێر هەر پۆستکارتێکدا دەربارەی ئەو شوێنە تایبەتییە ڕوونکردنەوەیەک نووسرابوو. کە ئێلا دەستی بە خوێندنەوەیان کرد، دەسبەجێ سێ زانیاری سەرنجیان ڕاکێشا: یەکەم، پیتی (ع) کورتکراوەی ناوی (عەزیز)ە. دووەمیان،

عەزیز خۆی بە سۆفی دادەنێت. سێیەمیان، ئێستا عەزیز بۆ گواتیمالا سەفەری کردووە.

لە گۆشەیەکی تردا چەند نموونەیەکی لەو وێنانە بینی کە گرتبوونی زۆربەیانی بە جۆرەها ڕەنگ و مەیل و ئارەزوو وێناکرد. سەرباری جیاوازیی زۆریان، بە شێوەیەکی سەیر هەندێکیان لە هەندێکیان دەچوون: ئاشکرا بوو لەنێو هەموو وێنەکاندا شتێکی بزر بوو کۆیدەکردنەوە. ڕەگەزی ونبوو لای هەندێکیان شتێکی سادە بوو، وەک گوارە، یان پێڵاو، یان قۆپچە. هی هەندێکی تریان لەوە گرینگتر بوو، وەک ددان، یان پەنجە، یان هەندێ جار لاق. لەژێر وێنەکاندا ئەمەی خوێندەوە:

ئێمە هەرچییەک بین، یان لە هەر شوێنێک بژیین، وەک ئەوەی شتێکمان ون کردبێت و دەبێ بیدۆزینەوە، لە دڵی خۆماندا هەست بە ناتەواوییەک دەکەین، لێ زۆربەمان قەت ئەو شتە نادۆزینەوە، ئەوانەش کە لە توانایاندایە بیدۆزنەوە، تەنها کەمێکی کەمیان زات دەکات بچێتە دەرەوە و بەدوایدا بگەڕێت.

ئێلا لاپەڕەکەی سەرەوژوور و سەرەوخوار جووڵاند و یەک لە دوای یەک لەسەر پۆستکارتەکان کلیکی کرد تا گەورەیان بکاتەوە. هەموو ئەو ڕوونکردنەوانەی خوێندەوەکە عەزیز نووسیبوونی. لە دامێنی لاپەڕەکەدا ناونیشانی پۆستە ئەلیکترۆنییەکەی دۆزییەوە: azizzahara@gmail.com لەسەر پارچە کاغەزێکی بچووک نووسیی کە بە تەنیشتییەوە یەکێ لە شیعرەکانی ڕۆمیی بینی:

**عەشق بکە بە سەرمەشقت، عەشق! وەک دەبینی**

**ژیان بەبێ عەشقی بێگەرد دەبێتە بارێکی قورس**

لە کاتێکدا ئێلا ئەم چامەیەی دەخوێندەوە، بیرۆکەیەکی سەیر لە سەریدا چەخماخەی دا. هەستێکی ڕەوتەنی دایگرت، ڕەنگە عەزیز. ز. زاهارا ئەم هەموو شتەی لە تۆمارە تایبەتەکەی خۆی- وێنەکان و ڕوونکردنەوەکان و وەرگرتنەکان و چامەکان - لە خۆشیی چاوەکانی ئەم دانابێت. بیرۆکەیەکی تا ڕادەیەک سەیر و خۆبەزلزانین بوو، وەلێ بۆ ئەو واتایەکی نایابی هەبوو.

* * *

لە عەسری ئەو ڕۆژەدا، ئێلا بە شەکەتی و جۆرە خەمۆکییەکەوە، لە نزیک پەنجەرەکە دانیشت، تیشکی خۆرەکە لەسەر پشتی قورس بوو، هەوا لەنێو ناندینەکەدا تژی بوو لە بۆنی ئەو کێکەی کە دەیبرژاند. ڕۆمانی (کفری شیرین) لە بەردەمی کرابووەوە، بەڵام بیری مژوول بوو و نەیدەتوانی بە وردی خەیاڵی لەسەر بێت. وای بە خەیاڵدا هات کە ئەمیش کۆمەڵێ ڕێسای سەرەکیی تایبەت بە خۆی بنووسێت، کە دەکرێ ناوی بنێت (چل ڕێساکەی کابانێکی ماڵیی کارامەی ناگەڕۆک لە دەوروبەر دەژی).

بە ترمەترمێک گوتی: (ڕێسای یەکەم: دەست لە منەکردنی خۆشەویستی هەڵبگرە. بەدوای خەونی ناکردەنیدا مەچۆ! بێگومان شتگەلێ لە ژیاندا هەن بۆ ئافرەتێکی تەمەن نزیکەی چل ساڵ گرینگترن).

بەڵام ئەم گەمەکردنەی پشووسوارییەکی ئاڵۆزی لە لا دروستکرد و خولیای گەورەتری بیرخستەوە. ئیدی لەبەر ئەوەی نەیدەتوانی خۆی ڕابگرێت، پەیوەندیی بە کچە گەورەکەیەوە کرد و گوێی بۆ ئامێری تۆماری پەیوەندییەکان هەڵخست.

"ئازیزم جانێت، دەزانم من هەڵەبووم کە تەلیفۆنم بۆ سکۆت کرد، لێ نیازم خراپ نەبوو. ویستم دڵنیات بکەمەوە کە...".

کەمەکێ وەستا و خەمێکی زۆر دایگرت، چونکە پێشتر خۆی بۆ ئەم پەیامە ئامادە نەکردبوو. دەنگی خشەخشێکی نەرمی لە ئامێری تۆماری پەیوەندییەکانەوە ژنەوت کە لە پشتەوە تۆماری دەکرد. کاتێ بیری کردەوە کە وا بە کرەکە دەسووڕێتەوە و ڕۆژگاریش بەلەز دەڕوات، هەستی بە شڵەژانێک کرد.

"جانێت، من بەداخەوەم بۆ ئەوەی کە کردم. دەزانم گەرەکە لەو خۆشییەی کە لە سایەیدا دەژیم بێزار نەبم، بەڵام هەمووی لەبەر ئەوەیە کە من.. بەختەوەر نیم".

دەنگی قرتەقرتێک. ماوەی ئامێری تۆماری قسەکان خەریک بوو تەواو دەبوو. دڵی ئێلا بەو قسانەی کە ئێستا کردبووی گوشرا. ئەوە چیی بەسەر هاتووە. ئەوێک کە هەستی بە خەمباری نەکردبێت، ئیدی چۆن دەکرێ تووشی خەمۆکی بووبێت، خۆ پەی بەوە هەر نەبردووە؟ بە شێوەیەکی سەیر پێی وا بوو کە هەست بە خەمۆکی ناکات، کەچی ددانی پێدا نابوو کە ئەو بەختەوەر نییە.

بە دزەنیگا تەماشایەکی ئەو پارچە کاغەزەی کرد کە ناونیشانی پۆستە ئەلیکترۆنییەکەی عەزیز زاهارای لەسەر تۆمارکردبوو. ناونیشانەکە سادە و ساکار و تا رادەیەک سەرنجڕاکێش بوو. بەبێ ئەوەی زۆر بیر لە شتەکە بکاتەوە، ڕووی کردە کۆمپیوتەرەکەی و ئەم نامەیەی نووسی:

سەیدا عەزیز. ز. زاهارا،

من ناوم ئێلایە. لەسەر داوای پەخشکارە ئەدەبییەکە، وا خەریکم ڕۆمانەکەت (کفری شیرین) دەخوێنمەوە. ماوەیەکی کەمە دەستم بە خوێندنەوەی کردووە و چێژێکی زۆرم لێ وەرگرت. بە هەرحاڵ ئەمە بۆچوونی تایبەتی خۆمە و ڕەنگدانەوەی بۆچوونی پەخشکارە ئەدەبییەکە نییە. گەر ڕۆمانەکەتم خۆش بوێ یان نا، بۆچوونی من لەسەر بڵاوکردنەوەی ڕۆمانەکەت نابێتە دوابڕیار و ڕەزامەندی.

وا دیارە تۆ باوەڕت وایە کە عەشق گەوهەری ژیانە و شتێکی دیکەی لەوە گرینگتر نییە. ئێستا نیازم نییە دەربارەی ئەم بابەتە لەگەڵتدا بێمە نێو گفتوگۆیەکی نەزۆکەوە. ئەوەندە بەسە بڵێم کە من تەواو لەگەڵ بۆچوونەکەتدا نیم.

وەلێ من ئێستا لەبەر ئەم هۆیە بۆت نانووسم، چونکە ناکرێ بۆ خوێندنەوەی ڕۆمانی (کفری شیرین) کاتێکی پچڕپچڕ تەرخان بکەم، بەڵکو بۆیە بۆت دەنووسم، من لە هەوڵی ئەوەدام کیژە گەورەکەم قایل بکەم کە شوونەکات، چونکە هێشتا منداڵە. دوێنێ داوام لە هاوڕێکەی کرد کە پرۆژەی

هاوسەرگیرییەکەیان هەڵبوەشێنێتەوە، کچەکەمیش ڕقی لێ هەڵگرتووم و نایهەوێ قسەم لەگەڵدا بکات. هەست دەکەم مامەڵەکردن لەگەڵ تۆدا خۆشە، چونکە وا دیارە دەربارەی خۆشەویستی هاوبۆچوونین.

داوای لێبوردن دەکەم، کە دەربارەی کێشە تایبەتییەکانی خۆم قسەت بۆ دەکەم. من ئەمەم نەدەویست. (ناونیشانە ئەلیکترۆنییەکەتم دۆزییەوە) و لە تۆمارە تایبەتییەکەتدا وا هاتووە کە تۆ ئێستا لە گواتیمالایت. بێگومان سەفەرکردن بۆ شوێنانی دنیا شتێکی خۆشە. گەر ڕێکەوت و سەردانی بۆستنت کرد، ڕەنگە چاومان بەیەک بکەوێت و بەدەم قاوەخواردنەوەوە گفتوگۆیەک بکەین.

**بە هیوای خۆشیت**

**ئێلا**

یەکەم نامەی ئەلیکترۆنی بۆ عەزیز، پتر داوەتێک بوو نەک نامە، هاوارێک بوو بۆ بەدەنگەوەهاتن، بەڵام ئێلا کاتێ بە بێدەنگی لە نانخانەکەی دانیشت، هەستی بەوە نەکرد کە نامەی بۆ نووسەرێکی نادیار نووسیوە و چاوەڕێی ئەوەیشی نەدەکرد کە نە ئێستا و نە لە بانەڕۆژدا چاوی پێ بکەوێت.

# سەیدەکە

## بەغدا، نیسانی ١٢٤٢

بەغدا تێکرا بە هاتنی شەمسی تەوریزی-ی زانیبوو، بەڵام من ئەو ڕۆژەم لەبیر ناچێتەوە کە بۆ تەکیی سادەکەی دەرویشەکان هات کە لێی دەمایینەوە. لە عەسری ئەو ڕۆژەدا ژمارەیەک لە گەورەپیاوان بۆ سەردانیکردنمان هاتبوون، سەرۆکی دادوەرانیش لەگەڵ چەند پیاوێکدا بۆ سەردانم هاتبوو، گومانی ئەوەم لا پەیدا بوو کە شتێ لە سەرووی دۆستایەتییەوە لە پشت سەردانەکەیەوە هەیە. دادوەرەکە بەوە ناسرابوو کە زۆر ڕقی لە سۆفیگەرییە، پێم وابوو هەر وەک چۆن لە ناوچەکەدا چاوی خستبووە سەر هەموو سۆفییەکان، دەیهەوێ بیرم بخاتەوە کە ئێمەش لەژێر چاودێریی ئەوداین.

دادوەرەکە پیاوێکی چاوچنۆک بوو، دەموچاوی پان و ورگی داچۆڕاو بوو، پەنجەکانی کورت و پتەو بوون و ئەنگوستیلەیەکی بەنرخی لە هەر پەنجەیەکی کردبوو. پێم وایە دەبوو واز لە زۆرخۆری بهێنێت، وەلێ گومان دەکەم کە یەکێ بوێرێت و ئەوەی پێ بێژێت، تەنانەت پزیشکەکەیشی ناتوانێت موچیارییەکی ئاوهای بکات. دادوەرەکە لە خانەوادەیەکە ژمارەیەک لە زانا و خاوەن دەسەڵاتی ناوچەکەی لێ هەڵکەوتووە. بە بڕیارێک دەتوانێت پیاوێک بنێرێتە بەر پای سێدارە، یان بە ئاسانی لە تاوانبارێک خۆش ببێت و لە تاریکترین زیندان دەری بهێنێت. بەردەوام عەبای فەروە و جلی گرانبەهای لە بەر دەکرد. وای پیشان دەدا کە کەسێکە یەکجار لە دەسەڵاتەکەی خۆی دڵنیایە. هەرچەندە من لەگەڵ شێوازە پۆزاوییە ئاشکراکانیدا نەبووم و

ئەوەندەی لە توانامدا بوو بۆ بەرژەوندیی تەکێکەمان هەوڵم دەدا لەگەڵ ئەم پیاوە خاوەن دەسەڵاتەدا پەیوەندیم باش بێت.

"ئێمە لە نایابترین شاری دنیادا دەژیین"، دادوەرەکە بەدەم قسەوە هەنجیرێکی خستە زارییەوە، "بەڵام ئێستا بەغدا لەو پەنابەرانە جمەی دێت کە لە جەوروستەمی مەغۆلەکان هەڵاتوون، ئێمە ئارامگەیەکی ئاسوودەیان بۆ دابین دەکەین. ئاخر بەغدا چەقی دنیایە. ئەریَ باوەزەمان تۆش هەر وای نابینیت؟"

"بێگومان ئەم شارە مرواربیەکە بۆخۆی"، بە پێداگرییەوە ئەمەم وت، وەلێ نابێت ئەوەمان لەبیر بچێت کە شارانیش مینا ئادەمیزادن. لەدایک دەبن و بە هەردوو قۆناغی منداڵی و هەرزەکاریدا تێدەپەڕن، ئینجا پیر دەبن و لە کۆتاییدا دەمرن. پێم وایە کە ئێستا بەغدا گەیشتووەتە کۆتایی لاوێتی، چونکە ئیدی دەوڵەمەندبووین، وەک چۆن لە سەردەمی خەلیفە هارون ئەلرەشید دەوڵەمەند بووین، وەلێ لەگەڵ ئەوەشدا بۆمان هەیە شانازی بکەین کە هێشتا مەڵبەندی بازرگانی و پیشەیی و شیعرین، بەڵام کێ چووزانێت دوای هەزار ساڵ دۆخی شارەکە چیی بەسەر دێت؟ ڕەنگە هەموو شتێ بگۆڕێت".

"ئای لەم ڕەشبینییە!"، دادوەرەکە سەری بادا و دەستی بۆ قاپە چینییەکە درێژکرد و هەنجیرێکی هەڵگرت و لەسەری ڕۆیشت: "خەلافەتی عەباسی سەقامگیر و بەربڵاو دەبێت و خێر و فەڕ زیاد دەکەن، بێگومان ئەمە لە کاتێکدا ئەگەر ئەو غایەنانەی بۆ ناومان دزەیان کردووە، ئارامی دۆخی ئێستا نەشێوێنن، ئەوانە بانگەشەی موسڵمانێتی دەکەن، بەڵام بۆچوونیان لەمەڕ ئیسلام گەلێ مەترسیدارترە لە هەڕشەی گاورەکان".

وام بە باش زانی کە بێدەنگ بم، چونکە لە کەس شاراوە نییە کە دادوەرەکە، سۆفییەکان و لێکدانەوە تایبەتی و پەنهانەکانیان دەربارەی ئیسلام، بە هۆکاری کێشەنانەوە و خراپەکاری دادەنێت. بەوە تاوانباری دەکردین کە گوایا ئێمە شەریعەتمان وەلاوە ناوە، ئەمەش سووکایەتیکردنە بە پیاوانی دەسەڵات – پیاوانی وەک خۆی. هەندێ جار هەستم دەکرد دەیهەوێ هەموو سۆفییەکان لە بەغدا دەرپەڕێنێت.

"ئەم برایەتییەی تۆ زیانی نییە، وەلیّ پێت وا نییە کە هەندێ لە سۆفییەکان سنووری ئاسایی دەبەزێنن"، دادوەر پرسیی و دەستی بە ڕیشیدا هێنا.

نەمزانی وەڵامی پرسیارەکەی چۆن بدەمەوە. سوپاس بۆ خودا لەو چرکەساتەدا گوێمان لە لێدانی دەرگا بوو. فەقێ قژسوورەکە هاتە ژوورەوە و ڕاستەوخۆ بەرەو لای من هات، چپاندییە بن گوێچکەمدا کە میوانێک لە دەرگا وەستاوە، دەروێشێکی گەڕیدەیە و لەسەر بینینی من پێی داگرتووە و نایەوێ لەگەڵ کەسێکی تردا قسەبکات.

فەقێکەم لەسەر ئەوە ڕاهێنابوو، کە میوانێکی تازە دەهات بۆ ژوورێکی تر دەیبرد و خۆراکێکی گەرمی پێشکەش دەکرد، تا میوانەکان دەڕۆیشتن چاوەڕێی دەکرد، وەلێ دادوەرەکە کەشێکی ئاوهای دروستکردبوو، بۆیە بیرم کردەوە کە ڕەنگە دەروێشە گەڕیدەکە بە گێڕانەوەی چەند چیرۆکێکی شوێنە دوورەکان، ئەم ئاڵۆزییە بڕەوێنێتەوە، بۆیە داوام لە فەقێکە کرد دەروێشەکە بهێنێتە ژوورەوە.

دوای چەند چرکەیەک دەرگاکە کرایەوە و پیاوێکی سەرتاپا ڕەشپۆش هاتە ژوورەوە. باڵابەرز و لاواز، هەستەم بوو مەزەندەی تەمەنی بکرێ. لووتی تیژ و چاوەکانی ڕەش و خەواڵوو، پرچە ڕەشەکەی هۆنیبووە و بەسەر چاوەکانیدا هاتبووە خوارێ. عەبایەکی درێژی کڵاودار و بەرگێکی سۆفیانەی لە بەر بوو، پێڵاوێکی پێستەمەڕی لە پێ بوو. چەند تەزبیح و ملوانکە بە گەردنیدا شۆڕبووبوونەوە. قاپلەمەیەکی دارینی پێ بوو لەو جۆرەی کە سۆفییە سواڵکەرەکان بۆ تێکشکاندنی لووتبەرزی هەڵیدەگرن و خۆ بە خۆشحاڵ دەزانن کە خەڵکی خێریان پێدەکەن. زانیم کە من لە بەردەم پیاوێکدام ئەوەندە بایەخ بە دابونەریتی خەڵکی نادات، ڕەنگە خەڵکی بە دەربەدەر یان بە سواڵکەری بزانن، وا دیاربوو ئەو گوێی بەوە هەر نەدەدا.

کە بینیم لەوێ وەستاوە و چاوەڕییە فەرمووی لێ بکرێ تا خۆی بناسێنێت، هەستم کرد کە پیاوێکی جیایە و ئەوەش بە ڕوونی لە چاوەکانی و لە جووڵە و ئاماژە ڕێکوپێکەکانی جەستەیدا دیاربوو، لە بەری داربەڕوو دەچوو و خاکەڕا بوو، چاوی کاڵفامان گرینگییان پێ نەدەدا، وەلێ نوقڵانەی

ئەوەی لیدەدا کە داربەروویەکی گەشە و لە بانەرۆژدا گەشەدەکات. بە چاوە تیژ و رەشەکانی تەماشای کردم و بە بیدەنگی سەری لەقاند.

"دەرویش بەخێربێیت بۆ تەکیەکەمان"، بەدەم بەخێرهێنانەوە ئامازەم بۆ کرد کە لەسەر رایەخەکانی بەرانبەر دابنیشێت.

دەرویشەکە دوای ئەوەی سلاوی لە هەموان کرد، دانیشت و بە چاوی پشکنینەوە بە وردی تەماشای ئامادەبووانی نێو ژوورەکەی کرد. لە کۆتاییدا پشکنینەکەی لە حەناس دادوەرەکە راگرت . هەردوو پیاوەکە بەبێ ئەوەی وشەیەکیان لە دەم دەربچێت، خولەکێکی تەواو تەماشای یەکتریان کرد. ل خۆم پرسی ئاخۆ چۆن لە یەکتر تێگەیشتوون، چونکە بە دوو کەسی نەباری یەکتر دەچوون.

شیری شلەتێنی بزن و چەند دانەهەنجیری خۆمالی و چەند دەنک خورمایەکم بە دەرویش دا. بە وێلێکی زۆرەوە هەمووی رەتکردەوە. کە ل ناویم پرسی، خۆی بە تەوریزی ناساند و گوتی دەرویشێکی گەریدەیە و لەسەر زەویی پان و بەرینی خودادا لە خودا دەگەرێت.

لیم پرسی: "ئایا دۆزیتەوە؟".

کە سەری لەقاند، سێبەرێک دەموچاوی دەرویشی داپۆشی و گوتی "بەلێ، ئەو هەموو کاتێ لەگەلمدایە".

دادوەرەکە بە زەردەخەنەیەکی دەستکردەوە هاتە نێوانەوە و گوتی "ناتوانم لەوە تێبگەم، بۆچی ئێوەی دەرویش بەم جۆرە ژیان ئالۆز دەکەن گەر خودا بە درێژایی کات لەگەلتدا بێت، ئیدی بۆچی منەی دەکەیت؟".

شەمسی تەوریزی سەری بەردایەوە و لە فکران راچوو و ساتێ بێدەنگ بوو. کە دووبارە سەری هەلبڕی، ڕوخساری هێمن و دەنگی هاوسەنگ بوو، وتی: "لەگەل ئەوەی ئاکری بە گەران بیدۆزیتەوە، تەنها ئەوانەی لێی دەگەرێن دەتوانن بیدۆزنەوە".

"نای ئەمە چ گەمەکردنێکە بە وشە". دادوەرەکە بە شۆخییەوە ئەمەی وت: "ئایا دەتەوێ بلێیت کە ئێمە بە درێژایی ژیانمان گەر لە هەمان شوێن ماینەوە، ئەوا ناتوانین خودا بدۆزینەوە؟ خۆ نابێت بنیادەم وەک تۆ جلی دراو لە بەر بکات و لە رێگەوبانان بسووڕێتەوە!".

بەدوای ئەو قسەیەدا شەپۆلیک پێکەنین بەرزبووەوە، چونکە وا دیابوو کە هەموو ئامادەبووان بە بۆچوونەکەی دادوەرەکە قایلن. قاقایەکی بەرز لەو کەسانەوە بەرزبووەوە کە ڕاهاتبوون مەرایی بۆ کەسانیکی لە خۆیان پلەبالاتر بکەن. هەستم بە تەنگەتاوی کرد و بۆم ڕوونبووەوە کە بیروکەی پێکەوەکریدانی دادوەر و دەرویش، بیروکەیەکی باش نەبوو. دەرویشەکە گوتی: 'ڕەنگە خراپ لە من گەیشتبیت. من لە قسەکەمدا مەبەستم ئەوە نەبوو گەر مرۆڤ لە شوێنی زایندەی خۆی مایەوە، ناتوانێت خودا بدۆزێتەوە. بێگومان ئەمە دەبیت و هەندی کەس قەت سەفەریان نەکردووە، لەگەل ئەوەشدا دنیایان بینیوە'.

'دەق وایە'، دادوەرەکە وەک سەرکەوتوویەک ئەمەی گوت و زەردەخەنەیەکی بەرین لەسەر ڕوخساری نەخشا، بەلام دوای ئەوەی قسەی دەرویشەکەی بیست، زەردەخەنەکەی ڕەوییەوە.

'هۆ دادوەر، لە قسەکەمدا مەبەستم ئەوە بوو، گەر مرۆڤ بەردەوام فەروە و جلوبەرگی ئاوریشم و زیرەوزەبەری گرانبەهای وەک ئەوەی تۆی لە بەر بێت، ئەوا ناتوانێت خودا بدۆزێتەوە'.

خامۆشییەکی سامناک بالی بەسەر ژوورەکەدا کیشا و دەوروبەرمان هەناسەی لەبەر برا. ئیدی وەک ئەوەی چاوەڕێی ڕوودانی شتیکی گەورەتر، بەریەککەوتنێکی زۆرتربین، نازانم بۆ هەموومان هەناسەی خۆمان قەتیس کردبوو.

دادوەرەکە وتی: 'ئەم زماندرێژییە لە دەرویشێک ناوەشێتەوە'.

'کاتی هەست بکەم کە دەبیت شتێک بلێم، ئەوا تەنانەت گەر هەموو دنیا ناقرگەم بگرێت و داوام لی بکات بیدەنگ بم، بیدەنگ نابم'.

کە دادوەرەکە ئەوەی بیست، دەموچاوی تێک نا، بەلام بە شۆخییەوە شانەکانی هەلتەکاند و وتی: 'چونت گەرەکە با وابێت. لە هەموو بارێکدا تۆ ئەو پیاوەی کە ئێمە پێویستمانە. ئێمە باسی نایابیی شارەکەمان دەکرد. بێگومان تۆ شوێنانی زۆرت دیوە. ئایا شوێنێک لە بەغدا جوانتر هەیە؟'.

شەمس بە هێمنی یەکە یەکە چاوی بە پیاوەکاندا گێرا، ئینجا گوتی: 'کەس لاریی لەوە نییە کە بەغدا شارێکی نایابە، بەلام لەسەر ڕووی زەوی جوانییەک

نییە هەتاهەتـایە بەردەوام بێت، چـونکە شـارەکان لەسـەر کـوڵەکەی ڕۆحـی وەستاون و مینا چەند ئاوێنەیەکی گەورە دڵی دانیشتوانەکانیان پیشان دەدەن، گەر ئەم دڵانە تاریکداهاتن و بڕوایان لەدەست دا، ئەوا درەوشانەوە و بەهایان لەدەست دەدەن. ئەوە بەسەر زۆر شاردا هاتووە و بەردەوامیش ڕوودەدات".

جگە لەوەی سەرم بابدەم، نەمتوانی هیچ بکەم. شەمسی تەورێزی بە لای مندا ئاوڕی دایەوە و کەمەکێ بیری ڕۆیشت، دۆستانە چاوەکانی پرووکاند و هەسـتم کـرد چاوەکـانی چـون خـۆرێکی سـووتێنەر دایـساون. ئیـدی بـۆم ڕوونبـووەوە کە بە لێهـاتوویییەوە شـایانی نـاوەکەی خۆیەتی. ئـاخر ئەو پیـاوە بەجۆش و چالاکی و درەوشانەوەیەوە لە ناوەوەی خۆیدا وەک تۆپەڵە ئاگرێک دەسووتا. بەڕاستی شەمس (خۆرێک) بوو بۆ خۆی.

بەڵام بۆچـوونی دادوەرەکە جیـاواز بـوو. ئەوەبـوو گـوتی: "ئێـوەی سـۆفییەکان بە چەشـنی فەیلەسـووفەکان و شـاعیرەکان، شـتەکان زۆر ئـاڵۆز دەکەن! چ پێویست بەم هەمـوو وشانە دەکات؟ مرۆڤ بوونەوەری سادەن و پێداویستییەکانیـشیان هەر سـادەن. ئەوەی دەکەوێـتە سـتۆی سـەرکردەکان ئەوەیە بەدەم داواکارییەکانیـانەوە بچن و هەوڵبدەن گومڕا نەبن و لە ڕێگەی ڕاست لانەدەن، ئەمەش وا دەخوازێت شەریعەت بە وردی جێبەجێ بکرێ".

شەمسی تەورێزی وتی: "شەریعەت مینـا مۆمە، ڕووناکییەکمـان بۆ دابین دەکـات نرخـی تەواو نابێت، لـێ گەرەکە بیرمـان نەچێت کە مـۆم یارمەتیمـان دەدات تا لە تاریکیدا لە شوێنێکەوە بۆ شـوێنێکی تر بچین. خۆ ئەگەر بیرمـان چـوو کە ئـێمە بـۆ کـوێ دەچـین و تەنهـا چاومـان بـڕییە مـۆمەکە، ئیـدی چ سوودێکی هەیە؟ ".

دادوەرەکە بە زەردەخەنەیەک لالێوەکانی کشان و دەموچاوی وێکهاتەوە. شـەپۆلێکی پەژارە بە جەسـتەمدا تێـپەڕی. ئـاخر چـوونە نێـو گفتوگـۆیەک دەربارەی گرینگیی شەریعەت، ئینجا لەگەڵ پیاوێکیشدا ئەرکەکەی وا بخوازێت فەرمانداری خەڵکی بکات و زۆر جاریش هەر بەپێی شـەریعەت سزایان بدات، مەلەکردنێکە لە ئاوێکی ترسناکدا. تۆ بڵێیت شەمس ئەمە نەزانێت؟

لە کاتێکدا لە بیانگێکی گونجاو دەگەڕام تا دەروێشەکە لە ژوورەکە ببەمە دەرەوە، گوێم لێ بوو دەڵێت: "ڕێسایەک هەیە بەسەر ئەم دۆخەدا جێبەجێ دەبێت".

دادوەرەکە بە گومانەوە پرسیی: "چ ڕێسایەک؟".

شەمسی تەورێزی وەک ئەوەی کتێبێکی نادیار بخوێنێتەوە، ڕاست ڕاوەستا و چاوەکانی جێگیر کرد و گوتی:

**(هەر خوێنەرێکی قورئانی پیرۆز بەگوێرەی قووڵیی تێگەیشتنی بە ئاستی جیاواز تێی دەگات. چوار ئاستی تێگەیشتن هەیە: ئاستی یەکەم لە واتای دەرەکی خۆ دەنوێنێت، ئەمەش واتایەکە هەموو خەڵکی قنیاتی پێدەکەن، ئینجا ئاستی ناوەکی "باتینی" دێت، لەئاستی سێیەمدا ناوەوەی ناوەکی دێت، بەڵام ئاستی چوارەم قووڵاییە و ناکرێ بە وشە دەرببڕدرێ، بۆیە وەسپکردنی هەستەمە).**

شەمس بە دوو چاوی درەوشاوەوە لەسەری ڕۆیشت: "بەڵام ئەو زانایانەی کە پێ لەسەر شەریعەت دادەگرن، ئەوانە تەنها واتای دەرەکی دەزانن، هەرچی سۆفییەکانیشن واتای باتینی دەزانن، بەڵام وەلی و پیاوچاکان ئەوانەن کە ناوەوەی ناوەکی دەزانن. لە کاتێکدا تەنها پێغەمبەران و پیاوچاکان و نزیکانی خودا ئاستی چوارەم دەزانن.".

("ئایا مەبەستت ئەوەیە کە سۆفییەکی خواسایی لە زانایەکی شەریعەت پتر لە قورئان تێدەگات؟"، دادوەرەکە بەدەم پرسیارکردنەوە بە پەنجەکانی لە قاپە فەخفوورییەکەی دەدا.

زەردەخەنەیەکی کاڵ و شۆخیئامێز لەسەر لێوەکانی دەروێشەکە نەخش بوو، بەڵام پاسووخی نەدایەوە.

"هێی برادەر، وریابە"، دادوەرەکە گوتی: "لە نێوان قسەکانی تۆ و کفرکردنێکی تەواودا داوێکی باریک هەیە".

خۆ ئەگەر لەم وشانەدا هەڕەشەیەکی شاراوە هەبوویێت، وا دیارە دەروێشەکە ئاگای لێ نەبووە، پرسیی: "بە دیاریکراوی کفری تەواو چییە؟"، دوای ئەوەی هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا، لەسەری ڕۆیشت: "ڕێگەم بدە با چیرۆکێکت بۆ بگێڕمەوە".

ئەمەش چیرۆکەکەیە کە بۆی گێراینەوە:

ڕۆژێکیان موسا لە چیاکاندا بە تەنها دەڕۆیشت، کاتێ شوانێکی لە دوورەوە بینی. شوانەکە لەسەر هەردوو ئەژنۆی بە چۆکدا هاتبوو و هەردوو دەستی بەرەو ئاسمان بەرزکردبووەوە. موسا لە خۆشیان شاگەشکە بوو، وەلێ کاتێ لێی نزیکبووەوە و گوێی لێ بوو شوانەکە نوێژدەکات، سەری سوڕما.

"هۆ خودای خۆشەویستم، من لەوە زیاتر خۆشتم گەرەکە کە خۆت دەیزانیت. لەپای تۆدا هەر چتێک بێت دەیکەم، تەنها پێم بێژە تۆ چیت گەرەکە. خۆ ئەگەر داوام لێ بکەیت، ئەوا لەپای تۆدا قەڵەوترین بەرخی ناو ڕانەکەم سەردەبڕم، دەیبرژێنم و بە ڕۆنی دونگەکەی برنج لێدەنێم تا تامی بەلەزەت بێت".

موسا لە شوانەکە نزیکبوودوە تا باشتر گوێی لێ بگرێت.

"ئینجا هەردوو پات دەشۆم و گوێچکەکانت پاکدەکەمەوە و ئەسپێت لێدەدوزم. ئاخر بەم تەرحە تۆم خۆش گەرەکە".

کە موسا ئەوەی بیست، بانگی شوانەکەی کرد و نوێژەکەی پێ بڕی و گوتی: "هەی پیاوی نەفام بووەستە! ئەوە تۆ پێت وایە چی دەکەیت؟ پێت وایە کە خودا برنج دەخوات؟ ئایا لەو باوەڕەدایت کە خودا دوو پێی هەیە تا بیانشۆیت؟ ئەمە نوێژ نییە، بەڵکو کفرێکی تەواوە".

شوانەکە کە تووشی سەرسوڕمان و شەرمەزاری بووبوو، تەوازۆی بۆ خواستەوە و بەڵێنی پێ دا کە وەک خواپەرستان نوێژ بکات. ئیدی موسا هەر عەسری ئەو ڕۆژە فێری نوێژی کرد و بە ڕەزامەندییەوە بە ڕێگەی خۆیدا ڕۆیشت.

هەر لەو شەوەدا موسا دەنگێکی بیست. دەنگی خودا بوو.

(هۆ موسا، ئەوە تۆ چیت کرد؟ تۆ ئەو شوانە داماوەت سەرکۆنە کرد و ئاگات لەوە نییە چەند لای من ڕێزی هەیە، ڕەنگە بە شێوازێکی دروست نوێژی نەکردبێت، بەڵام لەوەی دەیڵێت ڕاستگۆیە. دڵی پاکە و نیازی باشە. من لەو ڕازیم، ڕەنگە لە گوێی تۆدا وشەکانی کفر بن، بەڵام بە لای منەوە کفری شیرینن).

موسا دەسبەجێ لە هەڵەکەی خۆی گەیشت. بەیانیی ڕۆژی دواتر بەرەو چیاکان گەڕایەوە تا لە شوانەکە بگەڕێت. کە دۆزییەوە خەریکی نوێژکردن بوو، بەڵام ئەم جارە بەو شێوازە نوێژی دەکرد کە فێری کردبوو. جا بۆ ئەوەی نوێژەکەی بە دروستی بکات، دەمی تێکدەئالا و ئەو جۆش و سۆزەی جارانی نەمابوو. موسا لەو کارەی کە کردبووی ژیوانبووەوە و دەستی خستە سەر شانی شوانەکە و وتی: "هاوڕێم، من هەڵەم کرد. تکات لێدەکەم کە لێم خۆش بیت و وەک چۆن لەمەوبەر نوێژت دەکرد، هەر ئاوها نوێژبکە، چونکە نوێژەکەت لە لای خودا بەنرخ و دەگمەن بوو".

کە شوانەکە ئەوەی بیست، هەستی بە ئاسوودەییەکی قووڵتر کرد، کەچی نەیدەویست بگەڕێتەوە سەر نوێژەکەی جارانی و خۆیشی بەو نوێژە دروستەش وابەستە نەکرد کە موسا فێری کردبوو. ئەمیستا ئەو ڕێگەیەکی تازەی بۆ بەردەوامبوون لەگەڵ خودادا دۆزیبووەوە و بە بڕوا ساکارەکەی خۆی قایل و بەختەوەر بوو، چونکە ئێستا ئەو قۆناغەی تێپەڕاندبوو – قۆناغی دوای کفرە شیرینەکەی.

شەمس کۆتایی بە چیرۆکەکەی هێنا و وتی: "وەک دەبینی، بڕیار لەسەر ئەو شێوازە نادرێ کە خەڵکی لەگەڵ خودادا پەیوەست دەکات، هەر کەسێ شێوازی خۆی و نوێژی تایبەتی خۆی هەیە. خودا لەسەر وشەکانمان سزامان نادات، بەڵکو تەماشای قووڵایی دڵمان دەکات. ڕێوڕەسم و سرووت نامانکەن بە بڕوادار، بەڵکو ئەوە دڵمانە بێگەردە یان نا".

دیقەتی دەموچاوی دادوەرەکەم دا. بینیم لەبن دەمامکی بڕوابەخۆبوون و هێمنییە ڕەهاکەیەوە، بێزارییەکی توند سەرەتاتکێ دەکات. لەبەر ئەوەی پیاوێکی زیرەک بوو، هەستی کرد کە لە دۆخێکی سەخت و ناسکدایە. گەر وەڵامی چیرۆکەکەی شەمسی تەوریزی بدابایەوە، ئەوا دەبوو هەنگاوێکی دیکە هەڵبنێت و بەوای بێچاوڕوویییەکەیەوە سزای بدات، ئاوهاش شتەکان خراپتر دەبوون، چونکە هەموان بیستیان کە دەروێشێکی خواسایی لە بەردەم سەرۆکی دادوەران پەتی پساندووە، بۆیە بە باشی زانی کە خۆی وا پیشان بدات هیچ شتێ بێزاری نەکردووە و واز لە شتەکە بێنێت.

لە دەرەوە خۆر ڕووی لە ئاوابوون بوو، ئاسمان ڕەنگی سێبەرێکی سوورئامالّی لێ نیشتبوو، ناوبەناو هەورێکی خۆڵەمێشیی تاریک بەری دەگرت. دوای کەمێ دادوەرەکە هەستایە سەر پێ و گوتی کە چەندین کاری گرینگی لە پێشە و دەبێ جێبەجێیان بکات.

دوای ئەوەی سووکە ئاماژەیەیەکی بۆ کردم و نیگایەکی ساردوسڕی شەمسی تەورێزیی کرد، بێ ئەوەی شتێ بڵێت، چووە دەرەوە و پیاوەکانی دوایکەوتن.

"پێم وایە کە دادوەرەکە زۆر خۆشی پێتدا نەهات"، دوای ئەوەی هەموان ڕۆیشتن وام بە شەمس گوت.

شەمسی تەورێزی قژەکەی لەسەر دەموچاوی دوورخستەوە و بە زەردەخەنەوە گوتی: "گرینگ نییە، من لەگەڵ ئەو کەسانەی کە خۆشیان ناوێم، ڕاهاتووم".

هەستێکی ورووژاو دایگرتم. لەبەر ئەوەی دەمێکە من بەرپرسی ئەم تەکییەم، بۆیە دەزانم میوانێکی ئاوها زۆر ڕوو ناکاتە ئەم تەکییە.

پێم گوت: "دەروێش، پێم بڵێ کەسێکی وەک تۆ چ شتێ تۆی بۆ بەغدا هێنا؟".

پەرۆش بووم وەڵامەکەی بژنەوم، وەلێ بە شێوەیەکی سەیر هەستم کرد سڵی لێ دەکەمەوە.

# ئێلا

## نۆرتامبتۆن، ٢٠ی ئایاری ٢٠٠٨

بۆ شەوێ ئێلا کە شووەکەی بۆ ماڵ نەگەڕایەوە، لە خەوندا چەند ژنەسەماکەرێکی ڕۆژهەڵاتیی بینی، سەمایان دەکرد، دەروێشگەلێکی بینی بە دەوری خۆیاندا دەسووڕانەوە، هاوکات لە یەکێ لە خانەکانی سەر ڕێگە ژمارەیەک لە جەنگاوەری توندوتیژی بینی، نانیان دەخوارد و قاپەکانیان پڕبوو لە ناسکەنان و شیرینیی بەلەزەت.

ئینجا لە وڵاتێکی بیانیدا لە بازاڕێکی جەنجاڵ و پڕ جووڵە و چالاکی قەڵایەکدا خۆی بینی لە کەسێک دەگەڕێت، خەڵکەکە وەک ئەوەی لەسەر ڕیتم و ئاوازێکی نەبیستراو سەما بکەن، لەسەرخۆ بە دەوریدا دەجووڵێنەوە. پیاوێکی قەڵەو و سمێڵشۆڕی ڕاگرت تا دەربارەی شتێ پرسیاری لێ بکات، وەلێ لە یادی نییە چ پرسیارێکی لێکرد. پیاوەکە بە مۆنی تەماشای کرد و دوورکەوتەوە. هەوڵی دا لەگەڵ ژمارەیەک لە فرۆشیار و هاتوچۆکەرانی ناو بازاڕەکە قسە بکات، لێ کەسێ وەڵامی نەدایەوە. یەکەم جار وای بە بیردا هات هۆیەکەی ئەوەیە کە ئەو بە زمانی ئەوان قسەی نەکردووە، ئینجا دەستی خستە سەر زاری و بە ترسەوە زانیی کە زمانی براوە، بە ترسێکی زۆرترەوە دیقەتی دەوروبەری خۆی دا و مەنەی ئاوێنەیەکی کرد تا وێنەی خۆی تێدا ببینێت و دڵنیا بێت کە هێشتا هەر خۆیەتی. لەبەر ئەوەی لە بازاڕەکەدا ئاوێنە نەبوو، دەستی بە گریان کرد و بە دەنگێکی بێزارکەر بێداربووەوە و نەیدەزانی ئاخۆ هێشتا زمانی هەیە، یان نا.

کاتێ ئێلا چاوەکانی کردەوە، بینیی (سپیریت) وەک هاربوویەک چرنۆک لە دەرگای پشتەوە دەدات، ڕەنگە گیاندارێک هاتبێتە نێو باڵکۆنەکەوە و وای لە

سەگەکە کردبێت ئاوها شێلگیرانە بوەڕێت، چونکە دەڵەکەکان زۆر دەیانشلەژاند و هێشتا شەڕەکەی زستانی ڕابردووی لە یاد ماوە کە لەگەڵ یەکێ لە دەڵەکەکان کردی. ئێلا سەگەکەی لە حەوزێکی پڕ دۆشاوی تەماتە نوقم دەکرد، چونکە بۆنەکە لە بۆنی لاستیکی سووتاو دەچوو و بنبڕ نەدەبوو، ئیدی تا دوای چەند هەفتەیەک ئینجا دەیتوانی ئەو بۆنە بۆگەنە لە سەگەکە ببڕێت.

ئێلا تەماشای سەعاتی سەر دیوارەکەی کرد. سەعات سێ چارەک کەمی بەیانی بوو. دەیڤید نەگەڕابووەوە، ڕەنگە قەت نەگەڕێتەوە. جانێت وەڵامی تەلیفۆنەکەی نەدایەوە و ئێلا لەم دۆخە ڕەشبینییەیدا دڵنیا نەبوو کە وەڵامی دەداتەوە. ترسی ئەوەی لێ نیشت کە شووەکەی و کچەکەی وازیان لێی هێنابێت و جێیان هێشتبێت. یەخچاڵەکەی کردەوە و چەند خولەکێک تەماشای ناوی کرد. حەزەکەی ئاگاداری کردەوە تا کێشی زیاد نەبێت، گەرەکە کەمێ هەولبدات واز لە خواردنی مۆتەی ڤانێلای گێلاس بێنێت. کەمێ بە توندی دەرگای یەخچاڵەکەی پێوە دا و لێی دوورکەوتەوە.

ئێلا شووشەیەکی شەرابی سووری کردەوە و پەرداخێکی بۆ خۆی تێکرد، شەرابێکی نایاب و سووک و بووژێنەرەوە بوو، تامێکی تاڵ و شیرینی دەدا کە حەزی لێدەکرد. لەو دەمەیدا کە پەرداخی دووەمی پڕ دەکردەوە، وای بە خەیاڵدا هات کە ڕەنگە یەکێ لەو شووشە شەرابی بۆردۆ گرانبەهایەی هەڵپچڕیبێت کە دەیڤید دەیانهێنێت. نووسراوە پێوەلکاوەکەی سەر شووشەکەی خوێندەوە شاتو مارگۆ ١٩٩٦ . نەیزانی بەرانبەر ئەوە چی بکات، ئیدی بە گرژییەوە تەماشایەکی شووشەکەی کرد.

ماندوو بوو و هەستی کرد وەنەوز دەدات، ئیتر نەیدەتوانی لەوە زیاتر بخوێنێتەوە، بۆیە بڕیاری دا کە پۆستە ئەلیکترۆنییەکەی بخوێنێتەوە، شەش نامەی ئەلیکترۆنیی کەمبایەخ هەبوون، نامەیەک لە مێشێلەوەیە و دەربارەی دەستنووسەکە لێی دەپرسێت کە ئاخۆ کارەکە چۆن دەڕوات، نامەیەکی ئەلیکترۆنیی تریشی بینی کە لە عەزیز. ز. زاهاراوە بوو.

ئێلای ئازیز (گەر بۆم هەبێت کە وات پێ بڵێم)،

ئەوکاتەی نامەکەتم خوێندەوە، لە گوندێک لە گوندەکانی گواتیمالا بە ناوی مومۆستینانگۆ بووم، کە یەکێکە لە پاشماوەی ئەو شتە دەگمەنانەی کە

دانیشتوانەکەی هێشتا ڕۆژژمێری گەلی ئەلمایا بەکار دێنن. لە بەرانبەر ئەو هۆتێلەی کە لێی دەمێنمەوە، درەختی ئاوات چەقێنراوە، کە بە سەدان پارچە قوماشی هەمەڕەنگ و هەمەشێوە ڕازێنراوەتەوە کە دەتوانیت وێنای بکەیت. خۆیان پێی دەڵێن (درەختی خاوەن دڵەڕەنجاوەکان). خەڵکی لەسەر پەڕەکاغەز ناوی خۆیان دەنووسن و بە لقەکانی درەختەکەدا هەڵیدەواسن و لەپای چاکبوونەوەی دڵەڕەنجاوەکانیان لە خودا دەپاڕێنەوە.

تکایە ئەم قسەیەم بە جۆرێ لە بێ چاوورووییی نەزانیت. وەلێ دوای ئەوەی نامە ئەلیکترۆنییەکەتم خوێندەوە، ڕووم کردە درەختی ئاوات و بۆ تۆ نزام کرد تا لەو بەدحاڵیبوونەی نێوان خۆت و کچەکەت، بگەیتە چارەسەرێک. ئاخر دەبێت تەنانەت ڕێز لە گەردیلەیەک خۆشەویستی بگیرێت، چونکە وەک ڕۆمی وتوویەتی، خۆشەویستی ئاوی ژیانە.

ڕێگەم بدە پێت بڵێم کە لە ڕابردوودا یەکێک لەو شتانەی بە تایبەتی یارمەتیی دام، ئەوە بوو کاتێ نەمدەتوانی خەڵکی بگۆڕم، هەستم بە نائومێدی دەکرد، بەڵام وازم لەوە هێنا کە خۆم لە کاروباری دەوروبەرم هەڵبقورتێنم. کەواتە لەبری خۆتێهەڵقورتاندن یان خراپەکاری، ئایا بۆم هەیە پێشنیاری ددانپێدانان بکەم؟

هەندێ بە هەڵەدا دەچن کاتێ لە نێوان (ددانپێدانان) و (لاوازی) تێکەڵییەک دروست دەکەن. ددانپێدانان بە مەرجە گەردوونییەکەی شێوەیەکە لە شێوەکانی قەبوولکردنی ئاشتییانە، بە تایبەتی ئەو شتانەی کە ناتوانین بیانگۆڕین، یان ئەمێستا تێیانناگەین.

بەگوێرەی ڕۆژژمێری گەلی ئەلمایا، ئەمڕۆ بە ڕۆژێکی پیرۆز دادەنرێ. گۆڕانێکی گەردوونناسیی سەرەکیی تێدەکەیت، کە مزگێنیی وشیاریی مرۆڤێنی نوێ دەبەخشێت. دەبێ پێش ڕۆژاوابوون و کۆتایی ڕۆژەکە پەلە لە ناردنی ئەم نامە ئەلیکترۆنییە بۆ تۆ بکەم.

هیوادارم خۆشەویستی لە کاتێکی چاوەڕواننەکراودا بتدۆزێتەوە.

دڵسۆزت

عەزیز

ئێلا کۆمپیوتەرە دەستییەکەی داخست، کە زانیی لە شوێنێکی دووری دنیا کەسێکی نەناس هەیە و لەپای ئەو و لەپای بەختەوەریی ئەودا نزا دەکات، خۆشنوودییەک سەراپای گرتەوە. چاوەکانی نوقاند و بیری لە ناوی خۆی کردەوە کە لەسەر پارچەکاغەزێک نووسراوە و بەقەد لقێکی درەختی ئاواتەکانەوە وەک کۆلارەیەکی کاغەزین شۆڕبووەتەوە و بە ئازادی و شادمانی لە هەوادا دەشەکێتەوە.

دوای چەند خولەکێک، دەرگای نان‌دینەکەی کردەوە و بەرەو حەوشەی پشتەوە ڕۆیشت، تا چێژ لە هەوای سارد و سازگار وەربگرێت. بە تەنیشتییەوە (سپیریت) بە شڵەژاوییەوە وەستابوو و دەوەڕی. چاوەکانی سەگەکە بچووکبوونەوە، ئینجا بە پەژارەوە کرانەوە، وەک ئەوەی لە دوورەوە هەستی بە شتێکی ترسناک کردبێت، گوێیەکانی قوتکردەوە. ئێلا و سەگەکەی لەبەر تریفەی مانگی کۆتایی بەهاردا بە تەنیشت یەکەوە وەستابوون و چاویان بڕیبووە تاریکایی چڕ و بێکۆتایی، لەو شتانە دەترسان کە لە تاریکیدا دەجووڵانەوە، لە نادیارێک دەترسان.

## فەقێکە

### بەغدا، نیسانی ١٢٤٢

بە ئیکلامێکی زۆرەوە، دادوەرەکەم گەیاندە دەرگا، بە پەلە بۆ ژووری دانیشتن گەڕامەوە تا قاپە پیسەکان کۆبکەمەوە، بەڵام بە بینینی باوە زەمان و دەروێشەکە واقم وڕما، وەک چۆن بە بێدەنگی جێم هێشتبوون، هیچیان قسەی نەدەکرد. بەتیل چاو دەستم بە چاودێریکردنیان کرد، لە خۆم پرسی ئایا دەکرێ دوو کەس بەبێ ئەوەی دەم هەڵێنن، پێکەوە قسان بکەن. لەسەر خۆ دەبزوام، سەرینەکانم ڕێکدەخست، ژوورەکەم پاکدەکردەوە، وردەنانم لەسەر فەرشەکە هەڵدەگرت، ئینجا هەستم کرد ئیدی هۆیەک نییە ببێتە وای مانەوم.

بە خاووخلیچکی و لەسەرخۆ، پێیەکانم بەرەو ناندینەکە بکێشیان کردم. چێشتلێنەرەکە هەر ئەوەندە چاوی پێکەوتم، ڕیزێ فەرمانی پێدام: (مێزەکە پاکبکەوە، زەوییەکە پاکبکەوە! قاپەکان بشۆ! تۆزی ئاگردان و دیوارەکانی دەوری بــــرژێنەرەکە بتەکێـــنە. کە ئەوانەت تەواو کـــرد، بیـــرت نەچێـــت تەڵەمشکەکان سەح بکەیتەوە). شەش مانگە لەوەتەی پێم ناوەتە نێو ئەم تەکییەوە چێشتلێنەرەکە بە شێوەیەکی خراپ مامەڵەم لەگەڵدا دەکات. ڕۆژانە زۆرم لێدەکات وەکو سەگ کار بکەم، پێی دەوتم کە گوایە ئەم شێوە ئازاردانەم بەشێکە لە مەشقی ڕۆحی، وەک ئەوەی شتنی ئەو قاپانەی کە توێژێ چەورییان پێوەیە مەشقی ڕۆحی بێت.

چێشتلێنەرەکە پیاوێکی کەمدوو بوو و ئەم دەربڕینەی لێ خۆش هاتبوو: (پاکی نوێژە و نوێژ پاکییە).

جارێکیان زاتم کرد و گوتم: "گەر ئەوە ڕاست بێت، ئەوا هەموو کابانانی ماڵان لە بەغدا دەبوون بە ڕابەری ڕۆحی".

کەوچکێکی تێکرتم و سەری شکاندم و بە هەموو دەنگییەوە هاواری دەکرد: 'کوڕم، ئەوەی دەیلێم گەر بەرپەرچم بدەیتەوە، هیچ دادیکت نادات. کەر بتەوی ببیتە دەروێش، دەبێ وەک ئەم کەوچکە دارە بێدەنگ بیت. سەرسەختی و یاخیبوون سوخەتی ئەقینی باش نین. چەند قسە کەم بکەیت، زووتر پێدەگەیت'.

رقم لە چێشتلێنەرەکە دەبووەوە و لێیشی دەترسام. قەت فەرمانەکانیم رەت نەدەکردەوە. ئیدی تا ئەم ئێوارەیە شتەکە وابوو.

هەر ئەوەندە چێشتلێنەرەکە پشتی تێکردم، دزەم کرد و لە ناندینەکە دەرچووم، لەسەر نووکی پەنجەکانم بەرەو ژووری میوان بەشوێن خۆمدا گەڕامەوە. دەربارەی ئەم دەروێشە گەڕیدەیە پەرۆشی زانیاریی زیاتر بووم. ئەو کێیە؟ لێرە چی دەکات؟ لە دەروێشەکانی تری تەکێ ناچێت. چاوەکانی تەنانەت لە کاتی سەرداخستنی ئاساییدا سەخت و یاخی دەنوێنن. شتێکی نائاسایی وای تێدا بوو لە مەزەندە بەدەر بوو. شتێک ڕەنگە ترسناک بێت.

بە ئەڵهاوە لە درزی دەرگاکەوە دیقەتم دەدا. لە سەرەتادا نەمتوانی هیچ ببینم، لێ ئەوەندەی نەبرد چاوەکانم لەگەڵ نیمچە تاریکیی ژوورەکە ڕاهاتن و دەموچاوی هەردووکیان دەرکەوت.

گوێم لێ بوو سەید پرسیاری لێدەکات: 'شەمسی تەوریزی، ئەوە چی بوو کەسێکی وەک تۆی بۆ بەغدا هێنا؟ ئایا ئێرەت لە یەکێ لە خەونەکانتدا دیوە؟'.

دەروێشەکە سەری بادا و وتی: 'نەخێر، ئەوەی منی بۆ بەغدا هێنا خەون نەبوو، بەڵکو دیدگا بوو. من خەون نابینم'.

(هەمووان خەون دەبینن)، باوەزەمان بە ناسکییەوە ئەمەی گوت، (ڕەنگە بەردەوام لەبیرت نەمێنن، وەلێ ئەمە وا ناگەیەنێت کە تۆ خەون نابینیت).

دەروێشەکە بە پێداگرییەوە وتی: 'بەڵام من خەون نابینم: ئەمە بەشێکە لە پەیمانی نێوان من و خودا. کە منداڵ بووم، فریشتەکان و نهێنییەکانی گەردوون لە بەرچاوم دیار بوون. کە ئەوەم بە ئایبابم وت، تووڕە بوون و داوایان لێکردم واز لە خەونبینین بینم. کاتێ ئەوەم بە هاوڕێکانم وت، ئەوانیش گوتیان کە من خەونبینێکی ڕەنجبەخەسارم. هەوڵم دا کە ئەوە بە مامۆستاکانم بڵێم، کەچی وەڵامەکانیان جیاواز نەبوو. لە کۆتاییدا زانیم کە خەڵکی شتێکی

نائاسایی دەبیستن، ناوی لێدەنێن خەون، بۆیە وام لێهات ڕقم لە وشەی خەون و خەونبینینیش دەبووەوە".

دەروێشەکە وەک ئەوەی لەپڕ دەنگێکی بیستبێت، وازی لە قسەکردن هێنا، لە دواییدا شتێکی سەیر ڕووی دا. هەستایە سەر پێ و بە سەنگینی و ئارامییەوە بەرەو دەرگاکە بۆ لای من هات و تەماشای دەکرد. وەک ئەوەی لەمیانەی دەرگا دارەکەوە شت ببینێ، پێدەچوو بزانێت من خۆم لێ داگرتوون.

دڵم بە توندی کەوتە خورپە. ویستم بڕۆم و بەرەو ناندینەکە بگەڕێمەوە، لێ نەمزانی چۆن ئەوە بکەم. قۆڵەکانم و هەردوو لاقم و هەموو جەستەم وشک بوون. لە پشت و لەمیانەی دەرگاکەوە، چاوە نادیارەکانی شەمسی تەورێزی تەماشایان دەکردم.

ترسێکی زۆرم لێ نیشت، هەستم کرد هێزێکی گەورە بە جەستەمدا دەگەڕێت. نزیککەوتەوە و دەستی خستە سەر دەسکی دەرگاکە، وەلێ هەر ئەوکاتە وای بۆچووم کە دەرگاکە دەکاتەوە و دەمگرێت، وەستا. لەم مەودا کەمەوە دەموچاویم نەبینی و نەمزانی چ شتێ وای لێکرد کە ڕابوەستێت. بە شێوەیەکی تواناپڕووکێن دوو خولەکی دووروودرێژ چاوەڕێمان کرد، ئینجا وەرسووڕا. کە لە دەرگاکە دوورکەوتەوە، لەسەر گێڕانەوەی چیرۆکەکەی ڕۆیشت:

"کە کەمێ گەورەبووم، جا بۆ ئەوەی هەر کاتێ تووشی خەونبینین بووم وا بزانم کە خەون نابینم، داوام لە خودا کرد کە لە خەونبینین بێبەشم بکات. خودا نزاکەمی گیراکرد و خەونبینینی لەکۆڵ کردمەوە. ئاوها ئیدی خەونم نەبینی".

شەمسی تەورێزی بەر لەوەی بڵێت: "خودا توانای خەونبینینی لێ سەندمەوە، بەڵام بەوە قەرەبووی بۆ کردمەوە کە توانای لێکدانەوەی خەونی کەسانی دیکەی پێ بەخشیم. من لێکدەرەوەی خەونانم"، لەتەک پەنجەرە کراوەکانی ژوورەکە وەستا و تەماشای خوناوی بارانەکەی دەکرد و بیری دەکردەوە.

چاوەڕێی ئەوەم دەکرد کە باوەزەمان بەم گاڵتەجاڕییە باوەڕ نەکات و وەک چۆن بە سەرکۆنەکردنی منەوە ماندوو بوو، ئەویش سەرکۆنە بکات.

بەڵام سەید بە ڕێزەوە سەری لەقاند و گوتی: "پێدەچێت تۆ کەسێکی نائاسایی بیت. پێم بڵێ چیت دەوێ تا خزمەتت بکەم".

"نازانم. لە ڕاستیدا، من ئومێدم ئەوە بوو کە تۆ بتوانیت پێم بڵێیت چۆن دەتوانیت یارمەتیم بدەیت".

"مەبەستت چییە؟"، سەید پرسیی و نیشانەی سەرسوڕمان لە دەموچاویدا نەخش بوو.

"من دەروێشێکم و نزیکەی چل ساڵە بە وڵاتاندا دەگەڕێم و شارەزای شێوازەکانی سروشت بووم. هەرچەندە شێوازەکانی کۆمەڵ بۆ من نامۆن، بەڵام گەر پێویست بکات، دەتوانم بەقەد دڕندەیی گیاندارێکی کێوی بجەنگم، بەڵام ناتوانم ئازاری کەسێک بدەم. دەتوانم کەلووەکانی ئاسمان بژمێرم، لە دارستانەکاندا درەختەکان لە یەکتر جیابکەمەوە، وەک کتێبێکی کراوە جۆری کەسەکان دەخوێنمەوە کە خودا لە شێوەی خۆی ئەفراندوونی".

شەمس کەمەکێک وەستا و چاوەڕێی کرد تا سەید فانۆسێکی پێکرد، ئینجا لەسەر وتەکەی بەردەوام بوو، "یەکێ لە ڕێساکان دەڵێت: **لەم گەردوونەدا لەمیانەی هەموو شتێکەوە و لەمیانەی هەموو کەسێکەوە دەتوانیت خودا بخوێنیتەوە، چونکە خودا لە مزگەوت یان لە کەنیسە یان لە کەنێشت قەتیس نییە، لێ تۆ گەر هێشتا بتهەوێ بزانیت عەرشەکەی بە دیاریکراوی لە کوێیە، تەنها یەک شوێن هەیە دەتوانیت تێیدا لێی بگەڕێیت، ئەویش دڵی عاشقێکی ڕاستەقینەیە. ئیدی دوای بینینی ئەو کەسێک ناژی، دوای بینینی ئەو کەسێک نامرێت. ئەوەی بیدۆزێتەوە هەتاهەتایە لەگەڵیدا دەمێنێتەوە**".

لەبەر ئەو تیشکە کز و لەرزۆکەدا، شەمس باڵابەرزتر دیاربوو، پرچەکەی لە شێوەی شەپۆلی نارێکدا بەسەر شانەکانیدا شۆڕبووبووەوە.

"بەڵام زانیاری گەر لە شوێنێکەوە هەڵنەقوڵێت، لە ئاوێکی کەمخوێی بن گۆڵدانێکی کۆن دەچێت. ئەوە ساڵانێکە من داوا لە خودا دەکەم کە هاوەڵێکم بۆ بنێرێت تا ئەو زانیارییەی لەگەڵدا بەش بکەم کە لە ناخی خۆمدا کۆمکردووەتەوە. لە ئەنجامدا کاتێ لە سەمەرقەند بووم هەر لەو ڕوانینەمەوە زانیم کە دەبێ بەدوای ئەو چارەنووسەمدا بۆ بەغدا بێم. من دەزانم تۆ ناوی

هاوەڵەکەم دەزانیت و دەشزانیت لە کوێیە، هەروەها دەزانم کە تۆ ئێستاش نەبێت، لەمەولا هەر پێم دەڵێیت".

لە دەرەوە شەو خەریکبوو باڵی دەکێشا، لەمیانەی پەنجەرە کراوەکانەوە تیرۆژێک لە تیشکی مانگ دزەی دەکرد. زانیم کە درەنگم بەسەردا هاتووە. بێگومان چێشتلێنەرەکە لێم دەگەڕێت، بەڵام گوێم پێ نەدا. بۆ یەکەمین جار بوو هەستم بە بەختەوەری کرد، چونکە گوێڕایەڵیم فەرامۆش کردبوو.

"نازانم جۆری ئەو وەڵامانە چین کە لە من داوایان دەکەیت)، سەید ورەورێکی کرد، "خۆ ئەگەر لە چارەم نووسرابێت زانیارییەک ئاشکرابکەم، دەزانم ئەوە لە کاتی خۆیدا هەر ڕوودەدات. ئیدی تا ئەو کاتە دەتوانیت وەک میوانێک لە لامان بمێنیتەوە".

کە دەروێشە گەڕیدەکە ئەوەی ژنەوت، بە خاکەڕایی و پێزانینەوە داچەمایەوە تا دەستی باوەزەمان ماچ بکات. لەو ساتەدا سەید پرسیارێکی سەیری کرد: "تۆ گوتت ئامادەیت هەموو ئەوەی دەیزانیت پێشکەشی کەسێکی دیکەی بکەیت. دەتهەوێ وەک ئەوەی ڕاستی مرواریيەکی بەنرخ بێت و لەناو دەستتدا ڕایبگریت و پێشکەشی کەسێکی دیاریکراوی بکەیت، بەڵام کەسێک دڵی واڵا بکات تا بەپیریی ڕووناکی ڕۆحییەوە بچێت بۆ هەر مرۆڤێک کارێکی ئاسان نییە. تۆ هەورەبروسکەی خودا دەدزیت. ئەی بەرانبەر بەوە دەتوانیت چ شتێک ببەخشیت؟".

تا لە ژیاندا ماوم وەڵامەکەی ئەو کاتەی دەروێش لە یاد ناکەم. برۆکانی هەڵبڕی و بە دڵنیاییەوە وتی: "من ئامادەم سەری خۆم پێشکەش بکەم".

ترسام، تەزوویەکی سارد بە پشتمدا تێپەڕی. کە گەڕامەوە چاوەکانم خستە سەر درزی دەرگاکە، بینیم کە سەیدیش بە وەڵامەکە ئەبڵەق بووە.

"پێم وایە ئەمڕۆ بەگوێرەی پێویست قسەمان کرد"، باوەزەمان هەناسەیەکی هەڵکێشا و لەسەری ڕۆیشت: "بێگومان تۆ ماندوویت. با بانگی فەقێ لاوەکە بکەم، تا جێی خەوتنت پیشان بدات و پێخەفی پاک و قاپێ شیرت بداتێ".

شەمسی تەورێزی بەرەو دەرگاکە وەرسوڕا و ترسم لێ نیشت نەبادا دووبارە تێم بڕوانێت. وا دیاربوو کە تەماشای دەکردم، نیگاکانی دەرگاکە

دەســـمن و لە بۆشـــایی و ســـووچەکانی ڕۆحـــم ورد دەبێـــتەوە، لەو ڕازانە دەگەڕێت کە تەنانەت لە خۆمیش پەنهانن. لەوەیە جادووی ڕەش بکات، یان لە بەردەستی هـاروت و مـاروت، ئەو دوو فریشتە بـابلییەی کە قورئـان باسـیان دەکـات، مەشـقی کردبێـت، یـان بەهرەیەکـی وای هەیە کە دەتوانێـت لەمیـانەی دەرگا و دیوارەوە شت ببینێت. شتەکە هەرچییەک بێت ئەو ترسـی خستووەتە دڵمەوە.

"پێویست بە بـانگکردنی فەقێکە ناکات"، لەگەڵ قسەکەدا ڕیتمـی دەنگـی تـا دەهـات بەرزدەبـووەوە: "هەسـت دەکەم ئەو لە شـوێنێکی نـزیکە و ڕەنـگە گوێیشی لێمان بووبێت".

هاوارێکی وام لێ هەستا ڕەنگە مردووەکانم لە نێو گۆڕەکانیانەوە بێدار کردبێتەوە. بە ترسێکی بێقەوام ڕاپەڕیم و لەسـەر پێیەکانم وەستام و بەرەو بـاخچەکە ڕامکـرد. لەو تـاریکییەدا لە حەشـارگەیەک دەگەڕام، وەلـێ لەوێ شتێکی کتوپڕی ناخۆش چاوەڕێی دەکردم.

"هەی بچکـۆلی گێـل، کەواتە تـۆ لێرەیـت"، چێشتلێنەرەکە هـاواری کـرد و گسکەکەی دەسـتی ڕادەوەشـاند و بەرەو ڕووم دەهـات: "کـوڕم، تـۆ کێشەت ناوەتەوە، کێشەیەکی گەورە".

لابەلا دەرپەڕیم و دواجار توانیم خۆم لە گسکەکە لابدەم.

چێـشتلێنەرەکە بە هەناسـەبڕکێوە بـانگی کـردم: "بـۆ ئێـرە وەرە، ئەگینـا هەردوو لاقت دەشکێنم".

وەلێ نەچووم و وەک تیـر بـۆ دەرەوەی بـاخەکە دەرپەڕیـم. لەو دەمەدا ڕوخساری شەمـسی تەورێـزی لە بەرچـاوم دەدرەوشـایەوە، بە درێژایـی ئەو ڕێـگە پێچـاوپێچەی کە تەکـێکەی بە ڕێـگە سـەرەکییەکەوە دەبەسـتەوە، هەر ڕامکـرد و ڕامکـرد. تەنـانەت دوای ئەوەی زۆر دووریـش کەوتبـوومەوە، لە ڕاکـردن نەکەوتـم. دڵـم بە تونـدی لێـی دەدا و گەرووم وشـک بووبـوو. هەر ڕامدەکرد تا هەستم بە شلیوونی چۆکەکانم کرد، ئیدی توانای ڕۆیشتنم نەما.

# ئێلا

## نۆرتامپتۆن، ٢١ی ئایاری ٢٠٠٨

بەیانیی ڕۆژی دواتر دەیڤید زوو بۆ ماڵ گەڕایەوە و ئامادەی شەڕ و دەمەقاڵێ بوو، بەڵام سەیری کرد ئێلا لەنێو جێگەکەیدا لە پرخەی خەودایە و دەستنووسی ڕۆمانی (کفری شیرین) لە باوەشیدایە و پەرداخێ بەتاڵی شەراب بە تەنیشتییەوە دانراوە. بەرەو لای ڕۆیشت تا دڵنیا بێت کە بە پەتۆ بچووکەکەی خۆی باش داپۆشیوە، بەڵام زوو نیازەکەی گۆڕی.

دوای دە خولەک ئێلا لە خەو ڕابوو. کاتێ گوێی لێ بوو لەسەر شۆرکەکە خۆی دەشوات، سەری سوڕما. هەرچەندە ئەو لەگەڵ ئافرەتانی تردا سەرجێیی دەکرد و ڕوونیش بوو لەگەڵیاندا شەوی بەسەر دەبرد، بەڵام لەسەر شۆرکی ماڵەکەی خۆیدا نەبوایە، خۆی نەدەشت. کە دەیڤید لە خۆشتن بووەوە و بۆ ژوورەکە گەڕایەوە، ئێلا خۆی کردە خەوتوو تا لە چەندوچوونی نەهاتنەوەکەی خۆی دووربگرێت.

دوای سەعاتێک کەمتر، شووەکەی و هەردوو منداڵەکەی ڕۆیشتن و ئێلا بە تەنها لە ناندینەکە دانیشت. وا دیاربوو کە ژیان گەڕاوەتەوە دۆخی ئاسایی خۆی. ئێلا ئەو کتێبی چێشتلێنانەی کردەوە کە بە لایەوە پەسند بوو (چۆن هونەری چێشتلێنان ئاسان و لەزەتبەخش دەکەیت؟)، دوای ئەوەی لە چەند بابەتێکی هەڵبژاردەی کۆڵییەوە، خواردنێکی هەڵبژارد کە ئامادەکردنی هەندێ قورس بوو، بۆیە هەموو دوانیوەڕۆکە پێوەی مژوول بوو.

شۆربای گوێکە ماسی لەگەڵ زەعفەران، گوێزی هندی، پرتەقاڵی جنراو و قارچک، گژوگیای تازە، پەنیری ڕۆزماری، فاسۆلیای سەوز، سیر و لیمۆی

تێکەڵکراو و زەڵاتەی کەلەرم، ئینجا دەربارەی شیرینی بڕیاری دا: کێکی شکۆلاتە.

چەند هۆکارێک هەبوون وایان لە ئێلا دەکرد کە حەز لە چێشتلێنان بکات، چونکە حەزەکەی هەر ئەوە نەبوو لە چەند کەرەسەیەکی ئاسایی ژەمەخۆراکێکی بەلەزەت ئامادە بکات و دڵی خۆش بێت و هەست بە خۆشحاڵی بکات، بەڵکو کارەکە هەستێکی سەیری دەخستە دڵییەوە، لەوەش گرینگتر خۆی چێژی لە چێشتلێنان دەبینی، چونکە وەک ئەوەی مەژگی ئارام بکاتەوە، حەزی لێ دەکرد و داهێنانی تێدا دەکرد. لە ژیانیدا ناندین تاقە شوێنێک بوو کە لە سایەیدا دەیتوانی لە هەموو دنیای دەرەوە خۆی دووربگرێت و لە ناوەوەیدا ڕەوتی ڕۆژگار بووەستێنێت. بە خۆی دەوت ڕەنگە سێکس هەمان کاریگەریی لەسەر هەندێ کەس هەبێت، وەلێ ئەوە هەمیشە پێویستی بە دوو کەس هەیە، کەچی چێشتلێنان هەموو ئەوەی بنیادەم ئاتاجێتی کات و بایەخدان و کڕینی کۆمەڵێ کەرەسەی لای بەقاڵە.

ئەو کەسانەی لە تەلەڤزیۆن بەرنامە پێشکەش دەکەن ئاماژە بەوە دەدەن کە چێشتلێنان بەندە بە سرووش و ڕەسەنایەتی و داهێنانەوە. وشەی دڵخوازیشیان (ئەزموون)ە. لێ ئێلا لەگەڵ ئەو بۆچوونە نەبوو. بۆچی (ئەزموون) بۆ زاناکان و هونەرمەندەکان جێ ناهێڵرێ! ئاخر چێشتلێنان پەیوەندیی بە شتە بنەڕەتییەکان و ڕەچاوکردنی مۆچیارییەکان و حیکمەتی سەردەمەکانەوە هەیە. ئەوەی لەسەر تۆ پێویستە بیکەیت پەیڕەوکردنی دابە ڕەسەنەکان و بەکارهێنانیانە، نەک ئەزموونکردنیان، چونکە سەرچاوەی لێهاتوویی لە چێشتلێناندا دابونەریتەکانە. هەرچەندە سەردەمی نوێ بەهای ئەم شتانەی کەم کردووەتەوە، بەڵام زیانێکیش لەوەدا نییە کە بنیادەم لە خواردن چێکردندا کۆنەخواز بێت.

هەروەها ئێلا ڕۆژانە گەشەی بە کارە دووبارەبووەکانی دەدا. لە بەیانیی هەموو ڕۆژێکدا، تا ڕادەیەک لە هەمان کاتدا، ئەندامانی خێزانەکەی قاوەڵتی دەکەن، لە پشووی کۆتایی هەفتەدا بۆ هەمان مەڵبەندی بازاڕکردن دەڕۆن، لە یەکەم ڕۆژی یەکشەممەی هەموو مانگێکدا بۆ شێوکردن دراوسێکانیان داوەت دەکەن. لەبەر ئەوەی دەیڤید مژوولی کارەکەی بوو و کاتی بەدەستەوە نەبوو،

ئیدی بەرپرسیاریتیی ماڵەکە کەوتبووە ئەستۆی ئیلا: مشوورخواردن و سەرپەرشتیکردنی دارایی ماڵ، دووبارە دەستپێداهێنان و ڕێکخستنی کەلوپەلەکان، چوونە بازاڕ و دابینکردنی پێویستییەکانی ماڵەکە، ڕێکخستنی چەند خشتەیەک بۆ منداڵەکان و یارمەتیدانیان لە ئەرکەکانی قوتابخانەیاندا و شتی تر. لە ڕۆژانی پێنجشەممووەکاندا بۆ (یانەی تێکەڵکردنی خواردنەکان) دەچوو، لەوێ ئەندامانی یانەکە قاپەخواردنی چەندین وڵاتیان تێکەڵ دەکرد و بە بەهارات و پێکهاتەی نوێ شێوازە کۆنەکانیان تازە دەکردەوە. هەموو ڕۆژانی هەینییەک لە بازاڕی جوتیارەکاندا چەند سەعاتێکی بەسەردەبرد و دەربارەی بەروبوومەکانیان لەگەڵیاندا قسەی دەکرد و دیقەتی ئەو دەفرانەی دەدا کە خۆشاوی قۆخی کەمشەکریان تێدا بوو، یان باشترین شێوازی لێنانی قارچکی پۆرتابیلای قەوارە بچووکی بۆ کڕیارێک ڕاڤە دەکرد. کە بەرەو ماڵ دەڕۆیشتەوە لە ڕیزە دوکانێک ئەوەی بەرچاوی کەوتبا دەیکڕی.

لە ئێوارەی ڕۆژانی شەممەدا، دەیڤید لەگەڵ خۆیدا ئیلای بۆ چێشخانەیەک دەبرد (تایلاندی بوایە یان ژاپۆنی)، گەر ماندوو یان سەرخۆش نەبوونایە، یان سەرودڵیان خۆش بوایە، ئەوا کە بۆ ماڵ دەگەڕانەوە، پێکەوە جووت دەبوون. ماچوموچی کورت و خێرا، جووڵەی ناسکی لە سۆزەوە هەڵقوڵاو پتر لە ئەڤین. دەمێ بوو گڕی جووتبوونیان تێدا کوژابووەوە. چەندین هەفتە تێدەپەڕی بێ ئەوەی توخنی یەکتر بکەون. سەیر لەوەدا بوو ئیلا سەرجێیی بە شتێکی گرینگ دەزانی، وەلێ ئەمێستا دوای ئەوەی ئەڵهای کزبووبوو، هەستی بە ئاسوودەیی دەکرد و پێی وابوو کە خەریکە ڕەها دەبێت. بە شێوەیەکی گشتی دەربارەی ئەو بیرۆکەیەی کە ژن و مێردێک ماوەیەکی زۆر بەسەر ژن و مێردایەتییاندا تێپەڕی بێت، ئیدی وردەوردە جۆشی سروشتی لەدەست دەدەن، شێوازی پێکەوەژیان و پەیوەندییەکی پڕ لە دڵنیایی و جێگیری جێگەی دەگرێتەوە، ئاوهاش هەستی بە قایلبوونێک دەکرد.

تاقە کێشەیەک ئەوەبوو کە دەیڤید وەک لەگەڵ ژنەکەیدا وازی لە سەرجێیی هێنابوو، وەک دیکە لە دەرەوە وازی نەهێنابوو، ئەمیش ڕاستەوخۆ بە ڕوویدا نەدەدا، بەڵکو گومانەکانیشی دەرنەدەخست. جا لەبەر ئەوەی کەسێک لە هاوڕێ نزیکەکانیان بە نێوانیانی نەدەزانی، هیچ واتەوات و شتێکی

ئابڕووبەرانە ڕووی نەدابوو، هیچ شتێ نەبوو کە زمانەکان بیێنێتە گۆ، ئەمەش شتەکەی بۆ ئاسان کردبوو کە خۆی بە بێئاگا پیشان بدات. نەیدەزانی شووەکەی بەوای پەیوەندییەکانییەوە لەگەڵ ئافرەتانی تردا چۆن کاری خۆی دەکات، بە تایبەتی لەگەڵ ئافرەتە جحێڵە یاریدەدەرەکانیدا، بەڵام پیاوە شتەکەی بە هێوری و لێزانییەوە دەکرد. جا لەبەر ئەوەی خیانەتکردنیش بۆنی هەیە و بەم ئاوهایە ئێلا زۆر شتی دەزانی.

گەر ڕیزە ڕووداوێک قەومابان، لە توانای ئێلادا نەبوو کە بزانێت کامیان یەکەم جار ڕوویداوە و کامەیان دوای ئەوە ڕوویداوە. ئایا هۆیەکەی ئەوە بوو کە مێردەکەی غایەنەتی لێدەکرد؟ یان بە ئاوەژووەوە بوو؟ ئایا یەکەم جار دەیڤید غایەنەتی لێکرد، ئینجا ئەمیش جەستەی خۆی فەرامۆشکرد و ئارەزووی جووتبوونی لەدەست دا؟

لە هەردوو باردا شتەکە وەک خۆی مایەوە: ئیدی ڕووناکی لە نێوانیاندا نەمابوو، ئەو ڕووناکییەی کە یارمەتیی دەدان لە ئاوی ژن و مێردایەتییەکی نادیاردا مەلە بکەن و تەنانەت دوای خستنەوەی سێ منداڵ و تێپەڕینی بیست ساڵ، لەسەر ئارەزووە سەر ئاوکەتووەکانیان بمێننەوە.

لە ماوەی سێ سەعاتی دواییدا بیرۆکەکان لە مەژگیدا پێکدا دەهاتن، لە کاتێکدا دەستەکانی شڵەژابوون، تەماتەی قاژقاژ کرد و سیرەکەی جنی و پیازەکەی سوورکردەوە و زەڵاتەکەی ئامادە کرد و پرتەقاڵی پاککرد. بەگوێرەی ئەو ئامۆژگارییە زێڕینەی کە دایکی دەیڤید لە کاتی دەزگیرانییاندا کردبووی، بۆ نان دروستکردن هەویری شێلا (هیچ شتێ ئەوەندەی بۆنی نانی گەرمەتەنووری تازە، ماڵ بەبیری پیاو ناهێنێتەوە)، ڕۆژێ ئەمەی پێ گوتبوو (قەت بۆخۆت نان مەکڕە، ئازیزم خۆت دروستی بکە، کاریگەرییەکی سەیری دەبێت).

ئێلا هەموو دوانیوەڕۆکە کاری کرد، مێزێکی نایابی ئامادەکرد و لە جێی هەر کەسێک وەک یەک بەرکۆشی دانا، هەروەها مۆمی بۆندار و چەپکێ گوڵی زەرد و پرتەقاڵیی درەوشاوەی دانا کە تا ڕادەیەک لە دەستکرد دەچوو. وەک دوا چاوپێداخشاندن چەند پارچە دەستەسڕێکی بریقەداری بۆ زیادکرد. کە

تەواو بوو، مێزی نانخواردنەکە لەو مێزانە دەچوو کە لە ماڵە ڕێکوپێکەکاندا لە گۆڤارەکاندا دەبینرێ.

ماندوو بوو، بەڵام قایل بوو، تەلەڤزیۆنی نانخواردنەکەی کردەوە و گوێی لە هەواڵە ناوخۆییەکان گرت: کچێکی پسپۆڕ و گەنج لە شوقەکەی خۆی بەر چەقۆ درا، بە وای شۆرتێکی کارەباوە لە یەکێ لە نەخۆشخانەکان ئاگرکەوتەوە، بە تۆمەتی بەئەنقەست تێکدانی کەلوپەل، چوار قوتابیی قۆناغی دواناوەندی دەستگیر کران. هەواڵەکانی بیست و دەربارەی ئەو مەترسییە بێکۆتاییانەی ڕوویان کردووەتە جیهان، سەری بادا. ئاخر چۆن بتوانێت کەسانێکی وەک عەزیز. ز. زاهارا بدۆزێتەوە کە ئەو ئارەزوو و بوێرییەی تێدا بێت بۆ شوێنە کەم پێشکەوتووەکانی سەر گۆی زەوی سەفەر بکەن، لە کاتێکدا دەوروبەری ئەمریکا ئارامی و ئاسایشی تێدا نییە؟

ئێلا وای بینی ئەوەی جێگەی سەرلێشێوانە ئەوەیە لە دنیایەکی ئاڵۆزدا ناکرێ چاوەڕێی ئەوە بکەیت کە بتوانرێ خەڵکی بەرەو ماڵەکانیان بگێڕدرێنەوە، دیارە کاریگەرییەکەی لەسەر کەسێکی وەک عەزیز کە سرووش لە سەرکێشیی سەفەری بەرەو دوور و ڕێگە نەکوتراوەکان وەردەگرێت، جیاوازە.

خێزانەکەی ڕۆبنشتاین بە دەوری مێزێکی نموونەییدا دانیشتن، تا لە سەعات حەوت و نیوی ئێوارەدا وێنە بگرن. مۆمە دایساوەکان شێوەیەکی پیرۆزیان بە ژووری نانخواردنەکە بەخشیبوو، ڕەنگە کەسێکی نەناس بیانی بینایە وای بە خەیاڵدا هاتبا، کە ئەوان وەک دووکەڵێکی تەنک کە بە هێواشی لە هەوادا دەتوێتەوە خێزانێکی نموونەیی و ناسک پێکدێنن، تەنانەت نەبوونی جانێتیش وێنەکەی نەشێواندبوو. نانیان خوارد و ئۆرلی و ئافی دەربارەی ئەو شتانەی کە ئەو ڕۆژە لە قوتابخانە ڕوویان دابوو، دەستیان بە زۆربڵێی کرد. یەکەمین جاربوو ئێلا هەستی کرد لێیان ڕازییە، چونکە بە چەنەبازی و ژاوەژاوەکەیان بەسەر ئەوە بێدەنگییە قورسەدا زاڵ بووبوون کە بەسەر خۆی و شووەکەیدا باڵی کێشابوو.

ئێلا بەتیل چاو سەیری دەیڤیدی کرد کە چەتاڵەکەی لە پارچە قەرنابیتێک دەچەقاند و بەکاوەخۆ بۆ زاری دەیبرد و دەیجوو. نیگای بەرەو هەردوو لێوە

تەنک و زەردهەڵگەڕاوەکانی و ددانە مرواریئاسا و سپییەکانی شۆڕکردەوە – ئەو زارەی کە باش دەیناسێت و ماچیشی کردووە. دەیڤیدی هێنایە بەرچاوی خۆی وا ماچی ئافرەتێکی تر دەکات. لەبەر هەر هۆیەک بوو ئەو دژەی کە ئەم وێنای کرد سکرتێرە گەنجەکەی دەیڤید نەبوو، بەڵکو کۆپییەک بوو لە سۆزان ساراندۆن، بەڵام بە سینگێکی گەورەتر و لە ژێرکراسێکی تەنکدا بە ئاشکرا و بە لەخۆرازیبوونەوە مەمکەکانی دەرخستبوو. پێڵاوێکی چەرمی پاژنە بەرزی درێـژ و ســووری لە پـێ بــوو کە تـا چۆکەکـانی هــاتبوو، بەوای ئارایــشی زیـادەڕۆوە دەموچـاوی دەبریقـایەوە و ڕەنگـی کـۆڵکەزێڕینەی دەنوانـد. ئـێلا دەیڤیـدی هێنـایە بەرچـاوی خـۆی وا بە خێرایـی و بە هەڵـپەوە ئەم ژنە مـاچ دەکات، بەڵام نەک وەک جوینی قەرنابیتەکەی سەر مێزی خێزانەکە.

هەر لەو شــوێنەدا و تەواو لەو ســاتەدا کـاتێ ئـێلا لە کتێبـی (هــونەری چێشتلێنانی سادە و ئاسان) خواردنی ئێوارەی دروست دەکرد، ئەو ئافرەتەی کە مێردەکەی تێکەڵاوی بووبوو، وێنا کرد و شتێکی بە خەیاڵدا هات. زۆر بە ڕوونــی و ئــارامییەوە تێگەیـشت کە لەگەڵ ئەوەی کەمئەزمــوون و شــەرمنە، ڕۆژێ دادێت کە دەست لە هەموو شتێ هەڵدەگرێت: ناندینەکەی، سەگەکەی، منـداڵەکانی، دراوســێکانی، مێـردەکەی، کتێبەکـانی چێـشتلێنان و ڕێنماییەکـانی خـواردن دروستکردن بۆ مـاڵەکە. ئیدی بە ئاسـانی بەرەو ئەو دنیـایە هەیپـای لێدەکات کە بەردەوام شتی گرینگی تێدا ڕوودەدات.

## سەیدەکە

**بەغدا، ٢٦ی کانوونی دووەم ١٢٤٣**

بنیادەم کە بێتە ناو یەکێ لە تەکیێی دەروێشەکان، ئەوا دەبێ توانای لە سەرووی توانای شەمسی تەوریزییەوە بێت، وەلێ وا نۆ مانگ ڕابرد و ئەو هێشتا لەنێوماندایە.

سەرەتا پێم وا بوو لە هەر ساتێکدا بێت شتومەکەکانی کۆدەکاتەوە و دەڕوات، ئاخر ئەو ڕقی لە ژیانی ڕێکوپێک و وردەکاری بوو، سەرنجی ئەوەم دا کە نوستن و ڕابواردن و خواردنی ژەمە خۆراکی ڕێکوپێک و جێبەجێکردنی کارە دووبارەبووەکانی وەک خەڵکانی تر لە کاتی دیاریکراوی خۆیدا بۆ ئەو شتگەلێکن مایەی بێزارییەکی زۆرن. ئەو وا ڕاهاتبوو بە تەنها بە سەرکێشی و ئازادی بفرێت. چەندین جار پێم وا بوو کە هەڵدێت، بەڵام بەقەد گەورەیی پێویستبوونی بە خەڵوەت، بۆ دۆزینەوەی هاوەڵەکەی پێویستبوونەکەی گەورەتر بوو. شەمس پێی وا بوو کە من دەگەمە ئەو زانیارییانەی کە ئەو حەوەجەیانە و هەر دەبێ پێی ڕابگەیەنم بۆ کوێ بڕوات و ئەو کەسە کێیە بۆ لای دەڕوات. هەر بەوای ئەم خولیایەشەوە بوو لەتەکێ مایەوە.

لە ماوەی ئەو نۆ مانگەدا، لە نزیکەوە چاودێریم دەکرد و دەمپرسی ئاخۆ ڕۆژگار بۆ ئەو بە شێوەیەکی جیا و خێراتر و زۆر تیژتر فەراهەم بووە؟ ئاخر ئەو شتەی دەروێشەکانی تر بە چەندین مانگ و هەندێ جار چەندین ساڵ فێری دەبوون، شەمس لە چەند هەفتەیەکدا، بەڵکو لە چەند ڕۆژێکدا فێری دەبوو. بە وردی خۆی لە هەر شتێکی نوێ و نائاسایی هەڵدەقورتاند و چاودێرێکی وردەکاری سروشت بوو. ڕۆژانێکی زۆر دەمبینی لە باخەکەدا دەوەستا و بە سەرسامییەوە لە تەونی جاڵجاڵۆکە یان دڵۆپە ئاونگی

درەشاوەی سەر گوڵێکی پشکتووی شەو ورد دەبووەوە. بۆم دەرکەوت کە بایەخ بە گەزندە و ڕووەک و گیانداران دەدات و لە کتێب و دەستنووسەکان پتر سرووشی پێدەبەخشن. ئەو دەمەی وام دەزانی کە ئارەزووی خوێندنەوەی نەماوە، کەچی دەمبینی نوقمی نێو خوێندنەوەی کتێبێکی کۆن بووە.

پاشان چەند هەفتەیەک ڕادەبورد نە دەیخوێندەوە و نە لە شتێکی دەکۆڵییەوە.

کە دەربارەی ئەوە لێم پرسی، وتی گەرەکە بنیادەم بیری خۆی تیژ بکات، وەلێ دەبێ ئاگای لەوە بێت گەندەڵی نەکات. یەکێ لە ڕێساکان دەڵێت: **(هزر و خۆشەویستی لە چەندین ڕەگەزی جیا پێکدێت. هزر بنیادەم بە چەندین کۆت بەند دەکات، بەڵام خۆشەویستی هەموو کۆتەکان دەشکێنێت. هزر بەردەوام سرکە و بە مۆچیارییەوە دەڵێت: ئاگات لە بەدمەستی بێت، لە کاتێکدا خۆشەویستی دەڵێت: گوێ مەدەرێ بۆ ئەم سەرکێشییە هەنگاوبنێ. هزر بە ئاسانی لەنێو ناچێت، کەچی خۆشەویستی بە ئاسانی هەرەسدێنێت و لەخۆڕا دەبێتە داروپەردوویەکی بەسەریەکدا کەوتوو، بەڵام گەنجینە لەنێو داروپەردوودا ون دەبێت، دڵی شکاویش گەنجینان حەشاردەدات).**

تا پتر شارەزای دەبووم، پتر بە بوێری و زیرەکییەکەی سەرسام دەبووم، بەڵام گومانیشم لە ڕوویەکی دیکەی خەوشداری ڕەسەنایەتی لێهاتووییە بێهاوتاکەی شەمس دەکرد. ئاخر تا ڕادەی دڵڕەقی قسەلەڕوو و سەرڕاست بوو، لە کاتێکدا من لە تەکیەکەی خومدا دەروێشەکانم فێری ئەوە کردبوو کە تەماشای خەوشی کەسانی تر نەکەن، گەر خەوشەکانیشیان بینی لێی ببوورن و چاوپۆشیی لێ بکەن، بەڵام شەمس بەبێ تێبینی نەیدەهێشت هەڵەیەک تێپەڕێت. هەر گاوێ هەڵەیەکی دیبا، دەسبەجێ قسەی دەربارە دەکرد و قەت لە بابەتەکەدا پێچوپەنای نەدەکرد. ڕاستگۆییەکەی کەسانێکی توورە دەکرد و هەستیان بە سووکایەتی دەکرد، بۆیە حەزی لە توورەکردنی خەڵک بوو تا بزانێت لە ساتەکانی توورەییدا چییان لێ دەردەکەوێت.

هەستەم بوو ناچاری بکەیت کارێکی خواسایی بکات، چونکە حەوسەڵەی ئەم شتانەی نەبوو، کە فێری هەر شتێ دەبوو، لێی سارددەبووەوە. کە

تووشی کاریکی بێزارکەر دەبوو، وەک پڵینگی نێو قەفەز نائومێدی دایدەگرت. گەر دەموودوویەک بێزاری کردبا، یان کەسێ سەرنجێکی گێلانەی دەربڕیبا، دەسبەجێ هەڵدەستا و جێی دەهێشت و کاتی خۆی بە دڵڕاگرتنی بەفیڕۆ نەدەدا. ئەو بەهایانەی کە زۆربەی خەڵکی پارێزگاری دەکەن، وەک ئاسایش و ئاسوودەیی و بەختەوەری، بۆ ئەو هیچیان نەدەبەخشی. لە پەیڤان زۆر بە گومان بوو تا ئەو ڕادەیەی چەندین ڕۆژ تێدەپەڕین وشەیەکی لە زار دەرنەدەچوو، ئەمەش ڕێسایەکی دیکەیە لە ڕێساکانی: **زۆربەی کێشەکانی دنیا لە هەڵەی زمانەوانی و لە بەدحاڵیبوونێکی سادەوە سەرهەڵدەدەن. قەت وشەکان بە واتا ئاشکراکەیان وەرمەگرە. کاتێ بازنەی خۆشەویستی قورس و سەخت دەبێت، زمانی دەربڕینەکەیشی بەسەردەچێت، چونکە ئەو شتەی بە پەیڤان دەرنابڕدرێ، تەنها بێدەنگی دەرەقەتی دێت.**

تا دەهات پتر بۆی پەژارە دەبووم. لە ناخەوە هەستم دەکرد ئەو کەسێکە بە گرێکی توند دەسووتێت و ڕەنگە خۆی بخاتە مەترسییەوە.

لە دواقۆناغدا چارەنووسمان دەکەوێتە دەست ئەو خودایەی کە هەر خۆی دەزانێت هەر یەکێ لە ئێمە چۆن و کەی ئەم دنیایە جێدەهێڵێت. بڕیارم دا تا لەتوانامدا هەیە زیاتر شەمس ئارام و لەسەرخۆ بکەم و بەگوێرەی تواناش لەسەر شێوازی ژیانێکی دڵنیاتر ڕایبهێنم. پێم وا بوو سەردەکەوم، وەلێ کە زستان داهات، پەیکێک پەیدا بوو و نامەیەکی لە دوورەوە هێنابوو.

ئەم نامەیە هەموو شتێکی گۆڕی.

# نامەکە

## لە قەیسەرییەوە بۆ بەغدا، خاکەلێوەی ۱۲٤۳

بەناوی خودا کە دەهندە و دلۆڤانە

برای ئازیزم باوەزەمان

سڵاوتان لێ بێت و بەزەیی و فەڕی خوداتان بەسەردا بڕژێت

ماوەیەکی زۆر بەسەر دوا دیدارماندا تێپەڕیوە، نزادەکەم کاتێ ئەم نامەیەت پێدەگات باش بێت. دەربارەی ئەو خانەقایەی کە لە دەوروبەری بەغدا کردووتەوە و تێیدا دەروێشەکان فێری حیکمەت و خۆشەویستیی خودا دەکەیت، هەندێ شتی نایابم بیستووە. ئەم نامەیەت بە نهێنی بۆ دەنووسم تا لەبارەی شتێکەوە کە بیرکردنەوەمی مژوول کردووە، بۆچوونت بزانم. ڕێگەم بدە با لە نووکەوە دەست پێبکەم.

وەک دەزانیت، سوڵتانی کۆچکردوو (عەلائەدین کەیقوباد) پیاوێکی بێوێنە بوو و لە کاتی تەنگژەکاندا لە ڕابەرایەتیکردندا لێهاتوو بوو. خەونی بەوەوە دەبینی کە شارێک دروست بکات شاعیران و پیشەوەران و فەیلەسووفەکان بە ئاشتی کاری تێدا بکەن. خەونێک بوو بەوای ئاژاوە و جەنگەکانی جیهان، بە تایبەتی بەوای هێرشی دووسەرەی مەغۆلەکان و خاچپەرستەکانەوە زۆر کەس پێیان وا بوو نایەتە دی. ئێمە هەموو ئەوانەمان دی، کە کریستیان موسڵمانیان دەکوشت، کریستیان کریستانیان دەکوشت، موسڵمان موسڵمانی دەکوشت. ئایینـدار و تیرە و هۆز، تەنانەت برا دژی برا دەجەنگان، بەڵام کەیقوباد ڕابەرێکی باوەڕبەخۆبوو بوو، ئەوە بوو - یەکەم شوێنێ دوای نیشتنەوەی تۆفانی گەورە - بۆ هێنانەدیی خەونە مەزنەکەی، شاری قۆنیای هەڵبژارد.

ئەمێستا لە قۆنیا زانایەک دەژی، ڕەنگە ناویشیت بیستبێت، ناوی مەولانا جەلالەدینە، بەڵام بەزۆری بە ڕۆمی دەناسرێ. شانازیی ئەوەم پێ بڕا چاوم پێی بکەوێت، نەک هەر ئەوە، بەڵکو شانازیی ئەوەشم بەرکەوت کە لەگەڵیدا بخوێنم، یەکەم جار وەک مامۆستایەکی، ئینجا دوای کۆچی دوایی باوکی وەک مامۆستا و مۆچیاری ئەو، دوای ساڵانێکیش وەک قوتابییەکی ئەو. بەڵێ هاوڕێم، بووم بە قوتابیی قوتابییەکەم. لەبەر ئەوەی ڕۆمی یەکجار بەهرەدار و بەحیکمەت بوو، ئیدی من شتێکم پێ نەمابوو فێری بکەم، دەستم بەوە کرد لەوەوە فێربم. باوکیشی زانایەکی ناودار بوو، بەڵام ڕۆمی تایبەتمەندییەکی هەبوو زۆر بە دەگمەن لە زانایاندا هەیە، وەک: توانای قووڵبوونەوەی ژێر توێکڵی ئایین و دەرهێنانی گەوهەرە جیهانی و هەتاهەتاییەکەی.

دەمهەوێ بزانیت کە ئەمە تەنها بۆچوونی تایبەتی خۆم نییە. کاتێ ڕۆمیی لاو چاوی بە (شێخ فەریدەدین عەتاری سۆفی)ی پایەدار کەوت، کە کاری وردەواڵەفرۆشیی دەکرد، دەرمانی میللی و بەهارات و عەتری دەفرۆشت، عەتار لەبارەی ئەوەوە گوتی: (ئەم لاوە لە دڵی عەشقدا دەرگایەک دەکاتەوە و ئاگرێک لە دڵی هەموو سۆفییە عاشقەکان دادەگیرسێنێت). ڕۆژێکیان ئیبن عەرەبی فەیلەسووفی دیار و نووسەر و سۆفیی ناسراو، کاتێ ڕۆمیی لاوی بینی بەدوای باوکیدا دەڕۆیشت، گوتی: (پەنا بە خودا، ئۆقیانووسێک بەدوای دەریاچەیەکدا ڕێ دەکات).

ڕۆمی هێشتا لە تەمەنی بیستوچوار ساڵیدا بوو، بوو بە ڕابەرێکی ڕۆحی. بەڵام ئەمڕۆ دوای تێپەڕینی سیانزە ساڵ، دانیشتوانی قۆنیا بە پێشەنگی خۆیانی دەزانن. هەموو ڕۆژێکی هەینی لە سەرتاسەری ناوچەکەوە خەڵکی بۆ بیستنی وتارەکانی ڕوو لەو شارە دەکەن. لە بواری زانستە ئیسلامییەکان و فەلسەفە و لاهووت و ئاسمانناسی و مێژوو و کیمیا و جەبردا دەستڕۆیشتووە. دەوترێ ئێستا پتر لە دە هەزار مریدی هەیە. مریدەکانی بە هەموو وتەکانییەوە وابەستەن و وای دەبینن گەر لە مێژووی جیهانیش گۆڕان دروست نەکات، ئەوا لە مێژووی ئیسلامدا گۆڕانکاری دروست دەکات.

بەش بە حاڵی خۆمیش هەمیشە ڕۆمی وەک کوڕێکی خۆم تەماشا دەکەم، ئاخر بەڵێنم بە باوکە کۆچکردووەکەی دا کە بەردەوام چاوم لێی بێت.

ئەمێستا بەساڵدا چووم و خەریکە لە دوایین ڕۆژەکانی تەمەنم نزیک دەبمەوە، بە پەرۆشەوە دەمهەوێ بکەوێتە دەستێکی متمانەپێکراوەوە.

هەر وەک دەبینیت، سەرباری سەرکەوتن و باڵاییەکەی، کەچی ڕۆمی چەند جارێک بەربای گوێی داوم کە لە دڵەوە لە خۆی قایل نییە، چونکە لە ژیانیدا شتێکی ناتەواوە – ئەویش بۆشاییەکە نە خێزانەکەی و نە مریدەکانی دەتوانن پڕی بکەنەوە. جارێکیان پێم گوت، هەرچەندە هێشتا کەمئەزموونە و هێشتا نەسووتاویشە، وەلێ کاسەکەی سەرڕێژ پڕ بووە، لەگەڵ ئەوەشدا گەرەکە دەرگای ڕۆحی خۆی بکاتەوە تا ئاوی خۆشەویستی بەرەو ناوەوە و بەرەو دەرەوە هەڵبقوڵێت. کە لێی پرسیم ئەوە چۆن پێک دێت؟ پێم وت کە ئەو حەوەجەی هاوەڵێک، هاوڕێیەکی هاوسەفەرە، هەروەها فەرموودەیەکی پێغەمبەرم هێنایەوە یادی، (بڕوادار ئاوێنەی بڕوادارە).

گەر بابەتەکە دووبارە نەورووژێنرایەتەوە، لەوەبوو بەتەواوی لەبیرم بچوایەتەوە، بەڵام کاتێ قۆنیام جێهێشت، ڕۆمی بۆ لام هات و دەربارەی خەونێک پرسیاری لێکردم کە گوایا بەردەوام دەیبینێت و تەنگەتاوی دەکات. پێی گوتم لە خەونەکەیدا مەنەی کەسێک دەکات کە لە خاکێکی دوور لە شارێکی گەورە و پڕ لە خەڵک دەژی. لەوێ پەیڤەکان عەرەبین و کاتی ڕۆژاوابوونی دڵگیرە، کرمی ئاوریشم لەسەر گەڵای دارتوو لەنێو قۆزاخەی نادیاردا چاوەڕێی پێگەیشتن دەکات. ئینجا خۆی لە حەوشەی ماڵەکەی خۆیدا بینیوە لە نزیک بیرێک دانیشتووە و فانۆسێکی بە دەستەوە بووە و گریاوە.

سەرەتا نەمزانی خەونە تەرتەووەرتەکانی ئاماژە بۆچی دەکەن. خەونەکانی دیار نەبوون، وەلێ دوای ئەوە، ڕۆژێکیان ملپێچێکی ئاوریشمم بە دیاری پێگەیشت، ئیدی وەڵامەکە و مەتەڵەکەم هەڵهێنا. بیرم کەوتەوە کە من چەند حەزم لە ئاوریشم و کرمی ئاوریشم بووە. ئەو شتە نایابانەی کە بیستبوومن، دەربارەی ئەو (شێواز)ەی کە تۆ پەیڕەوی دەکەیت، هاتەوە یاد. بیرم کردەوە کە ئەو شوێنەی ڕۆمی لە خەونەکانیدا دیویتی، جگە لەو تەکیەی دەروێشانەی کە تۆ داتمەزراندووە، هیچ شوێنێکی تر نییە. هۆ براکەم، بە کورتی دەپرسم ئایا هاوەڵەکەی ڕۆمی لە سێیەری تەکیەکەی تۆدا دەژی؟ هەر ئەمەش وای لێکردم ئەم نامەیەت بۆ بنووسم.

نازانم ئاخۆ ئەو کەسە لە تەکێکەی تۆیە یان نا. گەر وایە، ئەوا من شتەکە بۆ تۆ جێدەهێڵم تا ئەو چارەنووسەی پێ ڕابگەیەنیت کە چاوەڕێی دەکات، گەر منیش و تۆش لە توانامانـدا بێت ببینە یارمەتیدەرێک بۆ پێکگەیاندنی دوو ڕووبار تا بڕژێنە نێو ئۆقیانووسی عەشقی خودایی و یەک دەراوی ئاو پێکبێنن، گەر توانیمان یارمەتیی دوو هاوڕێی باش بدەین کە لە هاوڕێیانی خودان، تا بەیەک بگەن، وا دەزانم کە فەڕی خودام بەسەردا باریوە.

بەڵام شتێ هەیە نابێت لە یادت بچێت، ڕەنگە ڕۆمی پیاوێکی کاریگەر بێت و لای زۆر کەس خۆشەویست و بەڕێز بێت، ئەمەش وا ناگەیەنێت کە ناحەزی نییە، بێگومان ناحەز و تانەلێدەری هەیە، هەروەها ئەم پێکەوە جۆشسەندنە ڕەنگە تووڕەیی و بەرهەڵستیی لێ بکەوێتەوە و ببێتە مایەی جۆرە ناکۆکییەک و ئێمە بە باشی لێی تێنەگەین و ڕەنگە لە سەرووی تێگەیشتنی ئێمەشەوە بێت، هەروەها ئەو جۆشسەندنەی لەگەڵ هاوەڵەکەیدا لەوەیە لە چوارچێوەی خێزانەکەی و دەوروبەری خۆیدا ببێتە مایەی کێشە، چونکە ئەو کەسەی کە بە ئاشکرا خۆشی دەوێ و خەڵکێکی زۆر پێی سەرسام دەبن و ڕێزی دەگرن، بێگومان دەبێتە مایەی وروورژاندنی ئێرەیی و ڕقی کەسانی دیکە.

ڕەنگە هەموو ئەوانە هاوەڵەکەی ڕۆمی تووشی مەترسییەک بکەن و کەس پەی بەو مەترسییە نەبات. براکەم، بە واتایەکی تر، ڕەنگە ئەو کەسەی کە تۆ بۆ قۆنیا دەینێریت جارێکی تر نەتوانێت بگەڕێتەوە، بۆیە پێش ئەوەی بڕیار بدەیت و ئەم نامەیە بۆ هاوەڵەکەی ڕۆمی ئاشکرا بکەیت، داوات لێدەکەم کە بۆ بیرکردنەوە لەم مەسەلەیە ماوەیەکی زۆرتر تەرخان بکەیت.

ئەفسووس من تۆم خستە دۆخێکی قورسەوە، وەلێ وەک هەردووکمان دەزانین، خودا داوای شتێک لە کەسێک ناکات کە لەتوانای خۆی بەدەر بێت. چاوەڕێی وەڵامت دەکەم. دڵنیام ئەنجامەکە هەرچییەک بێت، تۆ هەنگاوی دروست بەرەو ئاراستەی دروست دەنێیت.

داوا لە خودا دەکەم کە ڕووناکی و تیشکی باوەڕ لە خۆت و دەروێشەکانت نەبڕێت.

**سەید**

**سەعید بورهانەدین**

# شەمس

## بەغدا، ١٨ی کانوونی یەکەم ١٢٤٣

بەناو بەفرە چوون خووریی هەلاجیکراوەکەوە و ڕێچکە بەفرگرتووەکانەوە، لە دوورەوە پەیکێک دەرکەوت. وتی کە لە قەیسەرییەوە هاتووە، بەمە واتەواتێک کەوتە نێو دەروێشەکانەوە، چونکە دەیانزانی لەم کاتەی ساڵدا میوان لە تریێی شیرینی هاوین دەگمەنترە. ئاخر بەم بەفر و زریانە هاتنی پەیکێک بە خۆ و بە نامەیەکی بەپەلەوە یەکێ لەم دوو شتە دەگەیەنێت: یان شتێ ڕوویداوە، یان شتێکی گرینگ خەریکە ڕووبدات.

گەیشتنی تەتەرەکە وای لە دەروێشەکانی تەکیەکە کرد کە بێنە زمان، چونکە هەموویان پەرۆشی زانینی نێوەڕۆکی ئەو نامەیە بوون کە درایە دەست سەیدەوە، سەیدیش خۆی لە عەبای نهێنییەکانی پێچابوو و هیچ ئاماژەیەکی بۆ نێوەڕۆکەکەی نەدەکرد. بە سوخەتەسارد و لاملییەکەیەوە و بە خۆپارێزییە توندەکەیەوە، چەند ڕۆژێ هەر وا مایەوە و سیمای پیاوێکی پێوە دیاربوو، کە بە ویژدانی خەبات دەکات و بۆ گەیشتن بە بڕیارێکی دروست زەحمەت دەکێشێت.

لەو ماوەیەدا خۆهەڵقورتان نەبوو کە پاڵی پێوەدەنام چاو بخەمە سەر باوەزەمان، بەڵکو لە ناخەوە هەستم دەکرد نامەکە تایبەتە بە من، بەڵام نەمدەزانی چۆنە. چەند ڕۆژێکم بە تەنها و بە خەڵوەتی لە ژووری نوێژکردن بەسەر برد و هەر نەوەدونۆ ناوەجوانەکانی خودام دەوتەوە تا ڕێنماییم بکەن. لە هەموو جارێکدا ناوی (جبار)م دەهاتە پێش کە جگە لە دەسەلاتی خۆی، هیچ شتێ پێکنایەت.

لە ڕۆژەکانی دواتردا، ئەو دەمەی دەروێشەکان خەریکی واتەوات بوون، من بە تەنها لە باخەکەدا کاتم بەسەر دەبرد و لە دایکە سروشتەکەمان ڕامابووم کە ئێستا لەژێر پۆشاکێکی قورسی بەفردا بوو. دوای چەند ڕۆژێ گوێمان لە زەنگە مسینەکە بوو کە لە ناندینەکە بە زنجیرێکەوە هەڵواسرابوو، چەند جارێ زرینگەی لێوەهات، داوای کۆبوونەوەیەکی پەلەی لە هەموومان دەکرد. کاتێ چووینە ژووری سەرەکیی تەکێ، هەموان ئامادە بووبوون، فەقێ تازە دەستپێکردووەکان و موستەعیدەکان و دەروێشەکان بە بازنەیەکی فراوان دانیشتبوون، سەیدیش لە ناوەڕاستی بازنەکە دانیشتبوو و لێوەکانی هەڵقرچابوون و چاوەکانی بەقووڵدا چووبوون.

دوای ئەوەی خۆی بەملا و بەولادا هێنا و برد، گوتی: "بە ناوی خودا، بێگومان لە هۆی بانگکردنتان بۆ ئەم کۆبوونەوەیەی ئەمڕۆ دەپرسن. ئەمە دەربارەی ناوەڕۆکی ئەو نامەیەیە کە پێم گەیشتووە. ئەوە گرینگ نییە لە کوێوە هاتووە، بەڵام ئەوە بەسە کە ئەو نامەیە بۆ بابەتێکی یەکجار گرینگ سەرنجی ڕاکێشاوم".

باوەزەمان کەمەکێ وەستا و بۆ دەرەوەی پەنجەرەکە هەڵیڕوانی. وەک ئەوەی لە ماوەی ئەم چەند ڕۆژەی ڕابردوودا چەند ساڵێک بەتەمەنتر بووبێت، شەکەت و لاواز و ڕەنگ هەڵبزرکاو دیاربوو، بەڵام کاتێ لەسەر قسەکانی ڕۆیشت، دەنگی بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو پڕبوو لە ڕیتمی سەنگینی.

"زانایەکی باڵا لە شارێکدا دەژی کە زۆر لێرەوە دوور نییە، لە بەکارهێنانی پەیڤان شارەزایە، بەڵام زۆر خوازە بەکار ناهێنێت، چونکە شاعیر نییە. هەزاران کەس خۆشیان دەوێ و بە مەزنی دەزانن و ڕێزی دەگرن و یەکجار پێی سەرسامن، وەلێ ئەو عاشق نییە، بە هۆی چەند شتێکەوە کە لە سەرووی تێگەیشتنی من و ئێوەشەوەیە، پێویستە یەکێ لەدەروێشەکانی تەکێکەمان بۆ دیداری بڕوات و لەگەڵیدا بمێنێتەوە".

دڵم لە قەفەزەی سینگمدا گوشرا. هەناسەم قەتیس بوو، زۆر قەتیس بوو. ئیدی لەوە زیاترم لە توانادا نەبوو تەنها ئەوە نەبێت یەکێ لە ڕێساکان بیر خۆم بێنمەوە کە دەڵێت: **تەنهایی و خەڵوەت دوو شتی جیان. کاتێ بە تەنها دەبیت، ئاسانە خۆت هەڵبخەڵەتێنیت و وا بیر بکەیتەوە کە تۆ ڕێگەیەکی**

ڕاستت گرتووە، بەڵام خەڵوەت بۆ ئێمە لەبارترە، چونکە وا دەگەیەنێت کە تۆ تەنها خۆتیت بێ ئەوەی هەست بکەیت تەنهایت. بەڵام لە کۆتاییدا باشتر وایە منەی کەسێک بکەیت، کەسێک وەک ئاوێنە بێت بۆت. ئەوەت لەیاد بێت، مەگەر لە دڵی کەسێکی تر و خودای ناوەوەی خۆت زیاتر، ئیدی لەوەولا ناتوانیت خۆت ببینیت".

سەید لەسەر قسەکەی ڕۆیشت و گوتی: "لێرە کۆمکردوونەتەوە تا لێتان بپرسم ئایا کێ لە ئێوە ئارەزووی خۆبەخشیی هەیە کە ئەم گەشتە ڕۆحییە بکات؟ دەتوانم یەکێک دیاری بکەم، بەڵام ئەمە ئەرکێک نییە لە ڕوانگەی ئەرکەوە تەماشا بکرێ، چونکە تەنها لە ڕوانگەی عەشق و بە ناوی عەشقەوە نەبێت ناکرێ".

دەروێشێکی گەنج بۆ قسەکردن داوای مۆڵەتی کرد و پرسیی: "گەورەمان، ئەو زانایە کێیە؟".

"جگە لەو کەسەی کە دەیەوێ بۆ لای بڕوات، ناتوانم ناوەکەی بۆ هیچ کەسێ ئاشکرا بکەم".

ئەوسا ژمارەیەک لە دەروێشەکان بە جۆشەوە دەستیان بەرز کردەوە، نۆ دەروێش بوون، منیش چوومە پاڵیان و ژمارەمان بوو بە دە. باوەزەمان بەدەست ئاماژەی کرد کە چاوەڕێ بکەین تا لە قسەکەی دەبێتەوە، گوتی: "پێش ئەوەی بڕیار بدەن، شتێکی دی هەیە پێویستە بیزانن".

هەروەها سەید پێی ڕاگەیاندین کە سەفەرەکە پڕە لە ماندووبوون و مەترسیی زۆر، هیچ دەستەبەرێک بۆ گەڕانەوەی ئەو کەسە نییە کە دەڕوات. ئەوە بوو جگە لە من هەموویان دەستیان داگرت.

باوەزەمان هەر لە سەرەتاوە بەردەوام ڕاستەوخۆ تەماشای چاوەکانی دەکردم، کاتێ چاوەکانی لەگەڵ چاوەکانم یەکانگیر بوون، زانیم کە ئەو هەر لە یەکەم جارەوە دەیزانی من دەبمە تاقە خۆبەخشێک.

(شەمسی تەورێزی)، سەید لەسەرخۆ و بە جەختەوە ناوی هێنام، ناوەکەم تامێکی قورسی لە زاریدا جێهێشت، "من ڕێزی پێداگرییەکەت دەگرم، وەلێ تۆ ئەندامێکی گرینگی تەریقەتەکەمانی، جگە لەوەش تۆ میوانی ئێمەیت".

وتم: "من وای نابینم، چۆن دەکرێ ئەوە ببێتە کێشە".

سەید ماوەیەکی زۆر بێدەنگ بوو، چەندین سات بە قووڵی بیری کردەوە، ئینجا لەناکاو هەستایە سەرپێ و گوتی: "با ئێستا ئەم بابەتە بخەینەلاوە، کە بەهار هات جارێکی دی قسەی لێدەکەینەوە".

دڵم هاروشێت بوو. هەرچەندە ئەو دەیزانی کە ئەم ئەرکە بە پلەی یەکەم تاقە هۆیەک بوو منی بۆ بەغدا هێنابوو، باوەزەمان دەیەویست بۆ بەدیهێنانی چارەنووسەکەم، هەلەکەم لەدەست بدات.

وتم: "ئاخر گەورەم بۆچی؟ چاوەڕێکردن لەپای چی، لە کاتێکدا منێک ئامادەبم دەسبەجێ بڕۆم؟ پێم بڵێ شارەکە کامەیە و زاناکە ناوی چییە؟ تا دەسبەجێ هەیپای لێ بکەم".

سەید بە دەنگێکی یەکلاکەرەوە و ساردەوە کە ڕانەهاتبووم دەنگی وای لێ بژنەوم، وەڵامی دایەوە: "شتێ نییە تا گفتوگۆی لەبارەوە بکەین. کۆبوونەوەکە کۆتایی هات".

* * *

زستانێکی درێژ و سەخت بوو، باخەکە وەک لاشەیەکی ساردوسڕ بەستبووی، هەروەها لێوەکانی منیش. لە ماوەی سێ مانگی دواییدا کەسێکم نەدواند. هەموو ڕۆژێ بەو ئومێدەی درەختێ ببینم شکۆفەی کردووە، ئیدی کردبووم بە پیشە مەودایەکی دوور دەڕۆیشتم و لە دێیەکە دوور دەکەوتمەوە. وەلێ دوای بەفرەکە، بەفرێکی زۆرتری بەسەردا باری. هێشتا بەهار نزیک نەبووبووەوە. لەگەڵ ئەوەی لە دەرەوەمدا سەرودڵم تێکچووبوو، لە ناوەوەی خۆم بە ڕەزامەندی و گەشبینی مامەوە. لێرەدا ڕێسایەکی دیکەم هاتەوە یاد، ئەمیش بنەمایەکە لەگەڵ مگێرم دەگونجێت: **هەرچی شتێک لە ژیانتدا ڕوویدات، جا با بێزارکەریش بنوێنێت، مەچۆ نێو دەڤەری نائومێدییەوە، تەنانەت ئەگەر هەموو دەرگاکانیش داخران، ئەوا خودا دەرگایەکی تازەت بۆ دەکاتەوە. سوپاسی خودا بکە! کاتێ هەموو شتێ بە دڵی تۆ و لەبەر دڵان بێت، ئاسانە سوپاسی خودا بکەیت. سۆفی تەنها لەبەر ئەوەی خودا ئەو شتانەی**

**پێی بەخشیوە سوپاسی خودا ناکات، بەڵکو بۆ ئەو شتانەش سوپاسی دەکات کە لێی بێبەش کردووە.**

بەیانیی ڕۆژێکیان ڕەنگێکی دڵگیرم بینی، کە وەک ستراتێکی خۆش دڵکەرەوە بوو و لەبن توێژە بەفرەکانەوە سەری دەرکردبوو. چەندین درەخت بە ڕیز لە چەشنی ئەنگوستیلەی نقێمداردا، بە بڵاوی ڕوابوون و گوڵەزەنبەقی ڕەنگاوڕەنگیان دەرکردبوو. دڵم لێوانلێو بوو لە شادمانی. کە بەرەو تەکیە گەڕامەوە، تووشی فەقێ قژسوورەکە بووم، بە شادمانییەوە سڵاوی لێکردم. وا ڕاهاتبوو کە دەیبینیم بە بێدەنگی نوقمی نێو تووڕەییەک دەبوو، ئەوەبوو لە سەرسامیدا زاری کردەوە.

"لاوق، ڕووت خۆش بێت"، هاوارم کرد، "ئەی نابینی وا بەهار هات؟".

لەو ڕۆژەوە دیمەنی سروشت بە خێرایی گۆڕا. پاشماوەی بەفر توایەوە و درەختەکان چرۆیان دەرکرد و چۆلەکە و باڵندەی خۆشخوان گەڕانەوە و زۆری نەبرد هەوا پڕبوو لە سووکە بۆنێکی تیژ.

بەیانییەک گوێمان لە زەنگە مسەکە بوو دووبارە زرینگەی دەهات. ئەم جارە من یەکەم کەس بووم گەیشتمە ژوورە سەرەکییەکە. جارێکی دی بە دەوری سەیددا بە بازنەیەکی فراوان دانیشتین. ئێمە گوێمان لێگرتبوو و ئەویش بە نیشانەی خۆشەویستی دەربارەی ئەم زانا موسڵمان و سەنگین و هەمووشتزانە قسەی دەکرد! جارێکی تر جگە لە من، کەس ئامادەی خۆبەخشیی نەبوو.

"دەبینم شەمس تاقە دەروێشێکە ئامادەی خۆبەخشییە"، ڕیتمی دەنگی باوەزەمان بەرزبووەوە، ئینجا وەک شنەبا ناسک بووەوە"، بەڵام من چاوەڕێی پایز دەکەم تا دەگەمە بڕیارێک".

وەک بروسکە لێی دابم، باوەڕم نەدەکرد ئەمە ڕووبدات. ئاخر من ئامادەبووم دوای سێ مانگی دواخستن بڕۆم، کەچی ئەوەتا سەید داوام لێدەکات شەش مانگی تر سەفەرەکەم دوابخەم. ناڕەزاییم دەربڕی، گلەییم

کرد، تکام لە سەید کرد کە ناوی شارەکە و ناوی زاناکەم پێ بڵێت، بەڵام ئەو پێی داگرت کە پێم نەڵێت.

زانیم کە ئەم جارە چاوەڕوانییەکەم ئاسانترە، چونکە ئیدی دواخستنێکی تری بەدوادا نایات. دوای ئەوەی لە زستانەوە بۆ بەهار بەرگەی چاوەڕوانیم گرت، دەشتوانم لە بەهارەوە تا پایز بەرگەی گڕەی ئەو ئاگرە بگرم کە تێم بەربووە. ڕەتکردنەوەکەی باوەزەمان جۆشوخرۆشەکەمی خاونەکردەوە، بەڵکو ورەی بەرزکردمەوە تا پلانەکەم زیاتر بکەم. ڕێسایەکی تر دەڵێت: **ئارامگرتن مانای ئەوە نییە بە خراپی بەرگەی ئاستەنگان بگریت، بەڵکو ئەوە دەگەیەنێت ئەوندە دووربین بیت لەو ئەنجامە کۆتاییە دڵنیابیت کە لە هەر کردارێک دەکەویتەوە؟ ئارامگرتن مانای چییە؟ واتای ئەوەیە کە سەیری دڕکت کرد، گوڵ ببینیت، سەیری شەوت کرد، بەرەبەیان ببینیت، بەڵام بێئارامی ئەوە دەگەیەنێت کە تۆ کورتبینیت و ناتوانیت ئەنجام ببینیت. ئارامیی عاشقانی خودا قەت چک ناکات، چونکە دەزانن تا مانگی نوێ دەبێتە مانگی پڕ، کاتی دەوێ.**

کاتێ لە پایزدا بۆ جاری سێیەم زەنگە مسەکە لێدرا، بە هەنگاوی خێرا و دڵنیاییەوە ڕۆیشتم. دڵنیابووم لە کۆتاییدا شتەکان چارەسەر دەبن. سەید مینا شنگی لەبەربرابێت لە هەموو کاتەکانی تر ڕەنگزەردتر و بنێستر دیاربوو، بەڵام کە بینیمی وا دیسان دەستەکانم بەرز دەکەمەوە، نیگای کەلا نەخست و خۆی لە شتەکە نەبان نەکرد، بەڵکو بە بڕواوە سەری بۆ لەقاندم.

"هۆ شەمس، دەی باشە. بێگومان تۆ ئەو کەسەیت کە بۆ ئەم سەفەرە دەچیت. گەر خودا ویستی ئەوا سبەی بەیانی دەکەویتە ڕێ".

دەستی سەیدم ماچ کرد. ئاخرێکەی بە هاوەڵەکەم دەگەم.

باوەزەمان وەک چۆن باوکێک پێش ئەوەی کوڕەتاقانەکەی بۆ مەیدانی جەنگ بنێرێت، زەردەخەنەیەکی بە ڕوودا دەپژێنێت، ئاوها زەردەخەنەیەکی گەرمی بە ڕوومدا پژاند. ئینجا لە بن عەبا درێژەکەیەوە نامەیەکی مۆرکراوی دەرهێنا، دوای ئەوەی نامەکەی پێدام، بە بێدەنگی ژوورەکەی جێهێشت و

ئەوانی تر دوای کەوتن. کە بە تەنها لە ژوورەکە مامەوە، مۆرەمۆمەکەم شکاند.

لە ناوەوەیدا بە دەستخەتێکی جوان دوو زانیاری نووسرابوون کە بریتی بوون لە ناوی زاناکە و ناوی شارەکە. ئیدی بۆ دیداری زانایەک کە ناوی (ڕۆمی)یە بەرەو قۆنیا دەڕۆم.

دڵم بە توندی کەوتە خورپە. لەمەوبەر ناویم نەبیستبوو. بێگومان زانایەکی بەناوبانگە، وەلێ بۆ من بە تەواوی مەتەڵێک بوو. دەستم بە وتنی پیتەکانی ناوەکەی کرد: پیتی ڕێی قورس و درەوشاوە، پیتی واوی مەخمەڵی، پیتی میمی بوێری و باوەڕ بەخۆبوو، پیتی یێی ئاڵۆز کە دەبێت هەڵبهێنرێ.

پیتەکانم خستنەوە سەریەک و چەندینبارە دەستم بە درکاندنی ناوەکەی کرد تا وشەکە لەسەر زمانم وەک پارچە حەڵوایەکی شیرین توایەوە، ئیدی شتەکە وەک (ئاو) یان (نان) یان (شیر) لام ئاشنا بوو.

# ئێلا

## نۆرتامبتۆن، ٢٢ی ئایاری ٢٠٠٨

بەوای هەوکردنی گەرووییەوە، ئێلا لەژێر لیفە سپییەکەیدا، جەستەی ماندوو بوو و بەهەستەم دەیتوانی تفەکەی قووت بداتەوە. ئاخر شەوانی ڕابردوو تا درەنگانی شەو زیاد لە پێویست خواردبوویەوە و کاری تێکردبوو، لەگەڵ ئەوەشدا بۆ نهۆمی خوارەوە دابەزی تا قاوەڵتی دروست بکات. لەگەڵ هەردوو منداڵە جمکەکەی و مێردەکەی بە دەوری مێزەکەدا دانیشت و بە هەموو توانایەوە هەوڵی دا خۆی وا پیشان بدات کە بایەخ بە قسەکانیان دەدات کە باسی جوانترین ئۆتۆمبیلیان لە قوتابخانەکەیان دەکرد، هەموو ئەوەی دەیەویست ئەوەبوو بگەڕێتەوە سەر جێخەوەکەی و بنوێت.

لەناکاو ئۆرلی ئاوڕی لە دایکی دایەوە و لێی پرسی: "ئافی دەڵێت خوشکەکەمان ئیتر بۆماڵەوە ناگەڕێتەوە. دایکە، ئایا ئەمە ڕاستە؟). دەنگی گومان و تاوانبارکردنی پێوە دیاربوو.

ئێلا گوتی: "بێگومان ئەمە ڕاست نییە. وەک دەزانیت من لەگەڵ خوشکەکەتدا دەمەقاڵێیەکمان بوو، بەڵام خۆشی دەوێم و خۆشم دەوێ".

"ئایا ڕاستە کە تۆ قسەت لەگەڵ سکۆتدا کردووە و داوات لێی کردووە کە واز لە جانێت بهێنێت؟"، ئافی وا دیاربوو کە چێژ لە ورووژاندنی بابەتەکە وەردەگرێت، بەدەم پرسیارکردنەوە زەردەخەنەیەک لەسەر ڕوخساری نەخشا.

ئێلا بە دوو چاوی کراوەوە تەماشای مێردەکەی کرد، لێ دەیڤید برۆکانی تێکنا و وەک ئاماژەیەک کە ئەوەی پێ نەوتوون هەردوو لەپێ والاکرد.

ئێلا ڕیتمێکی دەسەڵاتخوازانەی بە دەنگی خۆی بەخشی، ئەمەیشی لەو کاتانەدا دەکرد کە ڕێنمایی بە منداڵەکانی دەدا، وتی: "ئەمە قەت ڕاست نییە، من لەگەڵ سکۆتدا قسەم کردووە، بەڵام داوام لێی نەکردووە کە واز لە خوشکەکەت بهێنێت. هەموو ئەوەی پێم گوتووە ئەوەبوو کە نابێت لە هاوسەرگیریدا پەلە بکەن".

"من قەت شووناکەم"، ئۆرلی وەک لەخۆدڵنیاییەک، ئەمەی ڕاگەیاند.

ئافی گوتی: "بەڵێ، ئاوها! وەک ئەوەیە پیاوێک چاوەڕێی خواستنی تۆ بێت".

لەو دەمەیدا کە ئێلا گوێی بۆ دوو منداڵە جمکەکەی ڕادێرابوو، کە هەریەکەیان ئەوی تری دەورووژاند، زەردەخەنەیەکی شڵەژاو لە دەموچاوی نەخش بوو کە خۆیشی نەیزانی هۆیەکەی چییە. هەرچەندە زەردەخەنەکەی خەفەکرد، بە خەفەکراوی هەر مایەوە، کاتێکیش هەردوو منداڵەکەی و مێردەکەی گەیاندە بەردەرگا، هیوای ڕۆژێکی خۆشی بۆ خواستن.

ئێلا تا ئەو دەمەی گەڕایەوە و لەسەر کورسییەکەی خۆی لە بەردەم مێزی نانخواردن دانیشت و نیوچەوانی گرژ کرد و هێشتا زەردەخەنەکە بە لالێوییەوە بوو. هەستی کرد وەک ئەوەی سوپایەکی ڕسق (جرج) پەلاماری ناندینەکەیان دابێت، پاشماوەی هێلکەی کوڵاو و قاپی نیوە بەتاڵ و کوپی پیس لەسەر مێزی نانخواردنەکە بڵاوبووبوونەوە. سەگەکە بەم سەروبەوسەری ناندینەکەدا دەهات و دەچوو، پەرۆشی دەرچوون بوو تا کەمێ پیاسە بکات، وەلێ ئێلا تا دوای ئەوەی دوو کوپ قاوەی خواردەوە و کەمێ ڤیتامینی خوارد، هەموو ئەوەی لە توانایدا بوو بیکات، ئەوە بوو کە بۆ ماوەی چەند خولەکێک سەگەکە بۆ ناو باخەکە دەربکات.

* * *

که ئـێلا له بـاخهکه گهڕایهوه، بینیـی له ئـامێری تۆمـاری تهلیفـۆنهکهوه ڕووناکییه سوورهکه دهبریسکێتهوه. ئهنگوستی خسته سهر زهنگهکه. ئای لهو خۆشییه! دهنگی ناسکی جانێت ژوورهکهی پڕکرد.

"دایکه، تۆ لهوێیت؟ دهی باشه، پێم وا بوو له ماڵ نییت، ئهگینا بیستهکی تهلیفۆنهکهت ههڵدهگرت"، به نـیمچه پێکهنینێکهوه لهسـهر قسهکهی بهردهوام بوو: "دهی باشه، زۆر لێت تووڕه بووم و نهمدهویست جارێکی تر دهموچاوت ببینمهوه، لێ ئێستا تووڕه نیم. مهبهستم ئهوهیه که ئهوهی تۆ کردت ههڵه بوو، ئهمه ڕاستییهکه. نهدهبوو پهیوهندی به سکۆتهوه بکهیت، بهڵام من لهو هۆیه تێدهگهم که وای لێکردیت ئهوه بکهیت. گوێ بگره، نابێت تۆ به درێژایی کات مژوولی پاراستن و چاودێریکردنی من بیت. ئیدی من ئهو کچه منداڵه نیم که دهبێت له دایهنگه بمێنێتهوه. واز لهم پارێزگارییه زێدهڕۆییه بێنه و لێمگهڕێ با به سروشتی خۆم ڕهفتار بکهم. پێکهاتین؟).

چاوهکانی ئێلا عهسریان تێزا. له هزریدا وێنهی جانێت به شیرهخۆرهیی بروسکهی دا. پێستی به جۆرێ سووربوو مایهی خهم بوو، پهنجه بچکۆلهکانی ئهوهنده تهنک بوون، لهوه بوو ئهودیویان دهرکهوێت، ههردوو سییهکهی بۆ ههناسهدان به بۆرییهکهوه بهستـرابوون – هێشتا ئامادهی ئهوه نهبوو که بۆ ئهم دنیایه بێت. ئێلا چهندین شهو به دیارییهوه شـهونخوونی کرد و گوێی له ههناسهی ڕادهگرت تا دڵنیا بێت که هێشتا له ژیاندا ماوه.

"دایه، شتێکی تر ههیه"، جانێت بهئاگاییهوه گوتی: "من تۆم خۆش دهوێ".

که ئێلا ئهوهی ژنهوت، ههناسهیهکی قووڵی ههڵکێشا و ڕاستـهوخۆ بیری بهرهو نامه ئهلیکترۆنییهکهی عهزیز چوو، ڕهنگه درهختی خۆزگهکان بهدهنگ داواکارییهکانییهوه چووبێت، ههر هیچ نهبێت بهشی یهکهمیان، ڕهنگه جانێت بهم پهیوهندییه ئهوهی لهسـهری پێویست بوو کردبێتی، ئهوهی ماوهتهوه له ئهسـتۆی ئـێلایه. پهیوهنـدیی به مۆبـایلی کـچهکهیهوه کـرد و زانیـی وا بهرهو کتێبخانهی زانکۆ بهڕێوهیه.

"کچی خۆشهویـستم، نـامهکهتم خوێنـدهوه. گـوێ بگـره. مـن زۆر داوای لێبوردن دهکهم. دهمهوێ تهوازۆت لێ بخوازمهوه".

ماوەیەکی کورت، بەڵام بارگاوی باڵی کێشا، "دایکە، کێشەیەک نییە".
"نا، شتەکە وا نییە، دەبوو ڕێزێکی زۆرترم لە هەستی تۆ بگرتایە".
وەک ئەوەی جانێت خۆی دایک بێت و ئێلاش کچە یاخییەکەی، گوتی: "با شتەکە لە بیر خۆمان ببەینەوە".
"بەڵێ، کچە خۆشەویستەکەم".
جانێت وەک ئەوەی بترسێت کە دوای ئەوە چ پرسیارێکی لێدەکات، مینا ورەورێکی پەنهان بکات، دەنگی نزم کردەوە: "ئەوەی پێش چەند ڕۆژێک وتم نیگەرانـی کـردووم. مەبەسـتم ئەوەیە، ئایـا ئەوە ڕاسـتە؟ ئایـا تـۆ زۆر خەمباریت؟".
ئـێلا بەلەز بەرسڤی دایەوە: "بێگومـان نەخێـر"، ئینجـا لەسـەری ڕۆیشت، سێ منداڵی جوانم بەخێو کرد، ئیدی بۆچی خەمبار بم؟).
بەڵام جانێت وەک دیاربوو دڵنیا نەبوو، گوتی: "مەبەستم لەگەڵ باوکەیە".
ئـێلا جـگە لە ڕاسـتی نەیزانـی چـی بڵێـت، "مـاوەیەکی زۆر بەسـەر ژن و مێردایەتیـی مـن و باوکتـدا تێپەڕیـوە، دوای ئەم هەمـوو سـاڵە هەسـتەمە وەک دوو عاشق بمێنینەوە".
"تێگەیشتم"، جانێت ئەمەی گوت و بە شێوەیەکی سـەیر لای ئێلا هەستێک دروست بوو کە جانێت لێی تێگەیشتووە.
ئێلا دوای ئەوەی تەلیفۆنەکەی داخست، دەربارەی عەشق خۆی ڕادەستی بیرکردنەوەیەکی قـووڵ کـرد. لەسـەر کورسـییە بـزۆکەکەی دانیـشت و خـۆی وێکهێنایەوە و لە خۆی پرسی ئاخۆ ئەمێکی بریندار و ئازارزەدە چۆن بتوانێت جارێکی تـر بچێتە نێو ئەزمـوونی خۆشەویستییەوە. ئـاخر ئەڤینداری بۆ ئەو کەسانەیە کە لەم دنیا تێژڕەوەدا بەدوای ئامانجێک یان هۆکارێکەوە عەوداڵن، بەڵام بۆ ئەوانەی زۆر دەمێکە دەستیان لەوە هەڵگرتووە چی؟
پێش ڕۆژاوابوون وەڵامی نامەکەی عەزیزی دایەوە.
ئازیزم عەزیز (گەر بۆم هەبێت ئاوها بانگت بکەم)
سوپاس بۆ وەڵامە ناسک و بەسۆزەکەت کە یارمەتیی دام بەسەر تەنگژە خێزانییەکەمـــدا زاڵ بـــبم. مـــن و کـــچەکەم توانیمـــان ئەو بەدحـــاڵیبوونە ئابڕووبەرەیە، هەر وەک خۆت بە وێڵەوە ناوت نابوو، تێپەڕێنین.

من لە تاقە شتێکدا ڕاست بووم. من لەنێوان دوو دژدا دێم و دەچم: شەڕانگێزی و نەرێنی، یان زۆر لە کاروباری ئەو کەسانە خۆم هەڵدەقورتێنم کە خۆشم دەوێن، یان بەرانبەر ڕەوتارەکانیان هەست بە دەسەوسانی دەکەم.

بەڵام دەربارەی دەسەڵاتخوازی، لە ژیانمدا ئەم جۆرە ملکەچپێکردنە ئاشتییانەیەم پەیڕەو نەکردووە کە تۆ دەربارەی بۆت نووسی بووم. ڕاستگۆیانە دەڵێم، پێم وا نییە کە ئەو توانایەم هەبێت ببم بە سۆفی، بەڵام گەرەکە ئەمەت پێ بڵێم: شتەکانی نێوان من و کچەکەم هەر وەک خۆم دەمەویست، دوای ئەوەی وازم لە دەستتێوەردانی کاروبارەکانی هێنا، بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر گۆڕان. قەرزاری تۆم و زۆر سوپاست دەکەم، هەروەها نزام بۆت کرد، وەلێ دەمێکە لە دەرگای خودام نەداوە و دڵنیا نیم ئاخۆ هێشتا لە هەمان شوێن نیشتەجییە. هەش بە سەرم، ئایا وەک چۆن لە چیرۆکەکەتدا خاوەن مەیخانەکە دەدوێت، منیش ئاوها دەدوێم؟ نیگەران مەبە، من بە دەردەدڵییەوە بەرانبەر بە بەهاکان کفر دەکەم. هێشتا کفرم نەکردووە. لەمەولاش نایکەم.

**لە نۆرتامپتۆنەوە**

**هاوڕێت، ئێلا**

# نامەکە

## لە بەغداوە بۆ قەیسەرییە، ٢٩ی ئەیلوول ١٢٤٣

بەناوی خودا کە دەهندە و دلۆڤانە

برامان سەید بورهانەدین

سڵاوتان لێ بێت و بەزەیی و فەڕی خوداتان بەسەردا بڕژێ

کە نامەکەتم پێگەیشت شادمان بووم وەک چۆن ناسیوتمە هەر وا وەفاداری ڕێگەی عەشقیت. نامەکەت تووشی گوڵمەزێکی کردم، چونکە هەر ئەوەندە زانیم کە بۆ ڕۆمی منەی هاوەڵێک دەکەیت، ئیدی زانیم مەبەستت کێیە، وەلێ ئەوەی نەمدەزانی ئەوە بوو کە لەدوای ئەوە چی بکەم.

وەک دەزانیت، دەروێشێکی گەڕیدە لە تەکیەکەی منە و ناوی شەمسی تەورێزییە. وەسپی ئەو کەسەی کە تۆ منەی دەکەیت، بەتەواوی لەمدا بەدی دەکرێ. بڕوای وایە کە ئەو پەیامێکی بۆ ئەم جیهانە پێیە. جا بۆ ئەوەی مەبەستەکەی بێنێتە دی، لە کەسێکی ڕوونبین و ڕووناکبیر دەگەڕێت تا پەیامەکەی خۆی بۆ بگوێزێتەوە و بیری زاخاوبدات و ڕووناک بکاتەوە. ئەو لە مریدێک یان لە فەقێیەک ناگەڕێت، بەڵکو داوا لە خودا دەکات کە هاوەڵێک بدۆزێتەوە. جارێکیان پێی گوتم کە ئەو لە پێناو کەسانی خواسایی نەهاتووە، بەڵکو هاتووە تا پەنجە بخاتە سەر خورپەی دڵی کەسێک کە بەرەو ڕاستی ڕێنوێنی دنیا دەکات.

کە نامەکەتم پێگەیشت، زانیم لە چارەی شەمسی تەورێزی نووسراوە کە بگات بە ڕۆمی. جا بۆ ئەوەی بە یەکسانی بۆ هەموو دەروێشەکانی تەکیەکەم هەل بڕەخسێنم، کۆمکردنەوە و بێ ئەوەی بچمە نێو وردەکارییەوە، دەربارەی زانایەک کە دەیهەوێ دڵی خۆی بکاتەوە قسەم بۆ کردن. لەگەڵ ئەوەی

ژمارەیەکی کەم و دیاریکراو بوون، شەمس تاقە کەسێک بوو تەنانەت دوای بیستنی مەترسیی ئەرکەکە، پێی لەسەر قەبوولکردنی ئەوە داگرت. ئەمە لە زستانی ڕابردوودا بوو. ئەوە بوو هەمان شت لە بەهار و ئینجا لە پایزدا دووبارەبووەوە.

ڕەنگە بپرسیت بۆچی بە درێژایی ئەم ماوەیە چاوەڕێم کرد. بە ئاشکرا دەڵێم زۆر بیرم لێکردەوە، جگە لە تاقە هۆیەک ناتوانم هۆی دیکە بهێنمەوە: وام لێهاتبوو شەمسم زۆر خۆش ویست و دڵم نەدەهات بۆ سەفەرێکی ترسناک بینێرم.

شەمس لەبەر ئەوەی ژیانێکی تەنها ژیاوە، کەسێکی تەبیات ئاسان نییە و هەر ئەوە دەتوانێت ئەم ئەرکە جێبەجێ بکات، بەڵام ئەگەر لە شارێکدا نشتەجێ بوو و تێکەڵاوی خەڵکەکەی بوو، ئەوە دەترسم هەندێ کەس بێزار بکات، بۆیە بەگوێرەی توانا هەوڵم دا سەفەرەکەی دوابخەم.

ئێوارەی پێش ڕۆیشتنەکەی شەمس، لەبەر ئەوەی کرمی ئاوریشم بەخێو دەکەم، بە دەوری دارتووەکاندا پیاسەیەکی درێژمان کرد. ئاخر دابونەریتە کۆنەکان بە کەمی لەنێو دەچن. عەشق وەک تروسکاییەک ناسکە و بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر چون ئاوریشم بەهێزە. بۆ شەمسم ڕاڤەکرد کە چۆن کرمی ئاوریشم دوای ئەوەی لە قۆزاخەکەی سەردەردێنێت، ئەو ئاوریشمە لەنێودەبات کە دروستی کردووە، بۆیە وەرزێرەکان لێدەبڕێن لەنێوان ئاوریشمەکە و کرمی ئاوریشمەکەدا یەکێکیان هەڵبژێرن. زۆر جار کرمی ئاوریشمەکە هێشتا لەناو قۆزاخەکەیدایە دەیکوژن تا بە ساغی ئاوریشمەکە دەربێنن، بۆ دروستکردنی یەک ملپێچی ئاوریشم، سەدان کرمی ئاوریشم بەکار دەهێنرێ.

خەریک بوو ئێوارە دادەهات، بایەکی سارد بەسەرماندا هەڵیکرد و لەرزم لێهات. لەم پیریبیەمدا بە ئاسانی سەرمام دەبێت، لێ زانیم کە ئەم لەرز لێهاتنەم بەوای پیرییەوە نییە، بەڵکو زانیم کە لەم دنیایەدا ئەمە دواجارە شەمس لەناو باخەکەمدا دەوەستێت و جارێکی تر هیچمان یەکتر نابینین. بێگومان ئەویش هەستی بەوە کردبوو، چونکە خەمێکم لە چاوەکانیدا بینی.

کازیوەی ئەم بەیانییە، هات تا دەستەکانم ماچ بکات و داوای فەرم لێ بکات، واقم ورما کە بینیم قژە رەش و درێژەکەی بڕیوە و سمێڵەکەی تاشیوە، ئەو هۆکارەکەی نەوت و منیش پرسیارم لێی نەکرد. پێش ئەوەی بڕوات، گوتی رۆڵی ئەو لەم چیرۆکەدا لە رۆڵی کرمی ئاوریشم دەچێت و ئەو و رۆمی بەرەو قۆزاخەی عەشقی خودایی دەکشێنەوە، تا ئەو کاتە دێت و ئاوریشمێکی بەنرخ دەچنرێ، لە ناویدا دەمێننەوە. وەلێ لە کۆتاییدا بۆ ئەوەی ئاوریشمەکە بژی، گەرەکە کرمی ئاوریشمەکە بمرێت.

ئینجا بەرەو قۆنیا کەوتە رێ . خودا بیپارێزێت. دەزانم ئەوەی لەسەرم بوو کردم، هەروەها تۆش، بەلام خەمێکی قورس کەوتووەتە سەر دڵم، خەریکە بۆ دەروێشێک پەرۆش دەبم کە لە هەموو ئەو دەروێشانەی لە تەکیەکەی خۆمدا بینیومن، سەیرتر و سەرکێشتر بوو.

لە کۆتاییدا هەمووومان بۆ لای خودا و بۆ لای ئەویش دەگەڕێینەوە.

هەر خودا پشتوپەنات بێت

**باوەزەمان**

# فەقێکە

## بەغدا، ٢٩ی ئەیلوول ١٢٤٣

بوون بە دەروێش وەک هەموان ئاگاداریان کردمەوە، ئاسان نییە، بەڵام ئەو شتەی بیریان چوو پێمی بڵێن، ئەوە بوو گەر من بووم بە دەروێش، ئەوا لە دوو لاوە تالاو دەچێژم. لەوەتەی گەیشتوومەتە ئەم تەکیّیە وەکو سەگێک کاردەکەم. ڕۆژانە ئەوەندە کاردەکەم کە دەچمە نێو جێیەکەم، لەتاو ئازاری ماسوولکەکانم و پێیەکانم، خەو ناچێتە چاوم. لە خۆم دەپرسم ئاخۆ کەسێ ئاگای لەوە هەیە کە چ مامەڵەیەکی خراپم لەگەڵدا دەکرێ؟ تەنانەت گەر یەکێکیش سەرنجی ئەوەی دابێت، بێگومان هەر گوێیشی پێ نادات. تا زیاتر کارم دەکرد، شتەکە خراپتر دەبوو، تەنانەت ئەوان ناویشم نازانن و لەنێو خۆیاندا بە چەپە لە دوامەوە بە (فەقێ تازەکە و نەناسەکە و قژسوورەکە) ناویان دەهێنام.

خراپترین شتێک بۆ من ئەوە بوو لە نانـدینەکە بە سەرپەرشتیی چێشتلێنەرێک کارم دەکرد. ئەم پیاوە لەجیاتی دڵ، خاوەنی پارچە بەردێک بوو. دەبوو لە سوپای مەغۆلەکاندا بووبووایەتە سەرکردەیەکی دڕندە و تینووی خوێن، نەک لە تەکیّی دەروێشەکاندا ببێتە چێشتلێنەر. لە یادم نییە قسەیەکی ناسکی لەگەڵ یەکێکدا کردبێت. پێم وا نییە بزانێت زەردەخەنەیەک بخاتە سەر لێوی. ڕۆژێکیان لە گەورە دەروێشێکیانم پرسی ئاخۆ لەسەر فەقێ پێویستە کە لە ناندین لەگەڵ چێشتلێنەرێکدا ملکەچی مەینەتی کارکردن بێت؟ بە زەردەخەنەیەکی ئاڵۆزەوە وەڵامی دایەوە: (نەک هەموو فەقێکان، بەڵکو تەنها هەندێکیان).

کەواتە بۆچی هەر من؟ سەید بۆچی دەیەوێ من لە فەقێکانی تر زیاتر ئازار بکێشم؟ ئایا لەبەر ئەوەیە کە (نەفسی من) لە (نەفسی ئەوان) گەورەترە، بۆیە بۆ پەروەردەکردنم ئاتاجی مامەڵەیەکی سەختترم؟

هەموو ڕۆژێ یەکەم کەس من ڕادەبم، لە جۆگە نزیکەکە ئاو دەهێنم، ئینجا لە کوانووەکە ئاگر دەکەمەوە، نانی کونجیدار دەکەم. بۆ قاوەڵتی شۆربا ئامادە دەکەم. ئاخر ئاسان نییە بۆ پەنجا کەس خواردن دابین بکەیت، چونکە پێویستە هەموو خواردنەکان لە مەنجەڵگەلێ لێبنرێن کە گەرەیی هەریەکێکیان لە قەوارەی حەوزی گەرماوەکان کەمتر نییە. جا ئەوە بێننە بەرچاوتان کێ پاکیاندەکاتەوە و دەیانشوات. من لە بەیانییەوە تا ئێوارە هەموو کاتەکانم بە پاککردنەوەی زەوی و سەربان و قاڵدرمە بەسەر دەبەم و حەوشە گسک دەدەم و دار دەبڕم. چەندین سەعات بە سڕینەوە و پاککردنەوەی تەختەبەندە کۆنەکانی زەویی ژوورەکان بەسەر دەستەکانم و ئەژنۆکانم کووڕ دەبمەوە، کە جیڕەجیڕیان لێوە دێت. مرەبای پرتەقاڵ و خۆراکی گەرم ئامادە دەکەم و گێزەر و کولەکە سوێر دەکەم و بە وریاییەوە بڕێکی گونجاوی خوێ بەکار دێنم بە جۆرێ نابێت بەشی تامی هێلکەیەکی زیاد بێت. خۆ ئەگەر بڕێکی زۆرتر یا کەمتر خوێم تێکردبا، ئەوا چێشتلێنەرەکە تووشی نۆرە تووڕەییەک دەبوو، ئەوسا هەموو شتێکی بەسەر یەکدا دەشکاند و دەبوو سەرلەنوێ هەموو شتێ ئامادە بکەمەوە.

لە هەموو ئەوانە خراپتر، ئەوە بوو لە کاتی کارکردنندا داوای لێدەکردم کە بە زمانی عەرەبی دوعا بخوێنم، داوایشی لێدەکردم بە دەنگی بەرز ئەو نزایانە بڵێمەوە تا دڵنیا بێت کە وشەیەکم بیر نەچووە، بۆیە من پێکەوە نوێژ دەکەم و کار دەکەم، کار دەکەم و نوێژ دەکەم. ئازاردەرەکەم لافی ئەوەی لێدەدا کە: (کوڕی خۆم، لە ناندیندا چەند بەرگەی زەحمەتییەکان بگریت، زیاتر پێدەگەیت و لەگەڵ فێربوونی چێشتلێناندا، وردەوردە ڕۆحت پێدەگات).

جارێکیان لێیم پرسی: (بەڵام ئەم ئەزموونە تا کەی بەردەوام دەبێت؟) .

لە وەڵامـدا گـوتی: (هەزار و یەک ڕۆژ، مـادام لە توانـای شـەهرەزادی حەکایەتخواندا بووبێت کە بە درێژایی ئەم ماوەیە هەموو شەوێک حەکایەتێکی تازە دروست بکات، ئەوا لە توانای تۆشدا هەیە بەرگەی ئەوە بگریت).

ئەمە شێتییە! ئایا لە نێوان من و شـەهرەزاددا چ لێکچوونێک هەیە؟ ئـاخر هەمـوو ئەوەی ئەو دەیکرد ئەوە بـوو لەسـەر نـوێنێکی مەخمەڵی ڕادەکشا و پەنـجەی پێیەکـانی دەجووڵانـد و دەنکەترێـی شـیرینی دەکـردە دەمـی پاشـا گێلەکەوە و چیرۆکی خەیاڵیی دروستدەکرد و خەیاڵێکی تیژیشی نەبوو. پێم وا نییە کە کارێکی قورسـی کردبێت، هەروەها پێم وا نییە گەر داوای لـێ کرابا نیـوەی ئەوە بکـات کە مـن دەیـکەم، هەفتەیەک بەرگەی نەدەگـرت. نـازانم ئایـا کەس هەیە ڕۆژەکان بژمێرێت، بەڵام بێگومـان مـن دەیانژمێرم، ئەوەتـا هێشتا ٦٢٤ ڕۆژ لە پێشم ماوە.

لە ئەزموونەکەمدا چل ڕۆژی یەکەمم لە ژوورێکی بچکۆلەی نزم بەسـەر دەبـرد کە نەمـدەتوانی ڕابکشێم یـا بە پێوە بوەسـتم، بۆیە لێدەبڕام بەردەوام لەسـەر چۆکەکـانم دانیـشم. گەر ئـارەزووی خـواردنێکی بـاش یـان کەمـێ پشوودانم کردبا، یان لە تـاریکی یـان لە تەنیایی ترسـابام، یـا خـودانەکەران بە ئـافرەتێکەوە شـەیتانی بووبـام، داوای لێـدەکردم کە ئەو زەنـگە مـسییەی لە بنمیچەکەوە شۆڕبووبووەوە لێبدەم تا یـارمەتیی ڕۆحیم بدات. وەلـێ مـن قەت ئەوەم نەدەکرد، خۆ ئەمەش وا ناگەیەنێت کە من ئەو بیرە هەڵەقومەڵەقانەم بە خەیاڵدا نەهـاتووە کە بنیـادەم کەیفـساز دەکەن، بەڵام چ هەڵەیەک لەوەدایە کە بیری هەڵەقومەڵەق بە خەیاڵی مرۆڤێکدا بێت کە بەندکراوێکی بێ جووڵە بێت؟

دوای تەواوبوونی خەڵوەتەکە، دەبوو بۆ ناندینەکە بگەڕێمەوە تـا بەدەست چێـشتلێنەرەکەوە ئازارەکـانم دەسـت پێـبکەنەوە، بێگومـان بەڕاسـتی ئـازارم دەچەشـت، بەڵام ئەو ڕاستییە تـاڵەی کە بەقەد تاڵیچەشـتنەکەم بـوو ئەوە بـوو قەت لە ڕێنماییەکـانی چێـشتلێنەرەکە لام نەدەدا - تـا ئەو ئێـوارەیەی کە شەمـسی تەورێـزی گەیـشتە جـێ. لەو شـەوەدا کە لە کۆتاییـدا چێشتلێنەرەکە دەستی لێم گیربوو، تێروپڕی لێدام، داردەستە قەڵەم تۆزەکان یەک لە دوای

یەک لەسەر پشتم دەشکان. ئینجا هەردوو پێڵاوەکەمی لە بەردەرگا دانا کە نوکەکانیان ڕووەو دەرەوە بوون، ئەمەش نیشانەی ئەوەبوو کە کاتی ئەوە هاتووە بڕۆم. لە تەکێی دەروێشەکاندا دەرت ناکەن و بە ئاشکرا پێت ناڵێن کە تۆ سەرکەتوو نەبوویت، بەڵکو وات لێدەکەن بە بێدەنگی بڕۆیت.

(ناتوانین بە زۆر بتکەین بە دەروێش)، چێشتلێنەرەکە ئەمەی درکاند، (چونکە بنیادەم دەتوانێت کەرێک بباتە سەر ئاو، بەڵام ناتوانێت بە زۆر ئاوی دەرخوارد بدات. دەبێ کەرەکە خۆی ئامادەیی تێدا بێت، لەمەش زیاتر ڕێگەیەکی تر نییە).

بێگومان مەبەستی ئەوە بوو کە من کەرم. لە ڕاستیدا گەر شەمسی تەورێزی نەبوایە، دەمێ بوو بەتەمابووم ئەم شوێنە جێ بهێڵم، کەواتە ختووکەی پتر ناسینی ئەو وای لێکردم لەم شوێنە چەق ببەستم، چونکە لەوەوپێش من کەسێکی وەک ئەوم نەدیبوو. ئاخر ئەو لە کەس نەدەترسا، ملکەچی کەس نەبوو، تەنانەت چێشتلێنەرەکەش زۆر ڕێزی دەگرت. گەر لەم تەکێیەدا گەر پێشەنگێ هەبووبێت و هی ئەوە بێت چاوی لێ بکرێ، تەنها شەمسی تەورێزی بە ئەفسوونەکەی و ئابڕوومەندییەکەی و یاخیبوونەکەیەوە بوو، نەک مامۆستا و شێخە خاکەراکەی تەکێکە.

بەڵێ، شەمسی تەورێزی لە بەرچاوی من قارەمانێک بوو. دوای ئەوەی کە بینیم، زانیم من حەوەجەی ئەوە نیم کە ببم بە دەروێشێکی سەلار. گەر ماوەیەکی زۆرم لەگەڵیدا بەسەر بردبا، ئەوا دەبوومە کەسێکی پێشەنگ و بەوەج و سەرکێش، بۆیە کە پایز داهات، زانیم شەمس دەڕوات و ئیتر ناگەڕێتەوە، بڕیارم دا لەگەڵیدا بڕۆم.

دوای ئەوەی خۆم یەکلا کردەوە، چووم چاوم بە باوەزەمان بکەوێت، بینیم دانیشتووە و لەبەر ڕووناکیی فانۆسێک کتێبێکی کۆن دەخوێنێتەوە.

(هێی فەقێ، چیت دەوێ؟)، وەک ئەوەی بە بینینی من بێتاقەت بووبێت، بە بێتاقەتییەوە لێی پرسیم.

بەگوێرەی ئەو توانای قسەلەڕووییەی هەمبوو، گوتم: (گەورەم، زانیومە بەم زووانە شەمسی تەورێزی دەڕوات. دەمەوێ لەگەڵیدا بڕۆم، ڕەنگە لە سەفەرەکەیدا ئاتاجی هاودەمێک بێت).

(نەمدەزانی تۆ ئاوها هۆگری بوویت)، سەید بە گومانەوە پێی گوتم: (یاخود بۆیە وا دەڵێیت تا لە کارکردنی نانەدین ڕابکەیت؟ هێشتا ماوەی مەشقکردنەکەت تەواو نەبووە، هێشتا ماوتە ببیت بە دەروێش).

(ڕەنگە یاوەریکردنی کەسێکی وەک (شەمسی تەورێزی) لە سەفەرەکەیدا بۆ من باشترین مەشق بێت)، هەرچەندە زانیم قسەیەکی ئاوها ئازایەتیی دەوێ، لەگەڵ ئەوەشدا هەر گوتم.

سەید کەوتە بیرکردنەوەوە و چەند بێدەنگییەکەی درێژەی دەکێشا، ئەوەندە بڕوام بەوە زیاتر دەبوو کە لەسەر بێچاوڕووییەکەم سەرکۆنەم دەکات و بانگی چێشتلێنەرەکە دەکات، تا سزام بدات، بەڵام ئەوەی نەکرد، بەڵکو بە نائومێدییەوە تەماشای کردم و سەری لەقاند.

(ڕۆڵە، ڕەنگە تۆ بۆ ئەوە نەخوڵقابیت تا لەتەکیَ بژیت. لە نێوان هەر حەوت فەقێدا لە یەکێکیان زیاتر نامێنێتەوە و ئەوانی تر ئەم ڕێگەیە دەگرنەبەر.هەستەوەریم پێم دەڵێت کە تۆ بۆ ئەوە ناشێیت ببیتە دەروێش، بۆیە دەبێت لە شوێنێکی تر بەدوای بەش و چارەنووسی خۆتدا بگەڕێیت. دەربارەی یاوەریکردنی شەمسیش لە سەفەرەکەیدا، دەبێ لە خۆی بپرسیت). کە دەمودووەکەمان ئاوها کۆتایی هات، باوەزەمان بەسەر ئاماژەیەکی بەویَل و یەکلاکەرەوەی کرد و کۆتایی بە بابەتەکە هێنا و گەڕایەوە سەر کتێبەکەی. هەستم بە خەمباری و بچووکیی خۆم کرد، بەڵام بە ڕادەیەکی سەیر پێم وا بوو کە من ئازاد بووم.

## شەمس

**بەغدا، ٣٠ی ئەیلوولی ١٢٤٣**

بە سواری ئەسپەکەم لە کازیوەدا ڕووەو بایەکە تێم تەقاند، تەنها جارێک وەستام تا تەماشایەکی دواوە بکەم، تەکێی دەروێشەکانم بینی وەک هێلانەی پەلەوەر لە نێو دارتووەکان و درەختیلەکان تا دەهات ون دەبوو. دەموچاوی ماندووی باوەزەمان لە بەرچاوم بوو، دەمزانی نیگەرانی منە، بەڵام هۆکارێکی ڕاستەقینەی وام نەدەبینی وای لێ بکات تا نیگەران بێت.

ئیدی لە سەفەرێکی عەشقی ئاوهای ناوەوەمدا هەیپام لێکرد، ئیدی چۆن دەبێت تووشی زیان ببم؟ ئەمەش ڕێسای دەیەمە: **لە نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوا و باشوور و باکووردا جیاوازییەکی ئەوتۆ نییە. ئیدی ئاراستەت ڕووەو هەر لایەک بێت، ئەو سەفەرەی کە دەیکەیت دەبێت بیکەیت بە سەفەری ناوەوەی خۆت. گەر لە ناوەوەی خۆتدا سەفەرت کرد، ئەوە دەتوانیت دنیا پانوبەرینەکە و ئەوەی پشتیشییەوە ببڕیت.**

هەرچەندە پێشبینیی ئەوەم دەکرد کە ڕووبەڕووی هەندێ ئاستەنگ ببمەوە، وەلێ پەژارە داینەگرتم و ئەو چارەنووسەم بەخێرهێنا کە لە قۆنیا چاوەڕێم بوو. لەبەر ئەوەی من سۆفیم، فێری ئەوە بووبووم کە پێکەوە بە درک و گوڵ، بە دزێوی و جوانیی ژیان قایل بم. ئەمەش ڕێسایەکی دیکەیە:

**کاتێ مامان کە دەبینێت دووگیانەکە لە کاتی ژاندا ئازار ناچێژێت، ئیدی دەزانێت هێشتا ڕێگە بۆ مەلۆتکەکە خۆش نەبووە، کەواتا جارێ منداڵی نابێت، جا بۆ ئەوەی نەفسێکی تازە لەدایک بێت، پێویستە ئازار هەبێت.**

هەر وەک چۆن خشتی سوور ئاتاجی گەرمییەکی بەرزە تا ڕەق بێت، خۆشەویستیش بە ئازار نەبێت کامڵ نابێت.

* * *

ئەو شەوەی پێش ئەوەی تەکێی دەروێشەکان جێ بهێڵم، پەنجەرەکانی ژوورەکەم والاکرد تا دەنگ و بۆنی تاریکی بێنە ژوورەوە. لەبەر پرتەپرتی ڕووناکی مۆمەکە، پرچە درێژەکەمم بڕی و چەند داوێکی زبری لێ کەوتە سەر زەوییەکە، ئینجا ڕیش و سمێڵم و هەردوو بڕۆم تاشی. کە لێبوومەوە، لەو ڕوخسارەی نێو ئاوێنەکە ورد بوومەوە کە پتر درەوشاوە و لاو دەینواند. دوای ئەوەی تووکەکانم لابرد، دەموچاوم لە هەر ناو و تەمەن و ڕەگەزێک خاڵیبووەوە و ئیدی نە ڕابردووی هەبوو نە بانەڕۆژ. لەم ساتەوە بۆ هەتاهەتایە داخرا.

بە هێوری گوتم: (بەڵێ، خۆم ئەوە دەزانم). ئەمەش ڕێسایەکی تری چل ڕێساکەیە: **"گەڕان بەدوای خۆشەویستیدا دەمانگۆڕێت. کەسێک نییە بەدوای خۆشەویستیدا بگەڕێت و لە کاتی سەفەرەکەیدا پێ نەگەیشتبێت. هەر ئەوەندە دەست بە سەفەری گەڕان بکەیت، ئیدی لە ناوەوە و لە دەرەوە دەست بە گۆڕان دەکەیت".**

باوەزەمان بە سووکە زەردەخەنەیەکەوە سندووقێکی مەخمەڵی دەرهێنا و پێشکەشی کردم. لە ناویدا سێ شتم بینی کە ئەمانە بوون: ئاوێنەیەکی زیوین، دەستبەسرێکی ئاوریشم و کەمۆڵەیەک کە عەتری تێدا بوو.

(ئەم شتانە ڕەنگە لە سەفەرەکەتدا یارمەتیت بدەن، کە ئاتاجیان بوویت بەکاریان بێنە. گەر بڕوات بە خۆت نەما، ئەوا ئاوێنەکە جوانیی ناوەوەت پیشان دەدات. ئەگەر هەستت کرد ناو و ناوبانگت لەکەیەکی گرتووە، ئەوا

دەستەسڕەکە یەکسەر بێگەردیی دڵت دێنێتەوە یاد، بەڵام عەترەکە برینەکانی ناوەوە و دەرەوەت تیمار دەکات).

دەستێکم لە هەریەکەیان دا، ئینجا سندووقەکەم داخست و سوپاسی باوەزەمانم کرد و گوتم: (پێم وایە تۆ ئیتر ناتەوێ شتێکی تر بڵێیت).

لەگەڵ گەردی بەیاندا، کاتێ چۆلەکەکان دەستیان بە جریوەجریو کرد، کە دڵۆپە ئاونگە بچووکەکان لەسەر لقەکانەوە دەستیان بە تکانەوە کرد، سواری ئەسپەکەم* بووم و بەرەو قۆنیا تێمتەقاند. نەمدەزانی چی چاوەڕێم دەکات، وەلێ لەو چارەنووسە دڵنیا بووم کە خودا بۆی نووسیبووم.

---

* نووسەر پێشتر ولاخەکەی شەمسی بە (ماین) ناوبردووە، بەلام لەمەولا بە درێژایی رۆمانەکە بە (ئەسپ) ناوی دەبات، بۆیە منیش هەر ئەسپم بەکار هێناوە. (و.کوردی).

# فەقێکە

## بەغدا، ٣٠ی ئەیلوولی ١٢٤٣

بەدوای شەمسی تەورێزیدا، بە سواری ئەو ئەسپەی کە دزیبووم، تێم تەقاند. تا لە توانامدا بوو هەوڵم دا مەودایەک لە نێوانماندا بهێڵمەوە، بۆم دەرکەوت ناکرێ بێ ئەوەی بمبینێت کە دوای کەوتووم، پێی بگەم.

کاتێ شەمس لە یەکێ لە بازاڕەکانی بەغدا وەستا تا کەمێ پشوو بدات و هەندێ پێویستیی سەفەر بکڕێت، بڕیارم دا خۆمی لێ ئاشکرا بکەم، ئیدی لە بەردەم ئەسپەکەی خۆم بە زەویدا دا.

"هێی لاوی نەناسی پرچسوور، ئەوە بۆ وا لەسەر زەوییەکە خۆت درێژ کردووە؟"، شەمس لەسەر پشتی ئەسپەکەیەوە نیوەشادمان و نیوە سەرسوڕماو بانگی کردم.

لە بەردەمیدا بە چۆکدا هاتم و وەک دەرۆزەکەران دەستەکانم پانکردەوە و ملم درێژ کرد، بە پاڕانەوەوە گوتم: "دەمەوێ یاوەریت بکەم. تکات لێدەکەم با لەگەڵتدا بێم".

"ئایا دەزانیت من بۆ کوێ دەڕۆم؟".

بێدەنگ بووم. بیرم لەم پرسیارە نەکردبووەوە، گوتم: "نەخێر، بەڵام ئەوە گرینگ نییە. من دەمەوێ ببمە مریدی تۆ. تۆ پێشەنگی منیت".

شەمس گوتی: "وا ڕاهاتووم بە تەنها سەفەر بکەم و نامەوێ مرید یان فەقێم هەبێت، سوپاست دەکەم! بێگومان من پێشەنگی کەس نیم، بە تایبەتی تۆ، دەی بە ڕێی خۆتدا بگەڕێوە، بەڵام ئەگەر لە بانەڕۆژدا بە دوای مامۆستایەکدا گەڕایت، تکایە ڕێسایەکی زێڕین بێنەوە یادت کە دەڵێت: **لەم دنیایەدا ژمارەی فێرکەری درۆزن و مامۆستای درۆزن لە ژمارەی ئەستێرە**

بینراوەکانی گەردوون زۆرترن. ئەو کەسە خۆپەرستانەی کە لە پای دەسەلاتدا کار دەکەن لەگەڵ مامۆستا راستەقینەکان تێکەڵ مەکە. مامۆستای رۆحیی راستگۆ سەرنجت بۆ خۆی راناکێشێت و چاوەڕێی ملکەچیی رەها، یان سەرسامیی تەواوی تۆ نییە، بەڵکو یارمەتیت دەدات تا بەهای خودی ناوەوەت بزانیت و رێزی بگریت. مامۆستا راستەقینەکان وەک شووشە روونن و نووری خودایان پێدا تێدەپەڕێت".

"تکات لێدەکەم هەڵیکم بدەرێ"، لێی پاڕامەوە، "هەموو گەریدە بەناوبانگەکان کەسێکیان وەک مرید یان خزمەتکار هەبووە لە بارگەخستن و رۆیشتنیاندا، یارمەتییان داون".

شەمس وەک ئەوەی دڵان بە راستیی قسەکانمدا بنێت، بەدەم ریشخوراندنەوە پرسیی: "ئایا دەتوانیت یاوەریم بکەیت؟".

راپەڕیم و بەرزەپێ هەستام، لە هەموو دڵمەوە سەرم لەقاند و گوتم: "بێگومان، لە ناخەوە حەز دەکەم".

"کەواتە باشە. یەکەم ئەرکت ئەوەیە: دەمەوێ روو بکەیتە نزیکترین مەیخانە و داوای دەفرێکی پڕ شەراب بکەیت، بیهێنیت و لێرە لە بازاڕەکەدا بیخۆیتەوە".

منێک کە بە عەباکەم زەویی ژوورەکانم پاکدەکردەوە، مەنجەڵەکانم وا سپی دەکردەوە، وەک شووشەی جوانی ڤینیسیا دەبریسکانەوە، کە لە لای یەکێک لە پیشەوەرەکان بینیبووم و زۆر دەمێ بوو کاتێ خاچپەرستەکان دایان بەسەر شارەکەدا لە قوستەنتینە تالانیان کردبوو، هەروەها دەتوانم بە یەک دانیشتن سەد پیاز پاک بکەم، یان لەتەسیر بجنم، هەموو ئەمانەشم بە ناوی گەشەکردنی رۆحەوە دەکرد، بەڵام خواردنەوەی شەراب لەنێو هەموو خەڵکی و لە بازاڕدا لە سەرووی توانای منەوەیە، بۆیە ئیدی بە ترسەوە تێیم روانی.

"ناتوانم ئەوە بکەم. گەر باوکم بزانێت، لاقەکانم دەشکێنێت. ئاخر ئەو منی بۆ تەکیی دەروێشەکان ناردووە تا ببمە موسڵمانێکی چاکەخواز، نەک ببمە یەکێ لە گاورانی بتپەرست. ئاخر خانەوادەکەم و هاوڕێکانم چیم پێ دەڵێن؟".

هەستم بە نیگا سووتێنەرەکەی شەمس کرد کە ئاراستەی کردم. هەموو جەستەم کەوتە لەرزین، هەر وەک چۆن ئەوسا کەوتە لەرزین، کاتێ لە پشت دەرگا داخراوەکانەوە خۆم لێ داگرتبوو.

"وەک دەبینی ناکرێ ببیتە یاوەرم"، ئەمەی بە ڕیتمێک گوت بۆنی تاوانبارکردنی لێدەهات، "تۆ زۆر بایەخ بە بۆچوونی خەڵک دەدەیت، تۆ ئەمەت زانیوە؟ زۆر بەتەنگ بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خەڵکەوەیت، ئێ هەرچەند هەوڵیش بدەیت لە ڕەخنەیان ڕزگار نابیت".

زانیم کە هەلی یاوەریکردنیم وا دوور دەکەوێتەوە، ئیدی دەستم بە بەرگریکردن لەخۆ کرد، "چۆن بتوانم کە بزانم تۆ بەم پرسیارە تاقیم ناکەیتەوە؟ ئاخر ئیسلام شەرابی حەرام کردووە"، "بەڵام ئەمە گەمەکردنە بە خودا. ئەرکی ئێمە ئەوە نییە کە یەکێکمان بڕیار لەسەر بڕوای ئەوی تر بدات"، شەمس ئاوها وەڵامی دامەوە.

بە نائومێدی دیقەتی دەوروبەری خۆم دا و نەمدەزانی چۆن وەڵامی قسەکانی بدەمەوە، مەژگم وەک هەویری هەڵاتە تێک هەڵدەچوو.

شەمس لەسەر قسەکەی ڕۆیشت و وتی: "تۆ دەڵێیت گوایا دەتەوێ ڕێگەکە ببڕیت، لێ ناتهەوێ لەپای وەدیهێنانی ئەم ئامانجە، قوربانی بە هیچ شتێ بدەیت. سامان یان هێز یان نێوبانگ یان زێدەڕۆیی یان چێژی جەستەیی. گەرەکە یەکەم جار لەو شتانە خۆت ڕزگار بکەیت کە لای مرۆڤ ئازیزن".

شەمس لەسەر ئەسپەکەی جێی خۆی خۆشکرد و بەمە کۆتایی بە قسەکەی هێنا: "پێم وایە دەبێ بۆ بەغدا بۆ لای خێزانەکەت بگەڕێیتەوە، منەی پیشەوەرێکی ڕاستگۆ بکە و لە بەردەستیدا فێربە. وای بۆ دەچم ڕەنگە ڕۆژێ بێت ببیتە بازرگانێکی باش، بەڵام چاوچنۆک مەبە. ڕێگەم بدە گەرەکە بڕۆم ".

بەم شێویە بۆ دواجار دوعاخوازیی لێکردم و ئاوزەنگی لە ئەسپەکەی دا، تێیتەقاند و دوورکەوتەوە، دنیا لەژێر سمەکانی ئەسپەکەیدا گرمەی دەهات و دەخزی. خۆم هەڵدایە سەر ئەسپەکەم و بەرەو دەرەوەی بەغدا دووی کەوتم، بەڵام مەودای نێوانمان تا دەهات زۆرتر دەبوو، تا بوو بە خاڵێکی تاریک و دوور، تەنانەت تا دوای ماوەیەکی زۆر کە خاڵە تاریکەکەش لە ئاسۆوە دیار نەمابوو، هەستم بە کاریگەریی نیگای شەمس دەکرد.

# ئیلا

## نۆرتامبتۆن، ٢٤ی ئایاری ٢٠٠٨

بەیانیی هەموو ڕۆژێک، ئیدی کۆتایی پشووی هەفتە بوایە یان ڕۆژەکانی تر، ئێلا ڕووی دەکردە نانخانەکە و بە خۆی دەوت ژەمی قاوەڵتیی باش، ڕەوتی پاشماوەی ڕۆژەکە دیاری دەکات، چونکە پێی وا بوو ژەمی بەیانیان گرینگترین ژەمی ڕۆژەکەیە. لە یەکێ لە گۆڤارەکانی تایبەت بە ئافرەتان خوێندبوویەوە کە ئەندامانی ئەو خێزانەی پێکەوە بە ڕێکوپێکی قاوەڵتی دەکەن، لە ئەندامانی ئەو خێزانە تەباتر و یەکگرتووترن کە بە نیوەتێری لە ماڵ دەردەچن. هەرچەندە وەک گۆڤارەکان باسیان دەکرد، بڕوای بەوە هەبوو کە دەبێت چێژ لە خواردنی بەیانیان وەربگرێت، بەڵام ئەزموونی لەگەڵ ژەمی بەیانیاندا وەک پێکدادانی هەسارەکان وا بوو، چونکە لە خواردندا هەر یەکێ لە ئەندامانی خێزانەکەی ئارەزوویەکی جیاوازی هەبوو و هەریەکەیان حەزی لە خواردنێکی جیا بوو، ئەمەش دژی بیرۆکەی پێکەوە نانخواردنی ئێلا بوو. ئیدی چۆن لە سەر مێزی نانخواردن هەماهەنگی دروست دەبێت، کاتێ جانێت لەتە نانێک بە مرەباوە دەقرتێنێت و ئافی نانی تێری بە هەنگوینەوە دەخوات و دەیڤید چاوەڕێیە قاپێ هێلکەی کوڵاوی بێتە بەردەم، ئۆرلیش نایهەوێ هیچ بخوات؟ سەرباری هەموو ئەمانە، ژەمی بەیانی گرینگ بوو و بەیانیی هەموو ڕۆژێ ئامادەی دەکرد. سووربوو لەسەر ئەوەی کە نابێت هیچ یەکێ لە منداڵەکانی ڕۆژەکەی بە خواردنی پارچە پسکیتێک، یان خواردنێکی دیکەی هەرزان، دەست پێبکات.

بەڵام ئەم بەیانییە کە ئێلا چووە نانخانەکە، یەکەم شتێ کە کردی ئەوە بوو لە بەردەم مێزی نانخواردنەکە دانیشت و کۆمپیوتەرەکەی کردەوە.

لەجیاتی ئەوەی قاوە یان خۆشاوی پرتەقاڵ ئامادە بکات، یان نان بکات، ئینتەرنێتەکەی کردەوە تا بزانێت ئاخۆ عەزیز نامەی ئەلیکترۆنیی بۆ ناردووە. ئای لەو خۆشییە کە نامەیەکی بینی!

**ئێلای ئازیز**

کە زانیم نێوان تۆ و کچەکەت باش بووە شادمان بووم. دوێنێ دەمەوبەیان گوندی مۆمۆستینانگۆم جێهێشت. سەیر لەوەدا بوو من جگە لە چەند ڕۆژێ زیاتر لەوێ نەمامەوە، کەچی کە کاتی دوعاخوازی هات زۆر خەمبار بووم، بەڵکو هەستم بە خەمۆکی دەکرد. لە خۆم پرسی ئاخۆ جارێکی دی دەتوانم لە گواتیمالا ئەم گوندە بچووکە ببینمەوە؟ پێم وا نییە.

هەر جارێ ماڵئاوایی لە شوێنێ بکەم کە خۆشم دەوێ، هەست دەکەم پاژێک لە خۆمی تێدا جێدەهێڵم. وام بە خەیاڵدا دێت، گەر ئێمە وەک مارکۆپۆلۆ گەڕیدەیی هەڵبژێرین، یان لەنێو بێشکەوە تا ناو گۆڕ لە هەمان شوێن بمێنینەوە، ئەوا ژیان دەبێتە زنجیرەیەک لە لەدایکبوون و مردن، چونکە چرکەساتێک لەدایک دەبیت و لەوی تردا دەمریت. جا بۆ ئەوەی تاقیکردنەوەی نوێ دەربکەون، تاقیکردنەوەی کۆن دەپووکێنەوە. ئەرێ تۆش پێت وا نییە؟

کە لە مۆمۆستینانگۆ بووم، دەستم بە ڕامان کرد و هەوڵم دا ڕەنگ و خەرمانەی تۆ وێنا بکەم. هەر زوو سێ ڕەنگ لە بەردەممدا دەرکەوتن کە ئەمانە بوون: زەردێکی گەرم، پرتەقاڵییەکی شەرمێون، ئەرخەوانی. وام مەزەندە کرد کە ئەمانە ڕەنگەکانی تۆن، بە خەیاڵمدا هات کە ئەمانە چ بە جیا بن یان پێکەوە بن، ڕەنگگەلێکی جوانن.

لە گواتیمالا، تشاگۆل دوا وێستگەمە – شارۆچکەیەکە خانووەکانی پەرش و بڵاو و لە قوڕ دروستکراون. حیکمەتێک لە چاوانی منداڵەکانیاندایە لە سەرووی تەمەنیانەوەیە. ئافرەتەکانی لە هەموو جۆرە تەمەنێک لە ماڵەکانی خۆیاندا خەریکی چنینی فەرشی سەر دیوارن کە بە نەخشی نایاب ڕازاونەتەوە. داوام لە پیرێژنێک کرد کە فەرشێکی سەر دیوارم بۆ هەڵبژێرێت، پێم گوت کە بۆ خاتوونێکی دەنێرم لە نۆرتامبتۆن دەژی. دوای ئەوەی کەمەکێک بیری کردەوە، لەنێو کۆمەڵە فەرشێکی زۆری پشت خۆیەوە، فەرشێکی ڕاکێشا. بە خودا سوێندی خوارد، ئەو کۆمەڵە پتر لە پەنجا فەرشی

لە هەموو ڕەنگەکان تێدا بووە، بەڵام ئەو فەرشەی کە بۆ تۆی هەڵبژارد، تەنها بە سێ ڕەنگ چنرابوو: زەرد و پرتەقاڵی و وەنەوشەیی. وا بزانم تۆ حەز دەکەیت ئەم ڕێکەوتە بزانیت، گەر لەمەدا شتێ هەبێت، ئەوا هەر لە خوداوەیە.
ئایا بە خەیاڵتدا هاتووە کە نامەگۆڕینەوەی نێوانمان ڕەنگە لە ڕێکەوتەوە نەبێت.

## لەگەڵ سڵاوی گەرممدا
## عەزیز

تێبینی: گەر ویستت، دەتوانم فەرشەکەت بە پۆستدا بۆ بنێرم، یان تا ئەو ڕۆژە دێت چاومان بە یەک بکەوێت و کوپێ قاوە پێکەوە بخۆینەوە، چاوەڕێ بکەم و خۆم پێشکەشتی بکەم.
ئێلا چاوەکانی نوقاند و هەوڵی دا ئەوە وێنا بکات کە چۆن ڕەنگەکانی دەوری خەرمانەی دەموچاوی دەدەن. سەیر لەوەدا بوو کە ئەو وێنەیەی لە خەیاڵیدا بەرجەستە بووبوو، ئەو وێنەیە نەبوو کە هی ژنێکی لە تەمەن خۆیدا بێت، بەڵکو وێنەی ئەو کاتەیەتی کە کیژۆڵەیەکی حەوت ساڵان بوو.
بیرەوەرییەکی زۆر هەڵدەقوڵان و بۆ لای دەگەڕانەوە، یادەوەریگەلێ بوون وایدەزانی دەمێکە لە بیری چوونەتەوە. وێنەی دایکی کە وەستاوە و پشتێنێکی فستقیی سەوزئاماڵی بەدەوری کەمەریدا بەستووە و کوپێکی پێوانەکردنی بەدەستەوەیە، ماسکێکی خۆڵەمێشی ئازاراوی دەموچاوی داپۆشیوە، چەندین دڵی کاغەزینی درەوشاوە و بریقەدار بە دیوارەکەوە هەڵواسراوە.
جەستەی باوکی وەک ئەوەی بیەوێ لەگەڵ کەرەسەی ڕازاندنەوەی جەژنی لەدایکبوون تێکەڵ بێت، لە بنمیچەکەوە شۆڕبووەتەوە و شێوەیەکی دڵگیری بە ماڵەکە بەخشیوە. بیری کەوتەوە چۆن ساڵانی هەرزەکاریی بەسەر بردووە، چۆن بەرپرسیارێتیی خۆکوشتنەکەی باوکی خستە ئەستۆی دایکی. کە ئێلا هێشتا کیژۆڵەیەکی بچووک بوو، بەڵێنی بە خۆی دا کە شووی کرد دەبێت مێردەکەی بەختەوەر بکات و نابێت وەک دایکی لە شووکردندا سەرکەوتوو نەبێت. بەپێی توانا هەوڵبدات هاوسەرگیرییەکەی لەوەی دایکی

جیا بێت، شووی بە پیاوێکی کریستیانی نەکرد، بەڵکو پێی باش بوو هەر لە ئایینەکەی خۆی شوو بە پیاوێک بکات.

ئەوە چەند ساڵێکی کەمە ئێلا وازی لەوە هێناوە کە ڕقی لە دایکە پیرێژنەکەی بێتەوە. هەرچەندە لەم دواییەدا نێوانیان باش بووە، لێ کە یادی ڕابردوو دەکاتەوە، هێشتا لە ناخەوە دڵتەنگییەک دایدەگرێت.

"دایکە! ...خاک دایکمانە! خاک دایکمانە".

ئێلا لە دوای خۆیەوە شەپۆلێک پێکەنین و چپەچپی ژنەوت. کە ئاوڕی دایەوە، بینیی چوار جووت چاو چاودێریی دەکەن. بۆ یەکەمین جار، ئۆرلی و ئافی و جانێت و دەیڤید پێکەوە بۆ قاوەڵتیکردن هاتن. هەموویان بە تەنیشت یەکەوە وەستان و وەک ئەوەی بوونەوەرێکی نامۆ بێت، تێیان دەڕوانی. لە شێوەی تەماشاکردنەکەیانەوە دیار بوو کە ئەوان دەمێ بوو لەوێ وەستاون و هەوڵیان داوە سەرنجی ڕابکێشن.

ئێلا بە زەردەخەنەوە گوتی: "بەیانیی هەمووتان باش".

"ئەوە گوێت لێمان نەبوو؟"، ئۆرلی بە سەرسوڕمانەوە لێی پرسی.

دەیڤید بێ ئەوەی تەماشای بکات، وتی: "تۆ تەواو نوقمی نێو ئەو شاشەیە بووبوویت".

ئێلا دوای نیگای شووەکەی کەوت و لەسەر شاشەکراوەکەی بەرانبەری نامەیەکی عەزیز . ز. زاهارای بینی کە بە شێوەیەکی کاڵ بریسکەی دەدا. بە پەلە بەبێ کوژاندنەوە کۆمپیوتەرەکەی داخست.

"چەند نامەیەکی پەخشکاری ئەدەبی هەیە، دەبێ بیانخوێنمەوە"، ئێلا لەسەری ڕۆیشت، "خەریکی نووسینی ڕاپۆرتەکەم بووم".

ئافی بە دەموچاوێکی گرژەوە گوتی: "نەخێر، تۆ نامە ئەلیکترۆنییەکانت دەخوێندەوە".

ئێلا لە خۆی پرسی ئاخۆ چی وای لە منداڵە هەرزەکارەکانی کردووە ئاوها ڕژد بن و خەوشی یەکتر و درۆی ئەوانی تر ئاشکرا بکەن؟ بەڵام کە ئەوان بە لای بابەتەکەدا نەچوون، بەڵکو تەماشای شوێنێکی دیکەیان دەکرد و چاویان بڕیبووە مێزی نانخواردنەکە، بۆیە هەستی بە ئاسوودەیی کرد.

ئۆرلی لای بە لای ئێلادا کردەوە و لەبری هەموویان پرسیی: "دایکە، بۆچی ئەم بەیانییە ژەمی قاوەڵتیت ئامادە نەکردووە؟"

ئێلا بەرەو مێزەکە ئاوڕیدایەوە و بینیی کە ئەوەی ئەوان تەماشایان دەکرد، نە قاوەی لێ بوو نە هێلکەی کوڵاو و نە نانی گەرم و نە مرەبای ترێ. چەند جارێ سەری بادا و وەک ئەوەی لە ناوەوەیدا بەو دەنگە قایل بێت کە ڕاستییەکی حاشاهەڵنەگر دەدرکێنێت.

ڕاستە، لەبەر خۆوە گوتی چۆن بیرت چوو خواردنی بەیانی دروست بکەیت؟

## بەشی دووەم

# ئاو
# شتە شلەمەنییەکان دەگۆڕێن و
# پێشبینی ناکرێن

# ڕۆمی

## قونیا، ١٥ی تشرینی یەکەم ١٢٤٤

بینیم مانگە پڕ و درەوشاوەکەی ئاسمان لە مروارییەکی نایاب و هەڵواسراو دەچوو، لەنێو جێگەکەم ڕابووم و لە پەنجەرەکەوە تەماشای حەوشەکەم کرد کە لێوانلێوبوو لە تریفەی مانگ، لێ ئەم جوانییە دڵڕفێنەی کە دیتم خورپەی دڵم و لەرزینی دەستەکانمی سووک نەکرد.

"ئەفەندی، تۆ ڕەنگت زەرد هەڵگەڕاوە. ئایا دیسان خەونت بینیوە؟"، هاوسەرەکەم بە نەرمی وای پێ گوتم، "جامێ ئاوت بۆ بێنم؟".

دڵنیام کردەوە و داوام لێکرد کە بۆ ناو جێیەکەی بگەڕێتەوە و ناتوانێت هیچ شتێ بکات، چونکە خەونەکانمان بەشێکن لە چارەنووسمان و خودا چۆنی بوێت ئاوها ڕەوتی خۆیان وەردگرن. بە خۆمم گوت بێگومان هۆیەک هەیە وام لێدەکات کە هەموو شەوێک لەو چل شەوەی ڕابردوو هەمان خەون ببینم. لە هەر جارێکدا سەرەتای خەونەکە کەمێ جیاواز بوو، یان ڕەنگە بەردەوام هەمان خەون بووبێت، بەڵام ئەوە من بووم لە هەر شەوێکدا لە خانەیەکی جیاوە ململانێم کردووە.

ئەمجارە لە ژوورێکی بە فەرش ڕاخراو و ئاشنا خۆم بینی قورئانم دەخوێند، بەڵام لە هیچ شوێنێ لەو شوێنانە نەدەچوو کە پێشتر بینیبوومن. دەروێشێکی باڵابەرز و باریکەلە لە بەرانبەرم قیت دانیشتبوو، دەمامکێ لەسەر دەموچاوی بوو و مۆمدانێکی بە دەستەوە بوو، پێنج مۆمی داگیرساوی تێدا بوو، ڕووناکییان بۆ دەکردم تا بتوانم بخوێنمەوە.

دوای کەمێ سەرم هەڵبڕی تا دەروێشەکە لەو چامەیە ئاگاداربکەمەوە کە دەمخوێندەوە. وای لەو ترسەی کە دایگرتم، ئاخر ئەوەی من بە مۆمدانم

دەزانی، دەستی ڕاستەی پیاوێک بوو. کە دەروێشەکە دەستی بۆ درێژکردم، بینیم هەر پەنجەیەک لە پەنجەکانی داگیرسابوون.

بە ترسەوە تەماشای دەوروبەری خۆم کرد و لە ئاو دەگەڕام، بەڵام چەند چاوم گێڕا، ئاوم دەست نەکەوت. ئیدی عەباکەم لە بەر خۆم داکەند و دام بە سەر دەروێشەکەدا تا ئاگرەکە بکوژێنمەوە.

کاتێ عەباکەم بەرزکردەوە، ئەو نەمابوو و لە دوای خۆی مۆمێکی داگیرساوی جێهێشتبوو.

لەوساوە وام لێهاتووە بەردەوام هەمان خەونم دەبینی. لە ماڵەکەدا بەدوایدا دەگەڕام و هەموو گۆشە و سووچێکم دەپشکنی. دواجار بەرەو حەوشەکە ڕامکرد، گوڵەکانی ناو حەوشەکە لە دەریایەکی ڕەنگی زەردی درەوشاوەدا پشکوتووبوون. بە ڕاست و چەپدا بانگم کرد، وەلێ لە هیچ شوێنێ پیاوەکەم نەدی.

"هۆو خۆشەویست بگەڕێوە، تۆ لە کوێیت؟".

لە کۆتاییدا وەک ئەوەی هەستەوەرییەکی شووم پێش خۆی دابم، لە بیرەکە نزیک بوومەوە و لە بنی تاریکیی بیرەکەدا تەماشای ئاوەکە و شەپۆلەکەیم کرد. سەرەتا هیچم نەدی، لێ دوای کەمێ، لە تریفە ڕووناکەکەی مانگ لێوانلێو بووم و حەوشەکەی ڕووناک کردەوە. ئەوسا دوو چاوی ڕەشم بینی کە لە بنی بیرەکەوە بە خەمێکی بێپێشینە نیگایان دەکردم.

"کوشتیان"، یەکێ بانگی کرد، ڕەنگە ئەوە هەر دەنگی خۆم بووبێت. لەوانەیە دەنگەکەی خۆم لە دۆخی ئازارێکی بێبڕانەوەدا، وا دەرکەوتبێت.

ئیدی هاوارم کرد و هاوارم کرد، تا هاوسەرەکەم بە توندی گرتمی و بە سینگی خۆوەی نوساندم. بە ناسکی لێی پرسیم "ئەفەندی، دیسان هەمان خەونت دیوە؟".

* * *

دوای ئەوەی کیرا دووبارە نوستەوە، بەرەو حەوشەکە دزەم کرد. لەو ساتەدا ئەو سەرنجەم لا دروست بوو، کە هێشتا خەونەکە بە ڕوونی و ترسناکییەوە دەبینم. لە کپیی شەوەکەدا بە بینینی بیرەکە تەزوویەک بە هەموو جەستەمدا تێپەڕی، بەڵام توانام نەبوو لە تەنیشتییەوە دابنیشم، ئیدی بۆ سرتەی شنەی شەوبای نێو درەختەکان گوێم هەڵخست.

لە کاتی ئاوهادا، نۆرەخەمێک دایدەگرتم و نەمدەزانی بەوای چییەوەیە. ئاخر منێک ژیانی خۆم دروستکردووە و ئەوەی بەهەویای بووم وەدیم هێناوە. خودا سێ شتی ئازیزی پێ ڕەوا بینیوم کە ئەمانەن: زانست، چاکەخوازی، توانای یارمەتیدانی خەڵکی تا بەدوای خودادا بگەڕێن.

دوای ئەوەی گەیشتمە تەمەنی سیوهەشتساڵی، خودا لەوە زۆرتری پێ بەخشیم کە داوام دەکرد. خوێندم تا بووم بە وتارخوێن و زانایەکی ئیسلامی و شەرعی، زانستەکانی عیرفانم خوێند، ئەمەش زانستێکە بە پلەی جیاجیا تەنها بە پێغەمبەران و پیاوچاکان و زانایانی ئایینی دەبەخشرێ. بە موچیاری باوکم خودا لێی خۆش بێت، لە لای باشترین زانایانی سەردەمەکەمان خوێندم و بۆ قووڵکردنەوەی باوەڕەکەم کە ئەرکێکە خودا منی بۆ تایبەتمەند کردووە، دەوانێکی زۆرم دا.

سەید بورهانەدینی کۆنەمامۆستام دەیگوت من لەو کەسانەم کە خودا زۆر خۆشی دەوێن، چونکە بۆ ئەم ئەرکە پیرۆزە ڕاسپێردراوم تا پەیامەکەی بگەیەنمە بەندەکانی و بۆ جیاکردنەوەی دادوبێدادی کۆمەکیان بکەم.

چەندین ساڵ لە حوجرە خوێندم، لەگەڵ زانایانی دیکەی ئایینناسیدا لە لاهووتم کۆڵییەوە، فەقێکانم فێرکرد و لە زانستی ئایینی و فەرمووودەم کۆڵییەوە و وتاری هەینیم لە گەورەترین مزگەوتەکانی شاردا خوێندەوە. بە دەگمەن ناوی ئەو فەقێیانەم لە بیردەچوو کە وانەم پێ گوتبوونەوە. هەست بە زیادەڕۆیی ئەو کەسانە دەکەم کە لێیان دەبیستم دەڵێن گوایە یەکجار ئاتاجی ئەو وتارانەی من بوون و ڕێنوێنیی کردوون و ژیانیانی گۆڕیوە.

خودا بە خێزانێکی خۆشەویست و برادەری باش و مریدی دڵسۆز خەڵاتی کردووم. لە ژیانمدا هەژاری و نەبوونیم نەچەشتووە، هەرچەندە بە لەدەستدانی یەکەمین هاوسەرم ئێشێکی توندم پێگەیشت و پێم وا بوو ئیتر ژن

ناهێنمەوە، بەڵام ژنم هێنا. لە سایەی کیراوە ژیانێکی پڕ خۆشی و گەشی ژیام. هەردوو کوڕەکەم گەورە بوون، لەگەڵ ئەوەشدا هەر ئەو پرسیارە دەکەم چۆن دەبێت یەکێکیان لەوی دیکە جیابێت. ئەو دووە مینا دوو تۆون، لەگەڵ ئەوەی بە تەنیشت یەکەوە و لە هەمان خاکدا ڕوێنراون و هەمان خۆر گەشەی پێداون و هەمان ئاو پاراوی کردوون، ئیدی سەریان دەرهێنا و دوو ڕووەکی تەواو جیایان لێ پەیدابوو. من شانازییان پێوە دەکەم، شانازی بەو کچەمانەوەش دەکەم کە هەڵمانگرتووەتەوە و خاوەن چەند بەهرەیەکی دەگمەنە. من پیاوێکی بەختەوەرم، بە ژیانی خۆم و بەو کۆمەڵەی کە تێیاندا دەژیم، ڕەزامەند و قایلم.

کەواتە بۆچی لە ناوەوەمدا هەست بە بۆشایی دەکەم و ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بۆشاییەکە قووڵ و هەراوتر دەبێت؟ وەک نەخۆشی ڕۆحم بۆگەن دەکات و بۆ هەر کوێیەک بڕۆم لەگەڵمدایە، وەک مشک هێمنە، بەڵام موزیر و دڕندەیە.

## شەمس

### قۆنیا، ١٧ی تشرینی یەکەم ١٢٤٤

بەرلەوەی لە دەروازەی هەر شارێک کە پێشتر نەم دی بێت، بچمە ژوورەوە، کەمێ دەوەستم تا سڵاو لە پیاوچاکان و پیرۆزەکان بکەم، ئیدی بە مردوو و زیندوویانەوە، بە ناسراو و گومناویانەوە. هەر کاتێ گەیشتبێتمە شوێنێکی نوێ، یەکەم شتێ کە کردوومە ئەوەیە فەرم لە پیاوچاکانی خێرخواز وەرگرتووە، ئیدی موسڵمان بووبن یان کریستیان یان جوولەکە بن، چونکە بڕوام وایە پیاوچاکان لە سەرووی ئەم ناولێنانە جیاوازە تووڕەهاتانەوەن، چونکە ئەوان سەر بە هەموو مرۆڤایەتین.

هەر ئەوەندە بۆ یەکەم جار لە مەودایەکی دوورەوە قۆنیام لێ دەرکەوت، ئەوەی لەوەپێش کردبووم لێرەش کردم، بەڵام شتێکی نائاسایی ڕووی دا. لەبری وەڵامدانەوەی سڵاوەکەم و فەڕ پێبەخشینم، پیاوچاکان وەک کێڵی وردوخاشبووی گۆڕەکان بێدەنگ بوون. دووبارە بە دەنگێکی بەرزتر و توندتر سڵاوم لێ کردنەوە، بەڵکو ئێ نەیانبیستبێتم. دیسان بێدەنگی باڵی کێشا. ئیدی زانیم ئەوان بە باشی گوێیان لە من بووە، بەڵام فەڕی خۆیان پێ نەبەخشیوم.

"پێم بڵێ ئەوە چی قەوماوە؟"، داوام لە (با)یەکە کرد تا بە درێژایی و پانایی وڵاتەکە قسەکانم بۆ پیاوچاکان و ڕێز لێگیراوەکان ببات.

دوای کەمەکێ بایەکە بە خۆ و وەڵامەوە گەڕایەوە و گوتی: "هۆ دەروێش، لەم شارەدا لە دوو شتی دژ بە یەکتر زیاتر نابینیت و لە نێوانیاندا شتی تر نییە، ئەویش یان خۆشەویستییەکی بێ غەلوغەشە، یان ڕقێکی ئەستوورە. ئێمە

ئاگادارت دەکەینەوە گەر بڕۆیت لەسەر بەرپرسیاریتیی خۆت دەچیتە ناو شارەکەوە".

وتم: "لەم بارەدا پێویست بە پەژارە ناکات، من تا ماوم خۆشەویستیی بێگەرد دەدۆزمەوە، ئەمەش بۆ من بەسە".

کاتێ پیاوچاکانی قۆنیا ئەوەیان بیست، فەری خۆیان پێ بەخشیم، بەڵام من بڕیارم دا لە چوونە نێوشارەکە پەلەنەکەم، ئەوە بوو لەژێر داربەڕوویەک دانیشتم. لەو دەمەدا کە ئەسپەکەم لەو گیاوگوڵانە دەلەوەڕا، دەستم بە تەماشاکردنی شارەکە کرد کە لە دووروا لێمەوە دیاربوو. منارەکانی قۆنیا لەبەر تیشکی خۆرەکە وەک پارچە بلوور دەبریسکانەوە. ناوبەناو وەڕینی سەگ و زەڕەی کەر و پێکەنینی منداڵان و دەنگی فرۆشیارانم دەبیست کە بە هەموو هێزیانەوە بانگیان دەکرد – دەنگگەلێکی ئاسایی کە نیشانەی دەنگەکانی شارێکە پڕە لە ژیان. لە خۆم پرسی ئاخۆ دەبێ لە پشت دەرگا داخراوەکان و پەنجەرە بە پەردە داپۆشراوەکان، جۆری شادمانی و خەم چی بن؟ لەبەر ئەوەی لەگەڵ ژیانی گەڕیدەییدا ڕاهاتبووم، بۆیە مانەوە لە شاردا کەمێ بێزاری دەکردم، بەڵام ڕێسایەکی بنچینەیی دیکەم هاتەوە یاد کە دەڵێت: **(هەوڵ مەدە بەرەنگاری ئەو گۆڕانکارییانە ببیتەوە کە ڕێت لێدەگرن، بەڵکو لێگەڕێ با ژیان لەناوتدا بژی. گەر ژیانت سەرەوژێر و قڵپەوە بوو، نیگەران مەبە. چۆن دەکرێ بزانیت کە ئەو شتەی لەگەڵیدا ڕاهاتوویت، لەو شتە باشترە کە بەڕێوەیە؟)**.

دەنگێکی ناسک لە زیندەخەوەکەم وەئاگای هێنام و گوتی: "دەروێش، سڵاوت لێ بێت".

کە ئاوڕم دایەوە، جوتیارێکی پێستئەسمەر و دەستوبازوو ئەستوور و سمێڵشۆڕم دی. سواری پەیتوونێک بووبوو کە گایەکی لەڕولاواز ڕایدەکێشا، ئەم گیانداره بەستەزمانە وا دیاربوو ها ئێستا ها نەختێکی تر گیانی دەردەچێت.

وەڵامم دایەوە: "سڵاو لە تۆش، بەرەکەتی خودات بەسەردا بڕژێت".

"ئەوە بۆ لێرە بە تەنیا دانیشتوویت؟ گەر لە سواری ئەسپەکەت ماندوو بوویت، ئەوە دەتوانم بتگەیەنم".

به زەردەخەنەوە پێم وت: "سوپاست دەکەم، پێم وایە بە پێیان بڕۆم لە گایەکەی تۆ زووتر دەگەمە جێ".

جوتیارەکە وتی: "گایەکەم بە کەم مەزانە"، هەستی بە سووکایەتی کرد، "ڕەنگە پیر و لاواز بووبێت، بەڵام ئازیزترین هاوڕێمە".

ئەم قسانەم بە دڵەوە نووسان، ئیدی بەرزەپێ ڕاپەڕیم و بەرانبەر جوتیارەکە دانوشتامەوە. ئاخر منێکی ساکاری پێکهاتەی بازنە فراوانەکەی خەڵقەندەکانی خودا، چۆن دەکرێ پێکهاتەیەکی دیکەی ئەم بازنەیە بە کەم بزانم، ئیدی ئەو پێکهاتەیە ئاژەڵ بێت یان مرۆڤ؟

گوتم: "داوای لێبووردن لە خۆت و لە گایەکەت دەکەم، تکات لێدەکەم بمبەخشە".

سێبەرێکی باوەڕنەکردن لەسەر ڕوخساری جوتیارەکە نەخش بوو. ماوەیەک لە شوێن خۆی وشک وەستا و وایزانی شۆخیی پێدەکەم، گوتی: "قەت هیچ کەسێ وای پێ نەوتووم". زەردەخەنەیەکی گەرمی بە ڕوومدا پژاند.

"مەبەستت ئەوەیە داوای لێبوردنم لە گایەکەت کرد؟".

"مەبەستم ئەمەشە، بەڵام قەت هیچ کەسێ داوای لێبوردنی لێ نەکردووم، بەڵکو گەر ڕوویشی دابێت ئەوە بە پێچەوانەوە بووە، بەردەوام منم تەوازۆ دەخوازمەوە. تەنانەت کاتێ خەڵکی هەڵەیەکم بەرانبەر دەکەن، هەر من داوای تەوازۆیان لێدەکەم".

بە بیستنی ئەوە نیگەران بووم، بە هێمنی گوتم: "قورئانی پیرۆز دەڵێت (مرۆڤمان لە باشترین شێوەدا دروستکرد)، ئەمەش ڕێسایەکە لە ڕێساکان ".

پرسیی: "کام ڕێسا؟ ".

**"خودا مژوولی تەواوکردنی دروستکردنی دەرەوە و ناوەوەی تۆیە. ئەو تەواو مژوولی تۆیە. هەر بنیادەمێک بریتییە لە کردەیەکی بەردەوام و لەسەرخۆ و بزواو، بەڵام بە خۆراگرییەکی بەرەو بەرکەماڵبوون. هەر یەکێ لە ئێمە بریتییە لە کارێکی هونەریی تەواونەکراو و لێبڕاوانە هەوڵی بەرکەماڵبوون دەدات. خودا لەگەڵ هەریەکەماندا بە جیا مامەڵە دەکات، چونکە مرۆڤایەتی تابلۆیەکی جوانە و شێوەکارێکی بەهرەمەند وێنەی کێشاوە، لە ڕووی بایەخیشەوە هەموو خاڵەکان لە تەواوکردنی وێنەکەدا یەکسانن".**

"ئایا هاتوویت تا گوێ لە وتارەکەش بگریت؟"، جوتیارەکە سەرلەنوێ بە بایەخەوە پرسیاری کرد و لەسەری ڕۆیشت: "وا دیارە شوێنەکە لە خەڵکی جمەی بێت. ئەو پیاوێکی مەزنە".

کە زانیم مەبەستی کێیە، دڵم بە توندی کەوتە خورپە، لێم پرسی: "پێم بڵێ جیاوازیی وتارەکانی ڕۆمی لە چیدایە؟".

جوتیارەکە بێدەنگ بوو و چاوی بڕییە ئاسۆی فراوان. وا دیاربوو کە بیری لە هەموو شوێنێکدا دەهات و دەچوو، بێ ئەوەی لە شوێنێکی دیاریکراو بگیرسێتەوە.

ئینجا وتی: "لە گوندی ڕزئیتەوە بە کۆمەڵێ دەردەسەرییەوە هاتم. سەرەتا برسێتی داهات، ئینجا مەغۆلەکان هاتن و ڕوویان دەکردە هەر دێیەک دەیانسووتاند و تاڵانیان دەکرد، بەڵام ئەوەی بە شارە گەورەکانیان کرد، خراپتر بوو. ئەوەبوو ئەرزەڕۆم و سیواس و قەیسەرییەیان داگیر کرد، هەرچی نێرینە بوو سەریان بڕین و ئافرەتانیان بە دیل گرت. بۆخۆم کەسێکم لە خۆشەویستانم لەدەست نەچووە یان ماڵم تێدا نەچووە، بەڵام شتێکی گرینگم لە دەست داوە، ئەویش خۆشی و گەشییە".

لێم پرسی: "ئەوە چی پەیوەندییەکی بە ڕۆمییەوە هەیە؟ ".

جوتیارەکە دووبارە چاوی بڕییەوە گایەکەی و بە ئاخافتنێکی خاڵی لە هەر ڕیتمێک، کەوتە بڵمەبڵم: "هەموو خەڵکی دەبێژن گەر گوێ لە وتارەکانی ڕۆمی بگریت، خەمەکانت دەڕەوێنەوە"؟

بەش بە حاڵی خۆم پێم وا نییە کە لەگەڵ خەمدا کێشەیەک هەبێت، بەڵکو تەواو بە پێچەوانەوەیە – ئەوە دووڕووییە کە خەڵکی بەختەوەر دەکات، بەڵام ڕاستی وایان لێدەکات هەست بە خەمباری بکەن، بەڵام ئەوەم بە جوتیارەکە نەوت، بەڵکو پێم گوت: "بۆچی تا قۆنیا هاوەڵیت نەکەم تا دەربارەی ڕۆمی پتر قسەم بۆ بکەیت؟".

هەوساری ئەسپەکەم بە گالیسکەکەوە بەست و سەرکەوتم و بە تەنیشت جوتیارەکەوە ڕۆنیشتم. کە زانیم گایەکە گوێ بە سەربارەکەی نادات، هەستم بە خۆشحاڵی کرد. بە شێوەیەکی بێزارکەر یەکجار لەسەرخۆ دەستی بە ڕۆیشتن کرد. جوتیارەکە لەتێ نان و پارچەیەک پەنیری بزنی پێدام و دەستم

به خواردنیان کرد. ئینجا به بەرچاوی نەنوستووی پیاوچاکانی شارەکەدا و لەژێر ئاسمانێکی سامال و شین و خۆرەتاوێکی داگیرساودا چووینە ناو قۆنیاوە.

"هاوڕێم خودا پشتیوانت بێت"، ئەمەم گوت و لەسەر گالیسکەکەیەوە قەڵەمبازێکم دا و هەوساری ئەسپەکەم کردەوە.

"لە بیرت نەچێت ئامادەی وتارەکان بیت"، جوتیارەکە بە پەرۆشەوە بانگی کردم. سەرم لەقاند و بە ئاماژەی دەست دوعاخوازیم لێکرد، گوتم "گەر خودا مەیلی لێ بێت".

لەگەڵ ئەوەی ئەڵهای بیستنی وتارەکە و چاوەڕێی بینینی ڕۆمی بووم، بەڵام سەرەتا ویستم لە شارەکەدا هەندێ کات بەسەر ببەم، بۆ ئەوەی یەکەم جار دەربارەی ئەم وتاربێژە مەزنە بۆچوونی دانیشتوانی شارەکە بزانم. دەمهەویست بەر لەوەی بە چاوی خۆم بیبینم، لە چاوی خەڵکەکەوە بیبینم، لە چاوی یار و نەیارەوە، چاوانێ خۆشیان دەوێ و چاوانێ ڕقیان لێیەتی.

# حەسەنی سواڵکەر

## قۆنیا، ١٧ی تشرینی یەکەم ١٢٤٤

باوەڕ دەکەیت یان نایکەیت، ئەوان بەم پاککەرەوە زەمینییە* دەڵێن (ئازاری پیرۆز). ئاخر منێکی گەڕوگولی لە یەمبووس** هەڵواسراو لەوە زیاتری ناوێ کە تەنیا بێڵن لە ناویاندا بێت، ئیدی مردوو بن یان زیندوو. لە شەقامەکاندا دایکەکان بۆ ترساندنی منداڵە هاروهاجەکانیان ئاماژە بە من دەکەن، منداڵان بەردبارانم دەکەن، خاوەن دوکانەکان لە بەردەم دوکانەکانیان دەرم دەکەن تا تووشی ئەو بەدبەختییەیان نەکەم کە بۆ هەر شوێنێ بڕۆم لەگەڵمدایە، ژنە دووگیانەکان کە چاویان بە من دەکەوێت لە ترسی ئەوەی منداڵی شێواویان نەبێت، ڕووی خۆیان دادەپۆشن. ئەوانە نەیاندەزانی چەند خۆیان لە من دوور بگرن، منیش بە هەمان شێوە خۆم لێیان دوور دەگرم تا لە نیگا توورەکانیان خۆم بپارێزم.

پێستم دەگۆڕا و ڕەش هەڵدەگەڕا و ئەستوور دەبوو، لەسەر هەردوو شانم و چۆکەکانم و باڵەکانم و دەموچاوم لە ڕەنگی هێلکەی پیس بە قەوارەی جیاجیا بڵق دەردەکەوتن و هەستم بە زوورانەوە و سووتانەوەیان دەکرد، بەڵام ئەوەندەی نەدەبرد ئێشەکەی نەدەما. ئەم پەڵانە گەورە دەبوون و هەڵدەئاوسان و کیسەی ناشیرینیان لێ پەیدا دەبوو، دەستەکانم چرنوکیان لێ پەیدا دەبوو و دەموچاوم بە ڕادەیەک دەگۆڕا هەر نەدەناسرایەوە. کە دەگەیشتمە دوادوایی، نەمدەتوانی پێڵووەکانم لێک بنێم. لیک بە دەممدا دەچۆڕایەوە و هەر لەخۆوە چاوەکانم فرمێسکیان دەڕژاند، شەش نینۆکی

---

* پاککەرەوەی زەمینی: دیوارێکی نێوان بەهەشت و دۆزەخە.

** یەمبووس: پێچێکی نێو دۆزەخە.

پەنجەکـانم کەوتـن و نینـۆکێکی تـرم خەریکبـوو دەکەوت. سـەیر لەوەدایە کە هێشتا جەستەم مووی پێوەیە، بۆیە دەبێ لەمەدا خۆم بە بەختەوەر بزانم. بیستبووم کە گەڕووەکـان فرێـدەدەنە دەرەوەی شـووراکانی شـار، بەڵام لەم شارەدا مادام گرویێ بوون بۆ ئاگادارکردنەوەی خەڵکی زەنگێکی پێیە تا لێی نزیک نەکەونەوە، وازیان لێی هێناوە تا لە ناوشار بژی.

هەروەهـا ڕێگەی دەرۆزەکردنیـان پێداوین، ئەمەش شـتێکی باشـە، چونکە گەر ئەوە نەکەین، لە برسان دەمرین. دەرۆزەکردن یەکێکە لەو دوو ڕێگەیەی پێـی دەژیـین، بەڵام ڕێـگەی دووەم نـوێژکردنە، ئەمەش نەک لەبەر ئەوەی کە خودا چاودێرییەکی تایبەتی گەڕووەکان دەکات، بەڵکو هەندێ پێیان وایە کە بە هـۆیەکی سـەیرەوە ئەمە دەکـات، بـۆیە دانیـشتوانی شـارەکە بەقەد ئەوەی نەفرەتیان لـێ دەکـردین، بەو ئومێدەی بـڕێ زیـادە نـزا لە دەممـان دەربێنن، خۆشـیان دەویـستین و بـڕێ پـارە یـان خواردنیـان پێـدەداین. ڕەنـگە لە شەقامەکاندا گەڕووەکان لە سـەگ خراپتر مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێ، بەڵام لەو شوێنانەی کە تارمایی مەرگ یان نائومێدییان لێ دەردەکەوێت، ئەوا ئێمەمانان تێیدا دەبین بە پاشا.

کە داوام لـێ دەکرێ بەرانبەر هەندێ پارە بـۆ کەسـێک هەندێ نـزابکەم، سەرم بەردەدەمەوە و بە چەند وشەیەکی ناحاڵی بە عەرەبی بلمەبلمێک دەکەم و خـۆم وا پیـشان دەدەم کە نـوقمی نێـو نزاکـردن بـووم. هەمـوو ئەوەی لە دەستم دێت تـا بیکەم ئەوەیە زۆر لە خـۆم دەکەم، چونکە لەو بـاوەڕەدام کە خـودا نامبیـستێت، ئـێ هۆکارێکیـشم بەدەسـتەوە نیـیە وام لـێ بکـات کە ئەو دەمبیستێت.

هەرچەندە سواڵکردن قازانجێکی وای نییە، بەڵام لە نزاکرن پێم ئاسـانترە. خۆ هیچ نەبێت کەس هەڵناخەڵەتێنم. ڕۆژی هەینی بۆ دەرۆزەکردن باشـترین ڕۆژەکـانی هەفتەیە، بەڵام هەمـوو ڕۆژەکـانی ڕەمەزان بەهەرمێنە. دواهەمـین ڕۆژەکانی ڕەمەزانیش باشـترین ڕۆژی سـواڵکردنن، خەڵکی تەنـانەت ئەوانەی هیچیـان نیـیە، بـۆ زەکاتـدان کێبڕکـێ دەکەن، تـا خـودا لە گونـاهی سـەرەتا و کۆتاییـان خـۆش بێت، بۆیە دەبینین خەڵکی لە ساڵێکدا یەک جار لە سـواڵکەر ڕانـاکەن، بەڵکـو بەدوای سـواڵکەردا دەگەڕێن، ئیدی تـا سـواڵکەرەکە دامـاوتر

بێت، باشترە و شانازی بەوەوە دەکەن کە بەخشندەن و حەزیان لە چاکەیە. ئەوان تەنها کێبڕکێ لەسەر ئەوە ناکەن کە زەکاتمان بدەنێ، بەڵکو ئەو هەستەشمان لا دروست دەکەن کە لەو ڕۆژەدا خۆشیان دەوێین.

ڕەنگە ئەمڕۆ لە هەموو ڕۆژەکان بەهەرمێنتر بێت، چونکە ڕۆمی وتاری هەینیی دەخوێنێتەوە. مزگەوتەکە پڕە لە نوێژکەران و ئەوانەی لەناو مزگەوتەکە جێیان دەست ناکەوێت، لەناو حەوشەکە ڕیزدەبەستن. نوێژی عەسر بۆ نوێژکەران و گیرفانبڕان باشترین کاتە، ئەوانیش وەک من هەموویان لێرەن و لە ڕیزی نوێژکەرەکاندا بڵاوبوونەتەوە.

بەرانبەر مزگەوتەکە دانیشتم و پشتم دایە درەختێکی کەوەتەوە. هەوای دوای باران لە بۆنی شێ یەقی دابووەوە و تێکەڵی ئەو بۆنە خۆشە بووبوو کە لە باخە دوورەکانەوە هەڵیکردبوو. جامولکەی سواڵکردنەکەم لە بەردەم خۆم دانا. وەک سواڵکەرەکانی تر بە ئاشکرا داوای خێرم نەدەکرد. ئاخر گەڕوگول ئاتاجی ناڵە و گریان و پاڕانەوە نییە، حەوەجەی ئەوەش نییە هەندێ چیرۆک دروست بکات و کڵۆڵی و نەخۆشیی خۆی پیشان بدات، چونکە هەر بە بینینی دەموچاوم کاریگەری هەزار وشەی هەیە، بۆیە ڕووی خۆم هەڵماڵی و دانیشتم.

دوای سەعاتێ پارچە دراوی کانزایی یەک لەدوای یەک کەوتنە نێو جامولکەکەمەوە، هەرهەمووی پارچە مسی شکاوبوون. من ئەڵهای ئەوەم دەکرد پارچە زێڕێکم دەست بکەوێت کە هێمای خۆر یان شێر یان مانگی دووشەوەی لەسەر هەڵکۆڵرابێت. ئیدی لەوەتەی خوالێخۆشبوو عەلائەدین کەیقوباد یاسا سەپێنراوەکانی لەسەر دراوەکان سووک کرد، بڕیار درا هەموو ئەو پارە کانزاییانەی کە لە لایەن والییەکانی حەلەب و فەرمانڕەوا فاتمییەکانی قاهیرە و خەلیفەی بەغدا و فلۆرینی ئیتاڵی لێدەدرێن بۆ مامەڵە بەکاردێن، ئاوهاش فەرمانڕەوایانی قۆنیا بە سواڵکەرەکانی شاریشەوە هەموویان قایلن بەکاری بهێنن.

چەند پارچە پارەیەکی کانزایی و هەندێ پارەی وشکەی کاغەزین کەوتنە کۆشمەوە. گەڵازێڕین و مەیلەو سوورەکانی دارکەوەتەکەش دادەڕژان و کە بایەکی توند هەڵیکرد مینا درەختەکەش بیهەوێ خێرم پێ بکات، هەندێ لە گەڵاکانی کەوتنە ناو جامەکەمەوە. لەناکاو زانیم کە شتێکی هاوبەش من و دارکەوەتەکە کۆدەکاتەوە. ئەو درەختەی کە لە پایزدا گەڵاکانی دەوەرێن و لەو پیاوە دەچێت کاتێ دەگاتە دوا قۆناغەکانی نەخۆشیی گەڕوویی و پەلەکانی هەڵدەوەرن.

وەک درەختێکی ڕووت بووم. پێستم و ئەندامەکانم و دەموچاوم هەڵدەوەرین، ئیدی هەموو ڕۆژێ بەشێکی دیکەی جەستەم جێی دەهێشتم و وەک دارکەوەتەکە وەرزێکی بەهارم نەبوو گوڵەکانم تێیدا خونچە دەربکات. ئەوەی لەدەستی دەدەم، هەتاهەتایە لەدەستی دەدەم. کاتێ خەڵکی تەماشام دەکەن، بۆ ئەوە تەماشام ناکەن تا بزانن من کێم، بەڵکو تەماشای ئەوە دەکەن کە لەدەستی دەدەم. کاتێ پارچە دراوێکیان فڕێدەدایە نێو جامەکەمەوە، زۆر بە خێرایی فڕێیاندەدا و وەک ئەوەی گەر تەماشام بکەن تووشی نەخۆشییەکەم دەبن، خۆیان لە تەماشاکردنی چاوەکانم دەدزییەوە. من بە لای ئەوانەوە لە دزێک یان بکوژێک خراپتر بووم. هەرچەندە ئەوان ڕقیان لەو تاوانبارانە بوو و ڕەتیان دەکردنەوە، بەڵام بە شێوەی کەسانی نەبینراو مامەڵەیان لەگەڵدا نەدەکردن، بەڵام ئەوەی لە مندا دەیانبینی مەرگێک بوو لە دەموچاویانی دەڕوانی. ئەوەی دەیترساندن بینینی ئەو مەرگە نزیک و دزێوە بوو کە بەو ڕادەیە لێیانەوە نزیکە.

لەناکاو لە پشتەوە هاتوهاوارێک بەرزبووەوە، گوێم لێ بوو یەکێ هاواری دەکرد: "وا هات! وا ئەو هات!".

وەک چاوەڕوان دەکرا، ڕۆمی هات. سواری ئەسپێکی سپیی وەک چۆڕی شیر بووبوو، عەبایەکی عەنبەریی نایابی لە بەردا بوو کە بە گەڵای زێڕین و مرواریی بچووک نەخشێنرابوو، بە شانازی و حیکمەت و خانەدانییەوە خۆی قیت گرتبوو. حەشیمەتێک لە هەوادارانی و مریدانی دوای کەوتبوون. سەنگینی

و دڵنیایی لێ دەدرەوشایەوە، ئاوهاش وەک دەستڕۆیشتوویەک دەردەکەوت نەک زانایەکی ئایینی - دەسەڵاتداری با و ئاگر و ئاو و خاک - تەنانەت ئەسپە سەنگینەکەیشی وەک ئەوەی گرینگیی ئەو پیاوەی لەسەر پشتێتی بزانێت، بە ئارامییەوە وەستابوو.

پارەکانم ئاخنییە نێو گیرفانم و سەرم پێچایەوە و نیوەی دەموچاوم بە هەڵماڵراوی هێشتەوە و چوومە ناو مزگەوتەکەوە. مزگەوتەکە بە ڕادەیەک لە خەڵکی جمەی دەهات، هەستەمبوو بنیادەم بتوانێت هەناسە بدات، چجای شوێنێکی دەست بکەوێت و لێی دابنیشێت، بەڵام باشتر وایە شوێنەکە چەند جەنجاڵ بێت، گەڕوگول دەتوانێت شوێنی دەست بکەوێت، چونکە کەس نایەوێ لە تەنیشتییەوە دابنیشێت.

"براکانم"، ڕۆمی بەدەم قسەوە دەنگی بەرز و نزم دەکرد، "فراوانیی گەردوون وامان لێدەکات هەست بە بچووکی، بەڵکو بە بێبایەخیی خۆمان بکەین. ڕەنگە هەندێ بپرسن: "لە زانینی سنووردارییی من دەربارەی خودا دەکرێ چ واتایەکم دەست بکەوێت؟ ناوبەناو وام بە بیردا دێت ڕەنگە ئەم پرسیارە بە خەیاڵی زۆرتاندا بێت. لە وتاری ئەمڕۆدا، دەمەوێ هەندێ وەڵامی دیاریکراو دەربارەی ئەم پرسیارە بدۆزمەوە".

هەردوو کوڕەکەی ڕۆمی لە ڕیزی پێشەوە دانیشتبوون، قۆزەکەیان کە (سوڵتان وەلەد)ە هەموان دەڵێن لە دایکە خوالێخۆشبووەکەی دەچێت، عەلائەدینی کوڕە بچووکی دەموچاوی پڕ چالاکییە و چاوەکانی مەکراوین.

ڕۆمی لەسەر قسەکەی ڕۆیشت و گوتی: "مرۆڤ بە زانیارییی مەزنی ئەوتۆ خەڵاتکراوە، تەنانەت چیاکان و ئاسمانەکانیش ناتوانن هەڵی بگرن، بۆیە خودای گەورە دەفەرموێت (انا عرضنا الامانة علی السموات والارض والجبال فابین ان یحملنها واشفقن منهاوحملها الانسان - ئێمە ئاوەزمان بە ئاسمان و زەوی و چیاکان دا، بەڵام لێی ترسان و نەیانتوانی هەڵی بگرن، مرۆڤ هەڵیگرت). دوای ئەوەی ئەم پایە بەرزەی بە مرۆڤ بەخشی، پێویستە ئامانجیان لەوە کەمتر نەبێت کە خودا پێی بەخشیون".

ڕۆمی دەربارەی خودا قسەی دەکرد و پیتە بزوێنەکانی بە شێوەیەک دەدرکاند، مەگەر هەر زاناکان بتوانن ئاوها بیاندرکێنن. پێی لەسەر ئەوە دادەگرت کە خودا لە ئاسماندا لەسەر عەرشێکی دوور دانەنیشتووە، بەڵکو لە هەریەکەمانەوە نزیکە. هەروەها وتی جگە لە ئێش و ئازارچەشتن، هیچ شتێکی دیکە لە خودا نزیکمان ناخاتەوە.

"دەستت بەردەوام دەکرێتەوە و دادەخرێت، گەر وانەکەیت، تووشی ئیفلیجی دەبیت. لە هەموو گرژبوونەوە و خاوبوونەوەیەکدا تۆ هەبوویەکیت، جا با ئەو دووە بچووکیش بن، هەردووکیان مینا دوو باڵی پەلەوەر بە شێوەیەکی جوان هاوسەنگ و ڕێکن".

لە سەرەتاوە بە قسەکانی سەرسام بووم، ئەوەی دڵمیشی گەرم کرد، ئەو بیرۆکەیە بوو کە خۆشی و خەم وەک دوو باڵی باڵندە پشت بە یەکتر دەبەستن، بەڵام لە هەمان ساتدا هەستم بە شەپۆلێک تووڕەیی کرد کە بەرەو ئەوکم هەڵدەکشا.

ڕۆمییەک کە کوڕی پیاوێکی ناسراو و میراتگری خانەوادەیەکی دەوڵەمەندە و بە تێروتەسەلی دەژی، ئیدی دەربارەی ئێش و ئازار چی دەزانێت؟ هەرچەندە دەمزانی کە ژنی یەکەمی مردووە، بەڵام پێم وا نییە تووشی مەینەتییەکی ڕاستەقینە بووبێت. کە لەدایک بووە کەوچکی زیوی بۆ دەمی بردووە و لای باشترین زانایان خوێندوویەتی، هەمیشە خۆشەویست و نازڕاگیراو و ڕێزگیراو بووە، ئیدی چۆن زات دەکات دەربارەی ئێش و ئازار وتار بدات؟

بە دڵێکی خەمینەوە زانیم کە بەراوردکردنی نێوان من و ڕۆمی سوودێکی نییە. بیرم لە نادادپەروەری کردەوە، خودا هەژاری و نەخۆشی و کڵۆڵیی بە من بەخشیوە و بە ڕۆمی سامان و سەرکەوتن و حیکمەت، ناوبانگی پاک و ڕەفتاری باڵا. ئەو مەگەر چۆنها، دەنا سەر بەم دنیایە نییە، هەر هیچ نەبێ سەر بەم شارە نییە، بەڵام من تا خەڵکی بە بینینم سڵ نەکەنەوە، گەرەکە دەموچاوی خۆم هەڵبپێچم، کەچی ڕۆمی دەدرەوشێتەوە و مینا بەردی

گرانبەها دەبریسکێتەوە. لە خۆم پرسی گەر ئەو لە شوێن من بوایە چۆن ڕەفتاری دەکرد؟ ئایا قەت بە خەیاڵیدا هاتووە کە کەسێکی نموونەیی و خاوەن پایە و دەسکەوتی وەک ئەو ڕۆژێ پێی هەڵدەکەوێت و دەکەوێت؟ ئایا ڕۆژێ بیری لەوە کردووەتەوە گەر مرۆڤ تەنانەت بۆ تاقە ڕۆژێک نەفرەتلێکراو بێت، هەست بە چی دەکات؟ ئایا ڕۆمیی مەزن گەر ژیانێکی وەک ئەوەی من ژیابا، هەر ئاوها بە ژیاندۆستی دەمایەوە؟

لەگەڵ هەر پرسیارێکی نوێدا، بێزارتر دەبووم و هەموو سەرسامبوونەکەمی ڕادەماڵی. بە هەستێکی تاڵ و سەرەڕۆییەوە، هەستام و بەرەو دەرەوە ڕێی خۆم کردەوە، ژمارەیەک لە نوێژکەران بە تەوسەوە تەماشایان دەکردم و لەبەر خۆوە دەیانپرسی ئاخۆ دەبێ بۆچی وتارێک جێ بهێڵم کە خەڵکێکی زۆر بە پەرۆشەوە ئامادەی بوون.

# شەمس

## قونیا، ۱۷ی تشرینی یەکەمی ۱۲٤٤

بەدوای ئەو جوتیارەوە کە گەیاندمییە ناوەندی شار، شوێنی داکردنم بۆ خۆم و ئەسپەکەم دۆزییەوە. بۆم دەرکەوت کە خانی بازرگانانی شەکر بۆ من گونجاوە. لەو چوار ژوورەی پیشانیان دام، ئەو ژوورەم هەڵبژارد کە کەمترین کەلوپەلی تێدا بوو، حەسیرێک بۆ خەوتن راخرابوو، پەتۆیەکی بۆگەن و فانۆسێک کە خەریکبوو دەکوژایەوە، لەگەڵ خشتێکی کاڵ کە وەک سەرین بەکار دەهێنرا. هەموو دیمەنی شار بە تەپۆڵکەکانی دەوروبەریشییەوە لەوێوە دیاربوو.

دوای ئەوەی لە خانەکە جێگیر بووم، دەرچووم و لە شەقامەکان دەستم بە گەڕان کرد. لەو تێکەڵەیەی ئایینەکان و دابونەریتەکان و زمانەکان سەرم سوڕما کە دەوروبەرەکەیان پڕکردبوو، چونکە بەدەم ڕێوە قەرەجم بینی مۆزیکیان دەژەنی، ڕێبوارانی عەرەب و حەجکەرانی کریستیانی و بازرگانانی جوولەکە و کاهینانی بوودایی و شاعیرانی گەڕۆکی ئەورووپایی و هونەرمەندانی فارس و پاڵەوانانی چینی و جادووگەری هیندی و ئەفسوونگەرانی زەردەشتی و فەیلەسووفانی یۆنانیم بینی. لە بازاڕی کەنیزەکاندا ئافرەتانی سپییستی وەک چوڕی شیر و قولەڕەشی خەسێنراوم بینی کە لەو زەبری ترسەی چێشتبوویان، توانای قسەکردنیان لەدەست دابوو. لە بازاڕدا تووشی دەلاکی گەڕۆک بووم کە تفاقی کەڵەشاخگرتنەوەیان پێ بوو. فاڵگرەوەم بینی تۆپی بلوورینیان پێ بوو، جادووگەرانم بینی ئاگریان قووت دەدا. هەندێ حاجی بەرەو قودس دەڕۆیشتن، هەندێ دەربەدەرم دی مەزەندەم بۆ ئەوە چوو کە سەرباز بن و لە دواپەلاماری خاچپەرستەکاندا

هەڵاتبن. گوێم لێ بوو کەسانێک بە زمانی ئیتاڵی و فەرەنسی و ساکسۆنی یۆنانی و فارسی و تورکی و کوردی و ئەرمەنی و عیبری و چەندین شێوەزار قسە دەکەن و من لێیان تێناگەم. لەگەڵ جیاوازییە ڕواڵەتییە بێکۆتاییەکانیاندا، هەموویان لە کەموکووڕی و ناتەواویدا لە شتێکی لەیەکترچوو دەچوون، ئەویش ئەوەیە هەریەکەیان پارچەیەکی هونەریی تەواونەکراو پێکدێنن.

شارەکە لە تاوەری بابل دەچوو. بەردەوام هەموو شتێکی تێدا دەگۆڕا، لقی لێدەبووەوە، خۆی دەدایە بەر ڕووناکی، پەرت دەبوو، گەشەی دەکرد، ئینجا دەتوایەوە و بۆگەن دەبوو و دەمرد. لە جەنگەی ئەم ئاژاوەیەدا، لە شوێنێکی خامۆش و پەنا وەستام. گوێم بە دنیای دەوروبەری خۆم نەدا، لێ لە هەمان کاتدا بۆ هەموو ئەوانەی تێدەکۆشن و ئازار دەکێشن، هەستم بە خۆشەویستییەکی بێقەوام کرد. ڕێسایەکی زێڕینی دیکەم هاتەوە یاد کە ئەمەیە: **(ئاسانە خودایەکت خۆش بوێ کە خاوەنی کەماڵ و بێگەردی و پاکژی بێت، لێ لەوە قورستر ئەوەیە کە برامرۆڤەکانت بە هەموو کەموکووڕی و خەوشێکیانەوە خۆش بوێ. لە بیرت بێت کە مرۆڤ جگە لە توانای خۆشەویستی، هیچی تر نازانێت. بەبێ خۆشەویستی حیکمەت بەنرخی نەبووانە. گەر فێر نەبین چۆن ئافەریدەکانی خودامان خۆش بوێ، ئەوا ناتوانین خۆشەویستیی ڕاستەقینە لە دڵماندا بێت و بەڕاستی خودا بناسین).**

بەنێو کوچە و کۆڵانە تەنگەکاندا دەستم بە گەڕان کرد، لەوێ پیشەوەران لە تەمەنی جیاجیادا لە دوکانە بچووک و پەڕپووتەکانیان ڕەنجیان دەکێشا. ڕووم لە هەر شوێنێ کردبا لەنێو خەڵکی شارەکەدا باس باسی ڕۆمی بوو. لە خۆم پرسی کاتێ مرۆڤ ناوبانگ دەردەکات و دەبێتە جێی سەرنجی جەماوەرێکی زۆر، ئاخۆ دەبێ هەستی چۆن بێت؟ ئەی ئەوە چ کارێکی دەروونیی دەبێت؟ لە کاتێکدا بیرم بەم پرسیارانەوە مژوول بوو، ڕێگەی پێچەوانەی ئەو مزگەوتەم گرتە بەر کە ڕۆمی وتاری تێدا دەخوێندەوە، شوێنەکەی دەوروبەرم وردەوردە تا دەهات دەگۆڕا. تا بەرەو باکوور دەبوومەوە، ماڵەکان پەڕپووت و داڕووخاوتر و دیواری باخەکان ڕماوتر دەبوون و منداڵانی ژاوەژاوکەر و چەقاوەسوو زیاتر دەردەکەوتن، بۆنەکانیش گۆڕان و بۆنی بەهارات و سیر تیژتر بوون. لە کۆتاییدا گەیشتمە شەقامێک

سێ بۆنی لێ هەڵدەستا: شەراب، عەتر، شەهوەت. لێرەدا زانیم کە من گەیشتوومەتە بەشی هەژارنشینی شارەکە.

لە سەرووی شەقامە زۆر لێژەکەوە خانوویەکی پەڕپووت دیاربوو، دیوارەکانی بە کۆڵەکەی دارحەیزەران ڕاگیرابوون و سەربانەکەی گژوگیا دایپۆشی بوو. لە بەردەم ماڵەکە کۆمەڵێ ئافرەت دانیشتبوون و خەریکی دەمەتەقێ بوون. کە بینییان وا لێیان نزیک دەبمەوە، بە چاوی خۆتێهەڵقورتانەوە تەماشایان کردم، لێ دیاربوو گوێنەدەرەن. لە نزیک باخێک دانیشتبوون هەموو جۆرە گوڵێکی تێدا بوو و نایابترین بۆنیان لێ هەڵدەستا. لە خۆم پرسی تۆ بڵێی کێ سەرپەرشتیی ئەم باخە بکات؟

زۆر چاوەڕێم نەکرد و وەڵامەکەم دەستکەوت. کە گەیشتمە باخەکە دەرگای چوونەژوورەوەی ماڵەکە کرایەوە و ئافرەتێکی قەڵەوی لێ هاتە دەرەوە، خشڵی بەقەد خۆیەوە کردبوو و باڵابەرز بوو. کە چاوەکانی بە نیوەنوقاوی دادەخست، هەردوو چاوی وەک ئێستا دەمبینی لە تویێ گۆشتەکەیدا ون دەبوون. سمێڵێکی باریک و ڕەشی هەبوو و دوو گوارەی ئەستووری لە گوێ بوو. تا زانیم کە ئەمە هاوکات پیاوە و ژنیشە ماوەیەکی پێچوو.

"چیت دەوێ؟"، نێرەمووکەکە بە گومانەوە لێی پرسیم. بەردەوام سیمای دەموچاوی دەگۆڕا: لە ساتێکدا دەموچاوی وەک ئافرەت دەینواند، ئینجا دەگۆڕا و دەموچاوی پیاوێک جێگەی دەگرتەوە.

خۆم پێی ناساند و پرسیاری ناویم کرد، بەڵام خۆی لە پرسیارەکەم نەبان کرد.

"ئێرە شوێنی تۆ نییە"، ئەمەی گوت و مینا مێشێک لە خۆی دوور بخاتەوە دەستەکانی هەڵتەکاند.

"لەبەر چی؟".

"ئەی نابینیت کە ئەم شوێنە سۆزانیخانەیە؟ دەروێشینە، ئەی ئێوە سوێندتان نەخواردووە کە لە ئارەزووی سێکسی خۆتان دووربخەنەوە؟ هەرچەندە خەڵکی پێیان وایە کە من لێرە خەریکی گوناهکاریم، وەلێ خێر

دەکەم و لە مانگی ڕەمەزاندا دەرگاکانم دادەخەم. ئەمێستا دەمەوێ ڕزگارت بکەم. دەی دوورەوەبکەوە. لە شارەکەدا ئێرە پیسترین شوێنە".

بە نارەزاییەوە وتم: "پیسی لە ناوەوە خۆی حەشارداوە، نەک لە دەرەوە. ڕێساکە وا دەڵێت".

بە دەنگێکی بەرز گوتی: "ئەوە باسی چی دەکەیت؟".

"ئەمە یەکێکە لە چل ڕێساکە"، هەوڵم دا ڕوونی بکەمەوە: **(پیسیی ڕاستەقینە لە ناوەوە خۆی حەشار داوە، بەڵام پیسییەکەی تر بە شۆردن دەڕوات.**

**یەک جۆرە پیسی هەیە کە بە سازگارترین ئاو پاک نابێتەوە، ئەویش پیسیی ڕق و دەمارگیرییە و ڕۆح دەلەوتێنێت. دەتوانین جەستەمان بە خوداپەرستی و نوێژ پاکبکەینەوە، بەڵام تەنها خۆشەویستی دڵەکانمان پاک دەکاتەوە).**

ئەوەی گوتم نێرەمووکەکە گوێی پێ نەدا، گوتی: "هێی دەروێشینە، ئێوە ئاوەزتان لەدەست داوە. من لێرە لە هەموو جۆرە مەعمیلێکم هەیە، بەڵام دەروێش و ئێرە؟! گەر شاخیش لە سەرت بڕوێت، نایەڵم بچیتە ژوورەوە. ئاخر لەبەر ئەوەی خوداناسێک لە ڕێ دەردەکەین، خودا ئەم شوێنەمان بەسەردا دەڕووخێنێت و بەر نەفرەتی دەکەوین".

لە پێکەنیندا خۆم پێ بەرزەوت نەکرا و گوتم: "ئەم بیرۆکە تووڕەهاتانەت لە کوێوە هێنا؟ ئایا پێت وایە کە خودا باوکێکی مکێز دەمدەمییە و هەر کاتێ هەڵەیەکمان کرد لەئاسمانەوە بەرد و بۆقمان بەسەردا دەبارێنێت؟".

خاوەن سۆزانیخانەکە لایەکی سمێڵە باریکەکەی گرت و کەمێ بای دا و بە بێزاری و قینەوە تەماشای کردم؟

"نیگەران مەبە، من بۆ ئەوە بۆ ئێرە نەهاتووم تا سەر لە سۆزانیخانەکەت بدەم"، بۆ دڵنیاکردنەوەی ئەمەم گوت، "بەڵکو حەزم لە بینینی گوڵەکانی باخەکەت بوو".

"ئێ ئێ، کەواتە ئاوها"، نێرەمووکەکە بە تەوسەوە شانەکانی هەڵتەکاند، "کچێک ڕواندوونی کە لای من کاردەکات، ناوی گوڵی بیابانە".

نێرەمووکەکە ئاماژەی بۆ کچێکی جحێڵ کرد کە بەرانبەرمان لەناو لەشفرۆشەکان دانیشتبوو. دەموچاوی گەنمەمووی پێوە بوو، ناسک، پێستەکەی وەک مرواری دەدرەوشایەوە، چاوەکانی بادەمی و خەمێکیان لەسەر نیشتبوو، یەکجار جوان بوو. کە تەماشام کرد، هەستم کرد کە لەم شوێنە زۆر نامێنێتەوە.

بۆ ئەوەی جگە لە خاوەن سۆزانیخانەکە زیاتر کەسی تر نەمبیستێت، دەنگم نزم کردەوە و گوتم: 'ئەو کچە، کچێکی باشە. ڕۆژێک دێت بۆ گەڕان بەدوای خودادا دەست بە سەفەرێکی ڕۆحی دەکات. ئەو ئەم شوێنە جێدەهێڵێت و قەت بۆ ئێرە ناگەڕێتەوە. کە ئەو ڕۆژە هات هەوڵ مەدە ڕێگەی لێ بگریت'.

نێرەمووکەکە بە سەرسوڕمانەوە تەماشای کردم، پێش ئەوەی بتەقێتەوە گوتی: 'ئەوە تۆ دەڵێیت چی؟ کەس بۆی نییە فەرمانم پێ بکات کە لەگەڵ کچەکانم چی دەکەم! دەی لێرە بڕۆ، ئەگینا بانگی سەرچەقەڵ دەکەم'.

لێم پرسی: 'ئەو کەسە کێیە؟'.

'بڕوا بکە، پێم وا نییە کە تۆ بتەوێت تێبگەیت'، نێرەمووکەکە بەدەم قسەوە پەنجەکانی ڕادەوەشاند و پێی لەسەر ئەو خاڵە دادەگرت کە دەیەویست جەختی لەسەر بکات.

بە بیستنی ئەم ناوە نامۆیە کەمێ تەزووم پێدا هات، بەڵام گوێم بە شتەکە نەدا و گوتم: 'ئێستا دەڕۆم، بەڵام دەگەڕێمەوە، کە دووبارە چاوت پێم کەوتەوە سەرت سوڕنەمێنێت. من لەو خوداپەرستانە نیم کە ژیانی خۆیان لەسەر بەرماڵی نوێژکردن بە چۆکدادانەوە بەسەردەبەن و چاو و دڵی خۆیان بۆ دنیای دەرەوە دادەخەن و بۆ ڕووکەشی نەبێت قورئان ناخوێنن، بەڵام من لەمیانەی گوڵی پشکوتوو و باڵندە کۆچەرییەکانەوە دەیخوێنمەوە. من ئەو هەناسانەی قورئان دەخوێنمەوە کە لەمیانەی مرۆڤەوە تێدەپەڕن'.

'ئایا ئەمە وا دەگەیەنێت کە تۆ کەسەکان دەخوێنیتەوە؟'، خاوەن سۆزانیخانەکە بە تەوسەوە پێکەنی، 'ئەم شتە تووڕەهاتانە چییە؟'.

'هەر بنیادەمێک بریتییە لە کتێبێکی کراوە، هەریەکێ لە ئێمە قورئانێکی گەڕۆکە. گەڕان بەدوای خودادا لە دڵی هەمواندا هەڵدەقوڵێت، ئیدی ئەو کەسە

پیاوی خودا بێت یان قەدیسێک بێت یان داوێنپیس. لەو ساتەوەی لەدایک دەبین، خۆشەویستی لە دڵی هەریەکەماندا چەکەرە دەکات، ئیدی چاوەڕێی هەلێکە و لە کاتی خۆیدا دەردەکەوێت. هەر وەک یەکێک لە چل بنەماکە دەڵێت:
**لە ناوەوەی هەر مرۆڤێکدا هەموو گەردوون جێگیر بووە — لە ناوەوەی تۆ. ئەوەی لە دەوروبەری خۆتدا دەیبینی، بەو شتانەشەوە کە خۆشت ناوێن، تەنانەت ئەو کەسانەی کە بێزت لێیان دەبێتەوە و ڕقت لێیانە، بە پلەی جیاجیا لە ناوەوەتدا خۆیان جێگیر کردووە، بۆیە لە دەرەوەی نەفسی خۆت منەی شەیتانیش مەکە. شەیتان هێزێکی لەتوانا بەدەر نییە لە دەرەوە پەلامارت بدات، بەڵکو دەنگێکی خواساییە و لە ناوەوەتدا هەڵدەقوڵێت.**
**گەر بەتەواوی خۆتت ناسی و بە ڕاستگۆیی و دڵڕەقییەوە ڕووبەڕووی هەردوو لای تاریکی و ڕووناکی بوویتەوە، ئەوسا دەگەیتە باڵاترین شێوەکانی وشیاری و هەر ئەو دەمە خۆت دەناسیت، ئاوهاش خودا دەناسیت".**
نێرەمووکەکە هەردوو باسکی لەسەر سینگی تێکپەڕاند و بەرەو پێشەوە خۆی نوشتاندەوەوە، بە نیگایەکی هەڕەشەئامێزەوە تەماشای کردم. ئینجا وتی: "دەروێشێک و ئامۆژگاریی سۆزانییان بکات! من ئاگادارت دەکەمەوە، ڕێگەت نادەم بە بیرۆکە توورەهاتەکانت لێرە کەس بێزار بکەیت.
باشتر وایە لەم سۆزانیخانەیە دوور بکەویتەوە! چونکە گەر وا نەکەیت، سوێند دەخۆم کە (سەرچەقەڵ) ئەو زمانە درێژەت دەبڕێت و منیش بەوپەڕی لەزەتەوە دەیخۆم".

## ئێلا

### نۆرتامبتۆن، ٢٨ی ئایاری ٢٠٠٨

بە خەمبارییەوە ئێلا ڕابوو، نەک لەبەر ئەوەی گریانی دەهات، یان لەبەر ئەوەی شادمان نەبوو، بەڵکو لەبەر ئەوە خەمبار بوو، چونکە هەستی نەدەکرد کە ئارەزووی زەردەخەنەی هەیە تا شتەکان بە ئاسانی وەربگرێت. هەستی دەکرد وەک ئەوەی گەیشتبێتە خاڵێکی گرینگ و خۆی بۆ ئامادە نەکردووە. لەو کاتەدا لە نانـدینەکە قـاوەی ئامـادەدەکرد، لە چـاوی مێـزەکە لیـستی ئەو بڕیارانەی دەرهێنا کە تۆماری کردبوون. ئیدی دەستی بە خوێندنەوەیان کرد.

پێش ئەوەی بگەیتە تەمەنی چل ساڵی، دە شت هەن گەرەکە بیانکەیت:

١- کاتی خۆت بە باشـی ڕێک بـخە. باشـترین ڕێکخەر بە و تـا ئەوپەڕی پلان بۆ باش بەکارهێنانی کاتەکەت دابنێ. بۆ تۆمارکردنی پلانەکانی ڕۆژانەت، دەفتەرێکی تێبینی بکڕە. (جێبەجێ کرا).

٢- ڤیتامین و کانزا تەواوکەرەکان و دژە ئۆکساندن بۆ خواردنەکەت زیـاد بکە. (جێبەجێ کرا).

٣- بـۆ نەهێشتنی لۆچەکان شـتێک بکە. بەرهەمەکانی ئەلفا هایدرۆکسید تاقی بکەوە، کرێمی لۆریالی نوێ بەکار بێنە. (جێبەجێ کرا).

٤ – قوماشـی تـاخمی ناومـاڵ بگـۆڕە، درەختـی نـوێ بکـڕە، سـەرینی نـوێ بهێنە. (جێبەجێ کرا).

٥ – ژیانـــت و بەهاکانـــت و بیروباوەڕەکانـــت هەڵـــسەنگێنە. (بەتەواوی جێبەجێ نەکراوە).

٦- گۆشت لە لیستی خواردنەکانت دەربکە، هەموو هەفتەیەک لیستێکی تەندروست دابنێ، بەو شێوەیە ڕێزی جەستەت بگرە کە شایانێتی. (بەتەواوی جێبەجێ نەکراوە).

٧ - دەست بە خوێندنەوەی شیعرەکانی ڕۆمی بکە. (جێبەجێ کرا).

٨ - منداڵەکان بۆ برۆدوای بۆ شانۆیی مۆزیک ببە. (جێبەجێ کرا).

٩ - دەست بە نووسینی کتێبی چێشتلێنان بکە. (جێبەجێ نەکراوە).

١٠ - دڵت بۆ خۆشەویستی بکەوە.

ئێلا لێرە لە شوێن خۆی وەستا. چاوەکانی لەسەر بەندی دەیەمی لیستەکەی گیرکرد، نەیدەزانی ئایا دەبێت تێبینییەک لە تەنیشتی دابنێت یان نا. تەنانەت کاتێ ئەو بەندەی نووسی بەڕاستی خۆیشی نەیزانی مەبەستی چی بووە. ئەی بیری لە چی دەکردەوە؟ بە چپە بە خۆی گوت بێگومان ئەوە لەژێر کاریگەریی ڕۆمانی (کفری شیرین)ەوە بووە. بڕوای بە خۆی هێنا کە لەم دواییەدا زۆر بیر لە خۆشەویستی دەکاتەوە.

* *

سەیدا عەزیز

ئەمڕۆ ڕێکەوتی ڕۆژی لەدایکبوونمە! هەست دەکەم لە ژیانمدا گەیشتوومەتە خاڵێکی بنچینەیی. دەوترێ تەمەنی چل ساڵی بە تایبەتی بۆ ئافرەت ساتی یەکلاکەرەوەیە، هەروەها دەوترێ کە چل بۆخۆی سییەکی تازەیە (شەستیش چلێکی تازەیە)، لێ لە بەڕاست وەرگرتنی ئەوەدا بەگوێرەی ئارەزووی من شتەکە ئامانجێکی دوورە. مەبەستم ئەوەیە بە کێ پێدەکەنن؟ چل هەر چلە! پێم وایە ئەمێستا من هەموو شتێکم بە زیادەوە دەست دەکەوێت – زانستی زیاد، حیکمەتی زیاد، بێگومان لە چرچولۆچی و سپیبوونی پرچیش بەزیادەوە.

بەردەوام جەژنەکانی لەدایکبوون شادییان بە دڵم بەخشیوە، بەڵام ئەم بەیانییە کە لە خەو ڕابووم لەسەر سینگم هەستم بە قورساییەک کرد. پرسیارێکی زۆر گەورە ڕووبەڕووی ئافرەتێک دەکەمەوە کە هێشتا قاوەی

بەیانیی نەخواردووەتەوە. لە خۆم پرسی ئایا ئەو ڕێگەیەی لە ژیانمدا گرتمەبەر، هەر ئەو ڕێگەیەیە کە دەمهەوێ لەسەری بەردەوام بم؟

دوایی ترسێک دایگرتم. ئەی ئەگەر هەردوو وشەی بەڵێ و نەخێر بوونە مایەی ئەنجامگەلێکی خراپ؟ بۆیە وەڵامێکی دیکەم دۆزییەوە، ئەویش: ڕەنگە.

سڵاوی گەرمم

ئێلا

تێبینی: ببوورە، چونکە نەمتوانی نامەیەکی لەوە گەشبینانەتر بنووسم. نازانم بۆچی ئەمڕۆ هەست بە خەمۆکی دەکەم و خۆمیش نازانم هۆیەکەی چییە. (مەبەستم جگە لە گەیشتنم بە چل ساڵی، پێم وایە کە ئەمەیە ناویان ناوە تەنگژەی ناوەڕاستی تەمەن).

* * *

ئێلای ئازیز

جەژنی لەدایکبوونت پیرۆز! تەمەنی چل ساڵی بۆ پیاوان و ئافرەتان وەکو یەک جوانترین تەمەنە. ئایا دەزانیت کە چل لە بیری سۆفیگەریدا بۆ ڕاچەنینی ڕۆح هێمایە بۆ هەڵکشان لە ئاستێکەوە بۆ ئاستێکی باڵاتر؟ کاتێ تووشی خەمێک دەبین، بۆ ماوەی چل ڕۆژ خەمبار دەبین، کە منداڵێک لەدایک دەبێت تا چلەی دەچێت و بۆ ژیانی سەر زەوی ئامادە دەبێت چل ڕۆژ دەخایەنێت، کاتێ عاشق دەبین، دەبێ چل ڕۆژ چاوەڕێ بکەین تا لە ئاستی هەستەوەریمان دڵنیا دەبین.

تۆفانی نوح چل ڕۆژ بەردەوام بوو، لە کاتێکدا ئاو ژیانی وێران کرد، بەڵام هەموو خڵت و خاشاکێکیشی ڕاماڵی و توانای دایە مرۆڤ تا دەست بە ژیانێکی نوێ بکاتەوە. لە ئیسلامدا چل ئاستی سۆفیێتی هەیە کە مرۆڤ لە خودا جیادەکاتەوە. سەرباری ئەوە لەو شیاریدا چوار قۆناغی بنەڕەتی هەیە، لە هەر یەکەیاندا دە پلە هەیە و کۆی هەموویان دەبێتە چل. مەسیح چل شەو

و چل ڕۆژ ڕووی کردە چۆڵی و بێئاوەدانی. محەمەد لە تەمەنی چل ساڵیدا سرووشی بۆ هاتە خوارەوە. بوودا لەژێر درەختی زەیزەفۆن چل ڕۆژ لە ڕاماندا بوو. ئەمە جگە لە چل ڕێساکەی شەمس.

تۆ لە چل ساڵیدا ئەرکێکی نوێ و ژیانێکی نوێت دەکەوێتە ئەستۆ! ئیدی تۆ گەیشتوویتەتە ژمارەیەکی پیرۆز و لە هەموو ژمارەکان زیاتر مزگێنی و فەڕی پێیە. پیرۆزە! نەکەی خەم داتبگرێت لەبەر ئەوەی ساڵێک گەورەتربوویت. نە هێزی چرچولۆچی و نە سپێتیی سەر دەتوانن ڕووبەڕووی هێزی چل ببنەوە.

**بە هیوای بەختەوەری**

**عەزیز**

# گوڵی بیابانی لەشفرۆش

## قۆنیا، ١٧ی تشرینی یەکەم ١٢٤٤

**بۆچی هەندێ دەڵێن کە خەڵکی ڕقیان لە چارەی لەشفرۆشە، لە کاتێکدا** لە دێر زەمانەوە خانەی لەشفرۆشان کە ئافرەتانی وەک من لەخۆدەگرن، هەر هەبوون. بەمەش سەرم سوڕماوە کە هاوکات ژیان لەو لەشفرۆشە تاڵ دەکەن، کە دەیهەوێ تۆبە بکات و ژیانێکی نوێ دەست پێبکاتەوە؟ وەک ئەوەیە پێمان بێژن کە بەزەییان پێماندا دێتەوە، چونکە کەوتووینەتە نێو زلکاوەوە، بۆیە دەبێ هەتاهەتایە لەو شوێنە بمێنینەوە کە تێکەوتووین. ناتوانم هۆی ئەوە تێبگەم، بەڵام ئەوە دەزانم هەندێ کەس لەسەر بەدبەختی کەسانی تر دەژین و حەزناکەن ژمارەی بەدبەختەکانی سەر زەوی کەم ببنەوە، بەڵام هەرچییەک بڵێن یان بیکەن، ئەوا من ڕۆژێ لەم شوێنە هەر دەردەچم.

ئەم بەیانییە کە لە خەو ڕابووم، بۆ بیستنی وتاری ڕۆمیی مەزن ئارەزوویەکی سەرکێشانەم لا پەیدا بوو. گەر ڕاستییەکەم بە خاوەن سۆزانیخانەکە گوتبا و داوام لێ کردبا کە ڕێگەی ڕۆیشتنم بدات، ئەوا گاڵتەی پێدەکردم و دەیگوت: "ئەوە لەکەیەوە لەشفرۆشەکان ڕوو لە مزگەوت دەکەن؟"، ئیدی لە پێکەنیندا شەقی دەبرد و دەموچاوە خڕەکەی سوور هەڵدەگەڕا، بۆیە درۆم لەگەڵدا کرد. ئەوەبوو دوای ئەوەی ئەو دەروێشە ڕووتەڵەیە ڕۆیشت، دیاربوو بیری ئاڵۆز بووبوو، بۆیە هەستم کرد ئێستا کاتەکەی لەبارە تا بڕۆم قسەی لەگەڵدا بکەم. ئاخر مەگەر خەیاڵی بە بیرکردنەوەیەک مژوول بوایە، ئەگینا قسەی لەگەڵدا بەکردن نەدەهات. پێم وت بۆ کڕینی بڕێ پێویستی بۆ بازاڕ دەچم. باوەڕی پێکردم دوای نۆ ساڵ کارکردن لە لای، ئینجا وەک دێڵەسەگێک باوەڕی پێکردم.

وتی: "بە مەرجێک کونجی لەگەڵتدا بێت".

ئەوە کێشەیەک نەبوو، کونجیم خۆش دەویست، ئەو پیاوە قەڵەو و گۆشتنەی عەقڵی منداڵانە و ساویلکە و ڕاستگۆ و جێگەی بڕوا بوو. نازانم چۆن توانیبووی لەم دنیا پڕ دڵڕەقییەدا بژی. ئەمە بۆ من مەتەڵێک بوو. کەسێک ناوی ڕاستەقینەی نەدەزانی، ڕەنگە خۆیشی هەر نەیزانی بێت. ئەو ناوەمان بۆیە لێی نابوو، چونکە خووی دابووە خواردنی شیرینی بە کونجییەوە. کاتێ یەکێ لە لەشفرۆشەکان لە خانەی سۆزانییەکان بچوایەتە دەرەوە، وەک سێبەرێکی بێدەنگ یاوەریی دەکرد، بۆیە باشترین پاسەوان بوو کە دەمەویست یاوەرم بێت.

ئەو ڕێگە خۆڵەمان گرتەبەر کە بە باخەکاندا تێدەپەڕی. کە گەیشتینە یەکەم دووڕێیان، داوام لە کونجی کرد کە چاوەڕێم بکات. ئیدی لە پشت ئەو چاڵ و بارستە خۆڵانەی کە جانتایەکی پڕ لە جلی پیاوانەم تێدا شاردبووەوە، خۆم حەشار دا.

لەبەرکردنی جلی پیاوانە لەوە قورستربوو وەک بیرم لێکردبووەوە. جا بۆ ئەوەی سینگم تەخت دەربکەوێ، ملپێچی درێژم لە دەوری مەمکەکانم ئاڵاند، ئینجا شەرواڵێکی پان و بەروانکەیەکی لۆکە و عەبایەکی درێژ و سووری تێرم لە بەر کرد و مێزەرێکم لە سەرم بەست. ئینجا بە لەچکێک نیوەی دەموچاوم داپۆشی تا وەک عەرەبێکی ڕەوەند دەربکەوم.

که بۆ لای کونجی گەڕامەوە، سڵی کردەوە و سەری سوڕمابوو.

"دەی با بڕۆین"، ئەمەم گوت و هانم دا. کە بینیم لە شوێنی خۆی نابزوێت، دەموچاوی خۆم هەڵماڵی و پێم گوت "ئازیزم، ئەوە نامناسیتەوە؟".

"گوڵی بیابان، ئەرێ ئەوە تۆیت؟"، کونجی هاواری لێ هەستا و وەک منداڵێکی ترساو دەستی خستە سەر دەمی، "بۆچی ئەم جلانەت لە بەر کردووە؟".

"نهێنییەک هەیە، ئایا دەتوانیت بیشاریتەوە؟".

کونجی سەری بادا و چاوەکانی ئەبڵەق بوون.

بە چپە گوتم: "دەی با بۆ مزگەوت بڕۆین، بەڵام بە خاوەن سۆزانیخانەکە مەڵێ".

لچی کونجی کەوتە تەتەڵە و گوتی: "نا، نا. ئێمە بۆ بازاڕ دەڕۆین".
"بەڵێ ئازیزم، بەڵام یەکەم جار بۆ مزگەوت دەچین تا گوێ لە وتارەکەی ڕۆمیی مەزن بگرین".
بە هۆی گۆڕینی پلانەکەوە، وەک پێشبینیم کردبوو، کونجی لەرزی لێهات. بەپاڕانەوەوە پێم گوت: "تکات لێدەکەم، ئاخر ئەم شتە بۆ من زۆر گرینگە، گەر قایل بیت و بەڵێنم پێ بدەیت کە شتەکە بە کەس ناڵێیت، ئەوا پارچەیەک شیرینیی گەورەت بۆ دەکڕم". کونجی وەک ئەوەی قسەکە تامێکی شیرینی لە دەمیدا جێ هێشتبێت، بە خۆشحاڵییەوە بە زمان دەستی بە مڵچەملچ کرد.
بەهەویای پارچە شیرینییەکەوە، بەرەو ئەو مزگەوتە کەوتینە ڕێ، کە ڕۆمی وتارەکەی تێدا دەخوێندەوە.

* * *

لە دێیەکی بچووکی نزیک نیکیا لەدایک بووبووم. دایکم بەردەوام پێی دەوتم: "لە شوێنێکی گونجاو لەدایک بوویت، من لەوە دەترسام کە لەژێر ئەستێرەیەکی شوومدا لەدایک ببیت". ئەو دەمە ڕۆژگارەکە خراپ بوو و ساڵ لەدوای ساڵ شتەکان دەگۆڕان. سەرەتا دەنگۆ بڵاوبووەوە کە خاچپەرستەکان دەگەڕێنەوە، هەروەها چیرۆکی ترسناکمان دەربارەی ئەو کوشتارە دڕندانەیە دەبیست کە لە قوستەنتینە کردبوویان، کۆشکەکانیان داگیر کردبوون و تاڵانیان کردبوون و ئایکۆنەکانی کەنیسەکانیان شکاندبوون. دوایی هەواڵی هێرشەکانی سەلجووقییەکانمان بیست. پێش ئەوەی خەڵکی ئەو چیرۆکە ترسناکانە و ئەو تاوانانەیان بیربچێتەوە کە سوپای سەلجووقی کردبوویان، مەغۆلە بێبەزەییەکان هاتن. هەرچەندە ناو و ڕوخساری دوژمن دەگۆڕا، بەڵام ترسی پەلاماردەرە دەرەکییەکان وەک بەفر لەسەر لوتکەی چیای ئیدا وەک خۆی مایەوە.
دایبابم هەردووکیان نانکەر و کریستیانی باوەڕدار بوون. بۆنی نان کە لە نانەواخانەکەوە هەڵدەستا، یەکێکە لەو یادەوەرییانەی کە تا ئەمڕۆ هەر لەگەڵمدایە. خێزانێکی دەوڵەمەند نەبووین، هەر لە منداڵییەوە من ئەوەم دەزانی، بەڵام نەداریش نەبووین. لە چاوی هەژارەکاندا ئەو نیگایانەم دەبینی کە بۆ

نانەواخانەکە دەهاتن و بۆ وەدەستهێنانی لەتەنانێک سواڵیان دەکرد. هەموو شەوێ پێش ئەوەی بچمە نێو جێ، سوپاسی خودام دەکرد، چونکە بە برسێتی نەیناردوومەتە نێو نوێنی نوستنەوە. وا هەستم دەکرد کە هاوڕێیەکم دەدوێنم، چونکە ئەو دەمە خودا هاوڕێم بوو.

کە لە تەمەنی حەوت ساڵیدا بووم، دایکم دووگیان بوو. پێم وایە بەرلەوەی بە من دووگیان بێت، چەند جارێ منداڵی لەبار بردبوو، بەڵام لەو بارەیەوە هیچم نەدەزانی. ئەو دەمە من کیژۆڵەیەکی بێگوناه بووم، گەر لێیان پرسیبام منداڵ چۆن دروست دەبێت، دەمگوت خودا لە هەویرێکی شیرین و تەڕ دروستی دەکات.

بەڵام بێگومان ئەو مەلۆتکەیەی کە خودا بۆ دایکمی شێلا، گەورە بوو، چونکە ئەوەندەی نەبرد زگی هەڵاوسا و بەرزبووەوە، دایکمیش دەرمانی لێ بڕا و ئیدی نەیدەتوانی جووڵە بکات. مامانەکە گوتی کە گوایا ئاوبەن بووە، بۆیە ئازاری هەیە، بەڵام بە لای منەوە ئەوە شتێکی خراپ نەبوو.

ئەو شتەی نە دایکم و نە مامانەکەش دەیانزانی، ئەوە بوو یەک منداڵ لە زگیدا نەبوو، بەڵکو سێ منداڵ بوون و هەرسێکیانیش کوڕبوون. براکانم لەنێو منداڵدانی دایکمدا دەستیان بە شەڕ کرد، ئیدی یەکێکیان وەک ئەوەی بیهەوێ تۆڵە بکاتەوە، بە ناوکە پەتکەکەی، براکەی خۆی خنکاند. منداڵە مردووەکە دەریچەکەی داخست و ڕێگەی دەرچوونی لە دوو منداڵەکەی دیکە گرت. دایکم بە درێژایی چوار ڕۆژ بە ژانەوە مایەوە و شەو و ڕۆژ گوێمان لە هاواری بوو و جگە لە هاواری ئەو، گوێمان لە هیچی تر نەبوو.

مامانەکە کە نەیتوانی دایکم ڕزگاربکات، ئینجا بۆ ڕزگارکردنی براکانم هەرچی لە توانایدا بوو بەکاری هێنا. مقەسێکی بە دەستەوە گرت و زگی دایکمی هەڵدڕی. لە کۆتاییدا تەنیا منداڵێکیان ڕزگاری بوو. بەم جۆرە ئەو برایەم لەدایک بوو کە باوکم لێی خۆش نەبوو و لە ڕێورەسمی شتن و پاککردنەوەکەیشی ئامادە نەبوو.

دوای ئەوەی دایکم مرد، باوکم هەمیشە گرژ و مۆن بوو، ئیدی ژیانمان وەک جاران نەما، کارەکانمان لە نانەواخانەکەدا زۆر بە خێرایی هەرەسیان هێنا و مەعمیلەکانمان تەکینەوە. کە هەستم کرد لە هەژاری دەترسم و ڕەنگە

ڕۆژێ ناچاربم دەرۆزە بکەم، ئیدی نانەڕەقم لەژێر سەرینەکەم دەشاردەوە، تا وشک و ڕەق دەبوونەوە. براکەم سەختترین ئازاری دەچەشت. هەر هیچ نەبێ من لە ڕابردوودا خۆشەویستی و نازێکم پێ درابوو، لێ ئەو لە هەردووکیان بێبەش بوو. کە دەمبینی باوکم خراپ مامەڵەی لەگەڵدا دەکات، زۆر نیگەران دەبووم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شتێکم تێدا بوو ئاسوودەی دەکردم و ئەرخایەن بووم، چونکە بەوای ئەوەوە نەدەبوومە ئامانجی توورەییەکانی باوکم. ئاواتەخوازبووم بتوانم براکەم بپارێزم. خۆ ئەگەر وام لێ نەهاتبا، ئەوا ئەمڕۆ لێ نەدەبڕام لە قۆنیا لە خانەی سۆزانییەکان کاربکەم. ئای لە سەیروسەمەرەیی ژیان!

دوای ساڵێک لە مردنی دایکم، باوکم ژنی هێنایەوە. ئیدی تاقە جیاوازییەک کە بەسەر ژیانی براکەمدا هات، ئەوە بوو، باوەژنەکەم چووە پاڵ باوکم و بە هەمان خراپی مامەڵەی لەگەڵ براکەمدا دەکرد. ئیدی لە ماڵ هەڵدەهات، کە دەگەڕایەوە خراپترین خووی لەگەڵ خۆیدا دەهێنایەوە و هاوڕێیەتیی کەسانی خراپی دەکرد.

ڕۆژێکیان باوکم ئەوەندەی لێ دا خەریکبوو بیکوژێت. لەوەوە هەرزەکارەکە گۆڕا و لە چاوەکانیدا نیگایەکی توند و سارد و تازە دەرکەوتن. دەمزانی شتێکی لە بن سەردایە، بەڵام نەمدەزانی ئەو پلانە سامناکە چییە کە لە سەریدا دەخولێتەوە، ئای ئاواتەخواز بووم بزانم. چەند حەزم دەکرد ڕێگە لە ڕوودانی کارەساتەکە بگرم.

بەیانیی ڕۆژێکی بەهار بوو، باوکم و ژنەکەی بە مردوویێتی دۆزرانەوە کە بە ژەهری ڕسق کوژرابوون. کاتێ هەواڵەکە بڵاوبووەوە، هەموو خەڵکی گومانی ئەوەیان کرد کە بکوژەکە براکەمە. کە پاسەوانەکان دەستیان بە تاقیبکردنی کرد، لەترسان هەڵات، ئیدی لەو ساوە نەمبینییەوە. بەم ئاوهایە لەم دنیایەدا بە تەنیا مامەوە و بەرگەی ئەوەم نەگرت لە ماڵەکەدا بمێنمەوە کە هێشتا بۆنی دایکمی لێدەهات، لە توانامیشدا نەبوو لە نانەواخانەکە کار بکەم کە یادەوەریی ناخۆشی تێدا بوو. ئیدی بڕیارم دا ڕووبکەمە قوستەنتینە تا لەگەڵ پوورێکی وجاخکوێر و پیرمدا کە ئێستا تاقە خزمێکم بوو، بژیم. ئەو کاتە تەمەنم سیانزە ساڵان بوو.

به گالیسکەیەک بۆ قوستەنتینە سەفەرم کرد. لە گالیسکەکەدا من منداڵترین ڕێبوار بووم و تاقە مێینەیەکیش بووم کە بە تەنیا سەفەرم دەکرد. دوای ئەوەی چەند سەعاتێ ڕێگەمان بڕی، کۆمەڵە دزێک ڕێگەیان لێگرتین و هەموو شتێکیان لێ سەندین: جانتا، جلوبەرگ، پێڵاو، پشتێن، خشڵ، تەنانەت ئەو قاورمەیەی کە خاوەن گالیسکەکە پێی بوو، ئەوەشیان برد. لەبەر ئەوەی من هیچم نەبوو بیاندەمێ، بە هێوری لە لایەکەوە وەستام و دڵنیا بووم کە هیچ ئازارێکم پێ ناگەیەنن، لێ کاتێ کارەکەیان تەواوکرد و خەریک بوون بڕۆن، دەمڕاستەکەیان ئاوڕی لێدامەوە و لێی پرسیم: "ئەرێ جوانکیلە تۆ پاکیزەیت؟".

لە شەرمان دەموچاوم سوورهەڵگەڕا و وەڵامی ئەم پرسیارە ئابڕووبەرەیەم نەدایەوە، بەڵام نەمزانی شەرمکردنەکەم وەڵامێکە ئەو چاوەڕێی بوو.

"دەی با بڕۆین"، سەرکردەی دەستەکە دەنگی دان و ئەمەیشی وت: "ئەسپەکان و کچەکە ببەن".

کە دەستم بە گریان کرد و خۆم لە دەستیان ڕاپسکان، هیچ یەکێ لە ڕێبوارەکان هەوڵی نەدا یارمەتیم بدات. ڕێگرەکان بەرەو دارستانێکی چڕ پێش خۆیان دام. کە بینیم لەناو دارستانەکە گوندێکی تەواویان چێکردووە و ئافرەت و منداڵ و مراوی و بزن و بەرازی تێدایە، سەرم سوڕما. وەک گوندێکی شاعیرانە دەهاتە بەرچاو، بەڵام لە حەشارگەیەکی کۆمەڵە تاوانبارێک زیاتر نەبوو.

ئەوەندەی نەبرد زانیم بۆچی سەردەستەی ڕێگرەکان دەربارەی پاکیزەییم پرسیاری لێکردم. گەورەی گوندەکە نەخۆش بوو و تووشی گرانەتا بووبوو. دەمێ بوو لەسەر جێ کەوتبوو و هەموو جەستەی بووبوو بە پەڵەی سوور، دەرمانێکی زۆری تاقی کردبووەوە و دادی نەدابوو. یەکێ لە گوندەکە قایلی کردبوو کە ئەگەر لەگەڵ کچێکی پاکیزەدا بنوێت، ئەوا نەخۆشییەکەی بۆ کچەکە دەگوێزرێتەوە و ئەم چاک دەبێتەوە.

هەندێ شت لە ژیانمدا هەن نامەوێ بێنەوە یادم، لەوانە ئەو ماوەیەی کە لە دارستانەکە بەسەرم برد، تا ئەمڕۆ جگە لە دارسەرووەکان، شتی ترم لە

یاد نییە. حەزم دەکرد لەژێر ئەو درەختانەدا لەگەڵ ژمارەیەک لە ئافرەتەکانی گوندەکە دابنیشم کە زۆربەیان ژن یان کچی ڕێگرەکان بوون. هەندێ لەشفرۆش هەر خۆیان بۆ ئەوێ دەهاتن، بەڵام لەوە تێنەدەگەیشتم کە بۆچی هەڵنایەن، لە کاتێکدا من پلانم دانابوو کە هەڵبێم.

چەندین گالیسکە بە دارستانەکەدا تێدەپەڕین، کە زۆربەی خاوەنەکانیان لە خانەدانەکان بوون. تالاننەکردنی ئەو گالیسکانە بۆ من بووبوو بە مەتەڵێک، دواجار تێگەیشتم کە هەندێ لە گالیسکەوانەکان پێش ئەوەی بە دارستانەکەدا تێپەڕن، بەرتیلیان بە دزەکان دەدا تا بە سەلامەتی سەفەر بکەن. کە تێگەیشتم کارەکان چۆن ڕایی دەبن، مشووری تایبەتی خۆم خوارد. دوای ئەوەی گالیسکەیەکم ڕاگرت کە بەرەو شارە گەورەکە دەڕۆیشت، لە گالیسکەوانەکە پاڕامەوە کە هەڵم بگرێت، بەڵام ئەو داوای بڕێکی زۆر پارەی لێ کردم، هەرچەندە دەیشیزانی کە من هیچ شتێک شک نابەم، ئیدی بەو تاقە ڕێگەیەی خۆم دەیزانم، قایلم کرد.

کە گەیشتمە قوستەنتینە، دوای ماوەیەکی زۆر ئینجا زانیم کە بۆچی لەشفرۆشەکان لە دێیەکەی ناو دارستانەکە ڕاناکەن، چونکە دۆخی شارەکە خراپتر بوو، شوێنێکە بەزەیی نازانێت. لە پوورە پیرەژنەکەمیش نەگەڕام، چونکە دەمزانی خانمێکی بەڕێزی وەک ئەو قایل نابێت لەگەڵ ئابڕووتکاوێکی وەک من بژی. ئیدی ئاوها بە تەنیا مامەوە. ماوەیەکی زۆر بەسەر هاتنەکەمدا بۆ شار تێنەپەڕیبوو، ورەم بەردا و جەستەم هەلاهەلا بوو. لەپڕ خۆم لە دنیایەکی تردا دۆزییەوە — دنیایەک پڕ لە ڕق و دەستدرێژیکردن و وەحشیگەری و نەخۆشی. چەندین جاری یەک لەدوای یەک منداڵم لەبار خۆم برد تا جەستەم پەکی کەوت و لاواز بوو، سوڕی بێنوێژیم وەستا و ئیتر توانای دووگیانبوونم نەما.

لە شەقامەکاندا شتهایەکم دی ناتوانم بە وشەی ڕووت باسیان بکەم. دوای ئەوەی شارەکەم جێهێشت، لەگەڵ سەربازان و پیاوانێکی قۆشمە و قەرەج سەفەرم کرد و بەدەم هەموو پێویستییەکانیانەوە دەچووم. ئینجا پیاوێک بە ناوی (سەرچەقەڵ) دۆزیمییەوە و بۆ ئەم خانەی لەشفرۆشانەی هێنام لە قۆنیا. بە لای خاوەن سۆزانیخانەکەوە گرینگ نەبوو بزانێت لە کوێوە

هاتووم، بەڵکو ئەوەی لا گرینگ بوو تەندروستییەکی باشم هەبوو. کە زانیی منداڵم نابێت یەکجار خۆشحاڵ بوو، چونکە ئەمە هیچ کێشەیەک بۆ کارەکەم دروست ناکات. بەوای نەزۆکییەکەمەوە ناوی نام (بیابان)، جا بۆ ئەوەی ڕەونەقێک بەم ناوە ببەخشێت، وشەی (گوڵ)ی خستە سەر و منیش دڵم گرتی، چونکە عاشقی گوڵ بووم.

وای دادەنێم کە بڕوا شێوازێکە وەک باخچەیەک بێت و گوڵی شاراوەی تێدا بووبێت و ڕۆژێ بەناویدا سووڕابێتمەوە و بۆنیانم هەڵمژیبێت، بەڵام نەمتوانیوە بچمە ناوییەوە. دەمەوێ هەر وەکو جاران خودا ببێتەوە بە هاوڕێم و بەم ئەڵهایەوە بە دەوری ئەو باخچەیەدا بخولێمەوە. ئێستا لە دەرگای چوونەژوورەوە دەگەڕێم، ڕەنگە دەرگایەک بدۆزمەوە تا بتوانم بچمە ژوورەوە.

* * *

کاتێ لەگەڵ کونجیدا گەیشتمە مزگەوتەکە، بڕوام بە چاوانی خۆم نەکرد. پیاوان لە جۆرەها تەمەن و پیشە لە سووچەکانی مزگەوتەکە و تەنانەت ئەو شوێنەش کە بۆ ئافرەتان تەرخانکرابوو، دانیشتبوون. خەریکبوو نائومێد ببم و بڕۆم، کاتێ سەرنجم دا سواڵکەرێک وا جێیەکەی جێدەهێڵێت و دەڕوات. سوپاسی بەختی خۆمم کرد و ڕێگەی خۆم لە نێو خەڵکەکە کردەوە و بەرەو ئەو شوێنە ڕۆیشتم کە چۆڵی کردبوو. داوام لە کونجی کرد کە لەدەرەوە چاوەڕێم بکات.

بەمجۆرە لە مزگەوتێکی پڕ لە پیاو خۆم بینییەوە و وا گوێم لە ڕۆمی مەزن گرتووە. تەنانەت نەمویست بیر لەوە بکەمەوە گەر بۆیان دەرکەوت وا ئافرەتێک لە نێویاندایە، چی ڕوودەدات، چجای ئافرەتەکە لەشفرۆشیش بێت. دوای ئەوەی هەموو خەیاڵە ناخۆشەکانم لە سەری خۆم دەرکرد، ئیدی هەموو هۆشی خۆم خستە سەر وتارەکە.

ڕۆمی گوتی: "خودا ئازاری دروستکردووە تا لەمیانەی دژەکەیەوە بەختەوەری دەربکەوێت. شتەکان لەمیانەی دژەکانیانەوە دەردەکەون. لەبەر ئەوەی خودا دژێکی نییە، بۆیە بە نادیاری دەمێنێتەوە".

لە کاتێکدا وتاربێژەکە قسەی دەکرد، وەک چۆن بەفری تواوە گوڕ دەداتە جۆگەلەی چیا، ئاوها دەنگی بەرز و نێر دەبوو: "تەماشای پووچیی زەوی و شکۆمەندیی ئاسمان بکەن. بزانن کە هەموو ئەو شتانەی لە دنیادا ڕوودەدەن، وەک: لافاوەکان و وشکەساڵی و ئاشتی و جەنگ، لەبیرتان نەچێت هەرچییەک ڕوویدات، خودا لە خۆڕایی دروستی نەکردوون. ئیدی شتەکە تووڕەیی یان خەونبینین بێت یان ڕاستگۆیی یان زیرەکی".

لەو دانیشتنەی ئەوێمدا خەریکبووم تێبگەم کە هەموو شتێ لە ژیاندا ئامانجێکی هەیە. پەتە ناوکەکەی دایکم و کوشتاری براکانم لە منداڵدانیدا، ئەو دۆخە تەنیاییەی براکەم تێیدا دەژیا، بەڵکو تەنانەت تاوانی کوشتنی باوکم و باوەژنەکەم و ئەو ڕۆژە سامناکانەی کە لە دارستانەکەدا ژیام، هەموو ئەو شتە وەحشیگەرییانەی لەشەقامەکانی قوستەنتینە تووشیان بووم، کە هەریەکەیان بە شێوازی تایبەتی خۆی بەشداری لە چیرۆکەکەمدا کرد. لە پشت هەریەکێ لەم دەردەسەری و ئاستەنگانەوە، پلانێکی گەورەتر خۆی مەڵاس دابوو و بەروونی لێی تێنەدەگەیشتم، بەڵام بە هەموو بوونێکمەوە دەمتوانی هەستی پێ بکەم. دوای ئەوەی لە مزگەوتێکی پڕ لە خەڵک و لە عەسری ئەو ڕۆژەدا گوێم لە ڕۆمی گرت، هەستم بە هەورێکی سوکنایی کرد کە بەسەر سەرمدا دادەبەزی، هەروەها چۆن دایکم دەبینی نانی دەکرد، ئاوها هەستم بە شادمانی و ئاسوودەیی کرد.

# حەسەنی سواڵکەر

## قۆنیا، ١٧ی تشرینی یەکەم ١٢٤٤

بە تووڕەیی لە بن دارکەوەتەکە دانیشتبووم، لە ڕۆمی تووڕە بووم، چونکە لە وتارە بەئاووتاوەکەیدا باسی ئێش و ئازاری دەکرد و وا دیاربوو شتێکی ئەوتۆی لێ نازانێت. سێبەری منارەکە خەریکبوو دەکەوتە سەر شەقامەکە. نیوە نوستوو و نیوە بەئاگا تەماشای ڕێبوارانم دەکرد. خەریک بوو خەوم لێ بکەوێت، چاوم بە دەروێشێک کەوت کە لەوەوبەر نەم دی بوو. جلێکی ڕەش و کۆنی لە بەردا بوو، داردەستێکی درێژی بە دەستەوە بوو، ڕیشی تاشی بوو، گوارەیەکی کردبووە یەکێ لە گوێیەکانی، ئەوەندە لە خەڵکی جیابوو، بەتەواوی نەمتوانی تەماشای بکەم.

لە کاتێکدا بە ڕاست و چەپدا چاوی دەگێڕا، هەر ئەوەندە چاوی پێم کەوت، لەجیاتی ئەوەی خۆیم لێ گێل بکات، هەر وەک چۆن خەڵکی لە ڕێگاوبان دەمبینن و خۆیان لێم گێل دەکەن، دەستی ڕاستەی خستە سەر دڵی و وەک ئەوەی دوو هاوڕێی دێرین بین، سڵاوی لێکردم. سەرم سوڕما و بە دەوری خۆمدا چاوم گێڕا تا دڵنیا بم کە سڵاوی لە کەسێکی تر نەکردووە، بەڵام جگە لە من و دارکەوەتەکە کەسی تر لەوێ نەبوو. بەپەشۆکاوی و سەرسوڕمانەوە دەستم خستە سەر دڵم و سڵاوەکەیم سەندەوە.

دەروێشەکە بە هەنگاوی سەنگینەوە بەرەو لام هات. چاوم لەوە بوو کە پارچە دراوێکی مس بخاتە ناو جامیلکەکەمەوە، یان پارچە نانێکم پێبدات، بەڵام ئەوەی نەکرد و بەرانبەرم بە چۆکدا هات.

گوتی: "هۆ سواڵکەر، سڵاوت لێ بێت".

وەڵامــم دایەوە و گــوتم: "دەرویـێش، سـڵاو لە تــۆش"، دەنگــم بە جــۆرێ بێباکانە بوو، بە لای خۆمیشەوە نامۆ بوو. ئاخر مـاوەیەکی زۆر بوو قسەم لەگەڵ کەســدا نەکردبــوو، بە جــۆرێ خەریکبــوو تــۆنی دەنگــی خــۆمیش بیربچێتەوە.

خۆی ناساند و گوتی کە ناوی شەمسی تەورێزییە، ئینجا پرسـیاری نـاوی منی کرد.

پێکەنیم و گوتم: "پیاوێکی وەک من چ پێویستییەکی بە ناو هەیە؟".

بە ناقایلییەوە وتی: "هەر کەسەو ناوێکی هەیە. خـودا نـاوی زۆری هەیە و لە نەوەدونۆ نـاوەکەی زیـاتر نـازانین. ئێ ئەگەر خـودا ئەوەنـدە نـاوی هەبێت، ئیدی چۆن دەکرێ بنیادەم کە وێنەیەکی خودایە، بە بێناو جووڵە بکات؟".

نەمزانـی چــۆن وەڵامــی بـدەمەوە، بەڵکو هەر هەوڵیشم نەدا، ئینجـا وتـم: "ڕۆژێ لە ڕۆژان هاوسەر و دایکم هەبوو، بە ناوی حەسەن بانگیان دەکردم".

"کەواتە ناوت حەسەنە". دەروێشەکە سەری بادا، ئینجا ئاوێنەیەکی زیوینی دامێ و گوتی: "لای خۆت بیپارێزە. لە بەغدا پیاوچاکێک پێشکەشی کردم، بەڵام ڕەنگە تۆ لە من زیاتر ئاتاجی بیت. ئەم ئاوێنەیە ئەوەت دەخاتەوە یاد کە تۆ لە ناوەوەی خۆتدا خودات هەڵگرتووە".

بەر لەوەی هەڵـــی وەڵامــــدانەوەم بـــۆ هەڵکەوێـــت، لە پـــشتمانەوە غەڵبەغەڵبێکمان ژنەوت. یەکەم شت کە بە خەیاڵمدا هـات، ئەوە بـوو کە ڕەنگە گیرفانبڕێکیان لە مزگەوتەکەدا دەستگیر کردبێت، لێ کاتێ دەنگەدەنگەکە بەرز بــووەوە و پتــر بــوو بە تونـدوتیژی و ژاوەژاو، گــوتم بێگومــان شــتەکە لەوە گەورەتــرە، چــونکە دەســتگیرکردنی گیرفانبڕێــک ئەم بگــرەوبەردەیەی لــێ ناکەوێتەوە.

ئەوەنـدەی نەبـرد شـتەکەمان بـۆ دەرکەوت. ئەوە بـوو لە مـزگەوتەکەدا ئافرەتێکی لەشفرۆشی ناسراویان دۆزیبووەوە کە خۆی گۆڕیبوو و جلوبەرگی پیـاوانەی لە بەر کردبـوو. چەنـدین پیـاو بەرەو دەرەوەی مـزگەوتەکە پاڵیـان پێوەدەنــا و هاواریــان دەکــرد: "ئەم ئــافرەتە فێڵبــازە بەر قــامچی بــدەن! ئەم لەشفرۆشە بەردباران بکەن".

لەم کاتەدا کۆمەڵێ چەورە و دەستوپێوەندی تووڕە گەیشتنە شەقامەکە. ئافرەتە جحێڵەکەم بینی کە جلی پیاوانەی پۆشیبوو، ڕەنگی مردووی لێ نیشتبوو، چاوە بادەمییەکانی ترسیان تێدازابوو. لەوەپێش کاری کوشتنی زۆرم دی بوو، بۆیە سەرم سوڕنەدەما کە ببینم چۆن هەندێ خەڵک دەگۆڕێن و دەچنە پاڵ تێکدەران، چونکە لەپڕ پیاوانی ئاسایی کە پێشینەیەکی توندوتیژییان نییە –پیشەوەر یان فرۆشیار یان فرۆشیاری دەستگێڕ– دەگۆڕێن و دەبنە کەسانێکی شەڕانگێز، تەنانەت کاتێ کۆدەبنەوە، دەبنە بکوژ. ئیدی کاری کوشتن تەشەنەی کردبوو، جا بۆ ئەوەی چاوی خەڵکی پێ بشکێنن، کارەکە بەوە کۆتایی دەهات لاشەکانیان لە شەقامەکاندا پیشان دەدا.

"ئای چەند ئافرەتێکی بەستەزمانە!"، ورەوورێکم بەربای گوێی شەمسی تەورێزیدا دا، لێ کە ئاوڕم دایەوە تا وەڵامەکەی بژنەوم، ئەو نەمابوو، بەڵکو دەروێشەکەم بینی وەک ئەوەی تیرێکی دایساو بێت و هاوێژرابێت، بە توندی بەرەو ناو ئاژاوەکە تەکانی دەدا. بەرزەیێ ڕاپەڕیم و ڕامکرد تا بگەم پێی. کە گەیشتمە بەرایی کۆڕەوەکە، شەمس داردەستەکەی چون ئاڵایەک بەرزکردەوە و بە هەموو دەنگییەوە بانگی کرد: "ڕاوەستن، هۆو خەڵکینە ڕاوەستن!".

بێدەنگییەک باڵی بەسەر پیاوەکاندا کێشا و بەواقوڕمانەوە تەماشایان کرد.

"دەبێ شەرم لە خۆتان بکەن!"، شەمسی تەورێزی هاواری دەکرد و داردەستەکەی بە زەویدا دەکوتا: "ئەوە سێ پیاو پەلاماری تاقە ئافرەتێک دەدەن. ئایا ئەمە دادپەروەرییە؟".

"ئەمە شایستەی دادپەروەری نییە"، پیاوێکی کەتە و دەموچاو چوارگۆشە و چاومات وای گوت و دیاربوو خۆی کردبوو بە دەمڕاستی ئەم تاخمە کە هەر لەخۆوە دروست بووبوو. ئیدی دەسبەجێ ناسیمەوە. حەسحەسێک بوو ناوی پێپرس بوو، بە هۆی دڕندەیی و چاوچنۆکییەوە هەموو دەرۆزەکەرەکانی شارەکە دەیانناسی.

پێپرس گوتی: "ئەم ئافرەتە خۆی گۆڕیوە و جلوبەرگی پیاوانەی لە بەر کردووە و بە دزییەوە هاتووەتە ناو مزگەوتەکەوە تا موسڵمانە باوەڕدارەکان لەخشتە ببات، ئێمەش دۆزیمانەوە".

"ئایا مەبەستت ئەوەیە کە ئێوە دەتانەوێ سزای کەسێک بدەن هەر لەبەر ئەوەی ڕووی کردووەتە مزگەوتەکە؟ ئایا ئەمە تاوانە؟"، شەمسی تەوریزی بە دەنگێ قێزهاتنەوەی لێ دەتکا، لێی پرسی.

ئەم پرسیارە هێوربوونەوەیەکی ئێرەتی دروست کرد. دیاربوو کەس بیری لەم شتە نەکردبووەوە.

"ئاخر ئەمە لەشفرۆشە!"، پیاوێکی دیکە کە لە تووڕەییاندا گڕی گرتبوو و دەموچاوی سوور هەڵگەڕابوو، هاواری کرد، "مزگەوتێکی پاک، شوێنی ئەو نییە".

دەرکەوت کە ئەو قسەیە بەسبوو تا دووبارە خەڵکەکە گڕبگرنەوە، چونکە کەسانێکی تر تێهەڵچوون: "ئەمە لەشفرۆشە! زیناکارە! با ئەم لەشفرۆشە بکوژین".

لاوێک بەرەوپێش تەکانی دا و مێزەری ئافرەتەکەی گرت و بە توندی ڕایکێشا. مێزەرەکەی کەوت و قژە درێژ و زەردەکەی دەرکەوت کە وەک درەختی گوڵەبەڕۆژە شەپۆلی دەدا و دەدرەوشایەوە. هەموومان هەناسەمان قەتیس بوو. لە جوانیی یەکجار بێوێنە و جحێڵیی ئافرەتەکە سەرمان سوڕما.

بێگومان شەمس دەرکی بەم هەستە جۆراوجۆرانە کردبوو، چونکە بە تووڕەییەوە ڕەخنەی لێدەگرتن: "براکانم، گەرەکە ئەوە یەکلا بکەنەوە، ئایا ئێوە بەڕاستی ڕقتان لەم ئافرەتەیە، یان حەزتان بۆی دەبزوێت؟".

دەروێشەکە دەستی لەشفرۆشەکەی گرت و بەرەو خۆی ڕایکێشا و لە لاوەکە و گێرەشێوێنەکان دووری خستەوە. ئافرەتەکە وەک چۆن کیژۆڵەیەک لە پشت باڵاپۆشەکەی دایکییەوە خۆی بشارێتەوە، خۆی دایە پەنای دەروێشەکە.

"تۆ هەڵەیەکی گەورە دەکەیت"، سەردەستەی کۆمەڵەکە دەنگی بەسەر غەڵبەغەڵبی حەشیمەتەکەدا بەرزکردەوە و گوتی: "تۆ لەم شارەدا نەناسێکیت و دابونەریتی ئێمە نازانیت و خۆت لەم شتە هەڵمەقورتێنە".

ئینجا کەسێکی تر هاتە قسە: "تۆ چ دەروێشێکیت؟ ئەرێ جگە لە پاراستنی لەشفرۆشێک، شتێکی دیکەت بەدەستەوە نییە؟".

شەمسی تەوریزی وەک ئەوەی بیر لەم پرسیارانە بکاتەوە، ساتێک بێدەنگ بوو. هیچ نیشانەیەکی تووڕەیی پێوە دیارنەبوو و هێمنیی خۆی پاراستبوو، ئینجا گوتی: "بەڵام توخوداتان چۆن هەستتان پێکرد؟ هەرچەندە ئێوە هاتوچۆی مزگەوت دەکەن، لێ پتر هۆشتان دەخەنە سەر ئەوانەی دەوروبەرتان، نەک خودا. خۆ ئەگەر وەک خۆتان دەڵێن، بەڕاستی بڕوادار بوونایە، ئەوا ئەم ئافرەتە ڕووتیش بوایە، هەستتان پێی نەدەکرد. دەی بەرەو لای وتارەکە بگەڕێنەوە و شتێک لەمە باشتر بکەن".

بێدەنگییەکی قورس هەموو شەقامەکەی گرتەوە. گەڵای درەختەکان کە بە درێژایی پیادەڕۆکە پەرت بووبوون بۆ ساتەوەختێک تاقە شت بوو دەجووڵانەوە.

"دەی خەڵکینە! دەی بگەڕێنەوە و گوێ لە وتارەکە بگرن"، شەمسی تەوریزی بەدەم قسەوە بە داردەستەکەی ئاماژەی دەکرد و وەک ئەوەی کشە لە مێشومەگەز بکات، کشەی لە پیاوەکان دەکرد.

هەموویان وەرسووڕان تا بڕۆن، بەڵام چەند هەنگاوێک بە لارەلار کشانەوە و نەیاندەزانی دوای ئەوە چی بکەن. ژمارەیەکی کەمیان وەک ئەوەی لە گەڕانەوە دوودڵ بن، تەماشای مزگەوتەکەیان دەکرد. لەم کاتەدا لەشفرۆشەکە زاتی خستە بەرخۆی تا لە پشت دەروێشەکە دەربچێت، ئیدی پشت لە خەڵکەکە، وەک کەروێشک بە خێرایی تێیتەقاند و پرچە درێژەکەی بە هەموو لایەکدا پەخشان بووبوو و بەرەو نزیکترین شەقامی لاوەکی هەیپای لێکرد.

دوو پیاو هەوڵیان دا دوای بکەون، بەڵام شەمسی تەوریزی ڕێگەی لێ گرتن و داردەستەکەی دایە بەر پێیان و ساتمەیان کرد و کەوتن. هەندێ خەڵکی ڕەوتەنی ئەوەیان بینی، پێکەنین، منیش پێکەنیم. دوو پیاوەکە بەخۆدا شکانەوە و بە جۆرە گێژبوونێکەوە هەستانەوە، بەڵام لەشفرۆشەکە ون بووبوو، دەروێشەکەش دوای ئەوەی ئەم ئەرکەی ئێرەی بەجێ هێنا، ڕۆیشت و دوورکەوتەوە.

# سلێمان سەرخۆش

## قۆنیا، ١٧ی تشرینی یەکەم ١٢٤٤

بەر لە ڕوودانی ئەو بگرەوبەردەیە، پشتم بە دیواری مەیخانەکەوە دابوو و سەرخەوم دەشکاند، بەڵام ئەو بگرەوبەردەیەی کە لە دەرەوە بەرپا بووبوو، وای لێکردم خەریکبوو لە پێستی خۆم بێمە دەرێ.

"ئەوە لێرە چی ڕوودەدات؟"، لەگەڵ چاوکردنەوەدا هاوارم کرد، "ئایا مەغۆلەکان هێرشیان کردووەتە سەرمان؟".

شەپۆلێک پێکەنین بەرزبووەوە. ئاوڕم دایەوە و بینیم چەند مەعمیلێک شۆخیم پێدەکەن. ئای لەم بیژییە چەپەڵانە.

"هێی پیری سەرخۆش، نیگەران مەبە"، خریستۆسی خاوەن مەیخانەکە پێی وتم "مەغۆل لێرە نین تا ڕاوەدووت بنێن، بەڵکو ئەوە ڕۆمییە بە خۆی و کەژاوەکەیەوە تێدەپەڕێت و بە حەشیمەتێک لە هەواداران و مریدەکانی دەورەدراوە".

ڕووم کردە پەنجەرەکە و تەماشای دەرەوەم کرد. کەژاوەیەکم لە مریدان و هەوادارانی بەجۆشوخرۆش بینی، هاواریان دەکرد: "خودا گەورەیە، خودا گەورەیە". لە ناوەندیاندا ڕۆمی بە باڵا قیتەکەیەوە، سواری ئەسپێکی سپی بووبوو، دەموچاوە بەتین و لەخۆ دڵنیاکەی دەدرەوشایەوە. پەنجەرەکەم کردەوە و سەرم دەرکردە دەرەوە و دیقەتیانم دا. کۆڕەوەکە کە زۆر لەسەرخۆ دەجووڵا و نزیکبووەوە. لەناو کۆڕەوەکەدا هەندێ لە پیاوەکان زۆر لە منەوە نزیک بوون، بە جۆرێ دەمتوانی دەستم بگاتە سەری هەندێکیان. لەناکاو بیرۆکەیەکی نایابم بۆ هات، ئەویش ئەوەبوو مێزەری سەری هەندێکیان بڕفێنم.

ئەو داری پشتخوراندنەم بە دەستەوە گرت کە هی خریستۆس بوو. بە دەستێکم پەنجەرەکەم کردەوە، بە دەستەکەی ترم داری پشتخوراندنەکەم گرت. خۆم بەرەو پێشەوە چەماندەوە و توانیم دارەکە بگەیەنمە مێزەری یەکێک لە پیاوەکان. ئەوەندەی نەمابوو مێزەرەکە ڕابکێشم، بە ڕێکەوت پیاوێکی دی چاوی هەڵبڕی و بینیمی.

"سڵاوتان لێ بێت"، بە زەردەخەنەوە سڵاوم لێی کرد.

"موسڵمان و لە مەیخانە بێت! ئەمە بۆ تۆ شوورەییە"، پیاوەکە بەسەرمدا نەڕاندی، "ئەی نازانیت شەرابخواردنەوە کارێکی نەگریسی شەیتانە؟"

زارم هەڵێنا تا وەڵام بدەمەوە، بەڵام پێش ئەوەی دەنگێکم لێوە بێت، وژەیەکی تیژ بە لای سەرمدا تێپەڕی. بە ترسێکی زۆرەوە زانیم کە ئەوە بەرد بوو. خۆ ئەگەر لە دواساتدا سەرم لانەبردبا، ئەوا کەللەسەرمی وردوخاش دەکرد. ئیدی لە پەنجەرە کراوەکەوە تێپەڕی و لە پشتمەوە کەوتە سەر ئەو مێزەی کە بازرگانێکی فارس لەسەری دانیشتبوو. بازرگانەکە زۆر سەرخۆش بوو و ئاگای لەوە نەبوو کە لە دەوروبەریدا چی ڕوودەدات، بەردەکەی هەڵگرت و وەک ئەوەی ئاگادارکردنەوەیەکی ئاڵۆز بێت و لە ئاسمانەوە بەربووبێتەوە، هەر دیقەتی دەدا.

"سلێمان، ئەو پەنجەرەیە دابخە و بگەڕێوە لای مێزەکەت"، خریستۆس بە بۆڵەبۆڵ و بە دەنگێکی بەرز و پەژارەوە بانگی کردم.

وتم: "ئەرێ بینیت چی ڕووی دا؟"، بە لەتردان بەرەو مێزەکەم گەڕامەوە، "یەکێکیان بەردی تێگرتم. خۆ خەریکبوو بمکوژێت".

خریستۆس برۆکانی هەڵبڕی و گوتی: "بەداخەوەم، بەڵام تۆ چاوەڕێی چیت دەکرد؟ ئەی نازانیت خەڵکانێک هەن چاویان بە موسڵمانێک هەڵنایات کە لە مەیخانە بێت؟ ئەوەتا تۆ خۆت ئاشکرا دەکەیت و بۆنی شەرابت لێدێت و لووتت وەک گڕی فانۆس سوورهەڵگەڕاوە".

"ئاخر ئەمە چ زیانێکی هەیە؟"، بە ترمەترم گوتم،"ئەی من مرۆڤ نیم؟".

خریستۆس وەک ئەوەی بڵێت، دەی باشە، باشە، دەستی خستە سەرشانم.

گوتم: "هەر بەوای ئەمەوەیە ڕقم لە ئایینە، چونکە ئایینپەروەرەکان پێیان وایە کە خودا لەتەکیان وەستاوە و وا دەزانن ئەوان لە سەرووی خەڵکی دیکەوەن".

خریستۆس هیچ وەڵامێکی نەدایەوە. پیاوێکی بڕوادار بوو، هاوکات خاوەن مەیخانەیەکی لێزان بوو، دەیزانی چۆن مەعمیلێکی تووڕە هێوربکاتەوە. قاپێ شەرابی سووری دیکەی بۆ هێنام، من هەڵمدەقوڕاند و ئەو تەماشای دەکردم. لە دەرەوە بایەکی توند هەڵیکردبوو و پەنجەرەکانی هێنابووە تەقوهوڕ، گەڵای وشکی درەختەکان بە چەپ و ڕاستدا پەرت دەبوون. وەک ئەوەی گوێ لە ئاوازێک بگرین، ساتێک گوێمان هەڵخست.

وتم: "من تێناگەم بۆچی خودا لەم دنیا شەرابی حەرام کردووە، کەچی لە بەهەشتدا وەک بەڵێنێک بەخەڵکی داوە. گەر وەک دەڵێن بەم ڕادەیە خراپە، ئەی بۆچی لە بەهەشتدا پێیان دەدرێ؟".

"پرسیار، پرسیار...". خریستۆس ورەورێکی کرد و هەردوو دەستی بەرزکردەوە،"تۆ بەردەوام پرسیارت لێدەڕژێت. ئایا پێویستە دەربارەی هەموو شتێک پرسیار بکەیت؟".

"بێگومان. ئەی بۆچی ئاوەزمان پێ بەخشراوە؟".

"سلێمان، من دەمێکە دەتناسم. تۆ لای من تەنها مەعمیلێک نییت. تۆ هاوڕێمیت، من بۆ تۆ نیگەرانم".

"باش دەبێت"، کە وام گوت خریستۆس قسەکەی پێ بڕیم و گوتی: "تۆ پیاوێکی باشیت، بەڵام زمانت وەک خەنجەر تیژە، هەر ئەمەشە پەژارەی کردووم. لە قۆنیا خەڵکی هەمەجۆر هەن و شاراوە نییە کە هەندێکیان ڕێزی موسڵمانێک ناگرن کە خووی دابێتە مەیخواردنەوە. گەرەکە فێر بیت چۆن لەنێو خەڵکدا ئاگات لە خۆت بێت. بە نهێنی شتەکانت بکە و ئاگات لە هەر وشەیەک بێت کە دەیڵێیت".

زەردەیەکم هاتێ و گوتم: "ئایا دەتوانین ئەم قسەیەمان بە چامەیەکی خەیام بڕازێنینەوە؟".

خریستۆس هەناسەیەکی هەڵکێشا، بەڵام بازرگانە فارسەکە کە گوێی لێم بوو بە خۆشحاڵییەوە دەنگی بەرزکردەوە، "بەڵێ، دەمانەوێ گوێمان لە چامەیەکی خەیام بێت".

مەعمیلی تریش هاتنە پاڵمان و بە توندی چەپڵەیان لێ دا. بە تەکانێکی پڕ لە جۆشوخرۆشەوە بەرەو مێزەکە بازم دا و دەستم بە خوێندنەوە کرد:

**"ئایا پێت وایە کە خودا خۆی دارمێوی دروست کرد**

**دوایی حەرامی کرد و شەرابەکەیشی کرد بە گوناه؟"**

بازرگانە فارسەکە هاواری کرد، "بێگومان نەخێر! ئەمە مانایەکی نییە".

**"سوپاسی ئەو کەسە بکە کە ئاوها بۆی فەراهەم کردین،**

**بێگومان ئەو تەنانەت حەزی لە بەیەکدادانی پەرداخەکانیشە!"**

گەر لە ماوەی ئەم ساڵانەدا لە خواردنەوەوە شتێ فێربووبم، ئەوەیە کە خەڵکی لە شێوازی خواردنەوەیاندا جیاوازن. من کەسانێکم دەناسی هەموو شەوێ چەند کاسە شەرابیان دەخواردەوە، ئیدی دەبوون بە کەسانێکی کەیفساز و گۆرانییان دەچڕی، ئینجا دەچوونە خەوێکی قووڵەوە، کەچی کەسانێکی تر لە چەند فڕێک زیاتریان نەدەخواردەوە، دەبوون بە دڕندە. گەر خواردنەوە هەندێ بکاتە مەشرەبخۆش و قسەشیرین و بڕێکی دیکە بکاتە خراپەکار و شەڕانگێز، کەواتە بۆ گازاندەکە نەخەینە سەر شەرابخۆرەکە، نەک شەرابەکە؟

**"بخۆرەوە! چونکە نازانیت لە کوێوە هاتوویت و بۆ هاتوویت**

**بخۆرەوە! چونکە نازانیت بۆچی دەڕۆیت و بۆ کوێ دەڕۆیت"**

گرمەی چەپڵەلێدان بەرزبووەوە، تەنانەت خریستۆسیش بەشداریی چەپڵەلێدانەکەی کرد. لە قۆنیا، لە گەڕەکی جوولەکەکان لە مەیخانەیەک کە خاوەنەکەی کریستیان بوو، ئێمە کۆمەڵە تێکەڵەیەکی هەموو ئایینەکان و عەشقی شەراب، پێکەوە پێکەکانمان بەرزکردەوە و بە خۆشیی یەکتر خواردمانەوە. هەرچەندە قورسە باوەڕ بەوە بکرێ کە خودا خۆشی بوێین و لێمان خۆش بێت.

# ئێلا

## نۆرتامبتۆن، ٣١ی ئایار ٢٠٠٨

"بە سەلامەتی بگەیت لەوە باشترە ژیوان ببیتەوە". یەکێ لە سایدەکانی ئینتەرنێت باسی ئەمەی کردبوو، "بۆ ئەوەی لە دەوسی پەڵەی سووراو دڵنیا بیت، دیقەتی کراسەکانی بدە. ئاگاداربە کە بۆ ماڵ دەگەڕێتەوە، بزانە ئاخۆ بۆنی عەترێکی نامۆی لێدێت".

ئەوە یەکەم جار بوو ئێلا ڕۆبنشتاین لە ئینتەرنێت بەم ناونیشانە خۆی تاقی بکاتەوە: "چۆن دەتوانیت ئەوە بزانیت ئاخۆ شووەکەت غایەنەتیت لەگەڵدا دەکات یان نا؟"، هەرچەندە پرسیارەکەی تووڕەهات دیاربوو، بەڵام ئێستا بۆی دەرکەوت کە ڕەنگە خودی ژیان بۆخۆی دەربڕینێکی دەمدەمی بێت و هیچی تر.

لەگەڵ ئەوەی ئـێلا نەیدەویـست لە ئەنجـامی ئەو تـاقیکردنەوەیەی کە ئەنجامی دابوو، ڕووبەڕووی دەیڤید ببێتەوە و لێیشی نەدەپرسی ئاخۆ ئەو شـەوانەی کە لە دەرەوەی مـاڵ بەسـەری دەبـات لە کـوێیە. لەم مـاوەیەدا زۆربەی کاتەکانی بە خوێندنەوەی ڕۆمـانی (کفـری شـیرین) بەسـەردەبرد و ڕۆمانەکەی وەک بیانوویەک بۆ داپۆشینی بێدەنگییەکەی بەکار دەهێنا. لەبەر ئەوەی ئاوەزی پەرتبوو، بۆیە ماوەیەکی لە کاتی خواسایی زیاتری دەویست، بەڵام چێـژی لە چیـرۆکەکە و لە هەر ڕێـسایەکی نـوێی ڕێـساکانی شـەمس وەردەگرت کە خەریک بوو سەراپای ژیانیان دەگۆڕی.

ئـێلا کـاتێ منـداڵەکانی ئامادەبوونـایە بە شـێوەیەکی خواسـای ڕەفتـاری دەکـرد، بەڵام ئەو دەمەی بە تەنهـا لەگەڵ دەیڤیـد بـوایە، دەیڤیـد وەک ئەوەی بپرسێت ئەمە چ جۆرە ژنێکە لە مێردەکەی ناپرسێتەوە ئاخۆ شەوەکەی لە

کـوێ بەسـەربردووە، ئیـدی بە جـۆرێکی تـر تەماشـای دەکـرد، بەڵام ئـێلا نەیدەویست ئەو زانیارییـانە ببیـستێت کە نەزانێـت بەرانبەریـان چـۆن ڕەفتـار بکـات. وا بیـری دەکـردەوە تـا کەمتـر ئاگـای لە پەیوەنـدییە ئەڤینییەکـانی شووەکەی بێت ئەوەندە کەمتر بیری لێدەکاتەوە. ڕاستە گوتوویـانە بێئاگایی نیعمەتە.

یەکەم جار بـوو کە لە جەژنـی لەدایکبوونی ڕابردوودا کاتێ لە یەکێ لە هــوتێلە ناوخۆییەکـــانەوە فــۆرمێکی ئاگـــادارکردنەوە گەیــشتە ســـندووقی پۆسـتەکەیان و ئاراسـتەی دەیڤیـد کرابـوو، لەقەی لەو خێروخۆشـییە دا. ئەوە بوو بەشی (خزمەتگوزاریی مەعمیلەکان) ویستی بزانێت ئایا لەو ئوتێلەی کە چەند جارێک لێی نیشتەجێ بووە کاتێکی ئاسوودەی تێدا بەسەربردووە یان نا. ئێلا نامەکەی لەسەر کۆمەڵێ نامەی دیکە لەسەر مێزەکە جێهێشت و ئەو ئێوارەیە دەسـتی بە چـاودێریکردنی کـرد. دەیڤیـد نـامەکەی لە زەرفەکـراوەکە دەرهێنا و خوێندییەوە.

"ئـاە، فـۆرمی هەڵـسەنگاندنە لە لایەن ئەو کەسـانەوە کە دەبـنە میـوانی هوتێل! ئەمە دواشتە دەمەوێ ببینم"، دەیڤید بەدەم قسەوە زەردەخەنەیەکی بە ڕووی ئـێلادا دا، "پـار ئامـادەی کـۆنگرەیەکی پزیـشکی ددان بـووم. بێگومـان ئەوان نـــاوی هەمـــوو بەشـــداربووانیان لە لیـــستی میوانەکـــانی خۆیـــان تۆمارکردووە".

ئـێلا بـڕوای پێکـرد. بە لای کەمەوە بـڕوای بەو لایەنەی کـرد کە حەزی نەدەکـرد گـۆمەکە بـشڵەقێنێت، بەڵام لایەنەکەی تـر کە ڕەشـبینی و گومـانی هەڵـدەگرت، ئەوە بـوو ڕۆژی دواتـر بەدوای ژمـارەی هـوتێلەکەدا گەڕا تـا پەیوەنـدیی پێوە بکـات و گـوێی لەو شـتانە بێت کە لە بنەڕەتەوە نەیـدەزانین، ئەویش ئەوە بوو کە لە هوتێلەکەیاندا نە ئەمساڵ و نە پار کۆنگرەی پزیشکی ددان نەبەسترابوو.

ئێلا لە ناخەوە خۆی سەرزەنشت کرد. ئاخر وا خەریکە بەساڵەوە دەچێت و لەماوەی شەش ساڵی ڕابردوودا کێشی زیادی کردبوو. لەگەڵ زیادبوونی هەر ڕەتڵێکی تازەی جەستەیدا، جۆشی سێکسیی کز دەبوو. وانەی چێشتلێنان خۆڕزگـارکردنی لە ڕەتـڵە زیادەکـان لـێ قـورس کردبـوو، کەچـی ئافرەتـانی

خۆیئاسا لەو باشتر و زیاتر چێشتیان لێدەنا و کێش و قەبارەیان نیوەی کێش و قەبارەی ئەو بوو.

کە ژیانی ڕابردووی خۆی بیرکەوتەوە، زانیی یاخیبوون دادی ئەو نادات، چونکە قەت لە پشت دەرگا داخراوەکانەوە لەگەڵ کچاندا تلیاکی نەکێشاوە، لە مەیخانەکان وەدەر نەنراوە، دەرمانی دژە دووگیانبوونی بەکار نەهێناوە، نۆرە تووڕەبوونی نەبووە، یان درۆی لەگەڵ دایکیدا نەکردووە و لە قوتابخانە هەڵنەهاتووە و لە تافی هەرزەکاریدا کاری جووتبوونی نەکردووە. لەکاتێکدا کچانی هاوتەمەنی ئەم منداڵیان لەبارخۆ دەبرد یان ئەو منداڵانەی کە پێش شووکردن دەیانخستنەوە دەیاندانە کەسانی تر تا هەڵیانبگرنەوە. ئیدی وەک ئەوەی دەربارەی برسێتی لە ئەسیوبیا بەرنامەیەکی تەلەڤزیۆنی ببینێت، گوێی لە چیرۆکەکانیان دەگرت. ئەو شتەی کە لە دڵی ئێلادا مایەی، خەم بوو، بڵاوبوونەوەی ئەم کارەساتانە بوو لە جیهاندا، بەڵام پێی وا نەبوو کە لە هەمان ئەو دنیایەدا دەژی کە ئەو کچە بەستەزمان و کڵۆڵانە تێیدا دەژین.

تەنانەت کاتێ لە تەمەنی هەرزەکاریدا بوو، بەشداریی ئەو ئاهەنگانە نەدەبوو کە لاوەکان سازیان دەدا، بەڵکو پێی باش بوو لە ماڵەوە بمێنێتەوە و لە شەوی هەینیدا کتێبێکی نوێ بخوێنێتەوە، نەک لە ئاهەنگێکی بەرەڵاییدا بەشداری کۆمەڵە لاوێکی نەناس بکات.

"بۆچی وەک ئێلا ناکەن؟"، لە گەڕەکەکەدا دایکەکان لە کچەکانی خۆیان دەپرسی، "تەماشا بکەن، ئەو خۆی لە هیچ کێشەیەک تێوەناگلێنێت".

لە کاتێکدا دایکانی کچەکان زۆر ڕێزیان لەم دەگرت، کەچی کچان و کوڕان ئەمیان بە جیددی و ئاڵۆز و خاڵی لە ڕۆحی خۆشنوودی دەبینی. ئیدی سەیر نەبوو لە قوتابخانەی دواناوەندی کچێکی زۆر خۆشەویست نەبوو. جارێکیان یەکێ لە کوڕە هاوپۆلەکانی پێی گوت: "ئایا دەزانیت کێشەی تۆ چییە؟ تۆ ژیانت زۆر بە قورسی گرتووە. کچێکیت تا بڵێیت بێزارکەریت".

بە وردی گوێی لێگرت و گوتی کە بیرێک لە شتەکە دەکاتەوە.

ئەوێک بە درێژایی ئەو ساڵانە شێوەی پرچیشی نەگۆڕیبوو ـ پرچێکی درێژ، پەخشان، زەردێکی هەنگوینی، لە شێوەی کێکێکدا هەڵێدەگەڕاندەوە ـ یان دەیکردە پەلک و تا خوارەوەی پشتی شۆڕدەبووەوە. خۆی زۆر

نەدەڕازاندەوە، بەڵکو تویێژێکی تەنکی لە سووراوی قاوەیی مەیلەو سووری بەکار دەهێنا، هەر وەک کچەکەی دەیگوت سێبەرێکی سەوز ئامالّی بۆ چاوی دەکـرد و لەجیـاتی ئەوەی دەریانبخـات، ڕەنـگە شـین و خۆڵەمێـشییەکەی دەشاردەوە.

لە هەموو بارێکدا نەیدەتوانی بە باشی دوو هێڵی چەماوە بۆ سێبەری چاوەکانی بکێشێت و بەزۆری هێڵە کێشراوەکەی سەر یەکێ لە پێڵووەکان لە ڕێـڕەوی خـۆی دەردەچـوو و لە هـێڵە کێـشراوەکەی سـەر پێڵـووەکەی تـر ئەستوورتر دەردەکەوت.

ئـێلا وای بە خەیاڵـدا دەهــات کە خەوشــێکی تێـدایە. ئــاخر ئەو یــان خۆتێهەڵقـورتێنەرێکی منجـڕە (وەک خۆهەڵقورتانـدنەکەی لە شـووکردنەکەی جانێت)، یان نەرم و ملکەچە (وەک پەیوەندییە سێکسییەکانی مێردەکەی). ئیدی لەوێ ئێلایەکــی دەســەلاتخواز و لێــرە ئێلایەکــی تــا ئەوپەڕی نائومێــد و بەستەزمان. نەیدەزانی لەم دوو شتە کامیان و کەی دەردەکەوێت.

ئێلایەکی سێیەمیش هەبوو، ئێلایەک بە هێمنی سەرنجی هەموو شتێکی دەدا و چاوەڕێی کاتی تەقینەوەی دەکرد. لە بن خودی ئێلای هێمن و خنکاودا، تووڕەیی و یاخیبوونێکی توند خۆیان حەشاردابوو. ئێلای سێیەم ئاگاداری دەکردەوە کە ئەگەر لەسەر ئەم ڕەوتە بەردەوام بێت، ئەوە بێگومان ڕۆژێک هەر دێت بتەقێتەوە، ئەمەش بەند بوو بە ڕەخسانی کاتەوە.

دوای ئەوەی ئێلا لە دواڕۆژی مـانگی ئایـاردا ئەوەی کـردی دەمـێ بـوو شـتی وای نەکردبـوو. نـوێژی کرد و لە خـودا پاڕایەوە کە خۆشەویستییەکی وای پـێ ببەخـشێت هەمـوو بـوونی پڕ بکـاتەوە، یـان وای لـێ بکـات ئەوەنـدە دڵڕەق و گوێنەدەر بێت، بیر لەوە نەکاتەوە و گوێ بەوە نەدات کە لە ژیانیـدا خۆشەویستی نییە.

"لەم دووە کامیـان هەڵـدەبژێریت، تکـایە زوو وەڵام بـدەوە"، بەدەم تکـاوە بیری کەوتەوە "ڕەنگە بیرت چووبێت کە من گەیشتوومەتە تەمەنی چل ساڵی. وەک دەبینیت، من ساڵانی تەمەنم بە باشی بەکار ناهێنم".

# گوڵی بیابانی لەشفرۆش

## قۆنیا، ١٧ی تشرینی یەکەم ١٢٤٤

بە هەناسەبڕکێوە بە کۆڵانە تەنگەکاندا هەر ڕامدەکرد و ڕامدەکرد، نەمدەتوانی ئاوڕی دواوە بدەمەوە. سییەکانم دەسووتانەوە و سینگم دەهەژی، تا لە کۆتاییدا گەیشتمە بازاڕە قەرەباڵغەکە و پشتم دایە دیوارێکەوە کە زگی دابوو و خەریکبوو دەڕووخا، ئەوسا زاتم وەبەر خۆ نا و تەماشای دواوەی خۆم کرد. وای چەند واقم وڕمان و ئاسوودە بووم. بینیم تاقە کەسێک دوامکەوتووە، ئەویش کونجییە. بە هەناسەبڕکێوە بە تەنیشتمەوە وەستا و دەستێکی کەوتبووە ئەملا و دەستەکەی تری ئەولا، سەری سوڕمابوو و تووڕەیی بە دەموچاوییەوە دیاربوو. لەوە تێنەدەگەیشت کە بۆچی لەپڕ وەک شێت بە کۆڵانەکانی قۆنیادا ڕامدەکرد.

شتەکان بە خێرایی ڕوویان دا. تا نەگەیشتمە بازاڕەکە، ڕاستییەکەم بۆ ڕوون نەبووەوە. کاتێ لە مزگەوتەکە دانیشتبووم و بە قووڵی گوێم لە وتارەکە گرتبوو، بە گەوهەری حیکمەتی وتەکانی ڕۆمی مەست بووبووم. لە گەرمەی ئەو مەستییەمدا، سەرنجی ئەوەم نەدا کە ئەو لاوەی بە تەنیشتمەوە دانیشتبوو، بەبێ مەبەست پێی خستە سەر ئەو ملپێچەی کە دەموچاوی خۆم پێداپۆشی بوو. ئیدی بەبێ ئەوەی ئاگام لێ بێت ملپێچەکە هاتە خوارەوە و مێزەرەکەم لاربووەوە و دەموچاوم و بەشێک لە قژەکەم دەرکەوتن. بە پەلە دەمامکەکەم توندکردەوە و لەسەر گوێگرتن لە ڕۆمی بەردەوام بووم و دڵنیا بووم کە کەس سەرنجی شتێکی نەداوە، بەڵام کاتێ دووبارە چاوم هەڵبڕی، بینیم گەنجێک لە ڕیزی پێشەوە چاوی تێبڕیوم. دەموچاوی شێوە چوارگۆشە

بوو، چاوی مات بوو، لووتێکی درێژ و تیژی هەبوو، دەمی وا پیشان دەدا کە بێزی دێتەوە. ئەمێستا زانیم کە ئەوە پێپرسە.

پێپرس یەکێ بوو لەو مەعمیلە بێزارکەرانەی کە هیچ کچێ لە سۆزانیخانەکە ئارەزووی نەبوو لەگەڵیدا بنوێت. ئاخر پیاوانێک هەن لەگەڵ لەشفرۆشدا جووت دەبن و هاوکات ڕقیان لێیان دەبێتەوە و سووکایەتییان پێدەکەن، پێپرسیش یەکێ بوو لەو جۆرە پیاوانە و لە قسەی سووک و نوکتەی ناشیرینی خۆی نەدەکەوت و تەبیاتێکی یەکجار خراپی هەبوو. جارێکیان بە شێوەیەکی کوشندە لە کچێکی دا، خاوەن سۆزانیخانەکە هەرچەندە بەر لە هەرشتێ حەزی لە پارە بوو، دەریکرد و پێی گوت کە جارێکی تر پێ نەخاتەوە ئەم شوێنە، بەڵام دوای چەند مانگێک هاتەوە. دوایی نەمزانی هۆیەکەی چییە لەناکاو وازی لە هاتوچۆی سۆزانیخانەکە هێنا و ئیدی دەنگوباسیمان نەبیستەوە. ئەوەتا ئێستا مینا پیاوانی خوداپەرست ڕیشێکی درێژی هێشتووەتەوە و لە ڕیزی پێشەوە دانیشتووە، بەڵام هێشتا بروسکەی توندوتیژی لە چاوانییەوە سەری دەکرد.

دەموچاوی خۆم لێی شاردەوە، بەڵام کار لەکار ترازابوو. ئیدی منی ناسیبووەوە. پێپرس شتێکی چپاندە بن گوێچکەی ئەو پیاوەی لە تەنیشتییەوە دانیشتبوو، ئینجا وەرسووڕان و چاویان تێبڕیم، دوایی ئاماژەیان بۆ پیاوێکی تر کرد، ئیدی هەموو پیاوەکان لەو ڕیزەدا یەک لە دوای یەک تەماشایان دەکردم. دەموچاوم سوورهەڵگەڕا و دڵم داخورپا، بەڵام نەمتوانی لە شوێنی خۆم ببزوێم، بەڵکو خۆم دایە دەست ئەو ئومێدە منداڵانەیە کە ئەگەر هەر وا بەبێ جووڵە لەشوێن خۆم دابنیشم و چاوەکانم بنووقێنم، ئەوا تاریکییەکە هەموومان قووتدەدات و پەژارەی ناوێت.

کە زاتم وەبەرخۆ نا و دووبارە چاوم کردەوە، بینیم وا پێپرس لەنێو حەشیمەتەکە ڕێگەی خۆی دەکاتەوە و بەرەو لای من دێت. ئیدی ڕووەو دەرگاکە ڕامکرد، بەڵام هەستەم بوو بتوانم ڕابکەم، چونکە بە دەریایەکی هەڵچووی پیاوان دەورە درابووم. پێپرس لە چاوترووکانێکدا پێم گەیشت و ئەوەندە لێم نزیک بووبووەوە، بۆنی هەناسەیم کرد. قۆڵی گرتم و لەنێوان

ددانە بەچیرەوەچووەکانییەوە گوتی: "سۆزانییەک لێرە چی دەکات، ئەوە شەرم ناکەیت؟".

"تکات لێدەکەم... لێت دەپاڕێمەوە وازم لێ بێنە با بڕۆم"، زمانم گیرابوو، بەڵام پێم وا نەبوو گوێی لێم بووبێت.

هاوڕێکانی هاتنە پاڵی. پیاوانی گێل، ترسناک، لووتبەرز، لەخۆرازی، بۆنی تووڕەیی و ترشەڵۆکیان لێدەهات، ئیدی سووکایەتیبارانیان کردم. پیاوەکانی دیکە ئاوڕیان دایەوە تا بزانن چی ڕوو دەدات، هەندێکیان ورتەورتێکی نارەزاییان دەربڕی، بەڵام کەسێکیان نەهاتە بەینەوە. جەستەم مینا پارچە هەویرێک خاوبووبووەوە. خۆم شلکرد تا بەرەو دەرگا پاڵم پێوەبنێن. کە گەیشتینە شەقامەکە، ئاواتەخواز بووم کونجی ڕاپەڕێت و یارمەتیم بدات. بەتەمابووم گەر لەمە خراپتر ڕووبدات، ڕابکەم، بەڵام هەر ئەوەندە پێیەکانم کەوتنە سەر زەویی شەقامەکە، توندوتیژی و شەڕانگێزیی پیاوەکان زیاتر بوو. ئەوان لەناو مزگەوتەکەدا بەوای وتاربێژەکە و نوێژکەرانەوە، سڵیان دەکردەوە دەنگ بەرز بکەنەوە، یان پاڵم پێوەبنێن، بەڵام ئێستا ترسی ئەوەم لێ نیشت لە شەقامەکەدا شتێک نەبوو بەریان پێ بگرێت.

لە ژیانمدا گەلێ ئاستەنگم دیون، لێ باوەڕناکەم قەت هەستێکی خەمینی وەک ئێستام هەبووبێت. دوای ساڵانێک لە دوودڵی، وا ئەمڕۆ هەنگاوێک بەرەو خودا نزیکدەبمەوە، دەبێ ئاوها وەڵامی نزیکبوونەوەکەم بداتەوە؟ بە تێهەڵدان و دەرکردنم لە ماڵی خۆی!

"نەدەبوو بۆ ئەوێ بچم"، وام بە کونجی گوت و دەنگم چون بەفرێکی تەنک درزی برد، "ئەوان ڕاست دەکەن، چونکە لە مزگەوت یان کەنیسە یان هەر ماڵێک لە ماڵەکانی خودا سۆزانییەک جێی نابێتەوە".

"وا مەڵێ".

کە ئاوڕم لە ئاخێوەرەکە دایەوە، باوەڕم بە چاوەکانی خۆم نەکرد. خۆ ئەوە دەروێشە گەڕیدە بێڕیشەکەیە. زەردەخەنەیەکی ئاشکرا لەسەر ڕوخساری کونجی نەخش بوو، خۆشحاڵ بوو کە جارێکی تر دەروێشەکەی بینییەوە. تەکانم دا دەستەکانی ماچ بکەم، بەڵام ڕایگرتم و نەیهێشت، ئینجا گوتی: "نا، تکات لێدەکەم".

بە پاڕانەوەوە گوتم: "ئاخر چۆن بتوانم سوپاست بکەم؟ من زۆر قەرزاری تۆم".

بە گوێنەدانەوە شانەکانی هەڵتەکاند و گوتی: "تۆ بە هیچ شتێ قەرزاری من نییت. جگە لە خودا ئێمە قەرزاری هیچ کەسێک نیین".

خۆی پێناساندم و گوتی کە ناوی شەمسی تەورێزییە، ئینجا باسی سەیرترین شتی کرد کە لە ژیانمدا نەمبیستبوو: "هەندێ خەڵک ژیانیان بە خەرمانەیەکی گەش دەست پێدەکەن، بەڵام ئەوەندە نابات ئەو گەشییە کاڵ دەبێتەوە. وا دیارە تۆش یەکێکیت لەوانە. خەرمانەی ژیانی تۆش ڕۆژێ لەرۆژان پڕبوو لەگوڵەزەنبەقی سپی و خاڵخاڵاوی، وەلێ وردەوردە کاڵبوونەوە و ئەمێستا بوون بە تەڵخێکی مات. ئەرێ تۆ ڕەنگە ڕەسەنەکانی خۆت لەدەست نەداوە؟ ئەرێ حەز ناکەیت مەیدانخوازی گەوهەری خۆت بکەیت؟".

هەستم کرد وا خەریکە تینووی وشەکانی دەبم.

"خەرمانەکەت درەوشانەوەی نەماوە، چونکە بە درێژایی ئەم ساڵانە باوەڕت بە خۆت هێناوە کە تۆ لە ناوەوە و لە دەرەوە پیسیت".

"من پیس نیم"، بەدەم قسەوە لێوەکانی خۆم گەست، "ئاخر تۆ ئەوە نازانیت، ئەی بۆ خۆژیاندن چی بکەم؟".

"ڕێگەم بدە با حەکایەتێکت بۆ بگێڕمەوە"، شەمس وای گوت و ئەمەی گێڕایەوە:

ڕۆژێ لەشفرۆشێک بە لای سەگێکی بەرەڵلادا تێپەڕی. سەگەکە لەبەر خۆرە سووتێنەرەکەدا لە تینوێتی و بێچارەییدا هەناسکەهەناسکێ بوو. لەشفرۆشەکە دەسبەجێ تاکێ لە پێڵاوەکانی داکەند و لە بیرێکی نزیک پڕی کرد لە ئاو تا ئاو بە سەگەکە بدات. ئینجا بە ڕێی خۆیدا ڕۆیشت. ڕۆژی دوایی تووشی سۆفییەکی بەحیکمەت بوو. کە لەشفرۆشەکەی بینی دەستەکانی ماچ کرد، ئەمیش سەری سوڕما. سۆفییەکە پێی گوت کە ئەو بە ڕاستگۆیی بەزەیی بە سەگەکەدا هاتووەتەوە، بۆیە خودا لە هەموو گوناهەکانی خۆشبووە".

تێگەیشتم کە شەمسی تەورێزی دەیەوێ چیم پێ بڵێت، بەڵام شتێ لە ناوەوەمدا ئەوەی ڕەتدەکردەوە کە باوەڕی پێ بکات، بۆیە گوتم: "با دڵنیات

بکەمەوە، گەر من هەموو سەگەکانی قۆنیا تێراو بکەم، بایی ئەوە نییە لە گوناهەکانم پاک ببمەوە".

"لە توانای تۆدا نییە ئەوە بزانیت، هەر خودا خۆی ئەوە دەزانێت. ئەی چی وات لێدەکات پێت وا بێت کە یەکێ لەو پیاوانەی لە مزگەوتەکە دەریان کردیت، لە هەموویان لەخوداوە نزیکترە؟".

"تەنانەت گەر لە خوداش نزیک نەبن"، هەر لەخۆوە وەڵامم دایەوە، "ئاخر کێ ئەوەیان پێ بڵێت؟ تۆ؟".

دەروێشەکە سەری بادا و گوتی: "نەخێر، شتەکان ئاوها بەڕێوە ناچن، گەرەکە تۆ خۆت پێیان بڵێیت".

"پێت وایە کە ئەوان گوێم لێدەگرن؟ ئاخر ئەو پیاوانە ڕقیان لێمە".

"دێ گوێ بگرن"، بە جەختەوە ئەمەی گوت، "چونکە شتێ نییە ناوی (ئەوان) بێت، هەروەها شتێکیش نییە ناوی (من) بێت، هەموو ئەوەی لەسەرتە بیکەیت ئەوەیە کە بزانیت لەم گەردوونەدا هەموو شتێک و هەموو کەسێک پێکەوە بەستراون. ئێمە بریتی نیین لە سەدان و هەزاران بوونەوەری جیاواز، بەڵکو هەموومان یەک شتین".

چاوەڕێم کرد تا بۆم ڕوون بکاتەوە، ئەو لەسەری ڕۆیشت و گوتی: "ئەمە ڕێسایەکە لە چل ڕێساکە: **گەر مرۆڤ بیەوێ ئەو شێوازە بگۆڕێت کە خەڵکی لەگەڵیدا مامەڵەی پێدەکەن، ئەوا پێویستە یەکەم جار ئەو شێوازە بگۆڕێت کە لەگەڵ خودی خۆیدا مامەڵەی پێدەکات. گەر مرۆڤ فێری ئەوە نەبوو چۆن بەتەواوی و ڕاستگۆیانە خۆی خۆش بوێ، ئیتر هیچ شێوازێکی دی نییە وای لێ بکات کە خۆشەویستی لە دڵیدا بێت. لێ کاتێ دەگاتە ئەو قۆناغە، ئەوا سوپاسی هەر دڕکێک دەکات کە لە لایەن خەڵکی دیکەوە پێیدا دەچەقێنرێ، ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە هاکا گوڵباران کرا.** کەمێ وەستا و ئینجا لەسەری ڕۆیشت: "گەر مرۆڤ خۆی بە شایستەی ڕێزگرتن نەزانێت، ئیدی چۆن دەکرێ گازاندە لە خەڵکی تر بکات لەبەر ئەوەی ڕێزی ناگرن؟".

کە هەستم کرد ئەوەی لەنێو چنگمدایە وا خەریکە لێم دەچۆڕێتەوە، بۆیە لێرەدا وەستام و نەمتوانی وشەیەک بدرکێنم، چونکە هەموو ئەو پیاوانەم هاتەوە یاد کە لەگەڵیاندا نوستبووم، بۆنیان، بەرکەوتنی دەستیان و پێستی

زبریـان، ئـاخوئۆفی سـاتی ڕەحەتبوونیـان... گەنجـانی سـەلارم بینی دەبـوونە درندە، دڕندە دەبوونە گەنجی ناسک و سەلار. جارێکیان مەعمیلێک هات بۆلام کە بەوە ڕاهـاتبوو لە کـاتی سـەرجێییکردندا تفـی لە سـۆزانییەکان دەکـرد و دەیگوت (چەپەڵ)، تفی لە دەموچاوم کرد و پێی وتم (هەی قەحپەی چەپەڵ).

کەچی ئەم دەروێشە پێی وتم کە من لە ئاوی کانی پاکترم، وام بەخەیاڵدا هات کە ئەمە نوکتەیەکی بێتامە، ویستم زۆر لە خۆم بکەم و پێبکەنم، دەنگ لە ئەوکمەوە دەرنەچوو، ئیدی هەناسەی خۆم قەتیس کرد.

"ڕابردوو خولانەوەیەکی بەردەوامە، گەر خۆتت بۆ شل کرد، ئەوا بەسـەر سـاتی ئێسـتاتدا زاڵ دەبێـت، ئیتـر هەڵتـدەمژێت و ڕاتـدەماڵێت". شـەمس وەک ئەوەی غایلەکانمی خوێندبێتەوە وای پێ گوتم، "ڕۆژگار لە وەهمێک زیاتر نییە، گەرەکە بە تایبەتی بۆ ئەم ساتە بژیت و ئەوەی گرینگە ئەمەیە".

کە ئەمەی گوت، دەستەسرێکی ئاوریشمی لە گیرفانی عەباکەی دەرهێنا و گوتی: "لای خۆت بیپارێزە. لە بەغدا پیاوچاکێک پێی بەخشیم، بەڵام تۆ لە من پتر پێویستت پێی دەبێت. ئەم دەستەسڕە بیرت دەخاتەوە کە تۆ دڵپاکیت و لە ناوەوەی خۆتدا خودات هەڵگرتووە".

دەروێشەکە داردەستەکەی هەڵگرت و هەستا و خۆی ئامادەکرد بڕوات، گوتی: "واز لەو سۆزانیخانەیە بێنە".

"بۆ کوێ و چۆن بڕۆم؟ ئاخر شوێنێکی دیکەم نییە ڕووی تێبکەم".

"ئەمە گرفـت نیـیە"، دەروێـشەکە بەدەم قـسەکردنەوە چاوەکـانی درەوشـانەوە، "گـوێ بەوە مەدە ڕێـگە بەرەو کوێـت دەبـات، بەڵکـو چـاوت لەهەنگـاوی یەکەم بێـت، کە قورسـترین هەنگـاوە و گەرەکە بەرپرسـیارێتی هەڵبگریـت. هەر ئەوەنـدە ئەو هەنگـاوەت هەڵێنـا، ئیـدی هەمـوو شـتەکان بە شێوەیەکی سروشتی بۆخۆیان دەڕۆن و ئەوەی دەمێنێتەوە هەر لەخۆوە دێت. لەگەڵ شەپۆلدا مەڕۆ، بەڵکو خۆت ببە بە شەپۆل".

سـەرم لەقانـد. ئیـدی ئاتـاجی ئەوە نەبـووم پرسـیار بـکەم تـا تێـبگەم کە ئەمیش یەکێکە لە چل ڕێساکە.

# سلێمان سەرخۆش

## قۆنیا، ١٧ی تشرینی یەکەم ١٢٤٤

پەر لە نیوەشەو، دوا پێکی شەرابم خواردەوە و مەیخانەکەم جێهێشت. "ئەوەی پێم وتیت لەبیرت بێت. وریای هەر وشەیەک بە کە لە دەمت دەردەچێت"، خریستۆس وەک ئاگادارکردنەوەیەک ئەمەی پێ گوتم و دەستی دوعاخوازیی بۆ هەڵبڕیم.

سەرم لەقاند و هەستم بە بەختەوەری کرد، چونکە هاوڕێیەکم هەیە و بەتەنگمەوەیە. وەلێ هەر ئەوەندە پێیەکانم کەوتنە سەر شەقامە چۆڵ و تاریکەکە، هەستم بە ماندووبوونێک کرد کە لەوەوپێش هەستم پێی نەکردبوو. شەڵلام کرد کە قاپێ شەرابم لەگەڵ خۆم هێنابا، چونکە هێشتا توانای خواردنەوەم هەبوو.

لە کاتێکدا دەڕۆیشتم و لەترم دەدا، پێڵاوە درێژەکانم لەسەر شەقامە نارێکەکە تەقەتەقیان لێ هەڵدەستا. وێنەی ئەو پیاوانەی کە لەگەڵ کەژاوەکەی ڕۆمیدا دەڕۆیشتن هاتەوە بەر چاوم. یادی نیگا ڕقاوییەکانی چاویان ئازاری دام. گەر لە دنیادا شتێک هەبێت ڕقم لێی بێتەوە، سەنگینییە، لەم بارەوە دەوڵەمەند و هەژار تانەیان لێداوم، ئیدی هەر بە یادکردنەوەیان تەزوویەک بە هەموو جەستەمدا تێدەپەڕێت.

لە‌کاتێکدا ئەم غایلانە مژوولیان کردبووم، لای لێژاییەکە پێچم کردەوە و بەکۆڵانێکی لاوەکیدا ڕێم گرتەبەر. بەوای درەختە لقوپۆپ بەرزەکانەوە کۆڵانەکە تاریکتر بوو، سەرباری تاریکییەکە لەناکاو مانگیش لە پشت پەڵەهەورێکەوە ون بوو. ئیدی تاریکییەکی ئەنگوستەچاو دەوری دام. خۆ

ئەگەر تاریکییەکە نەبوایە ئەوا ئەو دوو حەسحەسەم دەبینی کە خەریکبوون نزیک دەبوونەوە.

وتم: "سڵاوتان لێ بێت"، دەنگم خۆشحاڵیی پێوە دیاربوو و هەوڵم دا نیگەرانیی خۆم بشارمەوە.

دوو حەسحەسەکە سڵاوەکەمیان نەسەندەوە، بەڵکو لێیان پرسیم کە بەم درەنگی شەوە لەم شەقامە چی دەکەم.

بە بلمەبلم گوتم: "پیاسە دەکەم".

ڕووبەڕووی یەکتر وەستاین، بێدەنگییەکی قورس باڵی کێشا و جگە لە حەپەی دووری سەگەل، هیچی تر نەدەبیسترا. یەکێ لە پیاوەکان هاتە پێشەوە و بۆنی بە هەواوە کرد، ئینجا گوتی: "بۆنێکی ناخۆش دەکەم".

"بەڵێ، بۆنی شەراب دێت"، پاسەوانەکەی تر دڵنیای کردەوە.

بڕیارم دا کە شتەکە بە ئاسانی چارەسەر بکەم، بۆیە وتم: "خۆتان عەزێت مەدەن. ئەم بۆنە ناخۆشە تەنها بۆنێکی خوازەییە. لەبەر ئەوەی ئێمەی موسڵمان جگە لە شەرابی خوازەیی ڕێگەمان پێ نادرێ شەرابی دیکە بخۆینەوە، بێگومان بۆیە بۆنەکەیشی دەبێتە بۆنێکی خوازەیی".

"بۆ خاتری دۆزەخ، ئەم پیاوە چ وڕێنەیەک دەکات؟"، پاسەوانی یەکەم ترمەترمێکی کرد.

لەو ساتەدا مانگ لە پشت هەورەکەوە دەرکەوت و بە تریفە ناسک و زەردەکەی کۆیکردینەوە و توانیم ئەو پیاوەی بەرانبەرم وەستابوو ببینم، دەموچاوی چوارگۆشە بوو، ڕیشێکی بەردابووەوە، چاوەکانی شین و ساردوسڕ و لووتێکی تیژی هەبوو. خۆ ئەگەر چاوە ماتەکانی و دەموچاوە مۆنەکەی نەبوونایە، ڕەنگە قۆز بوایە.

"لەم کاتە درەنگەدا لەم شەقامە چی دەکەیت؟"، پیاوەکە پرسیارەکەی دووبارە کردەوە، "لە کوێوە هاتوویت و بۆ کوێ دەڕۆیت؟".

خۆم پێ نەگیرا و گوتم: "ڕۆڵە ئەم پرسیارانە قووڵن، گەر وەڵامەکانیانم بزانیایە، ئەوا مەتەڵی بوونی خۆمانم لەم دنیایەدا هەڵدەهێنا".

"هەی چەپەڵ، ئەوە گاڵتەم پێدەکەیت؟"، پاسەوانەکە بە مۆنییەوە پرسیاری کرد و بەخێرایی قامچییەکی دەرهێنا و لە هەوادا ڕایوەشاند.

لە جووڵەکانیدا زۆر زێدەڕۆیی دەکرد، بۆیە بە نەرمی پێکەنیم، پاشان قامچییەکی لەسەر سینگم دا. لێدانەکە بۆ من کتوپڕ بوو، لەنگەرم تێکچوو و کەوتم.

'ڕەنگە ئەمە فێرت بکات کە چۆن بەویڵەوە ڕەفتار بکەیت'، حەسحەسەکە بەدەم قسەوە قامچییەکەی ئەمدەست و ئەودەست کرد، 'ئەی نازانیت کە شەرابخواردنەوە لە گوناهە گەورەکانە؟'.

هەستم کرد خوێنم هاتووەتە کوڵ، سەرم لە دەریایەکی ئازاردا دەستی بە خولانەوە کرد و هێشتا باوەڕم نەدەکرد کە گەنجێ لە تەمەنی کوڕەکەی خۆمدا لە ناوجەرگەی گەڕەکدا بەر قامچیم بدات.

'دەی سزام بدە'، بەدەم قسەکردنەوە هاوارم کرد، 'گەر بەهەشت بۆ کەسانی وەک تۆ تەرخان کرابێت، ئەوا پێم باشترە لە ئاگری دۆزەخدا بسووتێم'.

لەنۆرە تووڕەییەکی توندندا حەسحەسە لاوەکە تا هێزی تێدا بوو بە قامچی لێی دەدام. بە دەستەکانم دەموچاوی خۆم دەشاردەوە، بەڵام ئەوە هیچ دادێکی نەدام. لەو ساتەدا سترانێکی خۆشم بیرکەوتەوە، کە بەزۆر لە نێوان هەردوو لێوە خڵتان خوێنبووەکانمەوە ڕێگەی خۆی کردەوە. سووربووم لەسەر ئەوەی خۆم بە زەبوونی پیشان نەدەم، لەگەڵ هەر زەبرێکی قامچییەکەدا بە دەنگێکی بەرز و بەرزتر دەستم بە گۆرانیگوتن کرد:

**'هۆ خۆشەویستم ماچم بکە، هەموو دڵم پارەپارە بکە لێوەکانت تامی شیرینی شەرابی گێلاس دەدەن، دەی زۆرترم بۆ تێ بکە'.**

ئەم شۆخیکردنەم پاسەوانەکەی تووڕەتر کرد. چەند بە دەنگی بەرز گۆرانییەکەم دەچڕی، توندتر لێی دەدام. لەو باوەڕەدا نەبووم کە ئەم جۆرە تووڕەیی و ڕقە بەم ڕادەیە لە ناخی تاقەکەسێکدا هەبێت.

'پێپرس ڕاوەستە، ئیتر بەسە'، گوێم لێبوو حەسحەسەکەی تر بە ترسەوە هاواری کرد.

لەپڕ چۆن دەستی بە لێدانم کرد، هەر واش دەستی لێ هەڵگرتم. ویستم دوا قسە بکەم و شتێکی لەناکاو و توند بڵێم، لێ سێڵاوی خوێنی ناو دەمم لە هەناومەوە قوڵپی دا و دەنگی خەفەکردم و ڕشامەوە..

"تـۆ پیـاوێکی نەخۆشـیت"، پیـرس بە تـانەوە وای پـێ گـوتم، "دەربـارەی ئەوەی پێم کردیت تەنیا لۆمەی خۆت بکە".

پشتیان تێکردم و هەیپایان لێکرد، ئیتر لەنێو تاریکیی شەوەکەدا بزربوون.

نەمزانی تـا کەی لەوێ کەوتبووم، ڕەنگە مـاوەی چەند خولەکێک یـان بە درێژایی شەوەکە بووبێت، چونکە زەمەن و هەمـوو شتێکی تر ڕەوتـی خۆی لەدەست دابـوو، مـانگەکەش لە پشت هەورەکـانەوە ون بـوو، ئیـدی نەک هەر ڕووناکییەکەی جێی هێشتم، بەڵکو بەجۆرێ جێی هێشتم کە نەمیش دەزانی من کێم. زۆری نەبرد لە نێوان دەریایەکی بیرچوونەوەی نێوان ژیان و مەرگدا دەستم بە گێنگڵدان کرد، ئیتر گوێم بەوە نەدەدا کۆتاییم بە چی دێت. ئینجا تا دەهات سڕیی جەستەم نەدەما و جێگەی هەر گاز و هەر لێدانێکی بەزەبر و هەر برینێکی جەستەم، شێتانە دەستی بە ئازار کرد و شـەپۆل دوای شـەپۆلی ئـازار دەیانکوتـامەوە. سـەرم لەقەلەقی بـوو، دەسـت و لاقەکـانم ئازاریـان لـێ هەڵدەستا. لەو دۆخەدا مینا گیانداریکی بریندار دەستم بە ناڵەناڵ کرد.

بێگومان کوێراییم داهاتووەوە. تاوێ چاوم کردەوە، میزم بە خۆمدا کردبوو، دەست و پێیەکانم یەکجار دەئێشان. لە خودا پاڕامەوە کە جەستەم سڕ بکات، یان شەرابم پێ ببەخشێت. لەم کاتەدا گوێم لە ترپەی هەنگاوگەلێ بـوو نزیـک دەبوونەوە. دڵم بە توندی کەوتە خورپە، ڕەنگە بەرەڵلایەکی شـەقامەکان بێت، یـان دزێـک، یـان پیاوکوژێـک بێـت، بە خـۆمم گـوت لە چـی بترسـێم؟ ئیـدی گەیشتوومەتە ڕادەیەک هـیچ شـتێکی ئەم شـەوە نامترسـێنێت کە لەگوینە بێتە ڕێگام.

لە پـشت سـێبەرەکانەوە دەروێـشێکی بـاڵابەرز و بـاریکەلە و ڕیـشتاشراو دەرکەوت و لە تەنیشتمەوە داچەمـایەوە، یـارمەتیی دام کە هەسـتم. خـۆی پـێ ناساندم کە ناوی شەمسی تەورێزییە، ئینجا لە ناوی پرسیم.

"سلێمان سەرخۆش، خەڵکی قۆنیام و لەخزمەتتدام"، بەدەم وەڵامدانەوەوە ددانێکی لەقم لە زارم دەرهێنا، "بە بینینت خۆشحاڵم".

"تۆ خوێنت لەبەر دەڕوات"، شـەمس بەدەم سـڕینەوەی خـوێنی دەموچـاوم، بڵمەبڵمێکی کرد، "نەک هـەر لە دەرەوە، بەڵکو لە ناویشەوە".

که ئەوەی گوت، کەمۆڵەیەکی زیوی لە گیرفانی عەباکەی دەرهێنا و گوتی: "بەم مەرهەمە برینەکانت چەور بکە. پیاوچاکێک لە بەغدا پێی بەخشیم، بەڵام تۆ لە من زیاتر پێویستیت پێی دەبێت. وەک دەزانیت برینەکانی ناوەوەت قووڵترن و دەبێ خەمیان بخۆیت. ئەوەشت بیردەخاتەوە کە تۆ لە ناختدا خودات هەڵگرتووە".

"سوپاست دەکەم". گوێم لە خۆم بوو بڵمەبڵم دەکرد. دوای ئەوەی نەرمونیانی و سۆزەکەی کاریان تێکردم، گوتم: "ئەو حەسحەسە.. بە قامچی لێی دام و گوتی کە گوایا من شایستەی ئەوەم".

کاتێ ئەم قسانەم دەکرد، سەرم لە کرووزانەوەی منداڵانەی خۆم و دەنگی پێوستبوونم بە یارمەتی سوڕما.

شەمسی تەورێزی سەری بادا و گوتی: "کەس بۆی نییە ئەوە بکات. هەر کەسەو لە خودی خۆیدا لە خودا دەگەڕێت. لەم بارەیەوە بنەمایەک هەیە: **خودا هەمووانی لەسەر شێوەی خۆی دروستکردووە، لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە هەموومان ئافەریدەی جیاواز و دیارین. دوو کەسی لەیەکترچوو دەست ناکەون و دوو دڵیش بە هەمان ڕیتم لێنادەن. گەر خودا ویستبای هەموومان لە یەکتر بچین، ئەوا وەک یەکتر دروستی دەکردین، بۆیە ڕێزنەگرتنی جیاوازییەکان و سەپاندنی بۆچوونی خۆت بەسەر ئەوانی تردا، ڕێزنەگرتنی ئەو سستەمە پیرۆزەیە کە خودا دایناوە**".

"باشە"، سەرم لە نیانیی دەنگی خۆم سوڕما، "بەڵام ئایا ئێوەی سۆفی دەربارەی ئەوە گومانتان نییە؟".

شەمسی تەورێزی زەردەخەنەیەکی ماندووانەی هاتێ و گوتی: "بەڵێ، گومان شتێکی باشە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە تۆ زیندوویت و بەردەوام لە منەکردندایت". ئەمەی بە جۆرێ وت، وەک ئەوەی خەریکی خوێندنەوەی کتێبێک بێت.

"هەروەها مرۆڤ لە شەو و ڕۆژێکدا نابێت بە بڕوادار، چونکە مرۆڤ وا بیردەکاتەوە کە بڕوادارە، ئینجا شتێک لە ژیانیدا ڕوودەدات و دەبێت بە بێباوەڕ، ئینجا دووبارە دەگەڕێتەوە و دەبێتەوە بە بڕوادار، ئینجا دەبێتە خانەگومان. ئیدی بەم ئاوهایە تا دەگاتە قۆناغێکی دیاریکراو. ئاخر ئێمە

بەردەوام لە دوودڵی داین، ئەمەش تاقە ڕێگەیەکە کە وامان لێدەکات بەرەو نواوە بڕۆین. لەگەڵ هەر هەنگاوێکی نوێدا لە حەقیقەت نزیک دەبینەوە".

وتم: "ئەگەر خریستۆس گوێی لێتبێت ئاوها قسە دەکەیت، ئەوا داوای لێدەکردیت کە ئاگات لە قسەی خۆت بێت. ئاخر ئەو دەڵێت هەموو قسەیەک بۆ هەموو گوێیەک ناگونجێت".

"قەیدی چییە، ئەویش بۆچوونی خۆی هەیە"، شەمسی تەورێزی بەدەم قسەکردنەوە بە ئاستەم پێکەنی و بەرزە پێی هەستا، "دەی با تا ماڵەوە یاوەریت بکەم، گەرەکە ئاگامان لێت بێت و دەبێ کەمێ بخەویت".

یارمەتیی دام تا هەستم و لەسەر پێی خۆم بوەستم، لێ توانای ڕۆیشتنم نەبوو و بەلادا دەهاتم، بۆیە دەروێشەکە وەک شتێکی سووک لەکۆڵی کردم. بە شەرمەوە ورەوریکم کرد، "دەمەوێ ئاگادارت بکەمەوە کە من بۆنێکی ناخۆشم لێدێت".

"سلێمان، خەمت نەبێت و هەر گوێیشی مەدەرێ".

بەم جۆرە دەروێشەکە بەبێ ئەوەی گوێ بداتە خوێن و میزەکەم و بۆنە بۆگەنەکەم، بە کۆڵانە تەنگەکانی قونیادا لە کۆڵی کردم. بە بەردەم ماڵان و کوختگەلێکدا تێپەڕیین لە پرخەی خەودا بوون، لە پشت دیواری باخەکانەوە سەگەل بە دەنگی بەرز و دڕندانە دەستیان بە لوورەلوور کرد و پێمان دەوەڕین تا هەموو خەڵکیمان لێ وەئاگا بێننەوە.

گوتم: "هەمیشە دەمپرسی لە شیعری سۆفییەکاندا باسی شەراب کراوە، ئایا ئەو شەرابەی کە سۆفییەکان پێیدا هەڵدەدەن، شەرابی ڕاستەقینەیە یان شەرابی خوازەییە؟".

"هاوڕێم، ئەوە کەی گرینگە؟"، شەمسی تەورێزی پێش ئەوەی لە بەردەم ماڵەکەی خۆم دامبنێت، لەسەر قسەکەی ڕۆیشت: "بۆ لێکدانەوەی ئەمە ڕێسایەک هەیە: **کاتێ عاشقێکی ڕاستەقینەی خودا دەچێتە مەیخانەیەکەوە، ئەوا مەیخانەکە دەبێتە ژووری نوێژکردنی ئەو، بەڵام ئەودەمەی شەرابخۆرێک دەچێتە هەمان ژوورەوە، ئەوا ژوورەکە دەبێتە مەیخانەی ئەو. هەر شتێ بکەین دەوەستێتە سەر دڵمان، نەک دیوی دەرەوەمان. سۆفییەکان بە دیمەنیان کەسایەتیی خەڵکی هەڵناسەنگێنن، کاتێ سۆفییەک دیقەتی کەسێک دەدات،**

هەردوو چاوی دەنووقێنێت و چاوی سێیەم دەکاتەوە – ئەو چاوەی کە دنیای ناوەوە دەبینێت".

دوای ئەو شەوە دوورودرێژ و تاقەتپڕووکێنە، بە تەنیا لە ماڵەکەی خۆم بووم و بیرم لەو شتانە دەکردەوە کە ڕوویان دابوو. لەگەڵ ئەوەی خەمباربووم، بەڵام لە ناخەوە هەستم بە ئارامییەکی خۆش دەکرد. بۆ ساتێکی ڕەوتەنی شەمسم بینی و ئەڵهام دەکرد بۆ هەتاهەتایە لەوێ بمێنێتەوە. هەر لەو ساتەدا زانیم کە خودایەک هەیە و خۆشی دەوێم.

هەرچەندە جەستەم ئازاری هەبوو، بەڵام سەیرم پێدەهات کە هەستم بە ئازار نەدەکرد.

# ئێلا

## نۆرتامبتۆن، ٣ی حوزێران ٢٠٠٨

بەرزبوونەوەی ڕیتمی گۆرانیی (لاوانی ڕۆخەکە) لە پەنجەرەکراوەکانی ئۆتۆمبیلی قوتابیانی زانکۆوە دەبیسترا، یەکەم تینی گەرمی خۆری هاوین بە دەموچاویاندا چزا. ئێلا بێ ئەوەی گوێ بە شادمانییان بدات، تەماشای دەکرد و یادگەی بەرەو ئەو چەند ڕۆژە کەمەی ڕابردوو گەڕایەوە. ئەوەبوو سەگە (سپیریت)* ی بە تۆپیوی لە ناندینەکەدا بینی، لەگەڵ ئەوەی خۆی بۆ ئەم چرکەساتە ئامادە کردبوو، بەڵام غەمێکی گەرە دایگرت و هەستی بە لاوازی و تەنیایی خۆی کرد. پێی وا بوو بە لەدەستدانی سەگەکەی لەم دنیایەدا بە تەنیا ماوەتەوە. دوایی بۆی دەرکەوت کە ئۆرلی بەدەست نەخۆشیی (پۆلیمیا)** وە موبتەلا بووە و هەموو دەستەخوشکەکانیشی لە قوتابخانە ئەوە دەزانن. شەپۆلێک لە هەستکردن بە گوناهباری ئێلای داگرت و دەربارەی پەیوەندیی نێوان خۆی و کچە بچووکەکەی گومانی لە لا پەیدا بوو، ئەمەش وای لێکرد وەک دایکێک بیر لەوە بکاتەوە کە بە تۆمارەکەیدا بچێتەوە. هەستکردن بە گوناهباری لە لای ئێلا شتێکی تازە نەبوو. لێ متمانە بەخۆ نەبوون لە پەروەردەکردندا وەک دایکێک، وای لێکرد هەست بەوە بکات.

لەو ماوەیەدا ئێلا هەموو ڕۆژێ لەگەڵ عەزیز. ز . زاهارادا چەندین نامەی ئەلیکترۆنییان بۆ یەکتر دەنووسی. دوو، سێ، هەندێ جار پێنج نامەی بۆ

---

* سپیریت: لە زمانی ئینگلیزیدا واتا ڕۆح، بەڵام لەم ڕۆمانەدا وەکو ناوێک بۆ سەگەکەی ئێلا بەکار هێنراوە.

** پۆلیمیا: ئارەزوویەکی بەردەوام و نارێک لە زۆرخۆریدا، کە لەدوای تێربوون زۆرخۆر هەوڵدەدات بڕشێتەوە، یان دەرمانی ڕەوانی یان ڕێجیم بەکار دێنێت. زۆرخۆر بەزۆری هەست بە گوناه و خەمۆکی دەکات.

دەنووسی و باسی هەموو شتێکی بۆ دەکرد. لەوە سەری سوڕمابوو کە یەکسەر وەڵامی دەدایەوە. ئێلا لەوە تێنەدەگەیشت ئەوێک بۆ شوێنە دوورەکان سەفەر بکات، ئیدی کەی کاتی ئەوەی هەیە، یان چۆن دەپەرژێتە سەر خوێندنەوەی پۆستی ئەلیکترۆنیی ئینتەرنێت. ئەوەندەی نەبرد هۆگری دەربڕینەکانی بوو. بەیانیان یان لە هەر دەرفەتێکی تردا یەکەم شت پۆستە ئەلیکترۆنییەکەی دەکردەوە، ئینجا دوای قاوەڵتی، کە لە پیاسەی بەیانیان دەگەڕایەوە و ژەمی خواردنی ئامادە دەکرد، هەروەها بەر لەوەی بۆ پێویستییەکان لە ماڵ دەربچێت، بەڵکو لەو کاتەشدا کە لای قاوەخانەی ئینتەرنێت هەڵوەستەیەکی دەکرد، هەروەها لەو دەمەیدا کە تەماشای بەرنامە دڵخوازەکانی خۆی لە تەلەڤزیۆن دەکرد، یان لە یانەی چێشتلێنان تەماتەی قاژقاژ دەکرد، یان ئەو کاتەی بە تەلیفۆن لەگەڵ دەستەخوشکەکانیدا قسەی دەکرد، یان ئەو کاتانەی کە گوێی لە هەردوو منداڵەکەی دەگرت کە دەربارەی قوتابخانە و ئەرکەکانی قوتابخانەیان گفتوگۆیان دەکرد، کۆمپیوتەرەکەی بە کراوەیی دەهێشتەوە و پۆستە ئەلیکترۆنییەکەی دەکردەوە. کە نامەی تازەی عەزیزی نەدەبینی، نامە کۆنەکانی دەخوێندەوە. لە هەموو جارێکدا کە نامەیەکی نوێی لەوەوە پێدەگەیشت، بەبێ دەستی خۆی، زەردەیەکی دەهاتێ و لەوەی ڕووی دەدا، تێدا دەما، چونکە شتێ هەر ڕووی دەدا.

زۆری نەبرد ئێلا لە سۆنگەی نامەکانی نێوان خۆی و عەزیزدا وای لێهات لە ژیانی سەلاری و سەنگینی داببڕێت و لە ئافرەتێکەوە کە تابلۆی ژیانی بریتی بێت لە ڕەنگی خۆڵەمێشییەکی مات، بگۆڕێت بۆ ئافرەتێکی خاوەن ڕەنگی نهێنی و سووری درەوشاوە، چونکە حەزی لێی بوو.

عەزیز پیاوێکی هەرزە نەبوو. لەو باوەڕەدابوو کە ئەوانەی دڵیان ناکەن بە ڕێنوێنێکی سەرەکی تا لە ژیانیاندا ڕابەرییان بکات، ئەوانەی ناتوانن خۆیان بۆ عەشق والا بکەن و وەک چۆن گوڵەبەڕۆژە ڕوو لە خۆر دەکات، ئاوها ڕووی تێبکەن، ئەوانە زیندووی ڕاستەقینە نین. (ئێلا بە خۆی گوت، گەر بکرێ ئەمەش بخاتە سەر لیستی ئەو شتانەوە کە زیندوویێتییان پێویستە). عەزیز دەربارەی زەپۆش یان دوا فیلمێک کە دیویێتی نەیدەنووسی، بەڵکو دەربارەی شتگەلێ دەینووسی کە وەک ژیان و مەرگ قووڵن، لەوەش گرینگتر دەربارەی

عەشق دەینووسی. ئێلا ڕانەهاتبوو ڕازی خۆی ئاشکرا بکات، بە تایبەتی بۆ کەسێکی نەناس، بەڵام ڕەنگە هەر ئەم نەناسە بێت کە وای لە ئافرەتێکی وەک ئەم کردبێت، ئەوەی لە دڵیدایە بیدرکێنێت.

ئێلا بە خۆی گوت، هەرچەندە نامەکانی نێوانیان بۆنی جۆرە ئەڤینییەکی لێدێت، بەڵام ئەڤینێکی پاکە و ڕەنگە بۆ هەردووکیان باش بێت، ڕەنگە یەکێکیان حەزی ئەوی تر ببزوێنێت و خۆیان لە پەناوپاسارێکی بێکۆتایی جیهانێکی گریمانەیی دابنێن. هەر لە سایەی ئەم نامەگۆڕینەوەیەدا ئومێدی بەوە بوو بەشێک لەو نائومێدییەی کە لەمیانەی شووکردنەکەیەوە لەدەستی دابوو، بەدەستی بێنێتەوە، چونکە عەزیز یەکێک بوو لەو پیاوانەی کە بەبێ ئەوەی ڕێزی خۆی لەدەست بدات، بۆی هەبوو ئافرەتێک بخاتە داوی خۆشەویستیی خۆیەوە، ڕەنگە هەست بە بەختەوەریش بکات، چونکە بووەتە جێگەی سەرنج و بایەخی ئافرەتێکی تەمەن مامناوەندی ئەمریکایی. ئیدی لە دەرەوەی سروشتی تایبەتی خۆی، ئینتەرنێت بوو بە مایەی کرانەوە و نیانی، بەبێ ئەوەی هەست بە گوناهباری بکات (حەزی لێ نەبوو، چونکە تێری لەوە خواردبوو)، سەرکێشی بەبێ مل پێوەنان(خۆیشی ئەمەی دەویست، چونکە پێشتر تاقیی نەکردبووەوە). دیارە ئەمەش وەک خواردنی خۆراکێکی خۆشی حەرامکراوە و بێ ئەوەی گوێ بداتە زیادە کالۆری – ئەنجامێکی خراپی نییە.

ڕەنگە کارێکی نەشیاو بێت کە ژنێکی مێرددار و منداڵدار نامەی ئەلیکترۆنیی ناوەخن سۆزداری بۆ کەسێکی نەدی و نەناس بنووسێت، بەڵام بە هۆی سروشتی پەیوەندییە ئەفلاتوونییەکەیانەوە، ئێلا گەیشتە ئەوەی بڵێت: ئەمە کفرێکی شیرینە.

# ئێلا

## نۆرتامبتۆن، ٥ی حوزێران ٢٠٠٨

باوانم عەزیز

لە یەکێ لە نامەکانی پێشووتدا باسی ئەو بیرۆکەیەت کردبوو کە ئەگەر هەڵبژاردنەکانمان ئاوەزمەندانە بێت، ئەوا دەتوانین دەست بەسەر ڕەوتی ژیانی خۆماندا بگرین، پێم وایە بیرۆکەیەکی تووڕەهاتە و لە ماسییەک دەچێت هەوڵبدات دەست بەسەر ئەو ئۆقیانووسەدا بگرێت کە مەلەی تێدا دەکات. زۆر بیرم لەو ڕستەیە کردەوە کە دەڵێت: "مرۆڤ خودی خۆی دەناسێت، ئەم بیرۆکەیە نەک هەر نەبوو بە مایەی ڕوودانی پێشبینییەکی هەڵە، بەڵکو لەو شوێنانەی کە ژیان تێیدا لەگەڵ پێشبینییەکانمان هەماهەنگ نییە، مایەی نائومێدییە".

ئەمێستا کاتی ئەوە هاتووە ددانی پێدا بنێم: من خواستی دەست بەسەرداگرتن و دەسەڵاتخوازیم هەیە. بە لای کەمەوە ئەوانەی بە ڕاستی دەمناسن هەر ئەمەت پێدەڵێن. تا ئەم ماوەیە من دایکێکی توند بووم و بنەمای زۆرم هەبوو (بڕوام پێ بکە، وەک ڕێسا سۆفیگەرییەکانی تۆ، ڕێساگەلێکی جوان نەبوون)، هیچ ڕێگەیەکم بۆ سازشکردن بەرانبەر بە خۆم نەهێشتبووەوە. جارێکیان کچە گەورەکەم بەوە تۆمەتباری کردم کە من پەیڕەوی ڕێبازی پیاوانی چەتە دەکەم. پێی گوتم کە من دەست لە وردەکاریی ژیانیان وەردەدەم و لە سەنگەری خۆمەوە هەوڵدەدەم لەسەر هەر بیرۆکەیەک یان ئارەزوویەکی هەڵەی ئەوان هەڵبدەم کە ڕەنگە دەری ببڕن.

گۆرانیی ("SERA,QUE SERA" چی دەبێت با ببێت)م بیرکەوتەوە، دەی بە هەرحاڵ پێم وا نییە کە ئەمە یەکێک بووبێت لە گۆرانییە دڵخوازەکانم، چونکە

دەستەواژەی (چی دەبێت با ببێت) قەت لەگەڵ مندا نەدەگونجا. ئاخر من ناتوانم لەگەڵ شەپۆلدا بڕۆم. دەزانم تۆ پیاوێکی ئاینپەروەریت، بەڵام من ئایینپەروەر نیم. هەرچەندە خێزانەکەی ئێمە ناوبەناو بە بۆنەی ڕۆژی شەممەوە ئاهەنگ دەگێڕین، لێ من ئەو دواجارەم لە یاد نییە کە نوێژم تێدا کردبێت. (ئاه ئێستا بیرم کەوتەوە، دوو ڕۆژ لەمەوبەر لە نانددینەکەی خۆم نزام کرد، بەڵام ئەمە بە نوێژ ناشێت، چونکە وەک گلەییەک بوو بەرەو زاتی باڵا).

ئەو دەمەی لە زانکۆ بووم، ماوەیەک خووم دابووە ڕۆحگەرایی ڕۆژهەڵاتی، هەندێ شتم دەربارەی بوودایی و تاوی خوێندەوە، تەنانەت لەگەڵ دەستەخوشکێکی ڕەوتار سەیرمدا بۆ بەسەربردنی مانگێک لە ئەشرامی هند هەندێ پلانم دانا، لێ ئەو قۆناغەی ژیانم زۆری نەخایاند. لەگەڵ ئەوەی سرووتە سۆفییەکان جوان و سەرنجڕاکێش بوون، بەڵام وام بە خەیاڵدا دەهات کە ئەوانە سرووتی نەرمی و ملکەچین و لەگەڵ ژیانی هاوچەرخدا ناگونجێن . ئیدی لەوساوە بۆچوونی خۆم نەگۆڕیوە.

ئومێدەوارم بەم خۆدوورگرتنەم لەئاین خراپەم لەگەڵ نەکردبێت. تکایە ئەمە بە ددانپێدانانێکی درەنگوەختەی کەسێک دابنێ کە بەتەنگتەوەیە.

لەگەڵ گەرموگوڕیم

ئێلا

* * *

ئێلای ئازیز، ژنە جەنگاوەرەکەی شەڕی پارتیزانی.

ئەو کاتەی نامەکەت پێم گەیشت خۆم ئامادە کردبوو ئامستردام جێ بهێڵم و بۆ مەلاوی بڕۆم. ڕاسپێردرابووم لە گوندێکدا وێنەی خەڵکانێک بگرم کە ئایدزیان تێدا بڵاوبووەتەوە و ژمارەیەکی زۆر منداڵی بێ دایبابی تێدایە.

ئەمێستا گەر هەموو شتێک وەک پێویستە بەڕێوە بچێت، ئەوە دوای چوار ڕۆژی تر دەگەڕێمەوە. ئایا دەتوانم ئەو ئومێدەم هەبێت؟ بەڵێ. ئەی ئاخۆ ئەوە لەدەستی خۆمدایە؟ نەخێر! ئەوەی دەتوانم بیکەم، کۆمپیوتەرەکەم لەگەڵ خۆم هەڵبگرم و هەوڵی پەیوەندییەکی باشی ئینتەرنێت بدەم، هیوادارم کە ڕۆژێکی

تریش بژیم. ئیدی ئەوەی دەمێنێتەوە لەدەستی مندا نییە. سۆفییەکان بەمە دەڵێن توخمی پێنجەم – بۆشایی. ئەو توخمە خوداییەی کە ناتوانرێ لێک بدرێتەوە و ناتوانرێ دەستی بەسەردا بگیرێت و ئێمەی مرۆڤ ناتوانین لێی تێبگەین، لەگەڵ ئەوەشدا گەرەکە دەرکی پێبکەین. گەر مەبەستت ئەوەیە کە تۆ بەتەواوی هیچ شتێ ناکەیت و بە قووڵی بایەخ بە ژیان نادەیت، ئەوە من بڕوام بە (خۆ دواخستن و گوێنەدان) نییە، بەڵام بڕوام بە ڕێزگرتنی ڕەگەزی پێنجەم هەیە.

پێم وایە کە هەر یەکێ لە ئێمە پەیمانێکی لەگەڵ خودادا بەستووە. من دەزانم کە ئەوەم کردووە. کاتێ بووم بە سۆفی، بەڵێنم بە خودا دا کە ئەوەی لەسەر من پێویستە بەگوێرەی توانای خۆم بیکەم، ئەوەی دەمێنێتەوە بۆ ئەوی جێ بهێڵم تەنها بۆ ئەو و بەس، چونکە بەو ڕاستییە قایل بووم کە شتگەلێ هەن سنووری من و توانای من تێدەپەڕێنن. ئیدی جگە لە هەندێ بەش وەک چەند پارچەیەکی سەرئاوکەتووی نێو فیلمێکی سینەما هیچی تر نابینم، بەڵام پلانە گەورەکە لە سەرووی تێگەیشتنی منەوەیە.

ئەمێستا تۆ پێت وایە کە من پیاوێکی ئایینپەروەرم. نەخێر من ئەوە نیم، بەڵکو پیاوێکی ڕۆحگەرام و ئەمەش شتێکی دیکەیە. ئایینپەروەری و ڕۆحگەرایی هەمان شت نین. پێم وایە لەپێشدا ئەو بۆشاییەی نێوان ئەم دوو شتە وەک ئەوەی ئەمڕۆ قووڵ نەبوو. کە دەڕوانمە دنیا دەبینم کێشەکە قووڵتر بووە. لە لایەکەوە جگە لە بڕوابوونمان بە خودا، بڕوامان بە ئازادی و توانای تاکەکەس، یان حکومەت، یان کۆمەڵ هەیە. لە زۆر ڕووەوە مرۆڤ خۆپەرستیی زیادی کردووە و جیهان تا دێت ماددیتر دەبێت. لە لایەکی دیکەوە مرۆڤایەتی بە گشتی دەبێتە ڕۆحگەرا. دوای ئەوەی ماوەیەکی زۆر پشتمان بە ئاوەز بەست، وا دیارە ئێستا گەیشتووینەتە نوختەیەک کە دەبێت ددان بەوەدا بنێین ئاوەز سنووری هەیە.

ئەمڕۆ هەر وەک چاخەکانی ناوەڕاست ڕابوونێکی ڕۆحگەرایی بەرپا بووە. خەڵکێکی زۆری ڕۆژاوا سەرباری سەرقاڵییان بە کارکردنەوە، هەوڵدەدەن لە ڕوحگەرایی نزیک ببنەوە، بەڵام لەگەڵ نیازی باشیان زۆر جار شێوازەکانیان بایی ئەوە نییە. ڕوحگەرایی ترشوخوێیەکی تر نییە بۆ هەمان

خواردنە کۆنەکە. گەر گۆڕانێکی سەرەکیی تێدا نەکەین، ناتوانین شتێک بخەینە سەر ژیانمان.

من دەزانم تۆ حەز لە چێشتلێنان دەکەیت. ئایا دەزانیت شەمسی تەورێزی وتوویەتی کە دنیا مەنجەڵێکی گەورەیە و شتی گەورەی تێدا دەکوڵێنرێ؟ بەڵام تا ئێستا نازانین ئەو شتە چییە. هەموو ئەوەی دەیکەین، یان بەرمان دەکەوێت، یان بیری لێدەکەینەوە، یەکێکە لە پێکهاتەکانی ئەو تێکەڵەیە. دەبێ لە خۆمان بپرسین چی دەکەینە ناو مەنجەڵەکەوە. ئایا بێزاری یان دوژمنکاری یان تووڕەیی یان توندوتیژیی تێدەکەین؟ یان عەشق و تەبایی تێدەکەین؟

ئێلای ئازیز، ئەی تۆ چیی تێدەکەیت؟ ئەو پێکهاتانە چین کە پێت وایە دەبێت بیکەیتە ناو شۆربایەکی مرۆڤێنی هاوبەشەوە؟ کاتێ بیر لە تۆ دەکەمەوە، ئەوا ئەو پێکهاتەیەی کە تێیدەکەم، بریتییە لە زەردەخەنەیەکی تەواو.

لەگەڵ هەموو خۆشەویستیم

عەزیز

## بەشی سێیەم

# با

# ئەو شتانەی کە دەبزوێن، گەشە دەکەن، مەیدانخوازی دەکەن

# دەمارگیرەکە

## قۆنیا، ١٩ی تشرینی یەکەم ١٢٤٤

بەپەنای پەنجەرە کراوەکەمەوە سەگەل دەوەڕین، لەسەر جێگەکەم ڕاستبوومەوە و گومانی ئەوەم کرد کە دزێک هاتووەتە سەر ماڵەکەم، یان سەرخۆشێکی چەپەڵ بە بەردەم ماڵەکەمدا تێدەپەڕێت. دوای ئەوەی بێڕەوشتی و گوناهکاری لە هەموو شوێنێک بڵاوبووەوە، ئیدی خەڵکی ئابڕوومەند لەزەتیان لە خەوێکی هێمن نەدەکرد. دۆخەکە لەمەوبەر وا نەبوو، چەند ساڵێ بوو ئەم شارە ئارام بوو. پێم وایە گەندەڵیی ڕەوشت جیاوازییەکی لەگەڵ ئەو پەتا ترسناکە نییە کە لەناکاو دێت و بە خێرایی بڵاودەبێتەوە و وەک یەک تووشی دەوڵەمەند و هەژار، گەورە و بچووک دەبێت. ئەمڕۆ ئەمە دۆخی شارەکەمانە. گەر لەبەر ئەوە نەبوایە لە سوختەخانە کار دەکەم، ئەوە ماڵم جێ نەدەهێشت .

من سوپاسی خودا دەکەم کە خەڵکانێک هەن بەرژەوەندیی کۆمەڵ دەخەنە پێش بەرژەوەندیی خۆیانەوە و بۆ سەپاندنی یاسا شەو دەدەنە دەم ڕۆژەوە. لەنێو ئەوانەش پێپرسی لاو و برازام، کە خەڵکی خۆشیان دەوێ و من و ژنەکەمیش شانازیی پێوە دەکەین. ئەوەی خەمی پێدەخۆم ئەوەیە کە پێپرس و هاوڕێ حەسحەسەکانی لەم کاتە درەنگانەی شەودا بۆ پاراستنی ئێمە تا پڕوپووچەکان و تاوانبارەکان و سەرخۆشەکان خراپەکاری بڵاونەکەنەوە، بە دەوری شارەکەدا دەسووڕێنەوە.

کە براکەم مرد، من خاوەنداریتیی پێپرسم لەئەستۆ گرت. لاوێکی دەمارگیر بوو، پێش شەش مانگێک وەک پاسەوانی شەوانە (حەسحەس) دەستبەکار بوو. زۆربلێکان دەنگۆی ئەوە بڵاودەکەنەوە کە گوایا بۆیە ئەم کارەی دەستکەوتووە، چونکە من مامۆستای سوختەخانەم. لێ من وەڵامیان

دەدەمەوە کە ئەوەی ئەوان دەیڵێن قسەی بێسەروبەرە، چونکە پێپرس خۆی گەنجێکی لێهاتوو و بەتوانایە و شایستەی ئەم کارەیە و ڕەنگە ببێتە سەربازێکی لێهاتووش. ئەو زۆر پەرۆش بوو کە بۆ شەڕی خاچپەرستان بۆ قودس بڕوات، بەڵام من و ژنەکەم بڕیارمان دا کە کاتی ئەوەی هاتووە دابمەزرێت و خێزان پێکەوە بنێت.

"پێم گوت: کوڕم، ئێمە لێرە پێویستمان بە تۆیە، چونکە هەندێ شت هەن پێویستە بەریان لێ بگرین".

بەڕاستی لێرە هەندێ شت هەن گەرەکە بەریان لێ بگیرێ، بە تایبەتی ئەم بەیانییە بە هاوسەرەکەمم گوت ئێمە بە کاتێکی پڕ تەنگوچەڵەمەدا تێدەپەڕین. ئاخر بە ڕێکەوت نییە ڕۆژانە ڕووداوێکی کارەساتبار دەژنەوین. خۆ ئەگەر مەغۆل سەرکەوتن، یان ئەگەر خاچپەرستان توانییان پەیامەکەیان بڵاوبکەنەوە، هەروەها ئەگەر بینیمان دوژمنانی ئیسلام کاولکاری و داگیرکاری دەکەن و شار لەدوای شار و گوند لەدوای گوند تاڵان دەکەن، ئەمەش تەنها لەبەر ئەوەی کە خەڵکی هەر بەناو بوون بە موسڵمان. کاتێ خەڵکی وابەستەی ئایین نابن و پابەندی فەرمانی خودا نابن، ئەوا ڕێگەی ڕاست ون دەکەن. هەر لەبەر ئەو گوناه و تاوانەی کردوومانە، خودا وەک سزایەک مەغۆلی بۆ ناردووین. خۆ ئەگەر مەغۆلیش نەهاتبان، ئەوا زەمینلەرزەیەک ڕووی دەدا، یان برسێتی دادەکەوت، یان لافاو هەڵدەستا. ئاخۆ بەوای ئەو گوناهبارانەی کە لەم شارەدا بەدڕەوشتی بڵاودەکەنەوە، دەبێ تووشی چەند کارەسات ببین، تا لە پەیامەکە تێبگەن و تۆبە بکەن؟ دەترسم ئەمجارە لە ئاسمانەوە بەردمان بەسەردا ببارێت و ئەو ڕۆژە نزیکە هەموومان لەنێوبچین و وەک نەتەوەی سەدوم و عامووره دەوسمان نەمێنێت.

لێ ئەم سۆفییانە کاریگەرییەکی خراپیان هەیە. ئاخر چۆن زات دەکەن ناوی خۆیان بنێن موسڵمان، لە کاتێکدا هەندێ شت دەڵێن هیچ پەیوەندییەکی بە ئیسلامەوە نییە، شتگەلێ نابێت بە خەیاڵی موسڵمانێکدا بێت، یان هەر بیری لێ بکاتەوە، چونکە کاتێ دەبیستم ناوی پێغەمبەر (د.خ) دێنن تا بیروبۆچوونە تووڕەهاتەکانیان بڵاوبکەنەوە، خوێنم دێتە کوڵ. ئاخر ئەوان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە محەمەدی پەیامبەر دوای یەکێ لە جەنگەکان وتوویەتی ئێمە لە

خـــۆبەختکردنی بچـــووکەوە بـــۆ خـــۆبەختکردنی گەورە گەڕایـــنەوە – ڕووبەڕووبوونەوەی نەفس– سۆفییەکان پێ لەسەر ئەوە دادەگرن کە گوایا لەو کاتەوە (نەفس) بوو بە تاقە دوژمنێک کە موسڵمان شەڕی دەکات. ئەم قسەیە لە ڕواڵەتدا جوانە، لێ من دەپرسم بۆ بەرەنگاربوونەوەی دوژمنانی ئیسلام ئەوە دەبێتە چ یارمەتیدەرێک؟

سۆفییەکان پێداگری دەکەن و پێیان وایە کە شەریعەت قۆناغێکی ڕێگەکەیە. دەپرسـم کـام قۆنـاغ، باسـی چـی دەکەن؟ وەک ئەوەی ئەمە هـیچ تـرس و پەژارەیەک نەخـاتەوە، دەبینیت پـێ لەسـەر ئەوە دادەگـرن کە نابێت بنەماکـانی قۆنـاغی پێشوونەکان کەسـی ڕۆشنگەر کۆتوبەند بکـات. بانگەشـەی ئەوە دەکەن کە ئەوان گەیـشتوونەتە پلەیەکـی بـاڵا و ئەمەشـیان کـردووەتە بیـانوویەک تـا بنەماکانی شەریعەت پشتگوێ بخەن و بەڕاستی پابەندیان نەبن. وا دیارە ئەوان شــەراب و ســەما و شــیعر و وێــنە لە ئەرکە ئایینییەکــان بە گرینگتــر دەزانــن، دەشڵێن لەبەر ئەوەی لە ئیسلامدا ڕیزبەندی نییە، بۆیە هەر مرۆڤێک بۆی هەیە مـنەی خـودا بکـات. لە ڕواڵەتـدا ئەم وتەیە باشـە و زیـان و ئـازاری نییە، لـێ لە شتەکە وردبیتەوە، لە ناواخنی قسەکەدا لایەنێکی شـەڕانگێزیت بۆ دەردەکەوێت، بەواتا ئیدی پێویست ناکات گوێ لە دەستەی پیاوانی ئایینی بگیرێت.

سۆفییەکان پێیـان وایە کە قورئـانی پیـرۆز لێوانلێوە لە ئامـاژەی ئـاڵۆز و هێمـــاگەلێ کە لە چەنـــدین چینـــی جۆراوجـــۆر پێکهـــاتووە، بـــۆیە گەرەکە هەریەکەیـان بە شـێوازێکی ســۆفییانەی بـاتینی لێـک بـدرێتەوە، بـۆیە لەوە دەکۆڵنەوە کە چـۆن هەر وشـەیەک بـۆ ژمـارە دەگـۆڕن و لەواتـای شـاراوەی ژمارەکــان دەکــۆڵنەوە و لە ئامــاژە و ســەرچاوە نادیارەکــانی نــاو دەقەکە دەگەڕێن. ئیدی هەموو توانایان بۆ ئەوە بەکاردێنن تـا خۆیـان لە خوێندنەوەی ئاسان و ڕوونی پەیامی خودا بدزنەوە.

تەنانەت هەندێ لە سۆفییەکان بانگەلای ئەوە دەکەن کە مرۆڤەکان خۆیان هەمان قورئانی قسەکەرن. ئێ ئەگەر ئەم قسەیە کفرێکی ڕووت نەبێت، نازانم دەبێ کفر چی بێت؟ هەندێ دەروێشی گەڕیدە هەن کە کۆمەڵێ سەرلێشێواوی تـرن و بـریتین لە کەسـانێکی نادروسـت و شـتەکانیان لـێ تێکەڵ بـووە، وەک قەلەندەری و حەیدەری و چەندین نـاوی تـر کە پێـی دەناسرێنەوە. من دەڵێم

ئەوانە خراپترین خەڵقەندەی خودان. ئاخر پیاوێک نەتوانێت لە شوێنێکدا جێگیر بێت، ئیدی کام شتی بەسوودی لێ دەوەشێتەوە. گەر بنیادەم هەستی بە پابەندبوون نەکرد، دەبێتە سەرەڕۆ و ڕوو لە هەموو شوێنێ دەکات و وەک گەڵای وشکی درەخت (با) دەیبات. ئەو قوربانییەکی نموونەیی شەیتانە.

دۆخی فەیلەسووفەکانیش لە سۆفییەکان باشتر نییە، ئاخر وەک ئەوەی بە ئاوەزی سنوورداریانەوە بتوانن لە ئاڵۆزیی گەردوون تێبگەن، کاوێژ دەکەن و بیردەکەنەوە. چیرۆکێک هەیە ئاماژە بۆ (سازش)ی نێوان فەیلەسووفەکان و سۆفییەکان دەکات.

ڕۆژێکیان فەیلەسووفێک تووشی دەروێشێک دەبێت و زۆری نەبرد بوون بە هاوڕێ. چەندین ڕۆژ هەر قسەیان کرد و هەریەکەیان قسەی ئەوی دیکەی تەواودەکرد. لە کۆتاییدا کە لە یەکتر جیابوونەوە، فەیلەسووفەکە دەربارەی ئەو قسانەی لە نێوانیاندا ڕووی دابوو گوتی: (هەموو ئەوەی من دەیزانم، ئەو دەیبینێت).

لەکۆتاییدا دەروێشەکە وتی: (هەموو ئەوەی من دەیبینم، ئەو دەیزانێت).

بەم جۆرە سۆفی لەو باوەڕەدایە کە دەبینێت، فەیلەسووفیش پێی وایە کە دەزانێت. من پێم وایە ئەوان نە شتێ دەبینن و نە شتێ دەزانن. ئاخر نازانن کە ئێمەی ئادەمیزاد بەو پێیەی بوونەوەری لەنێوچووین و بەو سادەیی و توانا سنووردارەمانەوە لە توانای زانینی خۆمان زیاتر نازانین؟ چونکە بنیادەم دەربارەی خودا زۆریش بزانێت، ئەوە هێشتا شتێکی کەمی دەست دەکەوێت. ئەمە هەموو شتەکەیە. ئەوە ئەرکی ئێمە نییە ڕێنماییەکانی خودا لێک بدەینەوە، بەڵکو تەنها ملکەچی و کارکردنە بە ڕێنماییەکانی خودا.

ئەو دەمەی پێپرس بۆ ماڵ دەگەڕێتەوە، باسی ئەم شتانە دەکەین. ئەوە بووەتە خوویەک لە خووەکانمان و سرووتە بچووکەکانمان. هەموو شەوێک دوای ئەوەی نۆرە پاسەوانییەکەی تەواو دەکات، ئەو شۆربا و نانە دەخوات کە هاوسەرەکەم بۆی ئامادە دەکات، ئینجا باسی ئەو ڕووداوانە دەکەین کە لەم شارەدا ڕوودەدەن. زۆر خۆشحاڵم کە دەیبینم ئارەزووی خواردنی باشە، ئاخر دەبێت بەهێز بێت، چونکە وەک لاوێکی خاوەن بڕوا، لەم شارە پڕ ئاشووبەدا کاری زۆری لەپێشە.

# شەمس

## قۆنیا،٣٠ی تشرینی یەکەم ١٢٤٤

بەر لەو شەوەی چاوم بە ڕۆمی بکەوێت، لەسەر سەکۆکەی خانی بازرگانانی شەکر دانیشتبووم. دڵم بە مەزنی و نایابیی گەردوون دایسابوو کە خودا لەسەر شێوەی خۆی دروستی کردووە، بۆیە بەرەو هەر کوێیەک وەرسووڕێین و تەماشا بکەین، دەتوانین لێی بگەڕێین و بیدۆزینەوە، بەڵام بنیادەم بە کەمی ئەوە دەکەن.

ئەو کەسانەم هاتنەوە یاد کە تووشیان بووبووم: سواڵکەرەکە و لەشفرۆشەکە و سەرخۆشەکە. خەڵکێکی خواسایی بەدەست نەخۆشییەکی هاوبەشەوە موبتەلان، ئەویش جیابوونەوەیە لە خودای تاک و تەنیا. ئەو زانایانەی کە لە شوێنی بەرز دانیشتوون، ئەم جۆرە کەسانە نابینن. لە خۆم پرسی ئاخۆ دەبێ ڕۆمی لەم زانایانە جیابێت؟ بە خۆمم گوت گەر جیانەبێت، ئەوە دەبێ ببمە میانگیری نێوان ئەو و بنکەی کۆمەڵ.

لە کۆتاییدا شارەکە کەوتە خەوێکی قووڵەوە. لەو کاتانەی شەودا تەنانەت گیاندارە شەوییەکانیش نایانهەوێ ئەو ئارامییە بشڵەقێنن کە باڵی بەسەر دنیادا کێشاوە. گوێهەڵخستن بۆ شارێک کە لە دۆخی نوستندایە، وام لێدەکات هاوکات خەمین و شادمان بم، دەپرسم دەبێ ئەو چیرۆکانە چی بن کە لە پشت دەرگا داخراوەکانەوە دەگێڕدرێنەوە. ئەی ئەو چیرۆکانە چین کە ڕەنگە لە گەڵیاندا بژیم لەکاتێکدا گەر سەرپشک بکرێم ڕێگەیەکی تر بگرمە بەر. لێ من سەرپشک نەبووم، بەڵکو ئەوە ڕێگە بوو کە منی هەڵبژارد.

حەکایەتێکم هاتەوە یاد کە دەڵێت، دەروێشێکی گەڕیدە گەیشتە شارێک، خەڵکەکەی متمانەیان بە کەسانی نەناس و لایدە نەبوو، تێیان خوڕی: "بڕۆ! لێرە کەس تۆ ناناسێت".

دەروێشەکە بە هێمنی وەڵامی دایەوە، "بەڵێ، بەڵام من خۆم دەناسم، بڕوام پێ بکەن"، لەگوێن بوو گەر مەسەلەکە شتێکی تر بوایە، زۆر لەوە خراپتر دەبوو.

مادام خۆم دەناسم، شتەکان بە باشی دەڕۆن. هەر کەسێک خۆی بناسێت، خودای تاک و تەنیاش دەناسێت.

مانگەکە بە تریفەی ڕووناک و فێنکی لێوانلێوی کردم. پرووشەیەکی نەرم بەسەر شارەکەدا باری، نەرم هەر وەک سەرپۆشێکی ئاوریشم. بۆ ئەم ساتە پیرۆزە سوپاسی پەروەردگارم کرد و خۆم ڕادەستی کرد. بیرم کەوتەوە کە ژیان فشەڵ و کورتخایەنە. هەروەها ڕێسایەکی دیکەم بیرکەوتەوە: **(ژیان لە قەرزێکی ئێرەتی پتر نییە، ئەم جیهانە لە لاساییکردنەوەیەکی لاوازی ڕاستییەکان زیاتر نییە. تەنها منداڵان دەتوانن گەمە و ڕاستەقینە تێکەڵ بکەن. لەگەڵ ئەوەشدا مرۆڤ یان دڵبەندی گەمەکە دەبن، یان بە لاقرتێوە دەیشکێنن و تووڕی دەدەن. لەم ژیانەدا خۆت لە هەموو جۆرەکانی زێدەڕۆیی دوور بگرە، چونکە هاوسەنگیی ناوەوەت تێکدەچێت).**

سۆفی لە ڕەوتاریدا زێدەڕۆیی ناکات، بەڵکو هەر لێبوردەیە و بەردەوام میانڕەوە.

سبەی بەیانی ڕوودەکەمە مزگەوتە گەورەکە و گوێ لە ڕۆمی دەگرم. وەک باسی دەکەن ڕەنگە وتاربێژێکی مەزن بێت، لێ گرینگی و جەماوەرداریی هەر وتاربێژێک لەژمارەی ئەو کەسانەوە دەردەکەوێت کە ڕووی تێدەکەن. دەشێ وشەکانی ڕۆمی مینا سەوزەڵانی دەشتودەر بێت، پڕ بێت لە درەخت و گیاوگوڵ و داری سەروو و کورتەدرەخت، بەڵام میوان هەمیشە بۆی هەیە بە ئارەزووی خۆی شتێک لێبکاتەوە. کەچی خەڵکێکی زۆر بۆ کردنەوەی گوڵێکی جوان یەکسەر ڕادەکەن، لێ کەمێکی کەم بە لای ئەو درەختانەدا دەچن کە دڕکاوین و ڕەنگە دەرمانی باشیشیان لێ دروست بکرێ.

ئایا هەمان شت بۆ باخچەی عەشقیش ناشێت؟ ئاخر ئەگەر بنیادەم تەنیا شتەجوانەکانی هەڵبژارد و وازی لە شتە دزێو و قورسەکان هێنا، ئیدی چۆن دەکرێ عەشق شایستەی ناوەکەی خۆی بێت؟ ئاسانە چێژ لە شتە باشەکان وەربگیرێ و قێز لە شتە خراپەکان بکرێتەوە. هەر کەسێک دەکارێ ئەوە

بکات، لێ مەیدانخوازیی ڕاستەقینە ئەوەیە کە مرۆڤ شتە باشەکان و شتە خراپەکانی پێکەوە خۆشبوێ، نەک لەبەر ئەوەی شتەکانی بە شیرینی و تاڵییەوە قەبووڵ بێت، بەڵکو لەبەر ئەوەی دەبێ ئەم خەسیەتانە تێپەڕێنێت و تێکڕای خۆشەویستی قەبووڵ بکات.

تەنها ڕۆژێک ماوە تا بگەم بە هاوەڵەکەم. وا خەویشم لێ تۆرا.

هۆ ڕۆمی! هۆ پاشای دنیای پەیڤ و واتا! ئاخۆ کاتێ دەمبینیت، دەمناسیت؟

دەی با بەیەک بگەین!

## ڕۆمی

**قۆنیا، ٣١ی تشرینی یەکەم ١٢٤٤**

بەڕاستی ئەمڕۆ ڕۆژێکی پیرۆزە، چونکە چاوم بە شەمسی تەورێزی کەوت. ئەمڕۆ دواین ڕۆژەکانی مانگی تشرینی یەکەمە و هەوا ساردتر بووە و بایەکی توند هەڵیکردووە و کۆتایی پایزی ڕاگەیاند. عەسری ئەمڕۆ وەک هەمیشە مزگەوتەکە لە نوێژکەران جمەی دێت. کاتێ بۆ ئەو خەڵکە زۆرە وەعز دادەدەم، بەردەوام خەمی ئەوەمە کە ئەو بڕوادارانەم بیر نەچێت گوێ لە وتارەکانم دەگرن. بۆ بەجێهێنانی ئەوە جگە لە تاکە ڕێگەیەک، هیچ شتێکی دیکەم بەدەستەوە نییە، ئەویش وا بیربکەمەوە کە جەماوەرەکە بریتییە لە یەک تاکە کەس. هەرچەندە هەموو هەفتەیەک سەدان کەس گوێ لە وتارەکانم دەگرن، لێ من یەک کەس دەدوێنم، ئەویش ئەو کەسەیە کە گوێ لە دەنگدانەوەی پەیڤەکانم دەگرێت و بەرەو ناو دڵی شۆڕدەبێتەوە، هەر ئەویش دەمناسێت و کەسێکی تر ناناسێت.

کە لە وتارەکەم بوومەوە و لە مزگەوتەکە دەرچووم، ئەسپەکەیان بۆ ئامادە کردبووم و چەند زەنگوڵەیەکی زیو و زێڕی بچووکیان بە چەند تاڵەموویەکی یاڵی ئەسپەکەوە بەستبوو. لەگەڵ هەر هەنگاوێکی ئەسپەکەدا، چێژم لە زرینگەی زەنگوڵەکان وەردەگرت، لێ لەبەر ئەو ژمارە زۆرەی خەڵکەکە کە لە پێشمەوە دەڕۆیشتن، هەستەم بوو خێراتر بڕۆم. لەسەرخۆ بە بەردەم دوکان و خانووی پەرشوبڵاوی بەهەڵەشک سەرگیراودا ڕۆیشتین. بانگەڵای فرۆشیاران و گریانی منداڵان و کرووزانەوەی دەرۆزەکەران تێکەڵ بووبوون و داوای نەختێ پارەیان دەکرد. زۆربەی خەڵکەکە داوایان دەکرد کە پیرۆزیان بکەم و نزایان بۆ بکەم. بڕێکی تریان هەر بەوە دادەکەوتن تەنها لە

نزیکمەوە بڕۆن، بەڵام هەندێکی دیکەیان داواکاری گەورەتریان هەبوو، داوایان لێ دەکردم کە لە نەخۆشییەکی قورس چاکیان بکەمەوە، یان ڕوحی پیسیان لێ دووربخەمەوە. بۆ ئەمانە نیگەران بووم، ئاخر ئەوانە نەیاندەزانی کە نە پێغەمبەر و نە حەکیمێکی دیکە لە توانایاندا نەبووە لەم بارەیەوە پەرجوویەک بەکار بهێنن؟

کاتێ لای لێژاییەکەی شەقامەکەوە پێچمانکردەوە و لە خانی بازرگانانی شەکر نزیک بووینەوە، پیاوچاکێکی خواپەرستی گەڕیدەم کەوتە بەرچاو، لەناو خەڵکەکەوە ڕێگەی خۆی دەکردەوە و ڕاستەوخۆ بەرەو لای من دەهات و بە دوو چاوی تیژەوە تێی دەڕوانیم. جووڵەکانی لێزانانە و چڕ بوون، خەرمانەیەکی توانای خودی لێ دەدرەوشایەوە. تەراشی کردبوو، نە ڕیشی هەبوو نە برۆ. هەرچەندە وەک هەر پیاوێکی ئاسایی دەموچاوی بەدەرەوە بوو، بەڵام سیمایەکی ئاڵۆزی هەبوو.

بەڵام ئەوە دیمەنەکەی نەبوو کە بە دڵمەوە نووسا و سەرنجی ڕاکێشام، چونکە ساڵانێکی زۆر بوو لە هەموو جۆرە دەروێشێکم دی بوو بە قۆنیادا تێپەڕیبوون و بەدوای خودادا دەگەڕان، زۆربەی ئەو دەروێشانە بە ڕەوتاری چەمووشیان و بە خاڵەکوتراوە زەقەکانیان و بە گوارەی گوێ و حەڵقەکانی لووتیان دەناسرانەوە. ئەوانە یان پرچیان بەردەدایەوە، یان بەتەواوی دەیانتاشی، بەڵکو هەندێ دەروێشی سەر بە ڕێبازی قەلەندەری، زمان و گۆی مەمکیان دەسمی و حەڵقەیان تێدەخست، بۆیە کە چاوم بەم دەروێشە کەوت، توێکڵی دەرەوەی نەبوو کە سەرنجی ڕاکێشام، بەڵکو دەتوانم بێژم نیگای بوو بە دڵمەوە نووسا.

چاوە ڕەشەکانی کە تێیان دەڕوانیم لە خەنجەر تیژتر بوون. لە ناوەڕاستی شەقامەکە وەستا و هەردوو باڵی بەرزکردەوە و تا ئەوپەڕی والای کردنەوە. وەک ئەوەی بەم کارەی بیەوێ نەک هەر کەژاوەکە بوەستێنێت، بەڵکو ڕەوتی ڕۆژگاریش ڕابگرێت. هەستم کرد شتێکی نەزانراو وەک تەزوویەک بە هەموو جەستەمدا تێپەڕی. ئەسپەکەم شڵەژا و بە دەنگێکی بەرز حیلاندی و بەملا و بەولادا دەستی بە سەرڕاوەشاندن کرد. هەوڵم دا

ترسەکەی بڕەوێنمەوە، بەڵام بەلەسە بوو، بۆیە منیش هەستم بە شڵەژانێک کرد.

دەروێشەکە بە بەرچاومەوە لە ئەسپە ڕەویوەکەم نزیکبووەوە. شتێکی چپاندە بن گوێچکەیدا. ئەسپەکەم کە هەناسەبڕکێی بوو، بە دەستی ئاماژەیەکی بۆ کرد و دەسبەجێ هێوربووەوە. چپەچپێک لەنێو حەشیمەتەکە پەیدا بوو، گوێم لێ بوو یەکێک بە ترمەترم دەڵێت: "ئەمە جادووە".

دەروێشەکە بێ ئەوەی گوێ بداتە دەوروبەری خۆی، نیگایەکی سەرکێشانەی کردم و گوتی: "هۆ زانای مەزنی ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوا، زۆرم لە بارەی تۆوە بیستووە. من ئەمڕۆ بۆ ئێرە هاتووم، گەر ڕێگەم بدەیت، پرسیارێت لێدەکەم".

بە چپە گوتم: "فەرموو".

"باشە، یەکەم جار گەرەکە لە ئەسپەکەت دابەزیت، تا بکەوینە یەک ئاستەوە".

بەم قسەیە سەرم سوڕما، بۆ ساتێک نەمتوانی هیچ بڵێم، خەڵکەکەی دەوروبەرم سەریان سوڕما. ئاخر تا ئێستا کەسێک زاتی نەکردبوو بەم شێوازە بمدوێنێت.

هەستم کرد دەموچاوم دادەگیرسێت و ئازار دەکەوێتە هەناوم، بەڵام بێزارییەکەی خۆم شاردەوە و لەسەر پشتی ئەسپەکەم دابەزیم. دەروێشەکە پشتی تێکردم و ڕۆیشت و دوورکەوتەوە.

"هۆو لەگەڵ تۆمە، ڕاوەستە". بانگم کرد و خۆم پێی گەیاند، "دەمەوێ گوێم لە پرسیارەکەت بێت".

وەستا و وەرسووڕایەوە، بۆ یەکەم جار زەردەیەکی هاتێ و گوتی: "دەی باشە. تکایە پێم بڵێ بەبۆچوونی تۆ محەمەدی پەیامبەر و ئەبو یەزیدی بوستامیی سۆفی کامیان مەزنترە؟".

وتم: "ئەمە چ پرسیارێکە؟ چۆن دەتوانیت پێغەمبەری مەزنمان درووود و سڵاوی خودای لێ بێت کە دوا پێغەمبەر و نێردراوەکانە، لەگەڵ سۆفییەکی ناوبانگزڕاودا بەراورد بکەیت؟".

خەڵکی خۆتێهەڵقورتێنەری نێو قەرباڵغییەکە لە دەورمان کۆبوونەوە، بەڵام وا دیاربوو دەروێشەکە هەر گوێشیان پێنادات. ئەو هێشتا کە دیقەتی دەدام، بە سووربوونەوە گوتی: "تکایە بیری لێ بکەوە. ئەی پێغەمبەر نەی گوتووە: (ئەی خودایە، لە ناسینی ڕاستەقینەی خۆتدا لە بێدەسەڵاتیم خۆش بە)، لە کاتێکدا بوستامی گوتوویەتی: (خۆشی لە خۆم، منێک بتوانم خودا لەنێو عەباکەم هەڵبگرم؟)، گەر پیاوێک هەبێت هەست بکات کە بەچاو خوداوە ئەوەندە بچووکە، کەچی پیاوێکی تر لافی ئەوە لێبدات کە خودای لە ناوەوەی خۆیدا هەڵگرتووە، ئیدی کامیان مەزنترە؟".

دڵم بە توندی داخورپا. ئیدی پرسیارەکە نامۆ نەبوو. لە ڕاستیدا وەک چۆن پەردەیەک لابدرێت و لە ژێریدا مەتەڵێکی سەرنجڕاکێش چاوەڕێم بکات، ئاوها دەرکەوت. لەسەر لێوەکانی دەروێشەکە زەردەخەنەیەکی مەکراوی مینا شنەیەکی ڕەوتەنی نەخش بوو. ئەمێستا زانیم کە ئەو شێت نییە، بەڵکو وەک هەر پیاوێک پرسیار دەکات، پرسیارێک لەوەوبەر بیرم لێ نەکردبووەوە.

"دەبینم ئەوەی هەوڵدەدەیت بیڵێیت"،وام گوت و نەمویست ئەو لەرزینەی کە لە دەنگی شڵەژاومدا پەیدابووبوو، بژنەوێت، "کە هەردوو وتەکە بەراورد دەکەم، دەبینم وتەکەی بوستامی بەرزتر دیارە، پێتیش دەڵێم بۆچی پێچەوانەکەی ڕاستە".

دەروێشەکە وتی: "هەموو گیانم گوێیەکی سووکن".

"وەک دەبینیت، خۆشەویستی خودا ئۆقیانووسێکی بێکۆتاییە، مرۆڤ هەوڵدەدەن زۆرترین بڕی ئاوی لێ هەڵێنجێنن، لێ لە کۆتاییدا ئەو بڕە ئاوەی کە هەریەکێ لە ئێمە دەستی دەکەوێت، دەوەستێتە سەر قەبارەی ئەو دەفرەی بەکاری دەهێنێت. لە کاتێکدا هەندێ کەس بەرمیلیان پێیە و هەندێکی دی دۆلکەیان پێیە، کەچی هەندێکی تریان جامیلکەیان پێیە".

کە قسەم دەکرد، چاوم بڕی بووە دەروێشەکە کە سیمای لە سووکە تەوسێکەوە دەگۆڕا و دەبوو بە سوپاسکردنێکی ئاشکرا، ئینجا دەبووە زەردەخەنەیەکی ناسکی کەسێک کە بۆچوونەکانی خۆی لە قسەی کەسێکی تردا ببینێتەوە.

"دەفرەکەی بوستامی نەختێ بچووک بوو، دوای ئەوەی چۆرێکی لێ خواردەوە، تینوێتیی شکا و بەو قۆناغەی پێی گەیشتبوو داکەوت، ئەوەش شتێکی مەزن بوو کە لە خودی خۆیدا هەست بە خودا بکات، بەڵام سەرباری ئەوەش نەیتوانی جیاوازی لە نێوان خودا و یەکێتیی خوددا بکات، بەڵام هەرچی پێغەمبەرە، خودا هەڵیبژارد و دەفرێکی زۆر گەورەتری هەبوو تا پڕی بکات، بۆیە خودا لە قورئاندا لێی پرسی: ئەی دڵی تۆمان بۆ بڕوا فراوان نەکرد؟ ئا بەم جۆرە دڵی فراوان کرد و دەفرەکەی یەکجار گەورە بوو و تا دەهات تینووتر دەبوو، بۆیە سەیر نییە کە وتوویەتی: (ئێمە وەک چۆن پێویستە بتناسین، ئاوها نەتماننناسیوە) ، لەگەڵ ئەوەشدا بێگومان ئەو بە جۆرێ دەیناسێت، کەسێکی تر ئاوها نایناسێت".

دەروێشەکە زەردەخەنەیەکی ئاشکرا و دۆستانەی نواند. سەری لەقاند و سوپاسی کردم. ئینجا وەک پێزانینێک ماوەیەک دەستی خستە سەر دڵی. کە دووبارە چاومان ئامبازی یەکتر بوون، سەرنجم دا، جۆرە ناسکییەک لە نیگایدا دەرکەوت.

بەرەو پشتەوەی دەروێش هەڵمڕوانی، دیمەنی سروشتی خۆڵەمێشی ئامالی مرواری ڕەنگم بینی کە لەم وەرزەی ساڵدا شارەکەمانی پێ دەناسرێتەوە. چەند گەڵایەکی وشکی درەختەکان بەدەور پێماندا خزان. دەروێشەکە بە بایەخێکی تازەوە دیقەتی دەدام، سوێند دەخۆم کە لەو زەردەی خۆراوایەدا بۆ ساتێک خەرمانەیەکی عەنبەرین ڕەنگم بە دەوریدا بینی.

بە ڕێزەوە بۆم داچەمایەوە و بۆی داچەمامەوە. نازانم ئاوها چەندێ وەستاین، ئاسمان بە ڕەنگە وەنەوشەییەکەیەوە بەسەر سەرمانەوە شۆڕبووبووەوە. دوای کەمێ ئەو خەڵکەی کە بە دەورماندا هەڵقەیان بەستبوو و ئێمەش قسەمان دەکرد، بە سەرسوڕمانێکی نیمچە ڕەتکردنەوە و تووڕەییەوە بەنێو یەکدا دەهاتن، چونکە قەت هیچ کەسێ منی نەبینیبوو بۆ یەکێ دابچەمێمەوە، بۆیە هەندێ کەس تەنانەت بە مریدە نزیکەکانی خۆمیشەوە کە منیان بینی بۆ سۆفییەکی سادە و گەڕیدە دادەچەمێمەوە، تووشی شۆک بوون.

بێگومان دەروێشەکە هەستی بە تووڕەیی تێکڕای خەڵکەکە کردبوو.

"باشـــتر وایە ئێـستا بـڕۆم و لەگەڵ مریدەکانتـــدا جێـت بهـێڵم"، بەدەم قسەکردنەوە دەنگی نزم کردەوە تا وەک دوا زرینگەی زەنگێک بوو بە چپە.
بە ناقایلییەوە گوتم: "چاوەڕێ بکە، مەڕۆ. تکایە بمێنەوە".
تـوێژاڵێ پەرۆشـیم لە ڕوخـساریدا بەدی کـرد، بە خەمەوە لێوەکـانی هەڵقرچاند، وەک ئەوە بـوو بـیهەوێ شـتێ بڵێت، ئینجـا یـان نەیـدەتوانی، یـان نەیدەویست بیڵێت. لەو ساتە بێدەنگییە کورتەدا، ئەو پرسیارەم ژنەوت کە لێی نەپرسی بووم.
ئەی وتاربێژی مەزن، ئەی دەربارەی خۆت چی دەڵێیت؟ پێم بڵێ قەبارەی دەفرەکەی تۆ چەندە؟
شـتێکم پـێ نەبـوو بیڵـێم، چـونکە وشـەکانم چکیـان کـرد. لە دەروێـشەکە نزیکبـوومەوە بە ڕادەیەک خەتە زێڕنەکـانی نێـو چـاوە ڕەشـەکانیم بینـی. لەپڕ وەک ئەوەی لەمەوبەر لەم چرکەسـاتەی ئێـستادا ژیـابم، هەسـتێکی سـەیر دایگرتم. نەک جارێک، بەڵکو پتر لە دە جار دەستم بە بیرهێنانەوەی پارچەکان کـرد. پیـاوێکی بـاڵابەرز و لاواز ڕووی خـۆی داپۆشـی بـوو، ئەنگوسـتەکانی داگیرسـابوون. ئینجـا زانـیم کە ئەم دەروێشەی لە بەرانـبەرم وەسـتاوە، دەبـێ هەر ئەو پیاوە بێت کە بەردەوام لە خەونەکانمدا دەمبینی.
زانـیم کە مـن هـاوەڵەکەی خـۆم دۆزیـیەوە، بەڵام وەک بە خەیاڵمـدا هـات، لەبری ئەوەی لە خۆشییان بگەشێمەوە، هەستم بە ترسێک کرد.

# ئێلا

## نۆرتامپتۆن، ٨ی حوزێران ٢٠٠٨

بە کۆمەڵە پرسیارێکی بێ وەڵام ئێلا دەورەدرابوو، تەماشای کرد لە نامەکانی نێوان خۆی و عەزیزدا ڕووبەڕووی شتهایەک بووەتەوە، بە تایبەتی ئەو ڕاستییەی کە لەگوینە بە کردەیی ڕوودەدات. لە هەموو ڕوویەکەوە تەواو لەیەکتر جیابوون. لە خۆی دەپرسی ئەو شتە هاوبەشانەی نێوانیان چین تا ببنە هۆی ئەوەی نامە بۆ یەکتر بنووسن.

عەزیز لە تابلۆیەکی شێوەکاری دەچوو کە لە چەند پارچەیەکی گەورە پێکهاتبێت. لە هەر نامەیەکی ئەلیکترۆنیی تازەدا کە دەینارد، پارچەیەکی دیکە لە شوێنی ڕاستەقینەی ئەو تابلۆیە دادەنرا. ئێلا دەیەویست هەموو تابلۆکە ببینێت، بەڵام دەربارەی ئەو پیاوەی کە نامەی لەگەڵدا دەگۆڕییەوە، چەند شتێکی ئاشکرا کرد.

لە تۆمارەکەی عەزیزدا لەسەر ئینتەرنێت، ئێلا زانیی کە ئەو وێنەگرێکی پیشەکارە و هەموو شوێنێکی گۆی زەوی دەگەڕێت و ئەم گەڕانەیشی بەدنیادا ئەوەند لە لا ئاسایی و ئاسانە وەک ئەوەیە لە باخچەی گەڕەکەکەی خۆیدا بای باڵێک بدات. لە ناخدا خێڵەکییەکی سەرسەختە، هەموو دنیا دەگەڕێت، لە سیبریا بێت یان لە شەنگەهای یان لە کەلکەتا، یان لە دارولبەیزا، ئیدی لە هەر شوێنێ بارگە بخات، تێیدا ئاسوودەیە. سەفەر دەکات و کۆڵەپشتێک و شمشاڵێکی لەقامیش چێکراو لەگەڵ خۆی هەڵدەگرێت و لەو شوێنانە دۆست بۆخۆی پەیدا دەکات کە ئێلا ناتوانێت لەسەر نەخشەش شوێنیان دیاری بکات. تووشی ئەو پاسەوانە مێشکپووچانەی سنوور دەبێت کە مامەڵەکردن لەگەڵیاندا هەستەمە، بە زەحمەت ڤیزای ئەو وڵاتانەی دەست دەکەوێت کە

حکومەتەکانیان ئاشتیخواز نین، تووشی ئەو نەخۆشییە درمانە دەبێت کە لە ڕێـگەی ئـاوەوە دەگـوێزرێتەوە، لە ئەنجـامی خـواردنی پیـسەوە تووشـی تێکچوونی کۆئەندامی هەرس دەبێت، تووشی مەترسیی گیرفانبڕین دەبێت و دەکەوێتە نێو بازنەی کێشەکانی حکومەت و شۆڕشگێڕەکانەوە. ئیدی شتێ نییە ببێتە ڕێگر لە نێوان ئەو و سـەفەرکردن بەرەو ڕۆژهەلات و ڕۆژاوا، بەرەو باکوور و بەرەو باشوور.

ئـێلا بەخـۆی گـوت کە عەزیـز تـاقگەیەکی بەخـورەمە. بە هەمـوو هێز و توانایەوە بۆ ئەو شوێنانە دەڕوات کە ئەم ناوێرێت پێی بخاتە سەریان. ئاخر ئێلا پێش ئەوەی بۆ کارێک هەنگاو بنێت، ڕاڕا و بە گومانە، کەچی لە سەرەتادا بـۆی بەپەرۆشـە و دوایـی دوودڵـی و پەژارە دایـدەگرێت. لـێ ئەو هـیچ دوودڵییەکی نییە. کەسێتیی عەزیز لێوانلێوە لە چالاکی، بە جۆرێ بە کەسێکی نمـوونەیی و پڕ لە خۆشەویـستییەکی وا ناسـرابوو کە هەستەم بـوو لە یەک جەستەدا پێکەوە جێگەیان ببێتەوە. چەندین جۆرە شـەپقەی لە سـەر دەکرد و دەیتوانی هەر یەکەیان بە شێوەیەکی باش لە سەر بکات.

ئێلا خۆی وا دەبینی کە ئافرەتێکی ئازادە و سـەر بە پارتی دیموکراسە و جـوولەکەیەکی ناوابەستەی ئـایینە و ڕووەکخـۆرێکی بەتەمـاحە. لەسـەر ئەوە مکوورە کە ڕۆژێـک هەمـوو جـۆرە گۆشـتێک لە ژەمە خواردنەکانیـدا بە لاوە بنێت. وەک چۆن کاروباری ماڵەکەی ڕێکدەخست، ئاوهاش شتەکانی بە ڕوونی بـۆ چەنـد جۆرێـک پـۆلین دەکـرد و دنیـاکەی خـۆی بە وردی و ڕیزبەنـدی ڕێکدەخست. ئیدی ئاوەزی بە دوو لیستی درێژی دژبەیەک کاری دەکرد: ئەو شتانەی کە خۆشی دەویستن، بەرانبەر ئەو شتانەی ڕقی لێیان دەبووەوە.

هەرچەندە ئێلا ئـایینپەروەر نەبـوو، لێ ناوبەنـاو چێژی لە جێبەجێکردنی هەندێ سرووتی ئایینی وەردەگرت. پێی وا بوو کە ئایین کێشەیەکی سەرەکییە و هەر وەک چـۆن لە ڕابـردوودا دنیـای مـژوول کردبـوو، ئەمـڕۆش دنیـای مژوول کردووە. ئاخر ئایینپەروەرەکان بەو لـووتبەرزییە زۆرەیان بەو بڕوا خودپەرستییەیانەوە شێواز و کرداری خۆیان لە سەرووی هەموانەوە دەبینن، ئەمەش دەمـاری دەگـرت، چـونکە ئەو حەوسـەڵەی دەمـارگیریی ئـایینی یـان

تیرەگەرایی یان هەر شتێکی لەم بابەتەی نەبوو، بەڵام لە ناخەوە پێی وا بوو کە موسڵمانە توندڕەوەکان لە هەموویان خراپترن.

عەزیز پیاوێکی ڕۆحانی بوو، ئایین و بڕوای بە ڕاستی وەرگرتبوو و لە شتە سیاسییە سەردەمییەکان خۆی دوور دەگرت و (ڕق)ی لە هیچ شتێ یان کەسێ نەدەبووەوە. گۆشتخۆرێکی بەهەڵپە بوو و دەیگوت ناتوانێت قاپێ کەبابی بەلەزەت ڕەت بکاتەوە. لە ناوەڕاستی حەفتاکاندا خودانەناس بوو ئینجا بوو، بە موسڵمان، هەر وەک خۆی بە لاقرتێوە دەڵێت "دوای کەریم عەبدولجەبار و پێش کاتی ستیڤنز". ئیدی لەوساوە وای لێهات نانی خۆی لەگەڵ سەدان سۆفی لە وڵاتانی جیا و ئایینی جیادا بەشدەکرد و دەیگوت: (ئەوان بە درێژایی ڕێگە خوشک و برای ئێمەن).

عەزیز پیاوێکی موسڵمان بوو و توندوتیژیی ڕەت دەکردەوە، بیروبۆچوونێکی مرۆڤدۆستیی بەهێزی هەبوو، هەروەها بڕوای وا بوو کە هەموو جەنگە ئایینییەکان لە گەوهەردا (کێشەی زمانەوانی)ن. دەڵێت زمان لەجیاتی ئەوەی ڕاستی ئاشکرا بکات، دەیشارێتەوە، لەبەر ئەوە خەڵکی لەنێو خۆیاندا خراپ لە یەکتر حاڵی دەبن و کەس ڕێزی ئەوی دیکە ناگرێت. ئیدی لە دنیایەکی تژی لە وەرگێڕانی خراپ چاوەڕوانیی هیچ سوودێک لەو کەسانەش ناکرێ کە خۆیان بۆ هەر بابەتێک تەرخان دەکەن، چونکە بۆی هەیە باشترین قەناعەتمان دەرهاویشتەی بەدحاڵیبوونێکی سادە بێت. بە گشتی مرۆڤ نابێت لە هیچ شتێکدا توندوتیژ بێت، چونکە "بۆ ئەوەی مرۆڤ بژی، گەرەکە بەردەوام ڕەنگەکان بگۆڕێت".

عەزیز و ئێلا لە باری پیشەیی و خوازەییەوە، هەریەکەیان لە ناوچەیەک دەژیان، لە ڕووی کاتەوە جیاوازییان هەبوو، کاتیش بۆ ئەو بە شێوەیەکی سەرەکی، واتا بانەڕۆژ. بەشێکی زۆری لە ڕۆژەکانی بەو ئارەزووەوە بەسەر دەبرد کە بۆ ساڵی داهاتوو و مانگی داهاتوو و بۆ سبەینێ، بەڵکو بۆ خولەکی داهاتووش پلان دابنێت. ئێلا تەنانەت لە شتی تازەی وەک بازاڕکردن یان کورسییەکی شکاو و بۆ هەر وردە شتێ پێشوەختە پلانی دادەنا و بەپێی خشتە و چەند لیستێک ئەو وردە شتانەی جێبەجێ دەکرد و جانتاکەی لەمانە پڕکردبوو.

بەڵام کـــات لە دیـــدگای عەزیـــزدا لە دەوری ســـــاتەوەختی ئێـــستادا کۆبووبووەوە، ئیدی جگە لەم چرکەساتە، لە خەیاڵێک پتر نەبوو. هەر بەوای ئەمەوە لەو باوەڕەدا بوو کە خۆشەویستی پەیوەندیی بە (پلانی سبەینێ)وە، یان بە (یادەوەرییەکانی دوێنێی عەلائەدین)ەوە نییە، خۆشەویستی تەنها لێرە و لە ئێستادا نەبێت، ئیتر نییە. ئەوە بوو لە یەکێ لە نامەکانی پێشوویدا بەم دەستەواژەیە کۆتایی هێنابوو: "من سۆفیم، منداڵێکی ئەم چرکەساتەی ئێستام".

ئێلا وەڵامی دایەوە: "لام سەیرە باسی ئەوە بۆ ژنێک دەکەیت کە زۆر بیر لە ڕابـردوو دەکـاتەوە و زۆرتـریش بیـر لە بـانەڕۆژ دەکـاتەوە، لـێ بەر ساتەوەختی ئێستا نەکەوتووە".

# عەلائەدین

## قۆنیا، ١٦ی کانوونی یەکەم ١٢٤٤

بەڕێکەوت کاتێ دەروێشەکە ڕێی لە باوکم گرتبوو، من لەوێ نەبووم. ئەوەبوو لەگەڵ هەندێ برادەردا بۆ ڕاوەئاسک دەرچووبووم و ڕۆژی دوایی گەڕامەوە، ئەمێستا دیداری باوکم و شەمسی تەوریزی کەوتبووە سەر هەموو زارێک. خەڵکی دەیانپرسی ئەو دەروێشە کێیە و چۆن دەکرێ زانایەکی سەنگینی وەک ڕۆمی ئاوها بایەخی پێبدات و کار بگاتە ئەوەی بۆی دابچەمێتەوە؟

هەر لە منداڵیمەوە خەڵکیم دەبینی بەرانبەر باوکم دادەچەمانەوە، ئەوەم بە خەیاڵدا نەدەهات کە ڕۆژێ دادێت باوکم دەبینم جگە لە پاشا یان سەدری ئەعزەم، بۆ یەکێکی تر دادەچەمێتەوە، بۆیە بە نیوەی ئەوە باوەڕم نەکرد کە بیستبووم و بێزاریشم دەرنەبڕی تا کاتێ گەیشتمەوە ماڵ و کیرای باوەژنم کە نە درۆدەکات و نە زیادوکەمی پێوەدەنێت، لە هەموو واریقاتەکە دڵنیای کردم. بەڵێ، ڕاستە کە دەروێشێک بە ناوی شەمسی تەوریزی لە بەردەم هەموو خەڵکەکە مەیدانداری باوکمی کردووە، بەڵکو ئێستا لە ماڵی خۆماندا دەژی.

تۆ بڵێیت ئەو نەناسە کێ بێت وا ئاسمان وەک تاشەبەردێکی نادیار تووڕی داوەتە نێو ژیانمانەوە؟ لە پەرۆشیی ئەوەی بە چاوی خۆم بیبینم، لە کیرام پرسی: "کەواتە ئەو دەروێشە لە کوێیە؟".

"بێدەنگ بە"، کیرا بە چپە و بە نەختێ شڵەژانەوە وەڵامی دایەوە، "باوکت و دەروێشەکە لە کتێبخانەکەن".

لە دوورەوە دەنگی هەردووکیان دەگەیشتە ئێمە، لەگەڵ ئەوەشدا هەستەم بوو بزانین چی دەڵێن. رووم کردە کتێبخانەکە، بەڵام کیرا رێی لێگرتم.

"جارێ راوەستە. داوایان کردووە کە کەس بێزاریان نەکات".

بە درێژایی رۆژەکە لە کتێبخانەکە دەرنەچوون، ئیدی بۆ سبەینێ و دووسبەییش هەر دەرنەچوون. دەبێ باسی چی بکەن؟ ئاخۆ چ شتێ کەسێکی وەک باوکم و دەروێشێکی سادە کۆبکاتەوە؟

هەفتەیەک رابرد و ئینجا هەفتەیەکی تری بەدوادا هات. هەموو بەیانییەک کیرا خواردنی قاوەڵتیی دروست دەکرد و دەیخستە سەر سینییەک و لەبەر دەرگای ژوورەکەیان دایدەنا. هەر خواردنێکی خۆشیان بۆ ئامادەکرابا دەمیان لێ نەدەدا، بەیانیان بە لەتە نانێک و ئێواران بە کوپێ شیری بزن دادەکەوتن.

لەم ماوەیەدا ترس و دوودڵییەک دایگرتم و حەوسەڵەم نەما. بە درێژایی رۆژ کون و درزی دەرگاکەم تاقیکردەوە تا بە دزییەوە تەماشای ناو کتێبخانەکە بکەم. گوێم بەوە نەدەدا گەر لەناکاو دەرگاکە بکەنەوە و ببینن وا گوێم هەڵخستووە. ماوەیەکی زۆر خۆم کوور دەکردەوە و هەوڵم دەدا بزانم باسی چی دەکەن، بەڵام هەموو ئەوەی کە دەمبیست، تەنها چپەچپێکی نزم بوو، زۆریشم نەدەبینی، چونکە ژوورەکە بەوای پەردە دادراوەکانەوە نیمچە تاریک بوو. کە هیچم نە دەبینی و نە دەبیست، جڵەوم بۆ ئاوەزم شل دەکرد تا بێدەنگییەکە پڕ بکاتەوە و ئەو قسەوباسانە هەڵببەستێت کە لەگوینە لە نێویاندا بکرێ.

جارێکیان کیرا بینیمی وا گوێم خستووەتە سەر دەرگاکە، بەڵام هیچی نەگوت، کەچی لە من پەرۆشتر بوو تا بزانێت چی روودەدات. ئاخر ئافرەتان بە سروشت حەز لە خۆهەڵقورتان دەکەن، بەڵام بە پێچەوانەوە، کاتێ سوڵتان وەلەدی برام بینیمی وا گوێیان لێ رادەگرم، نیگایەکی تیژی کردم و لە

توورەییان دەموچاوی سوورهەڵگەڕا. بە تانەوە گوتی: "مافی ئەوەت نییە سیخوڕی بەسەر کەسانی دیکەوە بکەیت، بەتایبەتی بەسەر باوکتەوە".

شانەکانم هەڵتەکاند و گوتم: "برام، بڕوام پێ بکە. ئەی ئەوە نیگەرانت ناکات کە باوکمان کاتی خۆی لەگەڵ کەسێکی نەناسدا بەسەر ببات؟ ئەوە مانگێ زیاتریان پێچووە و هەموو ئەم ماوەیە باوکمان خێزانەکەی خۆی فەرامۆش کردووە. ئەی ئەمە تەنگەتاوت ناکات؟".

"باوکمان فەرامۆشی نەکردووین"، براکەم ئەمەی گوت و لەسەری ڕۆیشت، "چونکە شەمسی تەوریزی پێی وایە کە هاوەڵێکی باشی دۆزیوەتەوە، جا تۆش وەک فەقێیەکی سوختەخانە لەجیاتی ئەوەی وەڕس بیت، گەر بەڕاستی خۆشت دەوێ، گەرەکە بە باوکمان شادمان بیت".

براکەم هەر ئەوەندەی لێ دەوەشێتەوە کە ئەم شتانە بڵێ. جا لەبەر ئەوەی من لەگەڵ بۆچوونەکانی ڕاهاتبووم، بۆیە بە قسە ڕەقەکانی تەنگەتاو نەبووم. ئەو هەمیشە ئەو گەنجە ناسکە بوو کە لە دڵی خێزانەکە و گەڕەکەکەدا خۆشەویست بوو، لای باوکمیش کوڕە ڕێزلێگیراوەکە بوو.

دوای ئەوەی چل ڕۆژ بەسەر خەڵوەتەکەی باوکم و شەمسی تەوریزی لە کتێبخانەکەدا تێپەڕی، شتێکی سەیر ڕووی دا. ئەوە بوو لەتەک دەرگاکە خۆم کووڕ کردبووەوە و گوێم لە بێدەنگییەکی زۆر نائاسایی دەگرت، گوێم لێ بوو لەپڕ دەروێشەکە دەنگی بەرز کردەوە.

"ئەوا لێرە چل ڕۆژ بەسەر خەڵوەتەکەماندا تێپەڕی و هەموو گفتوگۆیەکمان لەسەر هەر ڕێسایەک لە چل ڕێساکەی عەشق کرد. ئەمێستا دوای ئەوەی لێبووینەوە، بە مەزەندەی من باشتر وایە بچینە دەرەوە، ڕەنگە ئەم دیارنەبوونەت خێزانەکەتی تەنگاو کردبێت".

باوکم بە ناقایلییەوە وتی: "خەمت نەبێت، هاوسەرەکەم و کوڕەکانم لە ئاستێکی باشی پێگەیشتندان و لەوە تێدەگەن کە ڕەنگە من حەوەجەی هەندێ کات بم تا ناوبەناو لێیان دووربم".

"دەی باشـە، مـن دەربـارەی هاوسـەرەکەت هـیچ نـازانم، بەڵام هەردوو کـوڕەکەت وەک جیـاوازیی شـەو و ڕۆژ لە یەکتـر جیـان". شـەمس وەڵامـی دایەوە."چـونکە کـوڕە گەورەکەت ڕێچـکەی خـۆتی گرتـووە، بەڵام کـوڕە بچووکەکەت، دەترسم بە ڕێگەیەکی تەواو جیاوازدا بڕوات، چونکە دڵی پڕە لە ڕق و ئێرەیی".

لە تووڕەییان دەموچاوم دایسا. ئاخر ئێمەیەک قەت یەکترمـان نەبینیبێت، چۆن دەتوانێت دەربارەی من شتی وا خراپ بە زاریدا بێت.

"پێی وایە کە من نایناسـم، بەڵام مـن بـاش دەیناسـم"، دەروێشـەکە دوای کەمێ گوتی، "ئەو خۆی کوور کردووەتەوە و چنچکانی دانیشتووە و گوێی نـاوەتە دەرگـاکەوە و لە درزەکـانی دەرگـاکەوە تەماشـام دەکـات و منـیش چاودێریی ئەو دەکەم".

لەپڕ تەزوویەکی سارد بە جەستەمدا گەڕا و مووی سەر بازووەکانم ڕەپ بـوون. هەر لەخـۆوە پاڵم بە دەرگـاکەوە نـاو چـوومە ژوورەوە. بـاوکم وەک ئەوەی بـاوەڕ نەکـات، چاوەکـانی ئەبـڵەق بـوون، بەڵام زۆری نەبـرد تـووڕەیی جێگەی شۆکبوونەکەی گرتەوە.

"عەلائەدین، ئەوە تێکچوویت؟ چۆن زات دەکەیت ئاوهـا بێزارمـان بکەیت"، باوکم هاواری بەسەرمدا کرد.

خۆم لە پرسیارەکەی بـاوکم نەبـان کـرد و ئامـاژەم بـۆ شـەمس کـرد، بە دەنگێکی بەرز وتم : "بۆچی یەکەم جار لەو ناپرسیت، چۆن زات دەکـات ئاوهـا باسی من بکات؟".

بـاوکم هیچـی نەوت، وەک ئەوەی بـارێکی قـورس بـم بەسـەر شـانییەوە، تەماشایەکی کردم و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا.

"باوکە، تکات لێدەکەم، کیرا بیرت دەکات، هەروەها فەقێکانتیش. ئاخر چۆن دەتوانیت بۆ دەروێشێکی خراپەکار پشت لە خۆشەویستانت بکەیت؟".

هەر کە ئەم قسانەم کرد، یەکسەر ژێوان بوومەوە، بەڵام ئیدی کار لەکار ترازابوو. باوکم بە چاوێکی یەکجار بێزارییەوە تێیڕوانیم کە لەوەوبەر قەت ئاوها نەمبینی بوو.

"عەلائەدین، دەی هەر ئێستا بڕۆ دەرەوە"، باوکم لەسەری ڕۆیشت، "بڕۆ بۆ شوێنێکی هێمن و بیر لەوە بکەوە کە کردت. تا بە قووڵی بیری لێدەکەیتەوە و هەڵەکەی خۆت دەزانیت، قسەم لەگەڵدا مەکە".

"بەڵام، باوکە...".

"بڕۆ دەرەوە"، باوکم دووبارەی کردەوە و ڕووی خۆی لێم وەرگێڕا.

بە دڵێکی بریندارەوە ژوورەکەم جێهێشت. ناولەپەکانم ئارەقەیان کردبوو و ئەژنۆکانم دەلەرزین.

لەوساتەوە زانیم کە ژیانمان ئاڵۆزکاوە و گۆڕاوە و ئیدی شتەکان وەک جاران نەماون. لەوساوە کە پێش هەشت ساڵ دایکم کۆچی دوایی کردبوو، ئەمە دووەم جار بوو هەست بکەم کە باوکم وازی لێ هێناوم.

# ڕۆمی

## قۆنیا، ١٨ی کانوونی دووەم ١٢٤٤

**بۆ ئەوەی ڕاستی ببینم، ئاوەزم والا بکە هۆ خودای ڕوخسار پەنهان - خودا نادیارە.**

کاتێ شەمسی تەورێزی دەربارەی محەمەدی پێغەمبەر و بوستامی سۆفی پرسیاری لێکردم، هەستم کرد وەک ئەوەی هەردووکمان لەسەر زەوی بە تەنیا مابینەوە و هەر حەوت دۆخەکەی ڕێگەی ڕاستەقینە لە بەردەممانندا والا بووبێت – حەوت پێگە دەبێ هەموو ڕۆحێک ڕەنجی بۆ بدات تا دەگاتە یەکتایی.

دۆخی یەکەم نەفسی فەرمانداری خراپەکارە و لە هەموو جۆر و دۆخەکان سەرەتاییترە و لە گەردووندا بەربڵاوە، ئەمەش لە کاتێکدایە کە ڕۆح دەکەوێتە داوی هەوڵی دنیاییەوە. زۆربەی خەڵکی لەم دۆخەدا دەمێننەوە، ڕەنجدەدەن و ئازاردەکێشن، چونکە سەرقاڵی خزمەتکردنی نەفسی کڵۆڵی خۆیانن، بەڵام بەرپرسیارێتیی کڵۆڵییە بەردەوامەکەیان دەخەنە ئەستۆی کەسانی دی.

کاتێ بنیادەم دەزانێت گەیشتووەتە ئەو دۆخی داڕووخانی ڕۆحییە، ئیدی بەرەنگاریی نەفس دەکات تا دەگاتە قۆناغی دوای ئەوە کە پێچەوانەی دۆخی یەکەمە. ئیدی ئەو مرۆڤەی کە نەفسی خۆی گەیاندووەتە ئەو دۆخە لەبری ئەوەی بەردەوام خراپەکارییەکە بخاتە ئەستۆی ئەوانی تر، هەندێ جار دەگاتە پلەی لەنێوبردنی نەفس. لێرەدا نەفس دەبێتە نەفسێکی لۆمەکار و ئاوهاش سەفەرەکە بەرەو پاککردنەوەی ناوەوە دەست پێدەکات.

له دۆخی سێیه‌مدا بنیاده‌م پتر پێده‌گات و نه‌فس به‌ره‌و قۆناغی گواستنه‌وه هه‌نگاو ده‌نێت تا ببێته نه‌فسێکی سرووشبه‌خش. مرۆڤ ته‌نیا له‌م دۆخه‌دا ده‌توانێت له واتای ڕاسته‌قینه‌ی وشه‌ی (ملکه‌چی) تێبگات. به‌م ئاوهایه له دۆخی زانیارییه خوداییه‌کاندا ده‌ست به سووڕانه‌وه ده‌کات. ئه‌و که‌سه‌ی که ده‌گاته ئه‌م قۆناغه، ده‌بێته خاوه‌ن ئارامی و خۆڕاگری و حیکمه‌ت و خاکه‌ڕایی. دنیای به تازه‌یی و لێوانلێو له سرووش دێته به‌رچاو. هه‌رچه‌نده زۆربه‌ی ئه‌وانه‌ی که ده‌گه‌نه ئه‌م سێیه‌م پایه‌یه، ده‌یانهه‌وێ تێیدا بمێننه‌وه، ئازایه‌تی له‌ده‌ست ده‌ده‌ن و ئه‌و ئاره‌زووه‌یان نامێنێت جێگۆڕکێ بکه‌ن یان بچنه نێو دۆخه‌کانی تره‌وه، بۆیه هه‌رچه‌نده دۆخی سێیه‌م جوان و پیرۆز دیاره، که‌چی بۆ ئه‌و که‌سه‌ی که چاوی له‌وه‌یه بگاته پله‌یه‌کی به‌رزتر، وه‌ک هاوبه‌ش په‌یداکردنێک وایه.

به‌ڵام ئه‌وانه‌ی که ده‌توانن به‌ره‌و پێشه‌وه بڕۆن، ئیدی ده‌گه‌نه دۆڵی حیکمه‌ت و ئاشنای نه‌فسی دڵنیا ده‌بن. لێره‌دا هه‌سته‌وه‌ری نه‌فس له‌گه‌ڵ دۆخی پێشدا جیایه، چونکه به‌ره‌و پله‌یه‌کی به‌رزتری وشیاری هه‌ڵده‌کشێت. ئه‌وانه‌ی که ده‌گه‌نه ئه‌م دۆخه ئه‌م خه‌سڵه‌تانه‌یان تێدایه: به‌خشنده‌یی، خوداناسی، هه‌ستی ڕه‌زامه‌ندی، ئیدی سه‌ختی و ئاسته‌نگه‌کانی ژیان له هه‌ر ڕاده‌یه‌کدا بن ئه‌و پێیان قایله. ئینجا دۆڵی یه‌کبوون (یه‌کێتیبوون) دێت. ئه‌و که‌سه‌ی که ده‌گاته ئه‌م پایه‌یه، به هه‌موو بارێکی خودا قایله و گوێ به شته دنیاییه‌کان نادات، چونکه گه‌یشتووه‌ته نه‌فسی ڕه‌زامه‌ند.

دۆخی دوای ئه‌وه نه‌فسی قایلکه‌ر دێت. له‌م دۆخه‌دا بنیاده‌م بۆ مرۆڤایه‌تی ده‌بێته چرا و وزه به هه‌موو داواکارێک ده‌به‌خشێت، وه‌ک مامۆستایه‌کی ڕاسته‌قینه خه‌ڵکی فێر ده‌کات و بیریان ڕووناک ده‌کاته‌وه. هه‌ندێ جار مرۆڤ ده‌بێته خاوه‌ن زێده وزه‌یه‌کی وا ڕووبکاته هه‌ر شوێنێک ده‌وسێکی گه‌وره له ژیانی خه‌ڵکدا جێده‌هێڵێت. هه‌ر شتێک بکات له‌میانه‌ی خزمه‌تکردنی ئه‌وانی تره‌وه، ئامانجی خزمه‌تکردنی خودایه.

له کۆتاییدا دۆخی حه‌وته‌م دێت و مرۆڤ ده‌گاته نه‌فسی پاکژ و ده‌بێته (مرۆڤێکی کامڵ و ته‌واو)، به‌ڵام ده‌رباره‌ی ئه‌م دۆخه که‌س شتێکی ئه‌وتۆ نازانێت، ته‌نانه‌ت ئه‌و هه‌نده که‌سه‌ی پێیشی ده‌گه‌ن، قسه‌ی له‌سه‌ر ناکه‌ن.

کورتکردنەوەی ڕێگەی گەیشتن بە دۆخەکان ئاسانە، لێ بڕینی زەحمەتە. ئەو ئاستەنگانەی کە بە درێژایی ڕێگە ڕاستەقینەکە دەردەکەون، ئەوانەن کە دەستەبەرێک بۆ چوونە پێشەوە و بەردەوامبوون نییە، ڕێگەکەش هەر لە دۆخی یەکەمەوە تا دوا دۆخ هێڵکی ڕاست نییە و بەردەوام ئەگەری ئەوەی هەیە بکەویت و بۆ دۆخەکانی سەرەتا بگەڕێیتەوە، بڕێ جار بۆی هەیە کەوتنەخوارەوەکە لە ترۆپکی دۆخەکانەوە بەرەو دۆخی یەکەم بێت. جا بە درێژایی ڕێگەکە بە هۆی تەڵەی زۆرەوە، سەیر نییە کە ئەو کەسە نەگاتە دۆخە کۆتاییەکان، دەنا لە هەر سەدەیەکدا کەمێکی کەم پێی دەگەن.

* * *

شەمس کە ئەم پرسیارەی لێکردم، نیازی بەراوردکردنی نەبوو، بەڵکو دەیەویست بزانێت تا چ ڕادەیەک ئامادەییم تێدایە بەرەو ئەوە بچم کەسایەتیی خۆم لە خودادا بتوێنمەوە. لە پرسیاری یەکەمیدا پرسیارێکی شاراوە هەبوو.

"ئەی وتاربێژی مەزن، ئەی دەربارەی خۆت چی؟"، پرسیاری لێکردم، "لەنێو هەرحەوت دۆخەکەدا، ئەمێستا تۆ لە کام دۆخدایت، ئایا بوێریی ئەوەت هەیە تا کۆتایی بڕۆیت؟ پێم بڵێ، قەبارەی دەفرەکەت چەندە؟".

# کیرا

## قۆنیا، ١٨ی کانوونی یەکەم ١٢٤٤

بۆ بێ یەغباڵیی خۆم، خەمخواردن دادێکم نادات، بەڵام سەرباری ئەوە ئاواتەخوازبووم شارەزایی زۆرترم دەربارەی ئەو شتانە هەبێت کە پەیوەندییان بە ئایین و مێژوو و فەلسەفەوە هەیە، هەروەها شارەزاییم لەسەر هەموو ئەو شتانەی کە ڕۆمی و شەمس بە درێژایی شەو و ڕۆژ باسی دەکەن. سات لەدوای سات ئارەزووی یاخیبوون دەکەم لەبەر ئەوەی وەک ئافرەتێک دروستبووم. کە وەک کچێک لەدایک دەبێت، گەرەکە فێری چێشتلێنان و شتنی جلی کۆن و پینەکردنی گۆرەویی دڕاو و دروستکردنی سەرتوێژ و پەنیر و شیردانی منداڵ ببێت، هەروەها هەندێ ئافرەت فێری هونەری خۆشەویستی دەکرێن کە چۆن وا لە خۆیان بکەن سەرنجی پیاوان ڕابکێشن، بەڵام هەموو شتەکە ئەوەیە، کەسێک کتێب بە ئافرەتان نادات تا چاویان نەکرێتەوە.

لە یەکەم ساڵی ژن و مێردایەتیماندا، ئەوەندەی بۆم ڕێکەوتبا، دەخزامە نێو کتێبخانەکەی ڕۆمییەوە و لە ناوەڕاستی ئەو کتێبانە دادەنیشتم کە زۆر خۆشی دەویستن، ئەو تۆزەی کە لەسەریان نیشتبوو، ئەو بۆنە گەڵمەخاوییەی کە لێیان دەهات، هەڵمدەمژی و لە خۆم دەپرسی ئاخۆ ئەو مەتەڵانە چین کە لە دووتوێیاندا حەشاریان داوە. دەمزانی ڕۆمی چەند عاشقی ئەو کتێبانەیە کە زۆربەیان لە بەهادینی باوکی کۆچکردوویەوە بۆی ماونەتەوە. لەنێو ئەم کتێبانەدا عاشقی کتێبی (زانیارییەکان -ئینسکلۆپیدیا) بوو. چەندین شەو تا بەرەبەیان بەدیارییانەوە شەوبێداری دەکرد و دەیخوێندنەوە. پێم وا بوو کە هەمووی لەبەرکردووە.

ڕۆمی دەیگوت: "کتێبەکانی باوکم بە هیچ شتێ ناگۆڕمەوە، تەنانەت گەر چەندین کیسە زێڕیشم بدەنێ. هەر کتێبێک لەم کتێبانە کولتوورێکی بەنرخە و پێشوونانم بۆیان جێهێشتووم، لە باوکمەوە بۆم ماونەتەوە و منیش بۆ منداڵەکانم جێیان دەهێڵم".

دەمزانی کە کتێبەکانی بۆ ئەو چی دەگەیەنن. لەساڵی یەکەمی ژن و مێردایەتیماندا، ڕۆژێکیان بە تەنیا لەماڵەوە بووم و بە خەیاڵمدا هات کە کتێبخانەکە پاکبکەمەوە. هەموو کتێبەکانم لەسەر ڕەفەکان داگرت و بەرگەکانیانم بە پارچە مەخمەڵێکی بەگوڵاو تەڕکراو پاککردەوە. دانیشتوانە خۆجێییەکان لەو باوەڕەدان کە جنۆکەیەکی بچووک هەیە ناوی (کێپەک)ە و چێژ لە لەناوبردنی کتێب وەردەگرێت. جا بۆ ئەوەی ڕێگەی ئەو کارەی لێ بگیرێ، دەستەواژەیەکی ئاگادارکردنەوەیان لەسەر هەر کتێبێک دەنووسی: "هێی کێپەک ڕاوەستە، لەم کتێبە دوورەوەکەوە". ئاخر چۆن بزانم کێپەک تاقە کەس نەبوو کە دەبوو لە کتێبەکانی شووەکەم دوور بکەوێتەوە، بەڵکو دەبێ منیش دوور بکەومەوە.

لە عەسری ئەو ڕۆژەدا، تۆزی سەر هەموو کتێبەکانی ناو کتێبخانەکەم تەکاند و پاکم کردنەوە. من خەریکی ئەوە بووم، دەستم بە خوێندنەوەی کتێبی (ژیاندنەوەی زانستە ئایینییەکان)ی غەزالی کرد. کاتێ لە پشتمەوە دەنگێکی وشکم ژنەوت و زانیم کە ماوەیەکی زۆرم بە خوێندنەوە بەسەر بردووە.

"کیرا، ئەوە خەریکی چییت؟".

ئەوە ڕۆمی بوو، یان یەکێکی دیکە بوو لە شێوەی ئەو – ڕیتمی دەنگی زۆر تووڕە و یەکلاکەرەوە بوو. لە ماوەی هەشت ساڵی* ژن و مێردایەتیماندا ئەوە یەکەم جار بوو بەو شێوازە قسەم لەگەڵدا بکات.

(پاکیان دەکەمەوە)، بە دەنگێکی نزم وەڵامم دایەوە، (ویستم دڵت خۆش بکەم).

---

*پێم وایە ڕۆماننووس لێرەدا لە ڕووی کاتەوە تووشی غافڵبوونێک بووە، چونکە کاتێ کیرا چووەتە ناو کتێبخانەکەوە دەڵێت (ڕۆژێکیان لە ساڵی یەکەمی ژن و مێردایەتیماندا)، کەچی هێشتا هەر لەناو کتێبخانەکەیە و دەڵێت (لە ماوەی هەشت ساڵی ژن و مێردایەتیماند). و.کوری.

ڕۆمی وەڵامی دایەوە: "لەوە تێدەگەم، بەڵام تکایە جارێکی تر دەست لە کتێبەکانم مەدە. لە ڕاستیدا پێم باشە بە هیچ جۆرێ نەیەیتە ناو ئەم ژوورەوە."

لەو ڕۆژە بەدواوە تەنانەت گەر کەسیش لە ماڵ نەبوایە، نەدەچوومە ناو کتێبخانەکەوە. ئیدی تێگەیشتم و بەوە قایل بووم کە دنیای کتێب نە بۆ من بووە و نە بۆ منیش دەبێت.

بەڵام کە شەمسی تەورێزی بۆ ماڵمان هات و لەگەڵ مێردەکەمدا ماوەی چل ڕۆژ لە کتێبخانەکەدا کەوتە خەڵوەتەوە، هەستم بە ڕقێک کرد کە لە دڵمدا پەنگی دەخواردەوە. برینێک بوو نەمدەزانی ئاوها خوێنی لێ دەتکێتەوە.

# کیمیا

## قۆنیا، ٢٠ی کانوونی یەکەم ١٢٤٤

باوک و دایکی ڕاستەقینەم لەو جۆرە کەسانەن کە لە کارکردندا زۆر خۆیان دەڕەنجێنن و زوو پیردەبن. ئاخر من لە خێزانێکی جوتیاری سادە، لە یەکێ لە دەشتاییەکانی چیاکانی تۆرۆس لەدایک بووم. لە تەمەنی دوانزە ساڵیمدا ڕۆمی هەڵیگرتمەوە. لە خانوویەکی بچووکدا دەژیاین و من و خوشکەکەم پێکەوە لەگەڵ تارمایی برا مردووەکانمان لە ژوورێکدا بووین. ئەو پێنج منداڵەی کە هەموویان بەوای نەخۆشیی سووکەوە مردن، لە ماڵەکەدا من تاقە کەسێک بووم کە دەمتوانی تارماییەکانیان ببینم. هەر کاتێ باسی ئەوەم کردبا کە ڕۆحەکان چی دەکەن، خوشکەکەم و دایکم دەترسان و دەگریان.

هەوڵم دەدا وایان لێ بکەم لە هیچ نەترسێن و خەم نەخۆن، بەڵام بێسوود بوو. ئاخر هیچ شتێ دەرنەدەکەوت کە پەیوەندیی بە برامردووەکانمەوە هەبێت و مایەی ترس و پەژارە بێت، لێ نەمتوانی بڕوا بە خێزانەکەم بهێنم.

ڕۆژێکیان خوداپەرستێک بە دێیەکەماندا تێپەڕی، کە باوکم بینیبووی ماندووە، فەرمووی لێ کردبوو تا شەو لە ماڵمان بمێنێتەوە. ئەو ئێوارەیە هەموومان بە دەوری کوانووەکەدا کۆبووبووینەوە و پەنیری بزنمان دەبرژاند، خوداپەرستەکە هەندێ چیرۆکی شوێنانی دووری بۆ گێڕاینەوە. لەو کاتەدا کە چیرۆکەکانی بۆ دەگێڕاینەوە، چاوەکانم لێک نا و لەگەڵیدا بەرەو بیابانی عەرەبی و هەواری ڕەوەندەکان لە باکووری ئەفریقا و بۆ ئەو دەریایەی کە ئاوەکەی لە هەموو ئاوەکان شینترە و پێی دەڵێن دەریای سپیی ناوین، سەفەرم کرد. لە کەنارەکەیدا گوێچکەماسییەکی گەورە و درزبردووم

دۆزیـیەوە و خـستمە گیرفـانمەوە. خـۆم هەڵـدەنا کە دەتـوانم لەمـسەری کەنارەکەیەوە تا ئەوسەری کەنارەکەی بڕۆم، لێ لە نیوەی ڕێگە بۆنێکی تیژ و بۆگەن ڕایگرتم.

کە چاوەکانم کردەوە، خۆم بینی لەسەر زەوییەکە ڕاکشاوم و ئەوانەی ناو ماڵەکە بە پەژارەوە دەوریان دابووم. دایکم بە دەستێکی سەرمی گرتبوو و نیوسەلک پیازیش بە دەستەکەی دیکەیەوە بوو تا بۆنی بکەم.

"هاتەوە هۆش خۆی"، خوشکەکەم بەدەم قسەکردنەوە چەپڵەی لێدەدا.

"سوپاس بۆ خـودا"، دایکم بەدەم قسەوە هەناسـەی هەڵدەکێشا، ئینجـا ئـاوڕی لە خوداپەرستەکە دایەوە و بەدەم ڕوونکردنەوەوە وتـی: "کیمیـا هەر لەوساوە کە کیژۆڵەیەکی بچووک بوو نۆرەفێیەکی لەگەڵدا بوو".

بەیـانی خوداپەرسـتەکە بـۆ میوانـدارییەکەمان سوپاسـی کـردین و دوعاخوازیی لێکردین، بەڵام پێش ئەوەی بڕوات بە باوکمی وت: "کیمیای کچت منـداڵێکی ئاسـایی نیـیە و کچێکـی بەهـرەدارە، جـێگەی داخە گەر ڕێـزی ئەم بەهرەیەی نەگیرێ. پێویستە بیخەیتە بەر خوێندن".

"گەر کـچ فێـری خوێنـدن بێـت، چ سـوودێکی هەیە؟"، دایکـم هـاواری لـێ بەرزبووەوە، "شتی وات لە کوێ بیستووە؟ گەرەکە تا شوودەکات لای خۆم بمێنێـتەوە و لە فەرشـچنیندا یـارمەتیم بـدات. وەک دەزانیـت فەرشـچنێکی دەستڕەنگینە".

خوداپەرستەکە بەبێ دوودڵـی وەڵامـی دایەوە: "ڕەنـگە ڕۆژێ بێـت ببێـتە زانایەکی نـاودار. ئاشـکرایە خـودا پشتی لە کچەکەت نەکردووە لەبەر ئەوەی کچە، بۆیە چەندین بەهـرەی پێ بەخشیوە"، ئینجا لە دایکمی پرسی: "ئایا تۆ بۆت هەیە لە خودا زۆرتر بزانیت؟ گەر سوختەخانەش لێرە نەبێت، بینێرە لای یەکێ لە زاناکان تا ئەو زانیارییە وەربگرێت کە شایستەیەتی".

دایکم سەری بادا، بەڵام بینیم باوکم بۆچوونی جیابوو، چونکە دەمزانی چەند فێربوون و زانیاریی خۆش دەوێ و ڕێزی تواناکانی من دەگرێت، هەر لەبەر ئەوە پێم سـەیر نەبـوو کە گـوێم لـێ بـوو لێـی دەپرسـێت: "ئێمە هـیچ زانایەک ناناسین. ئاخر چۆن بتوانم یەکێکی ئاوها بدۆزمەوە؟".

خوداپەرستەکە ناوی زانایەکی هێنا کە ڕەوتی ژیانمی گۆڕی، وتی: "من زانایەکی پایەبەرز لە قۆنیا دەناسم و ناوی مەولانا جەلالەدینی ڕۆمییە، پێم وایە بۆ فێرکردنی کچێکی وەک کیمیا، خۆشحاڵ دەبێت. بۆ لای ئەو بیبە و پەشیمان نابیتەوە".

کە خواپەرستەکە ڕۆیشت، دایکم دەستەکانی بەرزکردەوە و گوتی: "من دووگیانم، هاکا ماڵەکەمان دەمێکی دیکەی بۆ زیاد بوو، تا خواردنی بۆ پەیدا بکرێ. ئاخر من پێویستیم بە یارمەتییە. کچان پێویستیان بە کتێب نییە، بەڵکو پێویستیان بە فێربوونی کاروباری ماڵ و سەرپەرشتیکردنی منداڵە".

حەزم دەکرد ناقایلییەکەی دایکم بەوای شتی دیکەوە بوایە. گەر وتبای بەرگەی ئەوە ناگرێت بە ئێرەتیش بێت بمبەخشێتە خێزانێکی تر و منی لەدەست بچم، لەگوین بوو کە بمێنمەوە، بەڵام شتێکی ئاوهای نەگوت، کەچی باوکم پێی وا بوو کە خواپەرستەکە ڕاست دەکات.

دوای ماوەیەک من و باوکم بۆ قۆنیا سەفەرمان کرد. لە دەرەوەی ئەو سوختەخانەیەی کە ڕۆمی وانەی تێدا دەوتەوە، چاوەڕێمان کرد. کاتێ هاتە دەرەوە، شەرمم کرد سەر هەڵببڕم و تەماشای بکەم، بۆیە چاوم بڕییە هەردوو دەستی. ئەنگوستەکانی درێژ و خاڵخاڵاوی بوون و پتر لە ئەنگوستی پیشەکارێک دەچوون، نەک هی زانایەک. باوکم بەرەو لای ئەو پاڵی نام .

"کچەکەم بەهرەیەکی باشی هەیە، بەڵام خۆم پیاوێکی ئاساییم و ژنەکەمیش هەر وایە. پێیان وتین کە تۆ لە ناوچەکەدا زاناترین پیاوی. ئایا دەتەوێ فێری بکەیت؟".

بێ ئەوەی تەماشای دەموچاوی بکەم، هەستم کرد کە ڕۆمی بە داواکەی باوکم سەری سوڕنەما، بێگومان ئەو لەگەڵ ئەو جۆرە داواکارییانەدا ڕاهاتبوو. لە کاتێکدا ئەو و باوکم مژوولی قسەکردن بوون، بەرەو گۆڕەپانەکە ڕۆیشتم. ئەوەبوو ژمارەیەک کوڕم بینی و هیچ کچێک نەکەوتە بەرچاوم. کاتێ گەڕامەوە سەرم سوڕما کە کچێکی جحێڵم بینی بە تەنیا لای لێژاییەکە وەستابوو. دەموچاوە خڕەکەی مینا بەردی مەڕمەڕ هێمن و سپی بوو. دەستم لێ هەڵتەکاند، دیاربوو بە بینینم سەری سوڕما، لێ دوای کەمەکێ دوودڵی، ئەویش دەستی بۆ هەڵتەکاندم.

لێی پرسیم: "کچە گەنجەکە سڵاو، ئایا دەتوانیت بمبینیت؟".

کە سەرم بۆی لەقاند، زەردەی هاتێ و دەستەکانی پێکدا دا و گوتی: "ئەمە زۆر نایابە، جگە لە تۆ، ئەمە لە توانای کەسی تردا نییە".

بەرەو لای ڕۆمـی و بـاوکم ڕۆیـشتین، پـێم وا بـوو ئەوان هەر کە ئەو ئافرەتە ببینن، واز لە قسەکردن دێنن، لێ ئەو ڕاستی دەکرد، نەیانتوانی ببینن.

ڕۆمی گوتی: "کیمیا وەرە. باوکت پێی وتم کە تۆ حەزت لە خوێندنە. پێم بڵێ، حەز لە چ جۆرە کتێبێک دەکەیت؟".

بەهەسـتەم تـفەکەم بـۆ قـووت درا و نەمتـوانی وەڵامـی بـدەمەوە. ئـاخر دەستەوسان بووم، دیاربوو باوکم بێزای دایگرتبوو، گوتی: "ئازیزم وەرە".

ویستم وەڵامێکی گونجاو بدەمەوە، وەڵامێک مایەی شانازیی باوکم بێت. لە گەرمەی پەژارەکەمـــدا تەنیـــا دەنگێـــک کە لە زارمەوە ســـەری کـــرد، هەناسەیەکی نائومێدانە بوو.

گەر ئەم ئـافرەتە نەهاتـایەتە نێـوانەوە، لەگـوێن بـوو لەگەڵ باوکمـدا بە دەستی خـاڵییەوە بۆ گونـدەکەمان بگەڕێمەوە. ژنەکە دەسـتی گرتم و گـوتی: "دەی پێی بڵێ لەوانەکانی ئەودا حەزت لە چییە. دڵنیات دەکەم هەموو شتی بە دڵی تۆ دەبێت".

کە هەستم کرد لە دۆخێکی باشتردام، بەرەو ڕۆمـی ئـاوڕم دایەوە و وتـم: "ئەی مەولانا، شانازی دەکەم کە لە بەر دەستی تودا فێری قورئانخوێندن ببم. ئامادەم لە خوێندنەکەدا هەوڵبدەم".

دەموچـاوی ڕۆمـی گەشـایەوە و گـوتی: "ئەمە نایـابە"، لـێ وەک ئەوەی هەنـدێ شـتی خراپـی بیـرکەتبێتەوە، گوتی: "بەڵام تـۆ کچیـت، تەنـانەت گەر خوێندت و قۆنـاغێکی باشیشت بـڕی، ئەوەنـدە نابـات شـوودەکەیت و منـداڵت دەبێت. ئەوسا هیچ سوودێک لەو ساڵانی خوێندنە نابینیت".

نەمزانی چی بڵێم، هەستم کرد کە من کچێکی بەدبەختم، بەڵکو گوناهیشم. دیاربوو باوکمیش نیگەرانە و خەریکبوو لە پێڵاوەکەی دەگەڕا. جارێکی تر ژنە جحـێڵەکە بە هانـامەوە هـات و گـوتی: "پێـی بڵـێ کە ژنەکەی حەزی دەکـرد کچێکی ببێت، ئێستا خۆشحاڵ دەبێت ببینێت وا ئەو خەریکە کچێکی تر فێرە خوێندن دەکات".

که پەیامەکەم پێی گەیاند، ڕۆمی پێکەنی و گوتی: "وا دیارە کە تۆ سەردانی ماڵەکەی منت کردووە و قسەت لەگەڵ هاوسەرەکەمدا کردووە، بەڵام با دڵنیات بکەمەوە کێرا دەست لە کاروباری وانەوتنەوەی من وەرنادات".

وتم: "من دەربارەی گەوهەر قسەم دەکرد"، ناوەکەیم بە باشی گۆکرد، "دایکی هەردوو کوڕەکەت".

ڕوخساری ڕۆمی زەردهەڵگەڕا و بە وشکی گوتی: "کیژۆڵەکەم، گەوهەر مردووە. تۆ دەربارەی هاوسەرە کۆچکردووەکەم چی دەزانیت؟ ئەمە لە گاڵتەیەکی توورەهات زیاتر نییە".

باوکم هاتە نێوانەوە و گوتی: "ئەی مەولانا، دڵنیام کە ئەو مەبەستێکی خراپی نییە. دەتوانم دڵنیات بکەمەوە کیمیا کچێکی پەرۆش و کارایە و زۆر ڕێزی ئەوانە دەگرێت کە لە خۆی گەورەترن"

زانیم کە دەبێت ڕاستییەکە بڵێم، بۆیە وتم: "هاوسەرە کۆچکردووەکەت لێرەیە. ئەوەتا دەستی گرتووم و هانم دەدات قسە بکەم. چاوەکانی مەڕین، خاڵی جوان بە دەموچاوییەوەیە، عەبایەکی زەردی درێژی لە بەرە...".

وەستام و سەرنجم دا وا ئافرەتە گەنجەکە ئاماژە بۆ نەعلەکانی دەکات، وتم: "ئەو داوام لێدەکات کە باسی نەعلەکانیت بۆ بکەم. جووتە نەعلێکی ئاوریشمن، ڕەنگیان پرتەقاڵییەکی درەوشاوەیە و بە وردە گوڵی سوور نەخشێنراون و یەکجار جوانن".

ڕۆمی وتی: "لە دیمەشق بۆم هێنان"، چاوەکانی فرمێسکیان تێزا "خۆشی دەویستن".

مەولانا بێدەنگ بوو و ڕیشی خوراند، سیمای پەرۆشی گرژبوو، بەڵام کە دووبارە دەستی بە قسە کردەوە، دەنگی ناسک و دۆستانە بوو و هیچ دەوسێکی خەمی پێوە دیارنەبوو.

"ئێستا تێگەیشتم بۆچی دەڵێن کچەکەت بەهرەدارە"، ڕۆمی بە باوکمی وت، "با بۆ ماڵەکەی من بڕۆین و لە بارەی ئایندەیەوە قسە بکەین و نانی شێوانیش بخۆین. من دڵنیام کە دەبێتە فەقێیەکی لێهاتوو و لە کوڕەکان زۆر باشتر دەبێت".

ئینجا ڕۆمی ئاوڕی لێ دامەوە و لێی پرسیم: "ئایا ئەمە بە گەوهەر ڕادەگەیەنیت؟".

وتم: "ئەی مەولانا، پێویست بەوە ناکات، چونکە ئەو خۆی گوێی لێت بوو"، لەسەری ڕۆیشتم، "وا ئەو دەڵێت دەبێ ئێستا بڕوات، ئاخر ئەو بەردەوام چاوی خۆشەویستیی لەسەرتە".

ڕۆمی زەردەخەنەیەکی گەرم گرتی و باوکمیش زەردەی هاتێ. ئێستا بە پێچەوانەی پێشتر ئاسوودەیی باڵی کێشا. لەو ساتەدا زانیم کە ئەم دیدارەم لەگەڵ ڕۆمیدا ئەنجامێکی دوورمەودای دەبێت.

قەت پەیوەندییەکی پتەوم لەگەڵ دایکمدا نەبوو، لێ وەک ئەوەی قەرەبووی دووریی دایکم بۆ بکرێتەوە، خودا دوو باوکی پێبەخشیم، باوکی ڕاستەقینەی خۆم و ئەو باوکەی کە هەڵیگرتمەوە.

بەم ئاوهایە بەر لە هەشت ساڵ گەیشتمە ماڵی ڕۆمی، کچۆڵەیەکی شەرمن و پەرۆشی زانیاری.

کیرا ئافرەتێک بوو لە دایکم زیاتر خۆشەویستی و سۆزی پێبەخشیم. هەردوو کوڕەکەی ڕۆمی ڕووخۆش بوون، بە تایبەتی کوڕە گەورەکەی دوای ماوەیەک وای لێهات بوو بە براگەورەم.

لە ئەنجامدا قسەی خواپەرستەکە هاتە دی. هەرچەندە باوک و خوشک و براکانم لەدەست دابوون، لێ بۆ چرکەساتێک لەوە ژێوان و خەمبار نەبووم کە بۆ قۆنیا هاتم و لەنێو خێزانەکەی ڕۆمی گیرسامەوە. ئیدی ڕۆژانێکی زۆر خۆشم لەژێر میچی ئەم ماڵەدا بەسەربرد.

تا هاتنی شەمسی تەورێزی دۆخەکە بەم شێوەیە مایەوە، هاتنی ئەو هەموو شتێکی گۆڕی.

# ئێلا

## نۆرتامپتۆن، ٩ی حوزێران ٢٠٠٨

بەوای ئەوەی ئێلا قەت چێژی وەرنەدەگرت کە لەگەڵ خۆیدا بکەوێتە خەڵوەتەوە، لە دواییشدا بۆی دەرکەوت کە خۆی ئەوەی ویستووە. خەریکی دوا پێداچوونەوەی ئەو راپۆرتە بوو کە دەربارەی رۆمانی (کفری شیرین) نووسی بووی. ئەوە بوو داوای لە میشێل کرد کە هەفتەیەکی تر لەسەری بوەستێت، لە کاتێکدا دەیتوانی کارەکەی زووتر تەواوبکات، لێ نەیدەویست ئەوە بکات. ئەم کارە بیانوویەکی بۆ دروست کرد تا پرسوڕایەک لەگەڵ ئاوەزی خۆی بکات و خۆی لە ئەرکەکانی ژن و مێردایەتی و خێزانەکەی بدزێتەوە کە دەمێ بوو چاوەڕێی ئەمەی دەکرد. بۆ یەکەم جار بوو لەم هەفتەیەدا بۆ یانەی چێشتلێنان نەچوو، چونکە هەستی نەدەکرد لەگەڵ پانزە ژندا کە هەموویان دۆخی ژیانیان وەک یەکە، ئارەزووی لە چێشتلێنان و چەنەبازیی هەبێت، هاوکات دڵنیا نەبوو کە چۆن مامەڵە لەگەڵ ژیانی خۆیدا بکات. ئیدی پەیوەندی پێوەکردن و ئاگاداریکردنەوە کە تای لێیە.

ئێلا زۆر بە نهێنی نامەی لەگەڵ عەزیزدا دەگۆڕییەوە. عەزیز نەیدەزانی کە ئەو هەر رۆمانەکەی ناخوێنێتەوە، بەڵکو راپۆرتیشی لەسەر دەنووسێت، پەخشکارە ئەدەبییەکەش نەیدەزانی ئەو دڵداری لەگەڵ نووسەری ئەو رۆمانەدا دەکات کە راسپێرراوە بیخوێنێتەوە و بۆچوونی خۆی لەسەر دەرببڕێت، هەروەها منداڵەکانی و مێردەکەی دەربارەی بابەتی رۆمانەکە و نووسەری رۆمانەکە و ئەو نامانەی کە دەینووسین، هیچیان نەدەزانی. ئێلا لە ماوەی چەند هەفتەیەکدا لە ژنێکەوە کە ژیانی وەک منداڵێکی تازە لەدایکبوو بێگەرد بوو، گۆڕا و بوو بە ژنێکی پڕ لە پێچوپەنا و لەنێو نهێنی و درۆدا

گێنگڵی دەدا. ئەوەی لەم گۆڕانەدا تووشی سەرسوڕمانێکی زۆری کردبوو، ئەوە بوو هەستی بە هیچ بێزارییەک نەدەکرد. وەک یەکێ ڕەفتاری دەکرد کە بە دڵنیایی و ئارامییەوە چاوەڕێی شتێکی گرینگ بێت. ئەم پێشبینییە نادروستەی بەشێک بوو لە ئەفسوونی مگێزە تازەکەی کە سەرباری هەموو نهێنییەکان، بە لایەوە دڵگیر بوو.

شتەکە هەر بە گۆڕینەوەی نامەی ئەلیکترۆنییەوە نەوەستا، هەرچەندە ئێلا لە نامەنووسیندا دەستپێشخەر بوو، لەگەڵ پێنج سەعات جیاوازیی کاتی نێوانیان، ئەمێستا وایان لێ هاتبوو ڕۆژانە بە تەلیفۆن قسەیان لەگەڵ یەکدا دەکرد. عەزیز پێی گوت کە دەنگی نەرم و ناسکە. کە پێکەنی، پێکەنینەکەی بە جۆرێ هاتە بەرگوێی لە خوڕەی ئاوی جۆگەلە دەچوو و وەک ئەوەی پێی وا بێت کە دەبێ زۆرتر پێبکەنێت، نەختێ هەناسەبڕکێ دەکەوتە نێو پێکەنینەکەیەوە. پێکەنینی ئافرەتێک بوو کە قەت فێری ئەو ڕێسایانە نەبووبوو چۆن خەڵکی تر لە پێکەنیندا پەیڕەوی دەکەن.

"خۆت بدە دەم شەپۆلەوە با لەگەڵ خۆیدا بتبات"، وتی: "وا لە خۆت بکە لەگەڵ شەپۆلدا هەڵبقوڵێیت".

بەڵام هەڵقوڵینەکانی دەوروبەری جێگیر نەبوون، چەند شتێک ڕێگری بوون و لە ماڵەکەی خۆیدا ڕوویان دەدا. ئافی خەریک بوو وانەی تایبەتی وەردەگرت، ئۆرلی سەردانی ڕاوێژکارێکی پزیشکیی دەکرد، تا چارەسەری ئەو ئازارە بکات کە لە دوای خواردن تووشی شڵەژان دەبوو. ئەم بەیانییە نیو کولێرە بە هێلکەی خوارد –چەند مانگێک بوو یەکەم جار بوو ژەمی قورس بخوات– ئەوە بوو یەکسەر پرسیاری ژمارەی ئەو کالۆرییەی کرد کە تێیدایە، سەیر لەوەدا بوو کە هەستی بە هەڵەکەی خۆی نەکرد و خۆیشی بەوە سزا نەدا کە ئەوەی خواردوویەتی هەڵی بهێنێتەوە. هەر لەم کاتەدا جانێت ڕایگەیاند کە لەگەڵ سکۆتدا جیابووەتەوە، بەمەش بۆمبێکی تەقاندەوە، لەبەر ئەوەی هەریەکەیان پێویستی بە کەشێکی تایبەت بە خۆی هەیە، هیچ شتێکی ڕوون نەکردەوە. ئێلا پرسیی ئاخۆ وشەی (کەش) هێمایە بۆ عەشقێکی نوێ، لەبەر ئەوەی لە بەردەم هەریەکە لە جانێت و سکۆتدا هێشتا کاتێکی زۆر هەیە تا کەسێکی دی بدۆزنەوە.

ئەو پەیوەندییە مرۆییانەی کە خێرا دەست پێدەکەن و هەڵدەوەشێنەوە، لە هەموو کاتێک زیاتر ئێلای دین کردبوو، لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵی دەدا بۆچوونی خۆی بەسەر ئەوانی تردا نەسەپێنێت. ئەوەی لە نامەکانی نێوان خۆی و عەزیز فێری بووبوو، ئەوە بوو هێمنی و هاوسەنگیی خۆی بپارێزێت، لێ لەگەڵ منداڵەکانیدا کێشەی زیادی کردبوو. کە وازی لەوە هێنا بەدوایاندا ڕابکات، ئینجا ئەوان لێی هەڵنەدەهاتن. شتەکان خەریکبوون بە ئاسانی بە دڵی ئەو بەڕێوە دەچوون، نەک وەک جاران کە هەوڵی دەدا لێبڕاوانە یارمەتیدەر بێت.

وا دێتە بەرچاو کە ئەو بۆ گەیشتن بەم ئامانجە هێشتا شتێکی ئەوتۆی نەکردووە. لەجیاتی ئەوەی وا بیر بکاتەوە ڕۆڵی ئەو لە ماڵەکەدا جۆرێکە لە ماددەی پێوەلکاندن و بووەتە چەقی پێکەوەژیانێکی نهێنیی ئەوتۆ وا دەزانیت پێکەوە نووساون، لێ ئێستا بووەتە تەماشاکەرێکی بێدەنگ. دەستی بە چاودێریکردنی ڕووداوەکان کرد کە تا دەهات ڕۆژبەڕۆژ لە بەردەمیدا ئاشکرا دەبوون، ئەمەیشی وەک پێویستبوونێک یان خوێنساردی و گوێنەدانێک نەدەکرد، بەڵکو بە بابەتییانە و نهێنی چاودێریی دەکردن. ئیدی گەیشتبووە ئەو بڕوایەی کە ئەوێک بەوە قایل بێت، ئیدی پێویست ناکات هەست بە شڵەژان بکات و دەرهەق بەو شتانەی دەسەڵاتی بەسەریاندا ناشکێت، فشار بخاتە سەر خۆی. بەم جۆرە خودێکی تر لە ناخیدا سەری هەڵدا، خودێکی هۆشمەندتر و هێمنتر و هەستەوەرتر.

"ڕەگەزی پێنجەم"، لەو ڕۆژەدا چەند جارێ لەبەر خۆوە ورەوری کرد، "بە بۆشایی قایل بە".

زۆری نەخایاند مێردەکەی سەرنجی دا کە لە ڕەوتاریدا شتێکی نامۆ پەیدا بووە، شتێک لە ئێلای ڕاستەقینەدا نەبوو. ئاخۆ هۆیەکەی ئەوەبوو کە حەزی دەکرد کاتێکی زۆرتری لەگەڵدا بەسەر ببات؟ چونکە لەم ڕۆژانەدا زوو بۆ ماڵ دەگەڕایەوە، ئەمەش وای لە ئێلا کرد گومانی ئەوە بکات، کە ماوەیەکە چاوی بە ژنی دیکە ناکەوێت.

"خۆشەویستم، ئایا تۆ باشیت؟"، دەیڤید چەندین جار لێی پرسی.

"وەک چۆن باران باشە، منیش ئاوها باشم"، هەموو جارێ بە زەردەخەنەوە وەڵامی دەدایەوە. وا دیاربوو ئەو پەنابردنەی بۆ کەشێکی هێمن

و تایبەت بە خۆی ئەو ڕەفتارە سەنگینەی لێ داماڵی بوو کە ساڵانێک بوو لە پشت ژن و مێردایەتییەکەیانەوە بە هێمنی خۆی مەڵاس دابوو، لێ ئەمێستا دوای ئەوەی بیانگ و لافلیدانەکانیان نەما، ئیدی دەیبینی خەوش و هەڵەکانیان ڕووتبوونەتەوە. ئیتر وازی لە نواندن هێنا و ئەو هەستەی لا پەیدا بوو کە دەیڤید وا خەریکە شتێک بکات.

لە کاتی قاوەڵتی و شێودا بە دەنگی دوو کەسی پێگەیشتوو و سەنگین دەربارەی ڕووداوی ڕۆژەکە قسەیان دەکرد، هەروەها لەسەر ڕاپۆرتی داهاتی ساڵانەی وەبەرهێنانەکانیان لە بازاڕی پارەگۆڕینەوە گفتوگۆیان دەکرد، ئینجا بێدەنگ دەبوون و بە ئاشکرا دەیانزانی کە ئیدی شتێکی ئەوتۆیان پێ نییە قسەی لەبارەوە بکەن، چونکە ئیدی شتەکە وەکو جاران نەمابوو.

هەندێ جار دەیبینی مێردەکەی بە دیقەتەوە تەماشای دەکات و چاوەڕێیە کە شتێ بڵێ، هەر شتێ. ئیلا هەستی دەکرد گەر لە بارەی پەیوەندییە سۆزدارییەکانییەوە پرسیاری لێ بکات، ئەوا بە خۆشحاڵییەوە ددانی پێدا دەنێت.

لە ڕابردوودا بۆ ئەوەی پاپۆڕی ژن و مێردایەتییەکەیان نەهەژێت، وەک ئەوەی هەر نەشزانێت ئەو لە دەرەوەی ماڵ چی دەکات، خۆی بە بێئاگا پیشان دەدا، لێ ئەمێستا وازی لەو ڕەفتاری نواندنە هێنابوو. ئەوە بوو پیشانی دا کە ئەو هەموو شتێ دەزانێت، بەڵام گوێی پێ نادات. هەر ئەم خۆکرکردنەی بوو کە شووەکەی ترساندبوو، هەرچەندە ئیلا دەیتوانی شتەکەی تێبگەیەنێت، بەڵام لە ناخەوە خۆیشی دەترساند.

خۆ ئەگەر مانگێ پێش ئێستا، دەیڤید هەنگاوێکی بچووکی بۆ ئاساییکردنەوەی نێوانیان هەڵێنایە، ئەوا هەستی بە پێزانین دەکرد و هەر هەوڵێک لە لایەن ئەوەوە گەشییەکی دەخستە دڵییەوە، بەڵام شتەکە وا نەکەوتەوە و پێی وا بوو کە ژیانێکی ڕاستەقینەی نییە. ئەی چۆن گەیشتە ئەم ئەنجامە؟ ژنێکی خۆبەختکەر بۆ سێ منداڵ چۆن ئاوها خەمۆکی و نائومێدیی خۆی ئاشکرا کرد؟ لە هەموو ئەوانە گرینگتر وەک ڕۆژێکیان بە جانێتی گوت گەر بەختەوەر نەبوایە، وەک چۆن کەسانی نابەختەوەر ڕەفتار دەکەن، ئەمیش ئاوها ڕەفتاری نەدەکرد؟ نە گریانی ناو گەرماو، نە هەنسکی بەردەم

دەستــشۆری نانــدین، نە بەدەم خەمەوە بەپــێ ڕۆیــشتنی دوور لە مــاڵ، نە بەدیواردادانی شتەکان.. نە هیچ شتێ.

بێدەنگییەکی سـەیر بـاڵی بەسـەر ئێلادا کێشا. وا دیـاربوو کە دۆخـی لە هەمـوو کاتێـک جێگیرتـرە، کەچـی زۆر بە خێرایـی بەرەو ژیـانێکی دوور لەو ژیانەی ناسـیبووی دەخـزا. بەیانی تەماشـای ئاوێنەکەی کـرد تـا بزانێت ئاخۆ هیچ گۆڕانێکی ئاشـکرا لە دەموچاویدا ڕووی داوە، ئایا وای لێهاتووە تەمەنـی بچووکتر و جـوانتر دیـار بێت، یان بـۆی هەیە تـژی بێت لە ژیـان؟ بەڵام هـیچ جیاوازییەکی نەدی. هیچ شتێ نەگۆڕابوو، لەگەڵ ئەوەشدا ئیدی شـتەکان وەک خۆیان نەبوون.

# کیرا

## قونیا، ٥ی ئایار ١٢٤٥

بەڕوکاری ئەودیوی پەنجەرەی ژوورەکەماندا، گوڵەکان لەسەر چڵی شۆڕەوەبووی ژێر قورسایی بەفر خەریکبوون دەپشکووتن. شەمسی تەوریزی هێشتا لەگەڵماندا دەژیا. لەم ماوەیەدا دەمبینی مێردەکەم تا دێت دەبێتە پیاوێکی تر، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لە من و لە خێزانەکەی دوور دەکەوتەوە. سەرەتا وای بۆ دەچووم کە یەکێکیان لەوی تر بێزار دەبێت، بەڵام وا دەرنەچوو، بەڵکو ئەوان پتر پێکەوە دەلکان. کە بەیەکەوە دەبوون، یان بە شێوەیەکی سەیر بێدەنگ دەبوون، یان بە شێوەیەکی بەردەوام بە کپی قسەیان دەکرد، هەندێ جار گفتوگۆکەیان پێکەنینی تێدەکەوت. دەمپرسی ئەرێ جۆگەلەی وشەکانیان هەر چکی نەکرد. ڕۆمی دوای هەر گفتوگۆیەک کە لەگەڵ شەمسدا دەیکرد، وەک ئەوەی بووبێت بە پیاوێکی تر و بە ناو ژوورەکەدا دەهات و دەچوو، وەک ئەوەی بە سرکەرێک سرکرابێت و لە توانای مندا نەبێت تامی بکەم و بیبینم، دەکەوتە خەیاڵەوە و کەیل دەبوو.

ئەو بەندیوارییەی کە کردبوونی بەیەک هێلانەیەکی دوو کەسی بوو و جێگەی کەسی سێیەمی تێدا نەدەبووەوە. وایان لێ هاتبوو پێکەوە زەردەخەنە دەیگرتن و پێدەکەنین، یان بە هەمان شێوە ڕوویان گرژ دەبوو، لە هەمان کاتدا لە نێوان ئەو قسانەی کە دەیانکرد بە دووروودرێژی و مەبەستەوە تەماشای یەکتریان دەکرد، تەنانەت حەواسی هەریەکێکیان بە حەواس و سەرودڵی ئەوی تریانەوە بەندبوو. دەتبینی هەندێ ڕۆژ هێمنن و هیچ شتێ ناخۆن و هیچ شتێ ناڵێن، کەچی ڕۆژانی تر دەتبینین بە جۆرێ بە خۆشحاڵییەوە بە دەوری یەکتردا دەخولێنەوە، گەر کەسێ دیبانای وای بۆ

دەچوو کە ئەم دوو پیاوە ئاوەزیان لەدەست داوە. لە هەردوو باردا، ئیدی من مێردەکەی خۆمم نەدەناسییەوە، ئەو پیاوەی کە هەشت ساڵ زیاتر بەسەر ژن و مێردایەتیماندا تێپەڕی بوو، ئەو پیاوەی کە منداڵەکانی وەک ئەوەی منداڵی خۆم بن بەخێوم کردن و خۆمیش منداڵێکم لێی بوو، ئەمێستا بووە بە پیاوێکی نامۆ. تەنها ئەو کاتانە هەستم بە نزیکیی ئەو دەکرد کە خەوی لێدەکەوت. لە ماوەی چەند هەفتەی ڕابردوودا چەندین شەو بە دیارییەوە نەنوستم و گوێم لە ڕیتمی هەناسەی دەگرت و هەستم دەکرد هەناسە ناسکەکانی بەر پێستم دەکەوتن و لێدانی دڵی وەک چپەیەک بەر گوێچکەکانم دەکەوت، تا بە یادی خۆمی بێنمەوە کە ئەو هێشتا ئەو پیاوەیە کە شووم پێی کرد.

بەوەوە ناوەستم و بە خۆم دەڵێم نەخێر، ئەمە قۆناغێکی کاتییە و بەسەردەچێت، بێگومان شەمس ڕۆژێ هەر دەڕوات، چونکە ئەو دەروێشێکی گەڕیدەیە، ئەوسا ڕۆمی بۆ لام دەگەڕێتەوە، چونکە سەر بەم شارە و مریدەکانێتی، بەڵام جگە لە چاوەڕوانییەکی خۆڕاگرانە، هیچ شتێکی دیکەم لەدەست نایات، خۆڕاگریش بە ئاسانی دەست ناکەوێت و ڕۆژبەڕۆژ شتەکە قورستر دەبێت. کە هەست بە نائومێدی دەکەم، هەوڵدەدەم یادی ڕۆژانی ڕابردوو بکەمەوە، بە تایبەتی ئەو کاتانەی سەرباری هەموو ئاستەنگەکان ڕۆمی پشتیوانم بوو.

"کیرا کریستیانییە، خۆ ئەگەر ببێتە موسڵمانیش، قەت نابێتە یەکێ لە ئێمە". خەڵکی کە بیستیان وا خەریکە شووی پێدەکەم، دەستیان بە زۆربڵێیی کرد، "لەبەر ئەوەی زانایەکی ئیسلامیی مەزنە گەرەکە ئافرەتێک نەخوازێت کە سەر بە ئایینەکەی خۆی نییە".

بەڵام ڕۆمی نە ئەوسا و نە ئێستاش هیچ گوێی پێ نەدان، بۆیە هەتا ماوم هەر بۆی وەفادار دەبم.

ئەنادۆڵ تێکەڵەیەکە لە ئایین و گەلان و خواردن. ئاخر گەر ئێمە هەمان خواردن بخۆین و هەمان سترانی خەمگین بچڕین و بڕوامان بە هەمان پڕوپووچ هەبێت و هەمان خەون ببینین، ئیدی بۆ نەتوانین پێکەوە بژین؟ من دەمزانی هەندێ منداڵی کریستیانی ناوی ئیسلامییان لێ نرابوو، منداڵانێکی موسڵمان دایکانی کریستیانی شیری خۆیانیان دەدانێ. دنیاکەمان دنیایەکی

نیانە و هەموو شتێکی لێ هەڵدەقوڵێت و تێکەڵی یەکتر دەبن. خۆ ئەگەر لە نێوان کریستیانی و موسڵماندا سنوورگەلێ هەبن، ئەوا ئەو سنوورانە لەوە نەرمونیانترن وەک پیاوانی ئایینی هەردوو لا بیری لێدەکەنەوە.

کە من هاوسەری زانایەکی ناسراو بووم، خەڵکەکە پێیان وا بوو کە من لە ئاستێکدام قەدر و ڕێزی زانایان دەزانم، بەڵام لە ڕاستیدا لەو ئاستەدا نەبووم. بێگومان زاناکان شتی زۆر دەزانن، بەڵام کاتێ شتەکە دێتە سەر وابەستەبوون بە بڕواوە، ئایا ئەو شت زۆرزانینە بنیادەم وابەستە ناکات؟

ئاخر ئەوان واز لە قسەی گەورە ناهێنن، بۆیە تێگەیشتن و هەرسکردنی ئەوەی ئەوان دەیڵێن هەستەمە. زانا موسڵمانەکان ڕەخنە لە ئایینی مەسیحی دەگرن، چونکە بڕوایان بە سێینەی پیرۆز هەیە. قەشەی مەسیحییەکانیش ڕەخنە لە موسڵمانەکان دەگرن، چونکە قورئان بە کتێبێکی تەواو دادەنێن و پێیان وایە هەردوو ئایینەکە دوو دنیای جیان، بەڵام بە بۆچوونی من، کە شتەکە دێتە سەر میتۆدە سەرەکییەکان، ئەوا کریستیانە ئاساییەکان و موسڵمانە ئاساییەکان لە شتگەلێکدا بەچاو پیاوە ئایینییەکانەوە زۆرتر هاوبەشن.

دەڵێن قورسترین شتێ بۆ ئەو موسڵمانەی کە بڕوا بە ئایینی مەسیحی بێنێت، قەبووڵکردنی سێینەی پیرۆزە، قورسترین شتێکیش بۆ ئەو مەسیحییەی کە دەبێتە موسڵمان وازهێنانە لە سێینەی پیرۆز. لە قورئاندا مەسیح دەڵێت: "من بەندەی ئەو خودایەم کە کتێبی بۆ ڕەوانەکردم و کردمی بە پێغەمبەر".

بەڵام من هیچ لام هەستەم نییە بڕوا بەو بیرۆکەیە بکەم کە مەسیح کوڕی خودا نییە، بەڵکو بەندەیەتی، بەڵام وەک بۆم دەرکەوت لەوە هەستەمتر وازهێنانە لە مریەم. ئەوەم بە کەس نەگوتووە، تەنانەت بە ڕۆمیش، بەڵام هەندێ جار ئەڵهای بینینی چاوە کاڵ و میهرەبانەکانی مریەم دەکەم، چونکە بەردەوام نیگاکانی کاریگەرییەکی هێورکەرەوەیان لەسەرم هەیە.

لەوساوە کە شەمسی تەورێزی پێی خستە بەردەرگای ماڵەکەمان، خەمۆکی و شڵەژانێک دایگرتووم، هەست دەکەم لە هەموو کاتێ زیاتر تامەزرۆی مریەمم، وەک تەزوویەک بە جەستەمدا دەگەڕێت و وەک جاران ئارەزوو دەکەم نوێژ بۆ مریەم بکەم، ئارەزوویەک خەریکە نەتوانم کپی

بکەمەوە. ئیدی وەک ئەوەی خایەنەتی لە ئایینە نوێیەکەم بکەم، هەستێکی گوناهباری دەست بە هەڵکۆڵینم دەکات.

کەسێک بەوە نازانێت، تەنانەت سەفییەی دراوسێمیش کە لە هەموو شتێکدا نهێنیپۆشم بوو نەیدەزانی، چونکە لێم تێناگات. زۆر ئاواتەخواز بووم کە لای مێردەکەم باسی ئەوە بکەم، بەڵام نەمدەزانی چۆن ئەو باسەی لەگەڵدا بکەمەوە، چونکە زۆر لێم دوورکەوتووەتەوە، دەترسم گەر ئەوەی پێ بڵێم، پتر لێم دوور بکەوێتەوە. ئاخر ڕۆمی بۆ من هەموو شتێکە، کەچی ئێستا بۆ من بووەتە نامۆیەک. ئیدی نازانم ئاخۆ دەتوانم لەژێر یەک میچدا لەگەڵ کەسێکدا بژیم و لەسەر هەمان جێخە و لەگەڵیدا بنووم و هەست بکەم کە ئەو بەڕاستی بوون و هەموو شتێکی منە.

# شەمسی تەوریزی

## قۆنیا، ١٢ی حوزیران ١٢٤٥

بێڕواداریکی دەمدەمی! گەر مرۆڤێک ناوی خودای لێ هێنا و هەموو مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو بوو، هەموو جەژنەیەک بەرخێک یان بزنێکی کردە قوربانی تا خودا لە گوناهەکانی خۆش بێت، گەر کەسێک بە درێژایی ژیانی هەوڵی دا لە مەککەی پیرۆز حەجی ماڵی خودا بکات، ئەگەر هەموو ڕۆژێ پێنج جار لەسەر بەرماڵ کڕنۆشی برد و شوێنێ بۆ خۆشەویستی لە دڵیدا نەبوو، ئیدی ئەم هەموو ماندووبوونە چ دادێکی دەدات؟ بڕوا گەر لە گەوهەردا خۆشەویستیی تێدا نەبوو و هەر قسەبوو، ئەوا دەبێتە شتێکی بێبەها و لە هەموو جۆرە ژیانێک بەتاڵ دەبێتەوە و دەبێتە، شتێکی ئاڵۆز و بۆش و ناتوانیت بەڕاستی هەستی پێبکەیت.

ئایا لەو باوەڕەدان کە خودا لە مەککەی پیرۆز یان لە مەدینەی منەوەرە نیشتەجێیە؟ یان لە هەر مزگەوتێک لە مزگەوتەکانی دنیایە؟ ئاخر چۆن دەتوانن ئەوە وێنا بکەن کە خودا لە ڤالاییەکی سنووورداردا قەتیس بووە، لە کاتێکدا ئەو خۆی دەفەرموێت: (ما وسعنى ارضي ولاسمائي، ووسعني قلب عبدى المؤمن - "نە لە زەوییەکەم جێم بووەوە نە لە ئاسمانەکەم، بەڵام لە دڵی بەندەیەکی بڕوادارمدا جێم بووەوە").

من بەزەییم بەو کاڵفامەدا دێتەوە کە پێی وایە سنووری ئاوەزی مرۆڤ هەر سنووری خودای بەرز و بەتوانایە. بەزەییم بەو نەزانەدا دێتەوە کە پێی وایە دەتوانێت سازش لەگەڵ خودادا بکات و ژمێرە و قەرزەکانی خۆی لەگەڵدا یەکلا بکاتەوە. ئایا ئەمانە پێیان وایە کە خودا بەقاڵێکە و چاکەکانمان و خراپەکانمان لە دوو تەرازووی جیادا پێوانە دەکات؟ ئایا پێیان وایە کە ئەو

گوناهەکانمان لە دەفتەری ژمێرەکانیدا بە وردی تۆماردەکات، تا ڕۆژی خۆی ئەوەی لەسەرمانە بیدەینەوە؟ ئایا دەربارەی یەکتایی ئاوها بیردەکەنەوە؟

خودای من نە بەقاڵە و نە ژمێریار، بەڵکو خودایەکی مەزنە. خودایەکی زیندووە! من خودای مردووم بۆ چییە؟ ئەو زیندووە. ناوی زیندوو و بەدەوامە. ئاخر بۆچی لە ترسێکی هەتاهەتایی و پەژارەیەکی بێکۆتاییدا گێنگڵ بدەم و بەردەوام بە حەرامکراوەکان و بڤەکان کۆتم بکات؟ ئەوێک کە ناوی خۆشویستراو و پەرستراو بێت، ئیدی بەزەیی ئەو سنووری بۆ نییە. من بە شێوەیەکی سروشتی و ئاسان بە هەموو وتن و ڕەفتارمەوە، وەک چۆن هەوا هەڵدەمژم، سوپاسی دەکەم.

ناوی سوپاسکراوە، ئیدی چۆن بتوانم لە پاشملەی کەسانی تر قسە بکەم و ناویان بزڕێنم، لە کاتێکدا لە قووڵایی دڵمەوە دەزانم خودا دەبیستێت و دەبینێت؟ ناوی مزگێنیدەرە، جوانە و لە سەرووی هەموو خەون و ئومێدێکەوەیە. جوان، بەدەوام، دەهەندە، دلۆڤان. لە کاتی برسێتی و لافاوەکاندا، لە کاتی بێبارانی و تینوێتیدا، تا چۆکەکانم شل دەبن، تا جەستەم بە لادا دێت، تا دڵم لە لێدان دەکەوێت، گۆرانی دەچڕم و سەمای بۆ دەکەم. نەفسی خۆم دەشکێنم و وردوخاشی دەکەم تا لە گەردیلەیەک زیاتر هیچی تر نەبم، تا لە بۆشاییەکی تەواودا دەبم بە ڕەوتەنییەک، لە ئەندازیارییە مەزن و نایابەکەیدا دەبم بە بێنموودێکی بێنموود. بە پێزانین و خۆشحاڵییەوە دەست لە پێداهەڵگوتنی مەزنی و بەخشندەیی ئەو هەڵناگرم. بۆ هەموو ئەو شتانەی پێی بەخشیوم و لێی قەدەغەکردووم، سوپاسی دەکەم، چونکە هەر خۆی دەزانێت چی لە قازانجی مندایە.

کاتێ لە لیستەکەمدا ڕێسایەکی ترم بیرکەوتەوە، شەپۆلێک لە بەختەوەری و ئومێدی نوێ پڕی کردم. مرۆڤ لەنێو ئافەریدەکانی خودادا شوێنێکی تاقانەی بەرکەوتووە، چونکە خودای بەرز و باڵا دەفەرموێت (ونفخت فیە من روحی "لە ڕۆحی خۆم گیانم وەبەردا کرد"). هەموومان بەبێ جیاوازی دروست کراوین تا لەسەر زەوی ببینە جێگرەوەی خودا. لە خۆت بپرسە چەند جار وەک جێگرەوەی ئەو ڕەفتارت کردووە، لە کاتێکدا گەر ئەوەت کردبێت؟

ئەوە بێنەوە یادت، ئەرکی هەریەکێکمانە کە ڕۆحی خودایی لە ناخی خۆیدا بدۆزێتەوە، تا بەپێی ئەوە بژی.

ئایینپەروەرە دەمارگیرەکان لەجیاتی ئەوەی خۆیان لە عەشقی خودادا بتوێننەوە و بەرەنگاری نەفسی خۆیان ببنەوە، دژایەتیی کەسانی تر دەکەن و شەپۆل لەدوای شەپۆل ترس دەخەنەوە. بە چاوێکی توقیوەوە دەڕوانن هەموو گەردوون، بۆیە ئەوەی ئەوان باسی دەکەن خەڵکی لێیان دەترسێت. کاتێ زەمینلەرزەیەک، یان بێبارانییەک، یان کارەساتێک ڕوودەدات، ئەمە بە نیشانەی تووڕەیی خودا دادەنێن، وەک ئەوەیە خودا نەیفەرموو بێت (ان رحمتي سبقت غضبي - بەزەییم پێش تووڕەییم کەوتووە). کاتێ بەوای هەر شتێکەوە بێت تووڕە دەبن، پێیان وایە کە خودای سوپاسکراو و باڵا لەجیاتی ئەوان دێتە نێوانەوە و تۆڵەیان بۆ دەکاتەوە. ئیدی بەردەوام ژیانیان پڕ دەبێت لە دۆخی ناخۆشی و دوژمنکاری و ڕوو بکەنە هەر شوێنێک، تووڕەییەکی ئەستوور وەک هەورێکی ڕەش دوایان دەکەوێت و ڕابردوو و بانەڕۆژیان تاریک دەکات.

لە بڕوابوونندا شتێ هەیە وا لە بنیادەم دەکات کە نەتوانێت دارستان ببینێت، چونکە تەنها درەخت دەبینێت. ئایین بە هەموو بوونێکییەوە گەلێ لە بەشە بچووکە پێکهێنەرەکانی مەزنتر و قووڵترە، گەرەکە هەر ڕێسایەک لە چوارچێوەی تێکڕای ڕێساکاندا بخوێنرێتەوە . ئیدی ڕێسا تەواوەکانیش لە گەهەردا ون دەبن.

دەمارگیرەکان لەجیاتی ئەوەی لە گەهەری قورئان بگەڕێن و وەک گشتێک وەریبگرن، ئایەتێک یان دوان وەک خۆی وەردەگرن و گرینگی بەو فەرمانە خوداییانە دەدەن کە لەگەڵ شێوازی ئەو بیرکردنەوە و ئاوەزەیان هەماهەنگە کە ترس هێلانەی تێدا کردووە. واز لەو وەبیرهێنانەوەیەش ناهێنن کە لە ڕۆژی پەسڵاندا هەموو مرۆڤ ناچار دەکرێن تا بەسەر ئەو پردەدا بپەڕنەوە کە لە موو باریکترە و لە شمشێر تیژترە. ئەوسا ئەو گوناهبارانەی کە ناتوانن لە پردەکە بپەڕنەوە، بەردەبنەوە و دەکەونە قووڵایی دۆزەخەوە و هەتاهەتایە ئازار دەکێشن، بەڵام ئەوانەی بە خوداپەرستی ژیانیان بەڕێ کردووە، دەتوانن تا ئەوسەری پردەکە بڕۆن، ئیدی بە میوەی بەلەزەت و

ئاوی سازگار و حۆری خەڵات دەکرێن. بە کورتی دەربارەی ڕۆژی پەسڵان ئەمە بیرکردنەوەیانە. لە ژیاندا هەموو خەیاڵیان لەسەر ترس و پاداشت و ئاگر و میوە و فریشتەکان و شەیتانەکان چڕبووەتەوە. بێوچان بۆ بانەڕۆژێک هەوڵدەدەن تا بیسەلمێنن کە ئێستا ئەوان کێن، ئاوهاش خودایان بیرچووەتەوە! تۆ بڵێیت لە چل ڕێساکە ئەم ڕێسایە نەزانن؟ کە دەڵێت: وا **ئێستا دۆزەخ لێرەیە، هەروەها بەهەشتیش هەر لێرەیە. واز لە بیرکردنەوەی ترسی دۆزەخ و خەون بینین بە بەهەشتەوە بێنن، چونکە لەم ساتەدا هەردووکیان بەتەواوی هەن. هەر کاتێ خۆشەویستی لە دڵماندا بێت، بەرەو ئاسمان هەڵدەکشێین، هەر کاتێکیش ڕق یان ئێرەیی لە دڵماندا بێت، یان دژایەتیی یەکێک بکەین، ئەوا یەکسەر دەکەوینە نێو ئاگری دۆزەخەوە. ئەمە ڕێسای بیستوپێنجەمینە و ئاوها دەڵێت.**

ئایا دۆزەخێک لە چێشتنی ئەو ئازارە خراپتر هەیە کە مرۆڤ لە قووڵایی ویژدانییەوە هەست بکات گوناهێکی کردووە، گوناهێکی گەورە؟ لەو کەسە بپرسە، ئەو پێت دەڵێت کە دۆزەخ چییە. ئایا بەهەشتێک لەو خێروفەڕە باشتر هەیە کە لەو چرکەساتە دەگمەنانەی کڵۆمەکانی گەردوون دەکرێنەوە و ژیان دەڕژێتە سەر مرۆڤ و هەست دەکات هەموو نهێنییەکانی نەمریی پێیە و بەتەواوی لەگەڵ خودادا یەکی گرتووە؟ لەو کەسە بپرسە ئەو پێت دەڵێت بەهەشت چییە.

ئەم هەموو نیگەرانییە بۆ ئەو بانەڕۆژە خەیاڵکردەیەی کە دوای ژیان ڕوودەدات لەپای چی؟ بە تایبەتی کاتێ ئەو چرکەساتە دەبێتە تاقە زەمەنێک کە بەڕاستی و بە شێوەیەکی تەواو لە ژیانماندا هەست بە بوون و نەبوونی خودا دەکەین؟ سۆفییەکان لە ترسی سزای ئاگری دۆزەخ و ئارەزووی خەڵات و پاداشتی بەهەشت خودایان خۆش ناوێ، بەڵکو تەنها لە خۆشەویستییەکی پاکەوە خودایان خۆش دەوێ، خۆشەویستییەکی بێگەرد و ئاسان و نەلەوتاو و بێبەرژەوەندی.

عەشق هۆیە، عەشق ئەنجامە.

کە عەشقی خودا دەبێت، کاتێ هەموو بوونەوەرەکانیت لە پێناو ئەودا خۆشویست، ئیدی لە سایەی ئەوەوە هەموو دابەشبوونەکان دەتوێنەوە و ون

دەبن. ئیدی لێرەوە شتێک نامێنێت پێی بوترێ (مـن) و هەمـوو ئەوەی پێی دەگەیت بریتییە لە سەرەتایەکی گەورە و هەموو بوونت دەگرێتەوە.

پـێش چەنـد ڕۆژێ مـن و ڕۆمـی بیرمـان لەم شـتانە دەکـردەوە، لەپـڕ چاوەکانی نوقاند و ئەم دێڕانەی بە دەمدا هات:

**"نە کریستیانم و نە جوولەکە و نە موسڵمان، نە بووداییم و نە هندۆکی، نە سۆفیم و نە زەن. نە سـەر بە هـیچ ئـایینێکم و نە هـیچ سـستەمێکی ڕۆشـنبیری. نە ڕۆژهەڵاتـیم و نە ڕۆژئـاوایی. شـوێنی مـن ناشـوێنە، شوێنەوارێکی ناشوێنەوارە".**

ڕۆمی پێی وایە ناکرێ ببێتە شاعیر، بەڵام لە ناوەوەیدا شاعیرێک هەیە، شاعیرێکی نایاب و وا ئێستا دەردەکەوێت!

بەڵـی ڕۆمـی ڕاسـت دەکـات، ئەو نە سـەر بە ڕۆژهەڵاتە و نە سـەر بە ڕۆژاوایە، ئەو سەر بە مەملەکەتی عەشقە، ئەو سەر بە مەعشوقە.

# ئێلا

## نۆرتامپتۆن، ١٢ی حوزێران ٢٠٠٨

بە کۆتاییهاتنی خوێندنەوەی ڕۆمانی (کفری شیرین)، ئێلا دەستی بە دوا پێداچوونەوەی ڕاپۆرتەکەی کرد. هەرچەندە پەرۆش بوو لەگەڵ عەزیزدا باسی وردەکاریی ڕۆمانەکە بکات، لێ هەستی پیشەیی کارکردن ڕێگەی ئەوەی پێ نەدا، چونکە پێش تەواوبوونی کارەکە ئەوە نەشیاو بوو، تەنانەت بە عەزیزی ڕانەگەیاند کە دوای ئەوەی لە خوێندنەوەی ڕۆمانەکە بووەوە، دانەیەکی لە چامەکانی ڕۆمی کڕیوە و هەموو شەوێک بەر لەوەی بنوێت هەندێکی لە چامەکان خوێندووەتەوە. توانیی بە شارەزاییەوە مەودای نێو کارکردنی لەسەر ڕۆمانەکە و ئەو نامانەی بۆ نووسەرەکە دەینووسی بگونجێنێت، لێ لە دوانزەی حوزێراندا شتێ ڕووی دا، مەودای نێوان هەردووکیانی شڵەقاند.

ئێلا تا ئەمڕۆ وێنەی عەزیزی نەدیبوو، چونکە لە سایدەکەیدا لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت وێنەی نەبوو و نەیشی دەتوانی لە خەیاڵی خۆیدا وێنەکەی وێنابکات. سەرەتا چێژی لەو ئاڵۆزییە وەردەگرت کە نامەی بۆ پیاوێکی بێ دەموچاو دەنووسی، لێ وردەوردە ئەو ئارەزووەی زیادی دەکرد کە وێنەی دەموچاوێک لەگەڵ نامەکاندا ببینێت، بەڵام ئەو داوای وێنەی ئێلای نەدەکرد، بۆیە ئەمەی زۆر بە لاوە سەیر بوو.

ئێلا وێنەیەکی خۆی بۆ نارد، لە وێنەکەدا لەگەڵ سەگە سپیرێتیدا لە بەلەکۆنەکە وەستابوو و جلێکی شینی کەمێ تەنگی لە بەر بوو و شوێنە

هەستیارەکانی جەستەی دەرخستبوو. لە وێنەکەدا زەردەخەنەیەکی بەسەر لێوەوە بوو، زەردەخەنەیەک تێکەڵ لە دوودڵی و خۆشحاڵی. وەک ئەوەی خۆی بە سەگەکەوە گرتبێت، بە پەنجەکانی توند قەرەوێتەی سەگەکەی گرتبوو. ئاسمان تێکەڵەیەک لە ڕەنگی زیوی و ئەرخەوانی لەسەر خۆی و سەگەکەی دروست کردبوو. ئەم وێنەیە لە هەموو وێنەکانی تری جوانتر بوو، بەڵام شتێکی ڕۆحیی تێدا بوو کە لە ڕۆژی پەسڵانەوە نزیک بوو، یان خۆی ئاواتێکی وای دەخواست. ئێلا بۆی نارد و دەستی بە چاوەڕوانی کرد. مەبەستی ئەوە بوو داوای لە عەزیز دەکرد تا وێنەی خۆی بۆ بنێرێت.

ئەوەبوو وێنەکەی خۆی نارد.

کاتێ ئێلا ئەو وێنەیەی بینی کە عەزیز ناردبووی، بە خۆی گوت بێگومان لە یەکێک لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی دوور گیراوە، وڵاتێک کە ئەو قەت نەیبینیوە. عەزیز لە وێنەکەدا بە ژمارەیەک منداڵی قژ ڕەشی وڵاتەکە دەورە درابوو. کراسێکی ڕەش و پانتۆڵێکی ڕەشی لە بەر بوو، بێ جورم بوو، لووتی تیژ بوو، پرچە ڕەش و وریـنجەدارەکەی تا سەر شانەکانی هاتبووە خوارێ. چاوەکانی زومورردی بوون و هێزیان لێ هەڵدەقوڵا، هەستی کرد شتێکی تریشی وەک جۆرە میهرەبانییەکیان تێدایە. حەڵقەیەکی بچووکی لە یەکێ لە گوێیەکانی کردبوو، لەگەڵ ملوانکەیەکدا کە شێوەکەی باش دیار نەبوو. لە ڤالایی وێنەکەدا دەریاچەیەکی زیوین درێژ بووبووەوە و بە گژوگیای درێژ دەورە درابوو. لە یەکێ لە سووچەکانەوە سێبەری شتێک یان کەسێک لە دەرەوەی چوارچێوەی وێنەکە دەبینرا.

ئێلا دەستی بە تەماشاکردنی پیاوەکەی ناو وێنەکە کرد و لە هەموو وردەکارییەکانی وردبووەوە. هەستی کرد کە دەیناسێت و لە شوێنێک دیویەتی. بە ڕادەیەکی سەیر دەیتوانی سوێند بخوات کە پێشتر بینیویەتی.

لەپڕ زانیی.

که لێکچوونێکی زۆر لە نێوان شەمسی تەوریزی و عەزیز. ز. زاهارادا هەیە. تەواو بەو شێوەیە بوو کە وەسفی شەمسی تەوریزیی کردبوو پێش ئەوەی بۆ دیداری ڕۆمی ڕووبکاتە قۆنیا. ئێلا لە خۆی پرسی ئاخۆ عەزیز کە باسی ئەو کەسێتییەی کردووە، پشتی بە سیمای ئەو بەستووە. ڕەنگە وەک نووسەرێک ویستبێتی وەک خودا چۆن لەسەر شێوەی خۆی بنیادەمی دروست کردووە، ئەمیش کەسێتییە تەوەرەییەکەی لەسەر شێوەی خۆی دروست بکات.

لەو دەمەیدا کە بیری لەوە دەکردەوە، ئەگەرێکی تریشی بە خەیاڵدا هات، ئەویش ئەوە بوو ئایا ڕێی تێدەچێت کە شێوەی ڕاستەقینەی شەمسی تەوریزی وەک لە کتێبەکەدا وەسفی کردووە، تەواو ئاوها بووبێت، ئەمەش وا دەگەیەنێت، ڕەنگە بە ڕێکەوت لێکچوونێک لەنێوان دوو پیاودا پەیدا بووبێت کە نزیکەی هەشتسەد ساڵ نێوانیانە؟ ئایا دەکرێ ئەم لێکچوونە بە مەبەستەوە نەبووبێت، بەڵکو ڕەنگە لە سەرووی تێگەیشتنی نووسەرەکەوە بووبێت؟ ئێلا چەند بیری لەم کێشەیە دەکردەوە، گومانی ئەگەری پێکەوەبەستنی نێوان شەمسی تەوریزی و عەزیز. ز. زاهارای لە لا زیاتردەبوو و لە سەرووی شێوازی سادەی فێڵی ئەدەبییەوە بوو.

ئەم دۆزینەوەیە دوو کاریگەریی چاوەڕواننەکراویان لەسەر ئێلا هەبوو، یەکەمیان ئەوە بوو هەستی کرد پێویستە بگەڕێتەوە سەر ڕۆمانی (کفری شیرین) و بە چاوێکی جیاوازەوە دووبارە بیخوێنێتەوە و ئەم جارەیان نەک لەپای تێگەیشتنی چیرۆکەکە، بەڵکو بۆ ئەوەی نووسەرەکە بدۆزێتەوە کە لە پشت شاکەسەکەوە خۆی حەشارداوە، مەبەستیشی ئەوەبوو عەزیز لە شەمسی تەوریزیدا ببینێت. دووەمیان ئەو تا دەهات دڵبەندی عەزیز دەبوو، بۆیە دەیەویست بزانێت کە ئەو کێیە؟ بەسەرهاتی چییە؟ لە نامەیەکی ئەلیکترۆنیی پێشوودا، پێی گوتبوو کە ئەو ئۆسکۆتلەندییە، لێ ناوێکی

ڕۆژهەڵاتییانەی هەیە- عەزیز؟ ئایا ئەمە ناوی ڕاستەقینەی خۆیەتی؟ یان ناوێکی سۆفیانەیە؟ ئەی سۆفیگەرایی بۆ ئەو چی دەگەیەنێت؟

شتێکی تریش مژوولی کردبوو: لە سەرەتادا هەر ئەوەتا ئارەزووی دەجووڵا، کەچی ماوەیەکی زۆری برد و هەستێکی وا داینەگرتبوو، بۆیە دوای چەند چرکەیەک، بەهێز و سووربوون و سەرکەشانەوە توانیی ئەو هەستە بناسێتەوە کە دایگرتبوو. ئیدی زانیی دڵی بەو پیاوەوەیە کە لەناو وێنەکەدایە.

هەستێکی ئەوەندە چاوەڕواننەکراو و شەرماوەر بوو، بە ڕادەیەک وەک ئەوەی پیاوی ناو وێنەکە بەرەو خۆی ڕای بکێشێت، خێرا لاپتۆپەکەی کوژاندەوە.

# پێپرسی جەنگاوەر

## قۆنیا، ١٠ی تەمموز ١٢٤٥

"بڕوا بە کەس مەکە، ڕۆڵە پێپرس". مامم گوتی، "چونکە لە دنیادا خراپەکاری پەرەی سەندووە. وتیشی تاکە ڕۆژگاری باش سەردەمی زێڕینی محەمەدی پەیامبەر (درووودی خوای لێ بێت) بوو. دوای کۆچی دوایی ئەو، هەموو شتێ لێژبووەوە و ئەو شوێنەی لە دوو کەس زیاتری لێ بوو، بوو بە مەیدانی جەنگ، بەڵام ئایا لە سەردەمی پێغەمبەریشدا جەنگ هەڵنەگیرساوە؟ ئاخر جەنگەکان کرۆکی ژیانن.

شێر شوور هەڵدەلووشێت، باشووکە کەلاک لرف دەکات و تەنها ئێسکە ڕووتەکەی دەهێڵێتەوە. سروشت بێبەزەییە، ئیدی لەسەر زەوی بێت یان لەناو دەریا یان لە هەوا، لە تاقە ڕێگەیەک زیاتر لە بەردەم هەر بوونەوەرێکدا نییە تا بتوانێت لە ژیاندا بمێنێتەوە: ئەویش ئەوەیە دەبێت لە دڕندەترین دوژمنت زیرەکتر و بەهێزتر بیت، جا بۆ ئەوەی لە ژیاندا بمێنیتەوە دەبێت بجەنگیت. بە سادەیی هەموو شتەکە ئەمەیە.

گەرەکە بجەنگین، تەنانەت ساویلکەترین کەس پێی وایە لەم ڕۆژ و سەردەمەماندا جگە لەوە ڕێگەیەکی تر نییە. ئەوە پێنج ساڵە شتەکان ئاراستەیەکی خراپیان گرتووە. کاتێ جەنگیزخان بۆ گفتوگۆی ئاشتەوایی سەد نێردەی خۆی نارد، ئەوە بوو هەموویان کوژران، ئیدی جەنگیزخان بوو بە تۆپەڵێ لە ئاگری تووڕەیی و جاڕی شەڕی بەسەر ئاشتیدا دا. کەسێک نەیزانی ئەم نێردانە چۆن کوژران و لەبەر چی. هەندێ کەس گومانی ئەوە دەکەن کە جەنگیزخان خۆی فەرمانی کوشتنی ئەو نێردانەی دەرکردووە کە ناردوونی، تا بیانووی هەڵگیرساندنی ئەم جەنگە نەفرینەی بکەوێتە دەست. ڕەنگە ئەمە

ڕاست بێت، لەگەڵ ئەوەشدا کەس نازانێت، لێ ئەوەی من دەیزانم ئەوەیە دوای پێنج ساڵ مەغۆل پەلاماری تێکڕای هەرێمی خاوەرشاری دا و پێی خراپەکارییان لە هەر شوێنێک دابنایە کاولیان دەکرد و مەرگیان تێدا دەچاند. پێش دوو ساڵ مەغۆل هێزە سەلجووقییەکانیان لە کۆسیداغ بەزاند و سوڵتانیان خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوەو

ناچاریان کرد باجیان پێ بدات. تاقە هۆیەک وای لە مەغۆلەکان کرد کە لەناومان نەبەن ئەوە بوو دەیانەویست بە زیندوویی بمێنینەوە تا ملکەچیان بین.

ڕەنگە هەر لە ئەزەلەوە جەنگ هەبووبێت، بە لای کەمەوە لەوساوە کە قابیل هابیلی برای کوشت، لێ مێژوو شتێکی لە وێنەی سوپای مەغۆلی بە خۆیەوە نەدیوە. شارەزاییان لە بەکارهێنانی چەندین چەک هەبوو، کە هەریەکەیان بۆ مەبەستێکی تایبەتی دروست کرابوو. هەموو سەربازانی مەغۆل چەکدار بوون و ئەم چەکانەیان پێ بوو: داردەست، پاچ، شمشێر، قەمە کە جۆرە تیرێکیان پێوە بوو زرێی دەسمی و دەیتوانی دێیەک بە تەواوی بسووتێنێت و قوربانییەکانی ژەهراوی بکات، یان ڕەقترین ئێسکی جەستەی مرۆڤ کون بکات. جۆرە تیرێکیان هەبوو وزەی دەهات و لە تیپێکەوە بۆ تیپێکی تر وەک ئاماژە بەکاریان دەهێنا. مەغۆلە لەخودا نەترسەکان بەم شارەزاییە جەنگییە پێشکەوتووانەوە بە هەر شار و شارۆچکە و گوندێکدا تێپەڕیبان، پەلاماریان دەدا و خەڵکەکەیان لەنێو دەبرد، تەنانەت شارێکی دێرینی وەک بوخارایان کردە کۆمەڵێ داروپەردوو. ئاخر خۆ هەر مەغۆلەکان کێشە نین، بەڵکو قودسیش کێشەیە و گەرەکە لە خاچپەرستەکان وەری بگرینەوە. ئەمە سەرباری فشاری بێزنتییەکان و ململانێی نێوان شیعە و سوننە. ئاخر کاتێ لە هەموو لایەکەوە بە دوژمنی دڕندە دەورە بدرێین، ئیدی چۆن لە مەترسییان دەخەڵەسێین؟

لەبەر ئەوەی ڕقم لە کەسانی وەک ڕۆمییە، ئیدی لام گرینگ نییە کە خەڵکی چەند ڕێزی دەگرن و بە مەزنی دەزانن. من پێم وایە ترسنۆکە و تەنها ماکی ترسنۆکی بڵاودەکاتەوە، ڕەنگە لە ڕابردوودا زانایەکی ئایینیی باش بووبێت، بەڵام ئێستا کەوتووەتە ژێر کاریگەری شەمسەوە، ئەو زۆرزانە

خراپەکارە. ئاخر دوژمنانی ئیسلام ئامۆژگارییەکانیی ڕۆمی چۆن پیشان دەدەن؟ ئەو داوای ئاشتی و خۆڕادەستکردن و ملکەچی دەکات.

**هۆ براکەم، بەرگەی ئازار بگرە.**
**خۆت لە ژەهری ئارەزووەکانت بپارێزە**
**ئاسمان بەرانبەر جوانیت دادەچەمێتەوە**
**گەر ئەوەت کرد... ئەوا درک دەبێتە گوڵ و**
**لەگەڵ هەردوو دنیادا دەدرەوشێیتەوە**

ڕۆمی بۆ ئەوە ئامۆژگاریمان دەکات تا دەستەپاچە بین، وا لە موسڵمانان دەکات لە مێگەلە مەڕێک زیاتر نەبن و بەستەزمان و شەرمن بن. دەڵێت هەر پێغەمبەرێک شوێنکەوتووانی خۆی هەیە و هەر کۆمەڵگەیەکیش ڕۆژگاری خۆی هەیە. سەرباری پەیڤی (عەشق)، وا دیارە پەیڤگەلێکی بەنرخی وەک ئەمانەیشی هەیە (ئارامگرتن) و (هاوسەنگی) و (خۆڕاگری). گەر شتەکە بە دەستی ئەو بێت، ئەوا هەموومان چوارمشقی لە ماڵەکانی خۆماندا لێی دادەنیشین و چاوەڕێ دەکەین تا بە دەستی دوژمنەکانمان سەردەبڕدرێین، یان تا کارەساتێکی دیکەمان بەسەر دێت. من دڵنیام دوای ئەوە دێت و تەماشایەکی خێرای کاولکارییەکە دەکات و ناوی لێدەنێت (فەڕ)، ئاخر هەندێ بیستوویانە گوتوویەتی: " کاتێ سوختەخانە و مزگەوت و شوێنی بانگدان بڕووخێنرین، ئەوسا دەروێشەکان دەتوانن کۆمەڵگەکەیان بنیاد بنێن. ئەرێ ئەم وتەیە مانای چییە؟

کە لە شتەکە ورد دەبیتەوە، دەبینیت تاقە هۆکارێک ڕۆمی لەم شارە جێگیر کرد، ئەوە بوو چەند دەیەیەک لەمەوبەر ژمارەیەک لە زانایان و دەوڵەمەندان داوەتنامەیەکی کراوەیان لە سوڵتانی سەلجووقییەوە پێگەیشت و یەکێ لەوانە باوکی ڕۆمی بوو، ئیدی خێزانەکەی ئەفغانستانی جێهێشت و پەنای هێنایە بەر ئەنادۆڵ. بەم جۆرە خانەوادەکەی ڕۆمی کە لە سایەی خێر و خۆشی و ئارامی و دەوڵەمەندی و ناز هەڵگیراویدا بوو، ئەفغانستانی جێهێشت کە ئەو دەمە ئاژاوەی تێکەوتبوو، ئیدی بەرەو باخەکانی قۆنیای ئارام و ئاشتیخواز هات. کە مێژوویەکی ئاوهات لە پشتەوە بێت، ئاسانە دەربارەی لێبوردەییش وتار بدەیت!

چەند ڕۆژێ لەمەوبەر چیرۆکێکم بیست کە دەڵێت گوایا شەمسی تەورێزی لە بازاڕ قسەی بۆ کۆمەڵە کەسێک کردووە و وتوویەتی کە عەلی خەلیفەی پێغەمبەر و یەکێ لە هاوەڵانی شەڕی لەگەڵ گاورێکی دڕندەدا کردووە، شەڕەکەی نێوانیان درێژە دەکێشێت. لە کۆتاییدا ڕەزای خوای لێ بێت بەسەر دوژمنەکەیدا سەردەکەوێت و گاورەکە دەکەوێتە ژێر پێی عەلی کوڕی ئەبی تالیبەوە و بریندار دەبێت. عەلی شمشێرەکەی بەرز کردبووە و خەریکبوو دایبووەشێنێت و بیکوژێت، گاورەکە تفێکی لە عەلی کرد. ئەوە بوو وازی لێی هێنا و دەستی لە کوشتنی هەڵگرت. کە هۆی ئەوەیان لێ پرسی، گوتی: من لە پێناو خودادا لەگەڵیدا دەجەنگام، کاتێ تفی لە دەموچاوم کرد، هەستم کرد کە من دەمەوێ تۆڵەی خۆمی لێ بکەمەوە، بۆیە وازم لێی هێنا.

بەم جۆرە عەلی پیاوەکەی ئازاد کرد. ئەمە زۆر کاری لە گاورەکە کرد، ئینجا بە ئارەزووی خۆی بوو بە موسڵمان و بوو بە یەکێک لە شوێنکەوتووانی عەلی.

دیارە شەمسی تەورێزی حەزی لەم جۆرە چیرۆکەیە، بەڵام لەم چیرۆکەدا دەیهەوێ چ پەیامێک بگەیەنێت؟ بهێڵێت تا کافرەکان تف لە چارەت بکەن! من دەڵێم چ کافر یان هەر کەسێکی تر بێت، مەگەر بەسەر لاشەکەمدا بڕوات، ئەگینا کەس ناتوانێت تف لە دەموچاوی پێپرسی جەنگاوەر بکات.

# ئێلا

## نۆرتامبتۆن، ١٣ی حوزێران ٢٠٠٨

بۆ عەزیزی خۆشەویست

پێم دەڵێیت کە من شێتم، لێ شتێک هەیە دەمەوێ لێتی بپرسم: ئایا تۆ شەمسیت؟

یان پێچەوانەکەی ڕاستە؟ ئایا ئەو شەمسە هەر خۆتیت؟

دڵسۆزت

ئێلا

* * *

ئێلای ئازیزم

شەمس بوو بە مایەی ئەوەی کە ڕۆمی لە پیاوێکی ئایینی ناوخۆییەوە بگۆڕێت بۆ شاعیر و سۆفییەکی ناوداری جیهانی.

سەید سامید پێی دەوتم: "تەنانەت گەر کەسێکی وەک شەمسیشمان دەست بکەوێت، ئەی کەسێکی وەک ڕۆمیمان لە کوێ دەست دەکەوێت؟".

لەگەڵ ڕێزمدا

عەزیز

* * *

عەزیزی قەدرگران

ئەو سەید سامیدە کێیە؟

جوانترین سڵاو

ئێلا

* * *

ئێلای خۆشەویست
ئەوە چیرۆکێکی درێژە. ئایا بەڕاستی دەتەوێ بزانیت؟
سڵاوی گەرمم
**عەزیز**
* * *

عەزیزی بەهادار
هێشتا کاتێکی زۆرم بەدەستەوەیە.
لەگەڵ خۆشەویستیم
**ئێلا**

# ڕۆمی

## قۆنیا، ٢ی ئابی ١٢٤٥

بەخەیاڵتدا دێت کە ژیانت پڕ شانازییە، لێپاولییە، بێ کەموکوورییە، تا کەسێک سەرهەڵدەدات و وات لێدەکات لەوە بەئاگا بێیتەوە کە لەو ماوەیە چیت ون کردبوو. مینا ئاوێنەیەک کە شتێکی نادیارت پیشان بدات، نەک هەر ئێستا، بەڵکو لە ڕۆحتدا بۆشاییەکت پیشان بدات _ ئەو بۆشاییەی چاوت لە بینینی دەپۆشی. ڕەنگە ئەو کەسە خۆشەویستێک بێت، یان هاوڕێیەک یان مامۆستایەکی ڕۆحی بێت، ڕەنگە منداڵێک بێت و پێویستە خۆشەویستی و سەرپەرشتیی پێ ببەخشرێ. گرینگ ئەوەیە ئەو ڕۆحە بدۆزیتەوە کە تەواوکەری ڕۆحی خۆتە. هەموو پێغەمبەران هەمان ئەم ئامۆژگارییەیان پێشکەش کردووە: ئەو کەسە بدۆزەرەوە کە دەبێتە ئاوێنەت! بەش بە حاڵی خۆم ئەو ئاوێنەیەی من شەمسی تەورێزییە، کاتێ هات وای لێکردم تا لە قووڵایی و پێچەکانی ڕۆحمدا بگەڕێم، چونکە من ڕاستییە بنچینەییەکەی خۆم نەدۆزیبووەوە: لەگەڵ ئەوەی من لەدەرەوە زانایەکی سەرکەوتوو بووم، لێ هەستم بە تەنهایی دەکرد و لە ناوەوەی خۆمدا هیچ شتێکم بەدی نەهێنابوو.

وا دیارە مینا چەندین ساڵت بە کۆکردنەوەی فەرهەنگێکی تایبەتی بەسەر بردبێت، هەر چەمکێکت پێ گرینگ بووبێت پێناسەت کردووە، وەک (ڕاستی)، یان (بەختەوەری)، یان (جوانی). ئیدی لە هەر وەرچەرخانێکی ژیانتدا بۆ ئەم فەرهەنگە گەڕاویتەتەوە، لێ کەم وا بووە هەستت بە پێویستبوونی گەڕان لە پێشەکییە لۆژیکییەکان کردبێت. ئیدی کەسێکی نەناس دێت و فەرهەنگە

بەنرخەکەت لێدەسەنێت و فڕێی دەداتە لاوە و پێت دەڵێت: "پێویستە هەموو ئەو پێناسانەی داتناون، دووبارە پێناسەیان بکەیتەوە. کاتی ئەوە هاتووە کە هەموو ئەوەی دەیانزانیت لە بیری خۆتیان ببەیتەوە".

لەبەر هۆیەک کە عەقڵت بڕی ناکات، بەڵام بۆ دڵت ڕوون و ئاشکرایە. قایل مەبە بەوەی کردووتە، یان بە مایەپووچی مەزانە، بەڵکو بە خۆشحاڵییەوە بەدەم ویستەکانییەوە بچۆ، شەمسیش هەر ئەمەی بە من کرد. هاوڕێیەتییەکەمان فێری زۆر شتی کردم، لێ لە هەمووی گرینگتر ئەوە بوو فێری کردم هەموو ئەوانە لەبیر خۆم ببەمەوە کە دەمزانی.

کاتێ کەسێکت بەم ڕادەیە خۆش بوێ، پێت وایە هەموو ئەوانەی دەوروبەریتش خۆشیان دەوێ و بەشداریی خۆشی و گەشییەکەت دەکەن، لێ کاتێ ئەوە نایەتەدی، تووشی سەرسوڕمان دەبیت و هەست دەکەیت کە ئەوان سووکایەتی و غەدریان لێکردوویت.

ئاخر چۆن داوا لە خێزانەکەم و دۆستەکانم بکەم ئەوەی من دەیبینم ئەوانیش ببینن؟ چۆن بتوانم وەسفی ئەو شتانە بکەم کە هەستەمە بتوانم وەسفیان بکەم؟ چونکە شەمس دەریای میهرەبانی و فەڕی منە، شەمس حەقیقەت و بڕوای منە و ناوم ناوە پاشای پاشاکانی ڕۆح. ئەو کانیاوی ژیانمە و درەختی کاژی لقوپۆپداری سەنگین و هەمیشە سەوزی منە، هاوڕێیەتیی ئەو لە خوێندنەوەی چوارەمی قورئان دەچێت – سەفەرێکە تەنها لە ناوەوە هەستی پێدکرێ و قەت لە دەرەوە هەستی پێ ناکرێ.

بۆ بەدبەختی زۆربەی خەڵکی خەریکی واتەوات و پڕوپاگەندەن، پێیان وایە کە شەمس تەنها دەروێشێکی ڕەفتار سەیرە و گوتە و ڕەفتارە سەیرەکانیشی کفرێکی تەواون، هەروەها بە کەسێکی دەمدەمیی دادەنێن و گوایا نابێت بڕوای پێ بکرێ، لێ بە لای منەوە نموونەیەکە لە خۆشەویستی و لە هەموو شوێنە جیاکانی گەردووندا لە جووڵەدایە، هەندێ جار بەرەو دواوە دەکشێتەوە تا پارچە پەرتبووەکان کۆبکاتەوە و بیانخاتەوە سەر یەک. بڕێ

جاری تر دەتەقێتەوە و پارچەپارچە دەبێت. دیدارێکی ئاوها تەنها یەک جار، هەر سیوهەشت ساڵ جارێک لە تەمەندا ڕوودەدات.

لەوساوە کە شەمس هاتووەتە نێو ژیانمانەوە، خەڵکی لێم دەپرسن ئەوەی لەودا دیوتە، ئەو لە چیدا لە خەڵکی تر جیایە، بەڵام وەڵامێک بۆ ئەم پرسیارەیان نادۆزمەوە. لە کۆتاییدا ئەوانەی ئەم پرسیارە دەکەن، ئەوە خۆیانن کە لێی تێناگەن، لێ ئەوانەی لێی تێگەیشتوون قەت ئەم پرسیارە ناکەن.

ئەو کێشەیەی کە خۆمی تێدا دەبینمەوە، چیرۆکەکەی لەیلا و هارون ئەلڕەشیدی خەلیفەی ناسراوی عەباسیم دێنێتەوە یاد. کاتێ بیستی کە شاعیرێکی خێڵەکی و ڕەوەند تووشی داوی عەشقی لەیلا بووە و لە پێناویدا دین بووە و ناوی (مەجنوون – دین)ی لێنراوە، ئیدی خەلیفە پەرۆشی ناسینی ئەو ئافرەتە دەبێت کە مەجنوونی گەیاندووەتە ئەم ڕادەی کڵۆڵییە.

بە خۆی گوت دەبێت ئەم لەیلایە بوونەوەرێکی زۆر تایبەتی بێت، ئافرەتێک بێت لە سەرووی هەموو ئافرەتانی ترەوە، ڕەنگە ئەفسوونێکی وای تێدا بێت لە جوانی و شۆخیدا هیچ ئافرەتێک شان لە شانی نەدات. ئەوە بوو هەموو ئەو فێڵ و شێوازانەی کە لەنێو کتێباندا باسکراون تاقیکردەوە تا لەیلا بە چاوی خۆی ببینێت.

ڕۆژێکیان لەیلایان بۆ کۆشکی هارون ئەلڕەشید هێنا، کە ڕووپۆشەکەی لادا و دەموچاوی بینی، هەستی بە نائومێدییەکی زۆر کرد. لەیلا پیرێژنێک یان کەمئەندامێک یان ناشیرینێک نەبوو، بەڵام هاوکات بەو ڕادەیە سەرنجڕاکێش و جوانیش نەبوو، تەنها ئافرەتێکی ئاسایی بوو و خەوشی خۆی هەبوو، ئافرەتێکی سادە و وەک هەموو ئافرەتانی تر بوو.

خەلیفە هەستی زەن بە خەساریی خۆی نەشاردەوە و لێی پرسی: "ئەرێ تۆ ئەو ئافرەتەی کە مەجنوون بۆی شێت و شەیدا بووە؟ ئەو شتە چییە تۆی کردووە بەو ئافرەتەی مەجنوون بۆی دین ببێت، لە کاتێکدا تۆ ئافرەتێکی خواساییت؟".

لێوەکانی لەیلا بە زەردەخەنەیەک کرانەوە و گوتی: "بەڵێ، من لەیلام، بەڵام تۆ مەجنوون نییت. جا بۆ ئەوەی ئەم مەتەڵە هەڵبێنیت کە ناوی عەشقە، دەبێ بە چاوەکانی مەجنوون تەماشام بکەیت".

چۆن بتوانم هەمان مەتەڵ بۆ خێزانەکەم، یان برادەرەکانم، یان فەقێکانم ڕاڤە بکەم؟ چۆن وایان لێ بکەم تێبگەن تا بزانن ئەوەی لە شەمسی تەورێزیدا هەیە، گەرەکە ئەوان بە چاوەکانی مەجنوون تەماشای بکەن؟

ئایا تا نەبیت بە عاشق ڕێگەیەک هەیە لە واتای عەشق تێبگەیت؟

عەشق لێکنادرێتەوە، هەروەها تا تێیدا نەژیت و ئەزموونی نەکەیت، هەست بە هەبوونی ناکەیت. هەرچەندە عەشق لێکنادرێتەوە، لێ ئەو هەموو شتێک لێکدەداتەوە.

# کیمیا

## قۆنیا، ١٧ی ئاب ١٢٤٥

بە پەرۆشەوە چاوەڕێم دەکرد ڕۆمی بانگم بکات تا وانەم پێ بڵێتەوە، بەڵام کاتی ئەوەی نەبوو. هەرچەندە وای لێهات وانەکانم لەدەست دەدا و هەستم دەکرد پشتگوێی خستووم، بەڵام من لێی زویر نەبووم، ڕەنگە بەوای ئەوەوە بێت خۆشم دەویست، یان ڕەنگە لەبەر ئەوە بووبێت من لەوانی تر زیاتر دەمزانی چۆن بیردەکاتەوە، لێ ئەوەی لە ناوەوەم وەک ئەوانی تر تووشی سەرسوڕمانی کردبووم، شەمسی تەورێزی بوو.

چۆن درەختی گوڵەبەڕۆژە دوای خۆر دەکەوێت، چاوەکانی ڕۆمیش ئاوها دوای شەمس کەتبوون. خۆشەویستیی نێوانیان ئاشکرا و بەهێز بوو، شتێکی یەکجار دەگمەن هەبوو کۆی دەکردنەوە. ئیدی هەموو ئەوانەی لە ماڵەکەدا بوون ئەو شتەیان بۆ قووت نەدەچوو، بە تایبەتی عەلائەدین کە چەندین جار بینیبووم بە تووڕەییەوە تەماشای شەمسی دەکرد. پەژارە کیرایشی گوشی بوو، بەڵام وشەیەک لە دەمی دەرنەدەچوو. ئاوها هەمووومان لەسەر بەرمیلێکی پڕ لە barووت دانیشتبووین، سەیر ئەوە بوو ئەو هەموو ئاڵۆزییەی باڵی بەسەرماندا کێشابوو شەمس لێی بەرپرسار بوو، کەچی ئاگای لێ نەبوو کە چی ڕووی داوە، یان ئاگای لێ بوو و خۆی لێ کڕکردبوو.

بەرانبەر بە شەمس لە لایەکەوە هەستم بە دەردەسەرییەک دەکرد، چونکە ڕۆمیی لێ زەوت کردبووین، لە لایەکی ترەوە پەرۆش بووم زیاتر بیناسم. ماوەیەک بوو ئەم هەستە دژانە لە دەروونمدا لە ململانێدا بوون. وا ئەمڕۆ ترسی ئەوەم هەیە کە هەندێ لە غایلەکانم ئاشکرا کردبێت.

ئەم ئێوارەیە قورئانە هەڵواسراوەکەی سەر دیوارەکەم هێنایە خوارەوە و بڕیارم دا خۆم بە تەنها بیخوێنمەوە. لەمەوبەر ڕۆمی پەیڕەوی ئەو ڕیزبەندییەی دەکرد کە ئایەتەکانی تێدا هاتبوونە خوارێ، لێ دوای ئەوەی کە کەسێک نەبوو ڕێنماییم بکات و دوای ئەوەی ژیانمان سەرەونخوون بووەوە، بینیم هیچ زیانێک لە ڕیزبەندی نەکردنیدا نییە، بۆیە هەر وا لەخۆوە لاپەڕەیەکم کردەوە و چاوم بە یەکەم سوورەت کەوت، ئەویش سوورەتی (النساء - ئافرەتان) بوو، کە زۆر حەزم لێی نەدەکرد، چونکە تێگەیشتنی ئەو فەرمانانەی پەیوەندیی بە ئافرەتەوە هەیە بۆ من زەحمەت و قورس بوو. چەند جارێ سوورەتەکەم خوێندەوە، بیرم کردەوە کە داوای لێ بکەم یارمەتیم بدات. هەرچەندە ڕۆمی ئیدی وانەی پێ نەدەوتمەوە، بەڵام هۆیەکیش نەبوو ڕێم لێ بگرێت تا پرسیاری لێ بکەم، بۆیە قورئانەکەم هەڵگرت و رووم کردە ژوورەکەی.

کە ڕۆمیم لە ژوورەکەدا نەبینی سەرم سوڕما، بەڵکو شەمسم بینی لە نزیک پەنجەرەکە دانیشتبوو و تەزبیحاتی دەکرد و زەردەی خۆراوا ختووکەی دەموچاوی دەدا. زۆر قۆز دیاربوو و دەموچاوی خۆم لێی شاردەوە.

پێم گوت: "بمبوورە لە مەولانا دەگەڕێم، دوایی دێمەوە".

شەمس گوتی: "پەلەی چیتە؟ ڕاوەستە. دیارە بۆ ئێرە هاتوویت تا دەربارەی شتێ پرسیار بکەیت. ڕەنگە بتوانم یارمەتیت بدەم".

شتێ نەبوو ڕێم لێ بگرێت تا پرسیاری لێ نەکەم، بە دوودڵییەوە وتم: "باشە، بە زەحمەت لەم سوورەتە تێدەگەم".

شەمس وەک ئەوەی خۆی بدوێنێت، ورەورێکی کرد و گوتی: "قورئان وەک بووکێکی شەرمنە، هەتا نەبینێت کە تەماشاکەرەکەی لە ناخەوە لەگەڵیدا نەرمونیان و بەسۆزە، چارشێوەکەی لانابات". ئینجا خۆی ڕاست کردەوە و پرسیی: "کام سوورەت؟".

گوتم: "سوورەتی ئافرەتان. هەندێ ئایەتی تێدایە دەڵێت پیاوان لە ئافرەتان دەسەڵاتدارترن، تەنانەت دەڵێت پیاوان بۆیان هەیە لە هاوسەرەکانی خۆیان بدەن....".

"ئایا شتەکە وایە؟"، شەمس بە بایەخێکی زێدەڕۆییەوە لێی پرسیم، جا نازانم بەڕاستی بوو یان هەوڵی ورووژاندنی منی دەدا، کەمێ بێدەنگ بوو، ئینجا زەردەخەنەیەکی ناسک کەوتە سەر لێوی و هەر لەبەر دەستی بە خوێندنەوەی ئایەتەکە کرد:

**(الرجال قوامون علي النساء بما فضل اللة بعضهم علي بعض وبما انفقوا من اموالهم، فالصالحات قانتات حافظات للغيب بما حفظ اللة واللاتي تخافون نشوزهن فعظوهن واهجروهن في المضاجع واضربوهن فان اطعنكم فلا تبغوا عليهن سبيلا ان اللة كان عليا كبيرا ).**

کاتێ لە خوێندنەوەی بووەوە، چاوەکانی نوقاند و بەم شێوەیە دەستی بە لێکدانەوەی ئایەتەکەکرد:

**(پیاوان بەخێوکەری ئافرەتانن، چونکە خودا بژێویی هەندێ کەسی لە هەندێ کەسی دیکە زیاتر کردووە، تا لە سامانی خۆیان خەرج بکەن و "ئافرەتان بەخێو بکەن". ئافرەتانی باش و ملکەچی خودا پارێزەری نادیارن هەر وەک خودا ئەو نادیارەی پاراستووە، بەڵام ئەو ئافرەتانەی کە لێیان دەترسن یاخی ببن، ئەوا "بێ ئەوەی ئازاریان بدەن" ئامۆژگارییان بکەن و سەرجێیان لەگەڵدا مەکەن. "گەر خۆیان ئارەزوویان لێ بوو "سەرجێیان لەگەڵدا بکەن. گەر لێتان هاتنە پێشەوە، لە بیانوویەک مەگەڕێن تا سەرکۆنەیان بکەن. خودا لەسەرووی هەموو توانایەکەوەیە).**

شەمس پرسیی: "ئایا جیاوازییەک دەبینیت؟".

وتم: "بەڵێ، جیاوازییەکی گەورە هەیە. لە کاتێکدا وا دیارە کە ئایەتەکە لەگەڵ ئەوەدایە پیاوان لە هاوسەرەکانیان بدەن، لێکدانەوەکەی ئامۆژگاریی پیاوان دەکات لێیان لووتەلابن و لێیان دوور بکەونەوە. پێم وایە کە جیاوازییەکی گەورە هەیە. ئەوە بۆ وایە؟".

"ئەوە بۆ وایە؟ ئەوە بۆ وایە؟"، شەمس وەک ئەوەی چێژ لە پرسیارەکە ببینێت، چەند جارێ وتییەوە، "کیمیا، شتێکم پێ بڵێ. ئایا لەمەوبەر هیچ لە ڕووباردا مەلەت کردووە؟".

کە بیرەوەرییەکانی منداڵیم لە یادگەمدا بروسکەیان دا، سەرم لەقاند. ئەو جۆگەلە ئاوە ساردانەم بیرکەوتەوە کە لە چیاکانی تۆرۆس دەهاتنە خوارێ و

تینویتییان دەشکاند، هەروەها بیرەوەرییەکانی کیژۆڵەیەکی بچکۆلە کە چەندین ئێوارەی خۆشی لەگەڵ خوشکەکەی و دەستەخوشکەکانیدا لە ڕۆخی ئەو جۆگەلانە بەسەر دەبرد، کە ئەمیستا جگە لە هەندێ شتێ کەم هیچی نەماوە. دەموچاوی خۆم لە شەمس شاردەوە، چونکە نەمویست ئەو ڕوندکانە ببینێت کە لە چاوەکانمەوە هاتنە خوارێ.

"کیمیا، کاتێ لە دوورەوە تەماشای ڕووبارێک دەکەیت، ڕەنگە هەست بە تەنیا یەک دەراوی ئاو بکەیت، بەڵام گەر خۆت لە ئاوەکەدا نوقم بکەیت، ئەوسا تێدەگەیت، کە لە ڕووبارێک زیاتر هەیە، چونکە ڕووبار چەندین تەوژم حەشاردەدات کە هەموویان بە یەک ڕیتم هەڵدەقوڵێن، بەڵام هاوکات هەریەکەیان لەوی دیکە جیایە."

شەمس بەدەم قسەکردنەوە لێم نزیکبووەوە و بە دوو پەنجە چەناگەی گرتم و ناچاری کردم ڕاستەوخۆ تەماشای چاوە قووڵ و بەسۆزەکانی بکەم. خەریکبوو دڵم لە لێدان بکەوێت، تەنانەت نەمدەتوانی هەناسە بدەم.

هەروەها گوتی: "قورئان ڕووبارێکی هەڵقوڵاوە. ئەوانەی لە دوورەوە تەماشای دەکەن، جگە لە یەک ڕووبار، هیچی دیکە نابینن، بەڵام ئەوانەی مەلەی تێدا دەکەن، چوار تەوژم دەبینن. مینا ماسییە جیاوازەکان، هەندێکمان لە نزیک ڕووی ئاوەکە مەلە دەکەین و هەندێکی ترمان لە ئاوی قووڵتر مەلە دەکەین".

وتم: "تێناگەم"، هەرچەندە خەریکبوو تێدەگەیشتم.

"ئەوانەی حەز دەکەن لە نزیک ڕووی ئاوەوە مەلە بکەن، بە واتای دەرەوەی قورئان قایل دەبن و کەسانێکی زۆر سەر بەم دەستەیەن، ئیدی ئایەتەکان بە شێوەی وشەبەوشە لێکدەدەنەوە، سەیریش نییە کاتێ سوورەتێکی وەک (النساء) دەخوێننەوە بگەنە ئەو ئەنجامەی کە پیاوان لە ئافرەتان پایەبەرزترن، چونکە ئەوان دەیانەوێ تەنها ئەمە ببینن".

لێم پرسی: "ئەی دەربارەی تەوژمەکانی تر چی دەڵێیت؟".

شەمس هەناسەیەکی ناسکی هەڵکێشا، بەدەست خۆم نەبوو تەماشای ناو دەمە ئاڵۆزەکەیم کرد کە چێژی باخچەیەکی نهێنی دەدا.

"سێ تەوژمی تر هەن: تەوژمی دووەم لە تەوژمی یەکەم قووڵترە، بەڵام لە سەرەوە نزیکە. کە ڕادەی وشیاریت فراوان دەبێت، ئاستی تێگەیشتنت بۆ

قورئانیش فراوان دەبێت، بەڵام تا ئەوە پێکدێت، گەرەکە بەرەو قووڵایی خۆت نوقم بکەیت".

کە گوێم لێی ڕاگرتبوو هاوکات هەستم بە بۆشایی و بە تێگەیشتن دەکرد، ئینجا بە وریاییەوە لێم پرسی: "ئەی کاتێ خۆت نوقم دەکەیت چی ڕوودەدات؟"

"بەڵام تەوژمی ژێرەوەی سێیەم خوێندنەوەی نادیارە. ئەگەر سوورەتی (ئافرەتان)ت خوێندەوە و چاوی ناخت کراوەبوو، ئەوا دەبینیت کە سوورەتەکە دەربارەی ئافرەتان و پیاوان قسەناکات، بەڵکو دەربارەی مێیایەتی و نێرایەتی دەدوێ. لە لای هەریەکێ لە ئێمە، بە من و تۆشەوە، مێیایەتی و نێرایەتی هەیە، بەڵام بە چەند پلە و سێبەری جیا. کە فێربووین چۆن ئەم دوو خەسیتە لە ئامێز بگرین، دەتوانین یەکتاییەکی هەماهەنگ بەدی بێنین".

"ئایا دەتەوێ پێم بڵێیت کە لە ناوەوەمدا شتێ لە نێرایەتی هەیە؟"

"بەڵێ، بێگومان. لە منیشدا لایەنێکی مێیایەتی هەیە".

سووکە پێکەنینێک گرتمی و لێم پرسی: "ئەی دەربارەی ڕۆمی دەڵێیت چی؟"

شەمس بە زەردەخەنەوە گوتی: "لەناو هەر پیاوێکدا پلەیەک لە مێیایەتی هەیە".

"تەنانەت ئەو پیاوانەش کە پیاوەتییان زۆر زاڵە؟"

"ئازیزم بە تایبەتی ئەمانە"، شەمس وەک ئەوەی نهێنییەکم لە لا بدرکێنێت، بەدەم قسەوە وشەکانی بە چاوداگرتنەوە دەڕازاندەوە و دەنگیشی تا دەهات دەبوو بە چپە.

وەک کچێکی بچکۆلە پێکەنینەکەم خەفەکرد. زۆر نزیکبوونەوەی شەمس ئەو کارەی تێکردبووم، پیاوێکی سەیر بوو، دەنگی ئەفسوونێکی سەیری تێدا بوو، دەستەکانی نەرم بوون، قۆڵ و باسکی ڕەگڕەگاوی بوون، نیگای چون هێڵێک لە تیشکی خۆر هەر شتێک بکەوتایەتە سەری تیژتر و چالاکتری دەکرد. کە شانبەشانی وەستابووم هەستم بە توانای جەیڵی خۆم دەکرد، هەروەها لە ناوەوەمدا حەزێکی زگماکانەی دایکایەتی بە ناوەوەمدا تێپەڕی و

بۆنی شیرێکی خەستی دایکایەتی لێدەهات. ویستم بیپارێزم، ئیدی چۆن و لەبەرچی، خۆمیش نەمدەزانی.

شەمس دەستی لەسەر شانەکانم دانا، دەموچاوی زۆر لە دەموچاوم نزیکخستەوە و هەناسە گەرمەکانی پێمدا چزان. لە چاوەکانیدا نیگایەکی خەونبینینی تازەم بینی. کە سەرئەنگوستە گەرمەکانی بەرمکەوتن وەک گڕێک پێستەکەمی داگیرساند و ختووکەی گۆناکانمی دا. کەمێ پەنجەکانی بەرەو لێوی خوارەوەم شۆڕکردەوە و سەرم سوڕما، هەستم بە سەرەگێژکە و شڵەژانێک کرد. چاوەکانم نوقاند و لە هەناومدا هەستم بە شەپۆلێکی ورووژاندن کرد کە بارتەقای تەمەنێکی تەواو بوو، بەڵام شەمس زوو دەستی لە لێوەکانم دوورخستەوە.

"ئازیزم کیمیا، گەرەکە هەر ئێستا بڕۆیت"، شەمس بە ورەورێکەوە ناوەکەمی وەک پەیڤێکی خەمین گۆکرد.

چوومە دەرەوە و هەستم بە شڵەژانێکی ناو مەژگم کرد، لە گەرمان ڕوومەتەکانم سوورهەڵگەڕابوون. کە بۆ ژوورەکەم گەڕامەوە، لەسەر حەسیری خەوتنەکەم لەسەر پشت ڕاکشام و چاوم بڕییە بنمیچەکە و لە خۆم پرسی ئەی ئەگەر شەمس ماچی کردبام هەستم چۆن دەبوو. بیرم کەوتەوە کە بیرم چوو دەربارەی ژێرینەی چوارەمی خشتەکە لێی بپرسم – خوێندنەوەی قووڵتری قورئان. ئەمە چییە؟ بنیادەم چۆن دەتوانێت بگاتە ئەو ڕادەیە ئاوها قووڵ ببێتەوە؟

ئەی دەربارەی ئەوانەی خۆیان نوقم دەکەن چی ڕوودەدات؟

# سوڵتان وەلەد

## قۆنیا، ٤ی ئەیلوول ١٢٤٥

بەراگەورەی عەلائەدین بووم و هەمیشە دڵم لە لای بوو، بەڵام ئیدی پەژارەکەم وەک ئەوەی لەمەبەر نەبوو. ئەو هەر لە منداڵییەوە توندە تەبیات بۆو و زوو توورە دەبوو، لێ ئێستا حەزی لە چەتوونی و شەڕانگێزی بوو. بەردەوام لەسەر هەر شتێ، ئیدی شتەکە چەند توورەهات و هیچ بوایە ئامادەی شەڕکردن بوو. بێحەوسەڵە و چەتوون بووبوو. منداڵان کە لە شەقام دەیاندی لێی دەترسان. هەرچەندە تەمەنی لە حەڤدە ساڵ تێنەپەڕی بوو، بەوای خۆگوشین و ڕقەوە چەند لۆچێک بە دەوری چاوەکانیدا دروست بووبوون. ئەم بەیانییە بە تایبەتی سەرنجم دا لۆچێکی تازە کەوتبووە لادەمییەوە، چونکە بەردەوام دەمی کرژدەکردەوە.

لەسەر پێستێکی تەنکی مەڕ خەریکی نووسین بووم، کاتێ لە پشتمەوە گوێم لە دەنگێکی نزم بوو. ئەوە عەلائەدین بوو بە لێوە هەڵقرچاوەکانییەوە. خودا دەزانێت لە کەیەوە لەوێ وەستابوو و بە چاوە مەڕی و نیگا شڵەژاوەکانییەوە سەیری دەکردم. لێی پرسیم کە چی دەکەم.

گوتم: "وانەیەکی کۆنی باوکمان کۆپی دەکەم. باشتر وایە وێنەیەکی زیادەی هەموو وانەکانی بپارێزین".

"ئەوە سوودی چییە؟"، علائەدین هەناسەیەکی توندی هەڵکێشا، "ئاخر ئەو وازی لە وانەوتنەوەکان و وتارەکانی هێناوە، مەگەر تێبینی ئەوەت نەکردووە وازی لە وانەوتنەوەی سوختەخانەش هێناوە. ئەی نابینیت دەستی لە هەموو بەرپرسیارێتییەکانی هەڵگرتووە؟".

گوتم: "ئەوە شتێکی کاتییە. بەم زووانە دەگەڕێتەوە سەر وانەوتنەوە".

"تۆ خۆت هەڵدەخەڵەتێنیت. ئەی نابینیت باوکمان جگە لە شەمس کاتی ئەوەی نەماوە بپەرژێتە سەر شتێک یان کەسێکی تر؟ ئایا ئەمە جێگەی پێکەنین نییە؟ وا گریمان ئەو دەروێشێکی گەڕیدەیە، بەڵام لە ماڵەکەماندا ڕەگی داکوتاوە".

عەلائەدیــن بە تەوســـەوە پێکەنـــی و پێـــی وا بـــوو کە مـــن لەگەڵ بۆچوونەکەیدام، لێ کە من وەڵامیم نەدایەوە، بەناو ژوورەکەدا دەستی بە هاتوچۆ کرد، تەنانەت بێ ئەوەی تەماشای بکەم هەستم بە بڵێسەی ئەو تووڕەییە کرد کە لە چاوەکانیدا بریسکەی دەدا.

"خەڵکی زۆر قسەدەکەن"، عەلائەدین بە غەمبارییەوە لەسەری ڕۆیشت، "خەڵکی هەمان پرسیار دەکەن: خودانەناسێک چۆن توانیی گەمە بە زانایەکی سەنگین بکات؟ ئاخر ناوبانگی باوکمان خەریکە وەک بەفری بەر تاو دەتوێتەوە، خۆ ئەگەر زوو واز لەو نەهێنێت، ڕەنگە لەم شارەدا مریدی دیکەی دەست نەکەوێت، چونکە ئیتر کەس وەک مامۆستایەک نایبەوێ، من لەو بارەیەوە گلەیی لەوان ناکەم".

پێستە تەنکەکەم خستە لاوە و تەماشای براکەمم کرد. ئەو هەرچەندە لاوێکی تازە پێگەیشتوو بوو، خەریکبوو سیمای پیاوەتیی لێدەنیشت. لە پارەوە زۆر گۆڕابوو و گومانی ئەوەم دەکرد کە ئەو عاشقە، لێ نەمدەزانی ئەو کچە کێیە و برادەرەکانیشی نەیاندەویست پێم بڵێن.

"برام، من دەزانم کە تۆ شەمست خۆش ناوێ، لێ میوانێکە و هاتووەتە ماڵەکەمان و پێویستە ڕێزی بگرین. گەر شتەکە ڕاستیش بێت، گوێ لە واتەواتـــی خەڵکـــی مەگـــرە. گەرەکە ئەم شـــتە ئـــاڵۆزنەکەین و ژاوەژاو نەوروژێنین".

کە ئەم قسانەم کرد، ژێوان بوومەوە، لێ کارلەکار ترازابوو. عەلائەدین مینا داری وشک بە خێرایی گڕی گرت.

"ژاوەژاو؟"، عەلائەدیــن هەناســەیەکی هەڵکێشا، "ئەرێ ئەو کارەســاتەی بەسەرماندا هاتووە ناوی دەنێیت ژاوەژاو؟ چۆن دەکرێ ئاوها کوێر بیت؟".

پێستەیەکی تەنکی دیکەم هەڵگرت و دەستێکم بە ڕووە تەنکەکەیدا هێنا. کۆپیکردنی وتارەکانی باوکم چێژێکی گەورەیان پێدەبەخشیم، بۆیە بەگوێرەی

توانا هەوڵم دەدا لەسەری بەردەوام بم، تا خەڵکی بتوانن وتارەکانی باوکم بخوێننەوە و سرووشی لێ وەربگرن. کارەکەم لەگەڵ بچووکیشیدا وای لێدەکردم هەست بە شانازی بکەم.

عەلائەدین بە تەنیشتمەوە وەستابوو و لەسەر بێزاریدەربڕینی خۆی بەدەوام بوو و بە دووچاوی خەمین و ئازارزەدەوە تەماشای کارەکەی منی دەکرد. هەر زوو لە چاوەکانیدا ئەڵهایەکم لە ڕوخساری لاوەکەدا بەدی کرد و زانیم کە حەوەجەی خۆشەویستیی باوکێتی. دڵم گوشرا و زانیم کە ئەو لە شەمس تووڕە نییە، بەڵکو لە باوکم تووڕەیە.

عەلائەدین لە باوکم تووڕە بوو، چونکە زۆر خۆشی نەدەویست. هەرچەندە باوکم زانایەکی سەنگین و لێهاتوو بوو، کەچی نەیتوانی دایکمان لە مردن ڕزگار بکات کە لە سەرەتای تەمەندا بوو.

ئینجا گوتی: "دەڵێن شەمس جادووی لە باوکمان کردووە، هەروەها دەڵێن گوایا تلیاککێشەکان خۆیان ئەویان ناردووە".

تلیاکییەکان گرووپێکن بەوە ناسراون بە شێوازێکی ورد بە ژەهر دوژمنەکانیان دەکوژن. کەسانی ئەم گرووپە خاوەن دەسەڵاتەکان و خاوەن پایەکانیان دەکردە ئامانج و قوربانییەکانیان لە شوێنە گشتییەکاندا دەکوشت تا ترس و دڵەڕاوکێ لەنێو خەڵکیدا بڵاوبکەنەوە. ئەوەبوو هەندێ حەڵوای ژەهراوییان لەگەڵ نامەیەکدا لە ناو خێوەتەکەی سەلاحەدینی ئەیوبی دانا و تێیدا نووسیبوویان تۆ لە بەردەستماندایت. سەلاحەدین، ئەو سەرکردە موسڵمانە مەزنەی کە بەرانبەر خاچپەرستەکان جەنگا و قودسی ڕزگارکرد، زاتی نەکرد شەڕیان بکات، بەڵکو پێی باشتربوو ئاگربەستیان لەگەڵدا مۆر بکات. ئاخر چۆن دەکرێ خەڵکی وا بیربکەنەوە کە شەمس پەیوەندی بەم گرووپەوە هەبێت کە ترس لە دڵی خەڵکیدا دەچێنێت؟

دەستم خستە سەر شانی عەلائەدین و ناچارم کرد تەماشای دەموچاوم بکات.

"سەربارێ ئەوە، ئەی نازانیت کە ئیدی گرووپەکە وەک جاران نەماوە؟ ئێستا تەنیا لە ناوێک زیاتر نییە".

عەلائەدین کەمێ لە قسەکە وردبووەوە و گوتی: "بەڵێ، بەڵام دەڵێن سێ لەو سەربازانەی کە زۆر ملکەچی حەسەن ئەلسەباحن، قەڵای ئەڵەمووتیات جێهێشتووە و سوێندیان خواردووە کە بگەنە هەر شوێنێ ترسی تێدا بچێنن. هەندێ پێیان وایە کە شەمس ڕابەریانە".

خەریکبوو ئارامم نەمێنێت، بۆیە وتم: "خودا یارمەتیی من بدات! ئایا دەتوانیت پێم بڵێیت بۆچی ئەو تلیاکییانە دەیانەوێ باوکمان بکوژن؟".

"لەبەر ئەوەی ڕقیان لە کەسانی خاوەن پایەیە و حەزیان لە بڵاوکردنەوەی ئاژاوەیە"، عەلائەدین کەوتبووە ژێر کاریگەریی پیلانگێڕانەوە، بۆیە ئاوها وەڵامی دایەوە، بە جۆرێ هەندێ سوورایی کەوتە سەر ڕوومەتەکانی.

دەبوو زۆر بە پێداگری شتەکە چارەسەر بکەم، بۆیە گوتم: "تەماشاکە، خەڵکی بەردەوام دەربارەی هەموو شتێ قسان دەکەن، نابێت بڕوا بەم پڕوپاگەندە خراپانە بکەیت. ئەم بیرە پڕ لە کینانە عەقڵت ژەهراوی دەکەن. لەسەر خۆت دەریان بکە".

هەرچەندە عەلائەدین نرکەیەکی تووڕەیی لێ هەستا، لێ لەسەر قسەکەم بەردەوام بووم و گوتم: "وا دیارە تۆ بە تایبەتی شەمست خۆش ناوێ، هیچ پێویستیش ناکات خۆشت بوێ، هەر لەبەر ڕێزی باوکمان گەرەکە خۆت وا پیشان بدەیت کە نەختێ ڕێزی دەگریت".

عەلائەدین بە کولوکەسەر و ڕقەوە تەماشای کردم. ئیدی تێگەیشتم کە برا گچکەکەم هەر تەنها لە باوکم نیگەران نییە و لە شەمس تووڕە نییە، بەڵکو لە منیش یەکجار تووڕەیە، چونکە پێی وا بوو کە من لەبەر لاوازیم ڕێزی شەمس دەگرم، ڕەنگە بیری لەوەش کردبێتەوە کە من بۆیە ملکەچ و بێدەسەڵات دیارم تا ڕەزامەندیی باوکم بەدەست بێنم. هەرچەندە ئەوە هەر گومان بوو، بەڵام زۆر ئازاری دەدام.

سەرباری ئەوە لێی تووڕە نەبووم و تەنانەت گەر لێیشی تووڕەبام، تووڕەییەکەم زۆری نەدەخایاند، چونکە برای بچووکمە و بۆ من هەر ئەو هەرزەکارەیە کە لە شەقامەکاندا بەدوای پشیلاندا ڕایدەکرد و پێیەکانی بە گۆماوی باراناو قوڕاوی دەبوون، هەروەها بەم ڕۆژگارە خەریکی نان و

شیرخواردن بوو. وەک لاوێک لە دەموچاودا کەمێ پتەو و بەچاو تەمەنییەوە کورتەبالاَ دیاربوو. ئەو لاوەی کاتێ هەواڵی مردنی دایکی بیست، تاقە دڵۆپێک عەسری نەڕشت، هەموو ئەوەی کە کردی سەری داخست و تەماشای پێڵاوەکانی خۆی کرد، وەک ئەوەی لە سۆنگەی پێڵاوە قوراوییەکانییەوە تووشی شەرمەزاری بووبێت بەجۆرێ لێوی خۆی گەست ڕەنگی تێدا نەما. ئەوەبوو نە وشەیەک لە دەمی دەرچوو و نە هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشا، کەچی ئاواتەخوازبووم کە بگریایە.

لێم پرسی: "ئەرێ لە یادتە کە لەگەڵ منداڵانی گەڕەک شەڕت کردبوو و بە گریانەوە بۆ ماڵەوە هاتیتەوە و خوێنی لووتت بەربووبوو، دایکمان چیی پێ گوتیت؟".

چاوەکانی عەلائەدین یەکەم جار بچووکبوونەوە ئینجا کرانەوە، لێ وشەیەک لە دەمی دەرنەچوو.

"پێی وتیت کاتێ لە کەسێ تووڕە دەبیت، پێویستە لەجیاتی دەموچاوی ئەو کەسە، دەموچاوی کەسێک بێنیتە بەرچاوت کە خۆشت دەوێ. ئایا هەوڵت داوە لەجیاتی ڕوخساری شەمس، ڕوخساری دایکمان بێنیتە بەرچاوت؟ ڕەنگە شتێکی تێدا بدۆزیتەوە کە خۆشت دەوێ".

زەردەخەنەیەکی ڕەوتەنی و خێرا و شەرمن وەک هەورێکی ڕەوتەنی لەسەر لێوەکانی عەلائەدین نەخش بوو. چەند سەرم سوڕما کە ئەم زەردەخەنەیە ڕقەکەی دەموچاوی ڕەواندەوە.

وتی: "ڕەنگە بمتوانیایە"، ئەمێستا تووڕەیی دەنگی ڕەویبووەوە.

دڵم توایەوە و براکەم لەئامێز گرت و نەمزانی دوای ئەمە چیی پێ بڵێم. کە باوەشی لێدام هەستێکی دڵنیایی دایگرتم و پێم وا بوو کە لەگەڵ شەمسدا پەیوەندیی خۆی باش دەکات و ئەوەندە نابات تەبایی دەکەوێتەوە ماڵەکەمان.

ئەو شتانەی دوای ئەوە ڕوویان دا، بەهەڵەدا نەچووبووم.

# کیرا

## قۆنیا، ٢٢ی تشرینی یەکەم ١٢٤٥

بەجۆشەوە دەربارەی خودا و ئەو شتانەی لە خودا زیاتر کەس نایانزانێت، ئەو ڕۆژە لە پشت دەرگا داخراوەکەوە شەمس و ڕۆمی قسەیان دەکرد. سینییەکم هەڵگرت کە قاپێ شیرینیی لەسەر بوو، لە دەرگام دا و بێ ئەوەی چاوەڕێی وەڵام بکەم چوومە ژوورەوە. شتەکە وا دەقی گرتبوو کە من لەوێ بوومایە، وەک ئەوەی بەوای منەوە قسەی بۆ نەیات و نەتوانێت لە خواردن دروستکردندا ستایشی دەسترەنگینیم بکات، هیچ قسەیەکی نەدەکرد. بە هەرحاڵ ئەو زۆر خواردنی نەدەخوارد و پێم وا بوو کە ئەو بە لایەوە گرینگ نییە خواردنی خۆشی بدەمێ یان نانە ڕەق. لێ ئەمجارە کاتێ ئەو پارچە شیرینییەی خوارد کە خۆم دروستم کردبوو، چاوەکانی بریسکانەوە.

وتی: "کیرا، ئەمە زۆر بەتامە. ئەوە چۆن دروستت کردووە؟".

خۆمیش نازانم چیم بەسەر هات، ئیدی لەبری ئەوەی پەسنەکەیم بۆ ئەو حەلوایەی دروستم کردبوو، پێ خۆش بێت، گوێم لە خۆم بوو وا وەڵامی دەدەمەوە: "بۆچی دەپرسیت؟ گەر پێتیش بڵێم چۆن دروستم کردووە، خۆ تۆ ناتوانیت دروستی بکەیت".

شەمس وەک ئەوەی بە قسەکەم قایل بێت، تەماشایەکی کردم و کەمێ سەری لەقاند. چاوەڕێم کرد لە وەڵامی ئەوەدا شتێک بڵێت، لێ بە بێدەنگی و هێمنی هەر وا لەوێ وەستابوو.

دوای نەختێ ژوورەکەم جێهێشت و بۆ ناندینەکە گەڕامەوە و بیرم لەوە دەکردەوە کە ڕووی دا. گەر ئەوەی ئەم بەیانییە ڕووی نەدابایە، ڕەنگە هیچم لە یاد نەمایە.

* * *

لە ناندینەکەدا بە تەنیشت ئاگردانەکەوە خەریکی شیر تێکدان بووم، لە حەوشەکە گوێم لە هەندێ دەنگەدەنگی سەیر بوو. بە پەلە بۆ دەرەوە ڕۆیشتم و چاوم بەشێتانەترین دیمەن کەوت کە لە ژیانمدا نەمدیبوو. کتێبەکان بە هەموو شوێنێکدا بڵاو بووبوونەوە، هەندێکیان لەسەر یەک کەڵەکە کرابوون و لەقەلەقیان بوو، هەندێ کتێبی دیکە سەر ئاوی گۆمەکە کەتبوون و بەوای مەرەکەبی تواوەوە ئاوەکەی زۆر شین هەڵگەڕابوو.

لە کاتێکدا ڕۆمی لەولاوە وەستابوو، شەمس لەنێو کتێبە بەسەریەکدا کەوتووەکان کتێبێکی هەڵگرت –دیوانی موتەنەبی– بوو، بە نیگایەکی مۆنەوە تەماشای کرد و تووڕی دایە نێو ئاوەکەوە. کە کتێبەکە لە ئاوەکەدا نوقم بوو، کتێبێکی دیکەی هەڵگرت. ئەمەیان کتێبی نهێنییەکانی عەتار بوو.

لەترسان زارم بەشکردەوە. ئاخر شەمس یەک لە دوای یەک کتێبە بەنرخەکانی ڕۆمیی لەنێودەبردا دوا کتێب کە تووڕی دایە نێو ئاوەکە، کتێبی (زانستە خوداییەکان) بوو کە باوکی ڕۆمی داینابوو. لەبەر ئەوەی دەمزانی تا چ ڕادەیەک ڕۆمی باوکی خۆشدەویست و چەند خووی بەم دەستنووسە کۆنەوە گرتووە، تەماشایەکیم کرد و پێم وا بوو کە لە تووڕەییاندا دەتەقێتەوە، بەڵام ڕۆمی بە ڕوخسارێکی وەک مۆم زەردهەڵگەڕاو و دەستی لەرزۆکەوە لەولاوە وەستابوو. نەمزانی بۆ هیچ شتێ ناڵێت. ئاخر ئەو پیاوەی بەوای تەکاندنی تۆزی سەر کتێبەکانی سەرکۆنەی کردم، وا ئێستا بێ ئەوەی وشەیەک لە دەمی دەربچێت، پیاوێکی شێت بە بەرچاوییەوە هەموو کتێبخانەکەی لەنێو دەبات. کە ڕۆمی نەهاتەدەست تا سنوورێک بۆ ئەوە دابنێ، من خۆم هاتمە دەست، چونکە ئەمە دادپەروەری نییە.

"ئەوە تۆ چی دەکەیت؟"، لە شەمسم پرسی: "ئاخر دانەی دیکە لەم کتێبانە نییە و زۆر بەنرخن. لەبەرچی تووڕیان دەدەیتە ناو ئاوەکەوە؟ ئەرێ تۆ شێت بوویت؟".

شەمس وەڵامی نەدایەوە، بەڵکو ئاوڕی لە ڕۆمی دایەوە و لێی پرسی: "ئەمە بۆچوونی تۆشە؟".

ڕۆمی لێوەکانی هەڵقرچاند و سووکە زەردەخەنەیەک گرتی، لێ هەر بێدەنگ بوو.

"بۆچی شتێک ناڵێیت؟"، بەسەر شووەکەمدا هاوارم کرد.

ڕۆمی لێم نزیکبووەوە و بە توندی دەستی گرتم و گوتی: "کیرا، تکات لێدەکەم هێمنبەرەوە. من بڕوام بە شەمس هەیە".

شـەمس بە ئاسـوودەیی و بڕوابەخۆبـوونەوە لە شـانی وەسـتابوو و تەماشای دەکردم، قۆڵەکانی هەڵکرد و کتێبەکانی لە ئاوەکە دەرهێنا. کاتێ بۆم دەرکەوت کە هەموو ئەو کتێبانەی لە ئاوەکەدا دەریان دەهێنێت وشکن، واقم وڕما.

لێم پرسی: "ئایا ئەمە جادووە؟ چۆن ئەمەت کرد؟"

شەمس گوتی: "بۆچی دەپرسیت؟ خۆ ئەگەر پێتیش بڵێم، تۆ ناتوانیت ئەوە بکەیت".

تووڕە بووم و فرمێسکەکانم قەتیس کرد، ئینجا بەرەو ناندینەکە خزام کە لەم ماوەیەدا بووبوو بە داڵدەم. لەنێو مەنجەڵ و مەقاڵە و کۆمەڵێ گژوگیا و بەهارات دانیشتم و لە سەلای گریانم دا.

## ڕۆمی

### قۆنیا، کانوونی یەکەم ١٢٤٥

بڕیارمان دا لەگەڵ شەمس پێکەوە نوێژی بەیانی لەدەشتودەر بکەین، ئەوە بوو دوای کازیوە کەمێ بەدواوە لە ماڵ دەرچووین. هەریەکەمان سواری ئەسپی خۆی بوو و ماوەیەک ڕۆیشتین. دەشتی پڕ لە گیاوگوڵ و شیو و جۆگەلەمان بڕی کە ئاوی زۆر ساردیان پێدا دەڕۆیشت. چێژمان لەو شنەی بەیانییە وەردەگرت کە بەر دەموچاومان دەکەوت، دەنگی ئاگادارکەرەوەی جۆراوجۆری سەیر لە پەڵەگەنمەکانەوە سڵاویان لێدەکردین، کاتێ لەو نیمچە تاریکانەدا بە بەردەم ماڵە لادێییەکدا تێپەڕین، جلوبەرگی تازەشۆردراو و هەڵخراومان بینی بە خێرایی بە هەموو لایەکدا دەشەکانەوە.

لە گەڕانەوەماندا شەمس جڵەوی ئەسپەکەی توندکرد و ئاماژەی بۆ داربەڕوویەکی زەبەلاحی دەرەوەی شارەکە کرد. پێکەوە لەژێر دارەکە دانیشتین، ئاسمان بەسەرمانەوە لەنێو سێبەرێکی ئەرخەوانیدا هەڵواسرابوو. کە لە مزگەوتە نزیک و دوورەکانەوە دەنگی بانگدان بەرزبووەوە و بۆ نوێژکردن بانگی موسڵمانانی کرد، شەمس عەباکەی لەسەر زەوییەکە ڕاخست و پێکەوە نوێژمان کرد.

"کە گەیشتمە قۆنیا، لەژێر ئەم دارە دانیشتم"، شەمس بەدەم قسەوە بیرەوەرییەکی دوور لە سەریدا بروسکەی دا و زردەخەنە گرتی، لێ ئەوەندەی نەبرد کەوتە دۆخێکی جدییەوە و گوتی: "ئەوەبوو جوتیارێک گەیاندمییە جێ زۆر سەرسامی تۆ بوو و گوتی کە وتارەکانی تۆ خەمڕەوێنن".

وتم: "ناوی ئەفسوونکاری پەیڤانیان لێ نابووم، لێ ئەوە ئەمێستا وەک ئەوەیە لە ڕۆژگارێکی کۆندا بووبێت. ئارەزووی وتاردانم نەماوە و لێبوومەتەوە".

"تـۆ ئەفـسونکاری پەیڤانیـت"، شـەمس ئەوەی بە جەخـتەوە وت، "بەڵام لەجیاتی ئەوەی ببیت بە خـاوەنی ئـاوەزێکی وتـاربێژی، بوویـت بە خـاوەنی دڵێکی ڕیتمدار".

لە مەبەسـتی تێنەگەیـشتم و لێیـشیم نەپرسـی. بەیـانی پاشـماوەی شـەوی ڕابـردووی بەزانـد و ئاسـمان بـوو بە ڕەنگێکـی پرتەقاڵیئـامێز. لە مەودایەکـی دووری پێشمانەوە شارەکە خەریکبوو لە خەو ڕادەبوو. قەلەڕەشـکە هێرشـیان بـۆ گـێڵگەی سـەوزاییەکان هێنـا تـا بتـوانن شـتێکیان دەسـت بکەوێـت. دەنگـی جیڕەی ئەو دەرگایـانەی کە خەریکبـوون دەکـرانەوە دەگەیـشتە گوێچکەمـان، هەروەها زەڕەی کەر و گڕپەگڕپی ئاگری کوانووە دایساوەکان هەموو پێکەوە پێشوازیی ڕۆژێکی نوێیان دەکرد.

"لە هەمـوو شـوێنێکدا خەڵکـی، بێ ئەوەی کەسـێک ئاراسـتەیان بکـات یـان ڕابەرایەتییـان بکـات کە دەبـێ چـی بـکەن، بـۆ خۆسـەلماندن سـەربەخۆ هەر خۆیان خەبات دەکەن"، شەمس بە سەربادانەوە ورەورێکی کرد، "پەیڤەکانی تۆ یارمەتییـان دەدات و منـیش ئەوەی لە توانامـدا بێـت یارمەتیـت دەدەم. مـن خزمەتکاری تۆم".

"وا مەڵێ"، بە ناقبلییەوە پێم گوت، "تۆ هاوڕێی منیت".

شەمس بێ ئەوەی گوێ بداتە ناقایلییەکەم، لەسەر قسەکانی ڕۆیشت و گوتی: "ئەوەی پەژارەی کردووم ئەوەیە تۆ لە ناوخۆ قەتیسکردندا دەژییت. جا لەبەر ئەوەی وتاربێژ و ئامۆژگاریکەرێکی ناوداریت، هەواداران و مریدەکانت دەورت دەدەن، بەڵام دەربـارەی خەڵـکە ڕەشـۆکییەکە چـی دەزانیـت؟ وەک سەرخۆشەکان و سواڵکەرەکان و دزەکان و لەشفرۆشەکان و قوماربازەکان – کە دڵدەرەوەیەکیان نییە و تووشـی سـەختترین جۆرەکانی ستەم و کڵۆڵی دەبـن. ئایـا دەتـوانین هەمـوو خەڵقەنـدەکانی خودامـان خـۆش بـوێ؟ ئەمە تاقیکردنەوەیەکی قورسە و تەنها خەڵکێکی کەم دەتوانن پێیدا تێپەڕن".

کە درێژەی بە قسەکەی دا، بینیم ناسکی و پەژارەیەک لەسەر ڕوخساری نەخش بوون، شتێکی دیکەشم بەدی کرد کە لە سۆزێکی دایکانە دەچوو.

وتم: "تۆ ڕاست دەکەیت. من بە خۆشگوزەرانی ژیام، تەنانەت نازانم کە خەڵکی ئاسایی چۆن دەژین".

شــــەمس چنگـــێ خـــۆڵی هەڵگـــرت، لە کاتێکـــدا خـــۆڵەکە لە نێـــوان ئەنگوستەکانییەوە دەهاتە خوارێ، بە هێمنی لەسەری ڕۆیشت: "گەر بتوانین بڕوا بە هەموو شتە جیاواز و دژەکانی گەردوون بهێنین، ئەوا هەموو شتێک لە یەک بۆدەقەدا دەتوێتەوە".

ئەوسا شەمس چڵەدارێکی وشکی هەڵگرت و بە دەوری داربەڕووەکەدا جغزێکـی گەورەی کێشا. کە ئەوەی تەواوکـرد، ئینجـا هەردوو بـاڵی بەرەو ئاسمان بەرزکـردەوە، وەک ئەوەی بە دەستەکانی پەتێکی نادیـاری گرتبێت، دەستی کرد بە وتنی هەر نەودونۆ ناوە جوانەکەی خـودا و هاوکـات لەنێو بازنەکەدا دەستی بە خولانەوە کرد، سەرەتا بە هێمنی و لەسەرخۆ، ئینجا مینا هەڵکردنـی شـنەی ئێـوارە. زۆری نەبـرد چەشـنی گەردەلوولێـک بە تونـدی و خێراییەوە خولانەوەکەی زۆرتر کرد. خولانەوە بە جۆشوخرۆشەکەی ئەوەندە دڵگیـر و کـاریگەر بـوو، خەریکبـوو هەسـتم دەکـرد وەک ئەوەی تێکـڕای گەردوون – زەوی و ئەستێرەکان و مانگ – لەگەڵیدا بخولێنەوە، دەستم بە تەماشـاکردنی ئەم سـەما سـەیرە کـرد و ئەو وزەیەم بیرچـووەوە کە لێـی دەدرەوشایەوە و ڕۆح و جەستەمی داگیر کردبوو.

شەمس وردەوردە خولانەوەکەی هێواش کردەوە تا بەتەواوی وەستا. کە هەناسـەی دەدا سـینگی دەهەژێ، دەموچـاوی سـپی هەڵـگەڕا، لەناکـاو وەک ئەوەی بە قووڵی دەنگی لە دوورەوە بێت، گوتی: "گەردوون یەک خەڵقەندەیە. هەموو شتێک و هەموو کەسێک بە تۆڕێکی شاردراوەی کۆمەڵە چیرۆکێکەوە بەسـتراونەتەوە. ئیـدی بـزانین یـان نـا، هەمووـمـان لە گفتوگـۆیەکی بێدەنگـدا هاوبەشـین. لەوەدا هـیچ زەرەر و زیانێـک نییە. میهرەبـان بە و تەنانەت ئەگەر قسەکانت بێ مەبەست و پاکیش بوون، چەندوچوون مەکە، چونکە پەیڤەکان کە لە زارمـانەوە هەڵـدەقولێن ون نـابن، بەڵکـو لە ڤـالاییەکی بێکۆتاییـدا بـۆ هەتاهەتـایە دەمێننەوە و لە کـاتێکی گونجاودا بۆ لامـان دەگەڕێنەوە. ئـازاریی تـاقە مرۆڤێـک هەموومـان ئـازاردەدات، خۆشـی و گەشـیی تـاقە مرۆڤێـک هەموومان دەخاتە زەردەخەنە.

یەکێ لە ڕێساکانی عەشق وا دەڵێت.

ئینجا نیگایەکی خۆتێهەڵقورتانی کردم، دەوسی نائومێدییەک لە قووڵایی چاوەکانیدا دیاربوو، دەوسی خەمێک کە پێشتر لەودا نەمدیبوو.
شەمس گوتی: "ڕۆژێ دێت تۆ لە ڕۆژهەڵات و لە ڕۆژئاوا بە دەنگی خۆشەویستی دەناسرێیت، ئەو کەسانەی کە قەت دەموچاویشتیان نەدی بێت، سرووش لە دەنگت وەردەگرن".
بە گومانەوە لێم پرسی: "چۆن دەبێت ئەوە ڕووبدات؟".
شەمس لە وەڵامدا گوتی: "لەمیانەی پەیڤەکانتەوە، بەڵام من لێرەدا دەربارەی وانەوتنەوە و وتارەکان قسەناکەم، بەڵکو دەربارەی شیعر دەدوێم".
"شیعر"، بە دەنگێکی پچڕپچڕ وتم: "ئاخر من شیعر دانانێم. من زانایەکی ئایینیم". قسەکەم زەردەخەنەیەکی شاراوەی لەسەر دەموچاوی شەمس نەخش کرد.
"هاوڕێم، تۆ دەبیتە یەکێ لە جوانترین ئەو شاعیرانەی کە دنیا دەیانناسێت".
خەریکبوو نارەزایی دەرببڕم، لێ نیگای یەکلاکەرەوەی چاوەکانی شەمس ژێوانی کردمەوە و نەمویست دەحکەی لەگەڵدا بکەم، بۆیە گوتم: "ئەوەی پێویست بێت پێکەوە دەیکەین. پێکەوە لەسەر ئەم ڕێگەیە دەڕۆین".
شەمس بە تێفکرینەوە سەری بادا و بە شێوەیەکی ترسناک بێدەنگ بوو و چاوی بڕییە ڕەنگە کاڵەوەبووەکانی ئاسۆ. کە دەستی بە قسە کردەوە بەو وشە شوومانە دەستی پێکرد کە قەت بەرۆکیان بەرنەدەدام و بەردەوام ڕۆحیان بریندار دەکردم: "هەرچەندە یەکجار حەزدەکەم لەگەڵتدا بم، لێ دەبێت خۆت بە تەنیا ئەوە بکەیت".
لێم پرسی: "مەبەستت چییە؟ بۆ کوێ دەڕۆیت؟".
شەمس بە خەمبارییەوە لێوەکانی کرژ کردەوە و چاوەکانی هەڵبڕی و وتی: "شتەکە لەدەست مندا نییە".
بایەکی سارد مینا هەواڵی ئەوەی پێ بێت کە پایز وا لە دەرگامان دەدات، لەپڕ بەسەرماندا هەڵیکرد و هەوا ساردی کرد. ئاسمانی شین و بێگەرد بە خوناوی فێنک وەک بەرکەوتنی پەپوولەیەک ختووکەدەر و ناسک، دەستی بە خوناو کرد. ئەمە یەکەم جار بوو بیرم لەوە کردەوە کە شەمس دەڕوات. ئیدی ئەوە بوو بەوای ئازاریکی تیژ لە سینگمدا.

# سوڵتان وەلەد

## قۆنیا، کانوونی یەکەم ١٢٤٥

بە بیستنی ئەو واتەواتە، ڕەنگە هەندێ کەس چێژیان وەرگرتبێت، لێ من بە بیستنیان ئازارم دەچەشت. ئاخر چۆن دەکرێ خەڵکانێک دەربارەی شتگەلێ دڵنیا نەبن و ئەوەندە داخ لە دڵ و لەخۆبایی بن؟ خەڵکێک ئەوەندە لە ڕاستییەوە دووربن، گەر ترسناک نەبن شتێکی سەیرە! ئاخر ئەوان لەو پەیوەندییە قووڵە تێناگەن کە من بە باوکم و شەمسەوە دەبەستێتەوە. ئاشکرایە کە ئەوانە قورئانیان نەخوێندووەتەوە، خۆ ئەگەر بیانخوێندایەتەوە، ئەوە دەیانزانی کە چیرۆککگەلێکی هاوشێوە هەن و باسی خێر و بەزەیی ڕۆحیی دەکەن، وەک چیرۆکی موسا و خدر.

لە سوورەتی (الکهف – ئەشکەوت)دا، زۆر بە ڕوونی باسی ئەوە کراوە. موسا پیاوێکی پەیڕەوکراو و مەزن بوو و بوو بە پێغەمبەر، سەرباری ئەوەش ڕابەر و یاسادانەرێکی بێهاوتا بوو. ئەوە بوو کە کاتی ئەوە هات هەستی کرد زۆر ئاتاجی هاوەڵێکی ڕۆحییە تا چاوی سێیەمی بکاتەوە، ئەو هاوەڵەش تەنیا خدر بوو، کە دڵدەرەوەی کۆستکەوتووان و کەسەرداران بوو.

خدر بە موسای گوت: "خودا فەرمانی پێکردم کە بە دنیادا بگەڕێم و ئەوە بکەم کە پێویستە بیکەم. تۆ دەڵێیت دەتەوێ لەگەڵمدا بێیت. جا گەر هەر دەتەوێ لەگەڵمدا بێیت، ئەوا تا خۆم بۆتی باس نەکەم، دەربارەی هیچ شتێ پرسیارم لێ مەکە".

موسا وتی: "دەمبینیت ئارام دەگرم و لە هیچ شتێکدا بێفەرمانیت ناکەم".

هەنگاویان لێکرد و لە ڕێگەدا سەریان لە چەندین شوێن دا، لێ موسا سەری لە کردەوەکانی سوڕمابوو. بە بەرچاوییەوە مێردمنداڵێکی کوشت و

پاپۆڕێکی کون کرد. موسا خۆی پێ نەگیرا و لێی پرسی: "ئەم کارە کارەساتبارانەت بۆچی کرد؟".

"ئەی پێم نەوتیت کە پرسیارم لێ نەکەیت؟".

موسا هەموو جارێ پرسیاری لێدەکرد و هاوکات تەوازۆی لێ دەخواستەوە و بەڵێنی پێدەدا کە دووبارە پرسیاری لێ نەکاتەوە، لێ بەڵێنەکەی نەدەبردە سەر. لە کۆتاییدا خدر هۆی ڕەفتارەکانی خۆی بۆ ڕوون کردەوە. موسا وردەوردە تێگەیشت کە هەندێ شت بە خراپ یان بە مایەی بەدبەختی دەردەکەون، لێ زۆر جار دەبنە مایەی خێر و خۆشییەکی لە شێوەدا بەکارەسات داپۆشراو، کاتێکیش شتەکان ڕوون دەبنەوە، ڕەنگە بۆ ماوەیەکی دوور زیانیان لێ بکەوێتەوە. ئیدی ئەو ماوە کورتەی کە لەگەڵ خدردا بوو، لە ژیانیدا بوو بە زۆرترین ئەزموونی سەرسوڕهێنەر.

وەک لەم حەکایەتە هێمادارەدا دیارە، لەم دنیایەدا هەندێ برادەرایەتی هەیە بۆ کەسانی ئاسایی ڕوون نییە، لێ ڕاستییەکەی ئەوەیە ئەو برادەرایەتییە هەندێ کەناڵی تر پێکدێنێت و دەبێتە مایەی فراوانکردنی حیکمەت و دووربینییەکی قووڵتر. شەمسیش لە ژیانی باوکمدا ئاوها دەبینم.

دەزانم خەڵکی تر بەو شێوازە شتەکە نابینن کە من دەیبینم، ئەمەش نیگەرانم دەکات. شەمس بۆ بەدبەختی شتەکان وا ئاسان ناکات تا خۆشەویستی و دۆستایەتیی خەڵکی بۆ خۆی بەدەست بێنێت. ئاخر ئەو لەبەر دەرگای تەکیێکە بە شێوەیەکی هەڕەشەئامێزەوە دادەنیشێت و هەر کەسێ بیەوێ بۆ بینینی باوکم بچێتە ژورەوە، ڕێی لێدەگرێت و لێی دەپرسێت: "بۆ دەتەوێ مەولانای مەزن ببینیت؟ ئەو دیارییە چییە کە بۆت هێناوە؟".

ئیدی میوانەکە زمانی تێکدەئاڵێت و دەکەوێتە ترمەترم، بەڵکو داوای لێبووردنیش بکات شەمس ڕێگەی نادات بچێتە ژوورەوە. هەندێ لەم سەردانیکەرانە دوای چەند ڕۆژێ دووبارە بە دەستودیاریی وەک میوەی وشکەوەکراو یان چەند دراوێکی زیو یان بەرماڵی ئاوریشم یان بەرخەکۆرپە، دەهاتنەوە. شەمس بە بینینی ئەم شتانە دەهری دەبوو و چاوە ڕەشەکانی دەبریسکانەوە و دەموچاوی سوورهەڵدەگەڕا و دووبارە دەری دەکردنەوە.

ڕۆژێکیان پیاوێک ڕقی هەستا و بە ڕووی شەمسدا هەڵشاخا: "کێ ئەو مافەی پێداویت کە دەرگای مەولانا بە ڕوومانندا دابخەیت؟ واز لەوە بێنە کە هەر کەسێ دێت و پرسیاری لێدەکەیت کە چیی لەگەڵ خۆیدا هێناوە! ئەی تۆ خۆت چیت هێناوە؟".

شەمس بۆ ئەوەی هەموویان گوێیان لێی بێت بە دەنگێکی بەرز وتی: "من نەفسی خۆم هێناوە. لەپای ئەودا قوربانیم بە سەری خۆم داوە".

پیاوەکە بە ترمەترم و بە شڵەژاوییەوە کە لە تووڕەیی زیاتر بوو، دوورکەوتەوە.

* * *

لە هەمان ڕۆژدا لە شەمسم پرسی ئاخۆ کاتێ هەموو خەڵکی بە خراپی لێی تێدەگەن و ڕێزی ناگرن، هەست بە نیگەرانی ناکات؟ بە ترسیشەوە ئەمەم پێگوت ئاخر لەم دواییەدا دوژمنێکی زۆری بۆخۆی پەیدا کردبوو.

شەمس وا دیاربوو کەوتە بیرکردنەوەوە و وەک ئەوەی ئەو شتانەی دەربارەی ئەو دەیانڵێم، بیرۆکەیەکی پێ نەبێت، گوتی: "بەڵام من هیچ دوژمنێکم نییە"، لەسەری ڕۆیشت، "ڕەنگە عاشقانی خودا ڕەخنەگر یان ڕکابەریان هەبێت، لێ دوژمنیان نییە".

به ناقایلییەوە گوتم: "بەڵێ، بەڵام تۆ لەگەڵ خەڵکیدا شەڕ دەکەیت".

شەمس بەرپەرچی دامەوە و گوتی: "من شەڕیان لەگەڵدا ناکەم، بەڵکو شەڕ لەگەڵ هەستی خۆبەزلزانینیاندا دەکەم، ئەمەیان شتێکی جیایە".

ئینجا بە هێمنی گوتی: "ئەمە ڕێسایەکە لە چل ڕێساکە: **(ئەم دنیایە لە چیایەکی بەفرگرتوو دەچێت کە دەنگی تۆ بداتەوە، هەموو ئەوەی دەیڵێیت، باش یان خراپ بە شێوەیەک لە شێوەکان بۆ لای خۆت دەگەڕێتەوە. لەبەر ئەوە گەر کەسێک بە خراپە باسی کردیت، تۆش بە هەمان شێواز بە خراپە باسی ئەوت کرد، ئەوا شتەکە خراپتر دەبێت. ئەوسا نەفسی خۆت دەبینیت لە بازنەیەکی بەتاڵدا بووەتە هێزێکی ڕقبەخش. لەبەر ئەوە گەرەکە بە درێژایی چل شەو و چل ڕۆژ دەربارەی ئەو کەسە بە شێوازێکی ناسک قسەبکەیت و بیربکەیتەوە. لە کۆتاییدا هەموو شتەکان لەگەڵ یەکتردا جیا دەبن، چونکە خۆت لە ناوەوە جیا دەبیت)**".

گوتم: "بەڵام خەڵکی دەربارەی تۆ شتی زۆر دەڵێن، تەنانەت گومان لەو پەیوەندییەی نێوان دوو پیاو دەکەن، کە ناکرێ باس بکرێ". لە کۆتاییدا خەریکبوو دەنگم لێم تێکبدات.

کە شەمس ئەوەی بیست، دەستی لەسەر قۆڵم خاوکردەوە و وەک هەمیشە زەردەخەنەیەکی ئاسوودە گرتی و ئەم چیرۆکەی بۆ گێڕامەوە"

دوو پیاو لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر سەفەریان دەکرد، گەیشتنە جۆگەلە ئاوێک کە بە هۆی بارانی زۆرەوە ئاوەکەی هەستابوو. ئەوەندەی نەمابوو لە جۆگەلەکە بپەڕنەوە، ئافرەتێکی جحێڵ و جوانیان بینی بە تەنیا وەستابوو و ئاتاجی یارمەتی بوو. دەسبەجێ یەکێ لە پیاوەکان بەرەو لای ڕۆیشت و بە باوەش هەڵیگرت و لە جۆگەلەکە پەڕاندییەوە، ئیدی لەوبەرەوە داینا و دەستی دوعاخوازیی بۆ هەڵبڕی، ئینجا کەوتنەوە ڕێ.

لە ماوەی ئەو مەودایەی لە سەفەرەکەیان مابوویان، ڕێبواری دووەم هەر بێدەنگ و گرژ بوو و وەڵامی پرسیارەکانی برادەرەکەی نەدەدایەوە. دوای چەند سەعاتێکی گرژی، ئیدی بێدەنگییەکەی شکاند و گوتی: "بۆچی دەستت بەر ئەو ئافرەتە کەوت؟ بۆی هەبوو لەخشتەت ببات! چونکە بۆ پیاو حەرامە دەستی بەر ئافرەتێکی ئاوها بکەوێت".

پیاوی یەکەم بە هێمنی وەڵامی دایەوە: "هاوڕێم، من ئەو ئافرەتەم هەڵگرت و لەوبەری جۆگەلەکە دامنا و لەوێ وازم لێی هێنا، لێ تۆ لەوساوە هێشتا هەر هەڵتگرتووە".

"هەندێ کەس ئاوهان"، شەمس گوتی، "ترس و بیرکردنەوەی لایەنگرانەیان بە شان هەڵگرتووە و ئەو بارە قورسە دەیانپلیشێنێتەوە. گەر لە دەمی یەکێکت بیست گوایا ناتوانێت لەو پەیوەندییەی نێوان من و باوکت تێبگات، پێی بڵێ با مەژگی خۆی بشواتەوە".

# ئێلا

## نۆرتامبتۆن، ١٥ی حوزێران ٢٠٠٨

بپرسیت و بڵێیت چۆن بووم بە سۆفی؟ منیش پێت دەڵێم لە نێوان شەو و ڕۆژێکدا نەبووم بە سۆفی.

ناوی ڕاستەقینەم کریگ ڕیتشارد سۆن-ە، لە شاری کینلۆ تشپێرڤی لەدایک بووم، کە بەندەرێکی دوورە و دەکەوێتە ناوچە بەرزاییەکانی ئوسکوتلەنداوە. کە ڕابردووم بیردەکەوێتەوە، بە ئەڵهایەکی زۆرەوە بەلەمی ڕاوکردن و ئەو گەنجانەم بیردەکەوێتەوە کە باری قورسی ماسییان هەڵگرتبوو، هەروەها ڕیشووی گژوگیای دەریاییم بیردەکەوێتەوە کە چون ماری سەوز شۆڕبووبوونەوە، ئەو باڵندە فیتووکەرانەی کە بە درێژایی لمی کەنارەکە دەفڕین و کرمیان هەڵدەگرتەوە، ئەو گژوگیایانەی لە هەندێ شوێنی دەگمەن و سەخت دەڕوان، هەروەها بۆنی تیژ و سوێری دەریام بیردەکەوێتەوە. ئیدی ئەو بۆنە و سەرباری بۆنی چیاکان و دەریاچەکان و ئەو دڵنیاییە خەماوییەی کە باڵی بەسەر ژیانی ئەورووپای دوای جەنگدا کێشابوو، پاشخانی منداڵیی منیان پێک هێنابوو.

لە کاتێکدا لە شەستەکانی سەدەی بیستەم جیهان لێژ بووبووەوە و ببووبوو بە شانۆی خۆپیشاندانی قوتابییان و فڕاندنی فڕۆکە و هەڵگیرساندنی شۆڕشەکان، من لە هەموو ئەوانە دووربووم و لە سووچێکی هێمن و سەوز خۆم مت کردبوو. باوکم کتێبخانەیەکی بۆ فرۆشتنی کتێبی بەکارهێنراو هەبوو، دایکمیش ئەو مەڕانەی بەخێودەکرد کە خورییەکی زۆر نایابیان هەبوو. لە منداڵیمدا هەستم بە لەزەتی ئەو تەنیاییە دەکرد کە شوانەکە تێیدا دەژیا، هەروەها ئەو هەستەی کە کتێبفرۆش هەیەتی. ڕۆژانێکی زۆر بەسەر

درەختێکی بەتەمەندا هەڵدەزنام و دیقەتی دیمەنی دەوروبەرم دەدا و پێم وا بوو کە من هەموو ژیانم لەوێ بەسەردەبەم. دڵم ئەڵهای سەرکێشی دەکرد، بەڵام کینلۆ تشپیرڤیم زۆر خۆشدەویست و بەختەوەر بووم و بڕوام بە شتە چاوەڕوانکراوەکانی ژیانی خۆم هەبوو. ئاخر چۆن بزانم کە خودا نەخشەیەکی تری داناوە؟

دوای ئەوەی گەیشتمە تەمەنی بیست ساڵ کەمتر، دوو شتم دۆزییەوە کە بۆ هەتاهەتایە ژیانمیان گۆڕی، یەکەمیان ئامێری وێنەگرتنی پیشەیی بوو، ئەوەبوو ناوی خۆم لە خولێکی فێربوونی وێنەی فۆتۆگرافی تۆمارکرد و نەمدەزانی کە خوو دەدەمە شتێ بە درێژایی ژیانم بە حەزێکی لاوەکیی دادەنێم. دووەمیان خۆشەویستی بوو. ئەوەبوو ئافرەتێکی هۆڵەندیم خۆشویست کە ناوی مارگۆ بوو کە لەگەڵ دەستە خوشکەکانیدا بە ئەورووپادا گەشتی دەکرد.

مارگۆ هەشت ساڵ لە من گەورەتر بوو، باڵابەرز و جوان و لامل بوو. خۆی بە بۆهیمی و نموونەیی و ڕادیکاڵی دادەنا و تێکەڵاوی هەردوو ڕەگەزەکەی دەکرد، چەپڕەو و ئاژاوەگێڕ و فرە ڕۆشنبیری و چالاکی بواری مافی مرۆڤ و چالاکێکی بەرهەڵستکاری ڕۆشنبیریی باو بوو، هەروەها مێینەیەکی ژینگەپارێز بوو. ئەمانە زاراوەگەلێ بوون گەر یەکێ لەبارەیانەوە پرسیاری لێ کردبام نەمدەزانی پێناسەیان بکەم، بەڵام هەر لە سەرەتاوە سەرنجم دا کە ئەوە شتێکی تر دەگەیەنێت: **ئافرەتێکی ئەمبەر و ئەوبەرکەر.** مارگۆ ئافرەتێک بوو دەیتوانی لە چەند خولەکێکدا لە نێوان دڵخۆشییەکی زێدەڕۆ و خەمۆکییەکی تەنکدا بێت و بچێت. زۆر دەمدەمی بوو و هەمیشە بەو شتە تووڕە دەبوو کە خۆی بە دووڕوویی (شێوازی ژیانی بۆرژوازییانە) لێکی دەدایەوە. هەوڵی دەدا لە هەموو وردەکارییەکانی ژیان بگەڕێت و دژی کۆمەڵگە جەنگی بەرپا دەکرد. تا ڕۆژی ئەمڕۆمان ئەوەم لە لا بووەتە مەتەڵێک کە هێشتا دەستبەرداری نەبووم و وازم لێی نەهێناوە، بەڵکو خۆم داوەتە دەست گێژاوی کەسایەتییە دەمدەمییەکەیەوە، چونکە لە خۆشەویستیی ئەودا نوقم بووبووم.

مارگۆ پینەوپەڕۆیەکی بێوێنەبوو، هەرچەندە لێوانلێو بوو لە بۆچوونی شۆڕشگێڕانە و بوێرییەکی ڕەها و داهێنەرانە، هاوکات گوڵێکی دەستکردی فشەڵ بوو. ئیدی بڕیارم دا پشتی بگرم و بیپارێزم، نەک هەر لە دنیای دەرەوە، بەڵکو لە نەفسی خۆیشی بیپارێزم. ئایا ئەوەندەی من خۆشم دەویست، ئەویش منی خۆش دەویست؟ پێم وا نییە، بەڵام دەمزانی کە ئەو بە شێوازە خۆپەرستییەکەی خۆی کە بریتی بوو لە ڕوخاندنی خود، خۆشی دەویستم.

بەم جۆرە تەمەنم بیست ساڵ بوو لە ئەمستردام گیرسامەوە، ئیدی لەوێ هاوسەرگیریمان کرد. مارگۆ کاتی خۆی بۆ ئەو پەنابەرانە تەرخان کرد کە بە هۆکاری سیاسی یان مرۆیی ڕوویان کردە ئەورووپا. بەوای کارەکەیەوە لە ڕێکخراوێک کە سەرپەرشتیی پێویستیی پەنابەرەکانی دەکرد، کۆمەکی ئەو زیانلێکەوتووانەی دەکرد کە لە هەموو شوێنێکی دنیاوە بۆ هۆڵەندا هاتبوون و ئەمیش بووبوو بە فریشتەی فریادڕەسیان و زۆر لەو خێزانانەی لە ئەندۆنیسیا و سۆماڵ و ئەرژەنتین و فەلەستینەوە هاتبوون، ناوی کچەکانی خۆیان نا مارگۆ.

لێ من ئەوندە بایەخم بە شتە گرینگەکان نەدەدا، چونکە سەرقاڵی ئەوە بووم پلەم بەرز ببێتەوە. دوای ئەوە لە کۆلێژی کارگێڕی دەرچووم، لە کۆمپانیایەکی نێودەوڵەتی کارم کرد. مارگۆ گوێی بە بارودۆخم یان مووچەکەم نەدەدا، ئەمەش وای لێکردم تەماحم بکەوێتە سەر وەدیهێنانی دەستکەتی تووڕەهات. زۆر تینووی دەسەڵاتخوازی بووم و دەمەویست دەوسی دەست و پەنجەم بەسەر هەموو دنیادا جێبهێڵم.

پلانم بۆ هەموو ژیانمان دانابوو، بڕیارمان دابوو دوای دوو ساڵ ئینجا منداڵ بخەینەوە. دوو کیژۆڵە ئەو وێنەیەیان تەواو دەکرد کە لە هزری خۆمدا بۆ خێزانێکی نموونەیی وێنەم کێشابوو. لەو بانەڕۆژەی لە بەردەممان دیاربوو دڵنیا بووم. لە وڵاتێک دەژیاین لە هەموو وڵاتانی سەر زەوی ئاسایشی زیاتر تێدا بوو، یەکێ نەبوو لەو وڵاتانەی کە ئاژاوەیان تێدا بڵاوبووبووەوە و خەڵکی وەک دارکاژێکی ئاو لێبراو بە لێشاو ڕوویان دەکردە ئەورووپا. لە هەڕەتی لاوێتی بووین و تەندروستییەکی باشمان هەبوو و یەکترمان خۆشدەویست.

ئێستا زۆر هەستەمە بڕوابکەم کە من گەیشتوومەتە تەمەنی پەنجاوچوار ساڵی و مارگۆ مردووە.

مارگۆ یەکجار لەشساغ بوو، لە سەردەمێکدا ئەو ڕووەکخۆر بوو، هێشتا ئەم وشەیە نەناسرابوو. هەوڵی دەدا خواردنی تەندروست بخوات و بەردەوام وەرزشی دەکرد و هیچ دەرمانێکی نەدەخوارد. دەموچاوە پەریئاساکەی تەندروستیی لێ دەتکا و بەردەوام جەستەی باریکەلە و لاواز بوو. بە جۆرێ بایەخی بە خۆی دەدا لەگەڵ جیاوازیی نێوان تەمەنمان، من لەو بەتەمەنتر دیاربووم.

مارگۆ بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو مردنێکی ئاسایی مرد. شەوێکیان لەدوای سەردانێکی بۆ لای ڕۆژنامەنووسێکی ڕووسی کە داوای پەنابەرێتیی کردبوو، لە گەڕانەوەدا لە ناوەڕاستی ڕێگەی خێرا ئۆتۆمبیلەکەی پەکی دەکەوێت. ئیدی شتێکی کردبوو لەگەڵ کەسێتیی ڕاستەقینەی ئەودا نەدەگونجا. ئاخر ئەو ژنێک بوو بە کەمی وابەستەی یاساکان بوو. ئیدی لەجیاتی ئەوەی چوار لایتی هەڵبکات و چاوەڕێی بەهاناهاتنەوە بکات، ئۆتۆمبیلەکەی جێدەهێڵێت و بەپێ بەرەو گوندێکی نزیک دەڕوات. چاکەتێکی خۆڵەمێشیی تاریک و پانتۆڵێکی تۆخی لە بەر بوو و هیچ ئاماژەیەکی وەک لایت یان هەر شتێک وای لێ بکات کە ببینرێ، پێی نەبوو. ئیدی بارهەڵگرێک کە لە یۆگسلافیاوە دەهات لێی دەدات. شوفێرەکە گوتبووی نەیدیوە، چونکە مارگۆ بەتەواوی لەنێو تاریکەشەوەکەدا تواببووەوە.

ڕۆژانێک گەنج بووم. خۆشەویستی چاوەکانمی بۆ ژیانێکی جوانتر کردەوە، بەڵام دوای ئەوەی ئەو ژنەی کە خۆشم دەویست لەدەستم دا، گۆڕانێکی گەورە لە شێوەمدا ڕووی دا، ئیدی نە ئەو لاوە بووم و نە ئەو پیاوە پێگەیشتووە، بەڵکو بووم بە ئاژەڵێکی سندمکراو. ئەم قۆناغەی ژیانم ناو دەنێم پیتی (س) لە وشەی (سۆفی).

هیوادارم بەم نامە درێژە بارتم گران نەکردبێت.

لەگەڵ خۆشەویستیم.

عەزیز

# گوڵی بیابانی لەشفرۆش

## قۆنیا، کانوونی دووەم ١٢٤٦

پ‌ەوای ئەو شەرمەزارییەی کە لە مزگەوتەکە تووشم بوو، ئیدی خاوەن سۆزانیخانەکە ڕێگەی نەدەدام بۆ هیچ شوێنێ دەربچم و بۆ هەتاهەتایە لە سۆزانیخانەکە بووم بە بەندکراوێک، بەڵام ئەوە بێزاری نەدەکردم، چونکە ئارەزووم لە هیچ شتێک نەمابوو.

ئەو دەموچاوەی کە بەیانیی هەموو ڕۆژێک لە ئاوێنەدا سڵاوی لێدەکردم تا دەهات زەردتر هەڵدەگەڕا، قژم شانە نەدەکرد، یان ڕوومەتەکانم هەڵنەدەگلۆفی تا ڕەنگی سووراوەکە بگرن. کچەکانی دیکە خەریکبوون لە ڕوخسارم دەڕەوینەوە لەبەر ئەوەی سەرنجڕاکێش نەبوو، دەیانگوت سەروسەکوتت وا دەکات مەعمیلەکان بتەکێنەوە. ڕەنگە قسەکەی ئەوان ڕاست بووبێت. ڕۆژێکیان پێیان گوتم کە مەعمیلێک سوورە لەسەر ئەوەی بمبینێت، بۆیە هەستم بە دڵنیاییەک کرد.

کاتێ بۆم دەرکەوت کە ئەوە پێپرسە، ترسم لێنیشت. کە لە ژوورەکەدا بە تەنیا لەگەڵیدا بووم، لێم پرسی: "حەسحەسێکی وەک تۆ لێرە چی دەکات؟".

بە دەنگێکی قورسی هێمادارەوە گوتی: "دەی باشە. خۆ هاتنی من بۆ سۆزانیخانەیەک لە چوونی لەشفرۆشێک بۆ مزگەوت نامۆتر و سەیرتر نییە".

گوتم: "من دڵنیا بووم کە لەو ڕۆژەدا دەتەویست بمکوژیت. من بە ژیانم قەرزاری شەمسی تەورێزیم".

وتی: "جارێکی تر لە بەردەم مندا ناوی ئەو زەندیق و کافرە قێزەونە بە دەمتدا نەیەت".

"نەخێر ئەو خوانەناس نییە"، نازانم چیم بەسەرهات، لێ گوێم لە خۆم بوو ئاوها دەڵێم: "لەو ڕۆژەوە شەمسی تەورێزی چەند جارێ سەردانی کردووم".

"ئاوها! دەروێشێک و لە سۆزانیخانە بێت!"، پێپرس مشەمشێکی لێوە هات، "ئەوەم لا سەیر نییە".

وتم: "شتەکە وا نییە. ئەوەی تۆ بیری لێدەکەیتەوە قەت وا نییە".

لەوە پێش باسی ئەوەم بۆ کەس نەکردبوو، ئیدی نازانم چی وای لێکردم کە ئێستا ئەوە بە پێپرس بڵێم، بەڵام شەمس لەم چەند مانگەی دواییدا هەموو هەفتەیەک سەری لێدەدام. نازانم چۆن دەیتوانی بێ ئەوەی کەسێک ببینێت بە تایبەتی خاوەن سۆزانیخانەکە، دزە بکات و بێتە ناو سۆزانیخانەکەوە. ڕەنگە کەسێکی تر مەزەندەی ئەوەی بکردایە کە جادووی ڕەش دەکات، بەڵام دەمزانی کە ئەمە ڕاست نییە و شەمس پیاوێکی باشە- بڕوادارە – و بەهرەی تایبەتی هەیە. جگە لە دایکم لە کاتی منداڵیمدا، شەمس تاکە کەسێک بوو کە بەبێ بەرانبەر بە ناسکی و نیانی مامەڵەی دەکردم. هەر ئەو بوو فێری کردم گەر شتەکە گەیشتە ئەوپەڕی خراپیش، نائومێد نەبم. کە پێم گوت کەسێکی وەک من ناتوانێت لە ڕابردووی خۆی ڕزگار بێت، یەکێ لە ڕێساکانی بیرهێنامەوە کە دەڵێت: (**ڕابردوو لێکدانەوەیە و ئاییندە خەیاڵە. دنیا وەک ئەوەی هێڵێکی ڕاست بێت لەمیانەی ڕۆژگارەوە ناجووڵێت، تا لە ڕابردووەوە بەرەو ئاییندە بڕوات، بەڵکو ڕۆژگار لەمیانەی ئێمەو لە ناوەوەماندا لە چەندین لوولەپێچی بێکۆتاییدا دەجووڵێت. هەتاهەتایی زەمەنی ڕەها ناگەیەنێت، بەڵکو نەمریی دەگەیەنێت. گەر ویستت ڕووناکیی هەتاهەتایی تاقی بکەیتەوە، ئەوا دەبێت ڕابردوو و ئاییندە لە ئاوەزت دەربکەیت و لەنێو چرکەساتی ئێستادا بژییت**).

شەمس لەسەر قسەکەی بەردەوام بوو: "وەک دەبینیت، ئەم ساتەی ئێستا هەموو ئەوەیە کە بووە و هەموو ئەوەشە کە دەبێت. کاتێ لەم ڕاستییە تێدەگەیت، ئیدی شتێ نامێنێت لێی بترسیت، ئەوسا دەتوانیت هەتاهەتایە ئەم سۆزانیخانەیە بەجێ بهێڵیت".

* * *

پێپرس سەیری دەموچاوی دەکردم. وەک ئەوەی لە ژوورەکەدا کەسێکی دیکەمان لەگەڵدا بێت، چاوی ڕاستەی بەرەو لاوە خێلکردەوە، کەسێک کە من نەمدەبینی، ئەمەش ترساندمی.

زانیم ئیدی نابێت باسی شەمس بکەم، قاپێ بیرەم دایێ و بە پەلە هەڵیقوڕاند.

"کەواتە شارەزاییت لە چی هەیە؟"، دوای ئەوەی پێپرس قاپێکی دیکەی بیرەی خواردەوە، لێی پرسیم: "ئەرێ ئێوەی کچان بەهرەیەکی تایبەتیتان نییە؟ ئایا سەمای ڕۆژهەڵاتی دەزانیت؟".

وتم بەهرەیەکی لەم بابەتانەم نییە، ئەو بەهرانەیش کە لە ڕابردوودا هەمبوون، دوای ئەوەی تووشی نەخۆشییەکی نادیار بووم، لەدەستم دان. ئێ ئەگەر خاوەن سۆزانیخانەکەش بژنەوێت شتی ئاوها بە یەکێک لە مەعمیلەکان دەڵێم، ئەوا هەر دەمکوژێت، لێ ئیدی گوێی پێ نادەم. هیوام دەخواست کە پێپرس ئەم شەوەی لەگەڵ کچێکی تردا بەسەر ببات، بەڵام پێپرس هیوابڕاوی کردم، چونکە دەستی بە سەربادان کرد و گوتی کە ئەو گوێ بەوە نادات. ئینجا کیسەیەکی دەرهێنا و ماددەیەکی قاوەیی سوورئامالی ڕژاندە ناو لەپی و هاویشتییە دەمییەوە و دەستی بە جوینی کرد، ئینجا لێی پرسیم: "ئایا کەمێکت ناوێ؟".

سەری نەخێرم لەقاند. ئاخر دەمزانی ماددەکە چییە.

"تۆ نازانیت چیت لەدەست داوە"، کە لەسەر تەختەخەوەکە ڕاکشا جەستەی سڕبووی ڕادەستی تلیاکەکە بوو.

لەو ئێوارەیەدا، پێپرس دوای ئەوەی بەوای بیرەکە و حەشیشەکەوە هەستی بە خاوبوونەوە کرد، بە شانازییەوە دەستی بە باسکردنی ئەو کارەساتانە کرد کە لە مەیدانەکانی جەنگدا بینیبوونی. وتی هەرچەندە کە جەنگیزخان مردووە و لاشەکەی داڕزاوە، بەڵام هێشتا سێبەر و تارمایی ئەو لەگەڵ سوپاکانی مەغۆلدایە. هەر تارمایییەکەی ئەوە سوپای مەغۆل هاندەدات پەلاماری کاروانەکان بدات و دێهاتەکان تاڵان بکات و داگیریان بکات، ئافرەتان و پیاوان سەرببڕێت. ئینجا دوای ئەوەی سەدان کەس دەکوژران و بریندار دەبوون و دەیان کەس دوا هەناسەیان دەدا. باسی ئەو بێدەنگییەی بۆ کردم

کە وەک سیپاڵێکی تەنک لە شەوانی زستانی سارددا باڵی بەسەر مەیدانی جەنگدا دەکێشا. بە دەنگێکی ئاڵۆز گوتی: "ئەو بێدەنگییەی کە دوای کارەساتێکی گەورە باڵ دەکێشێت لە هەموو ئەو دەنگە بیستراوانەی سەر زەوی هێمنترە".

بە ورتەورت گوتم: "شتەکە زۆر خەمین دیارە".

لەناکاو قسەکان چکیان کرد، ئیدی شتێ نەبوو قسەی لەسەر بکەین. قۆڵی گرتم و بەرەو سەر جێخەوەکە پاڵی نام و جلەکانی لە بەر داکەندم. چاوەکانی بێشەرمانەتر و دەنگی بەرزتر بوو. بۆنی تێکەڵەیەکی لە بۆگەنی حەشیش و ئارەقە و برسێتیی لێدەهات. مستەکۆڵەیەکی توندی لێدام. هەوڵم دا خۆم بخەمە لاوە و ڕانەکانم خاوبکەمەوە تا ئازارە زۆرەکەم سووک بکەمەوە، بەڵام بە هەردوو دەستی فشارێکی توندی خستە سەر سینگم و لە شوێنەکەی خۆم وشکی کردم. ئیدی وەک بووکەڵەیەکی بزواو کە دەستێکی نادیار بیجووڵێنێت بە بانمەوە دەیهێنا و دەیبرد تا ڕژاندییە ناوم. دیاربوو کە ئەو تووڕەیە و گێلانە دەجووڵایەوە. ترسام کە دووبارە بکەوێتەوە سەر باری ڕەپبوون، بەڵام لەپڕ هەموو شتێ کۆتایی هات. هێشتا لەبانم بوو و بە ڕقەوە دیقەتی دەدام، وا دیاربوو ئەو جەستەیەی کە پێش چەند چرکەیەک ورووژاندبووی، ئەمێستا بووبوو بە مایەی قێزهاتنەوەی.

"جلەکانت لە بەر بکە"، فەرمانی پێدام و خۆی خستە لاوە.

جلەکانم لە بەر کرد و بە تیل چاو سەیریم دەکرد ئەویش کەمێ تلیاکی خستە دەمییەوە و گوتی: "دەمەوێ لە ئێستا بەدواوە ببیتە دۆستم". بەدەم قسەوە قەپۆزی بەرەو دەرەوە دەرپەڕاند.

ڕووی نەدابوو کە مەعمیلەکان داوای شتێکی وام لێ بکەن. خۆم دەمزانی ئەم جۆرە شتە چارەسەر بکەم، ئیدی بیرۆکەیەکی درۆم هەڵدەبەست و وام پیشان دەدا کە گوایا لەو زیاتر خزمەتی کەسی تر ناکەم و دۆستی ئەوم، بە مەرجێ بۆ ڕازیکردنی خاوەن سۆزانیخانەکە پارەیەکی زۆرتر بدات، بەڵام ئەمڕۆ نەمویست خۆم ئاوها پیشان بدەم.

وتم: "ناتوانم ببم بە دۆستت، چونکە بەم زووانە ئەم سۆزانیخانەیە جێدەهێڵم".

پێپـرس وەک ئەوەی سـەمەرەترین شـتی لە ژیانیـدا بیـستبێت، لە قاقـای پێکەنینی دا، ئینجا بە دڵنیاییەکی تەواوەوە وتی: "ناتوانیت ئەوە بکەیت".

دەمزانی کە نابێت بەرەو ڕووی ببمەوە، بەڵام خۆم پێ بەرزەوت نەکرا و گوتم: "من و تۆ ئەوەندە جیاوازیمان نییە. لەمەوبەر هەریەکەمـان شتگەلێکمان کـردووە زۆر لێـی ژێـوانین، بەڵام تـۆ بەوای پـێکە و ڕێوشـوێنی مـامتەوە بە حەسحەس (پاسەوانی شەوانە) دامەزراویت، لێ من مامێکم نییە پشتم بگرێت".

دەموچـاوی پێپرس وشـک هەڵگەڕا، لە تووڕەییـان چاوە ساردوسـڕەکانی کـرانەوە. بەرەو لام تەکـانی دا و بە پـرچ ڕایکێشام. بە گرمەگـرم گـوتی: "مـن لەگەڵتدا نەرم بووم، تۆ خۆت بە چی دەزانیت؟".

زارم هەڵێنـا تـا شـتێ بڵـێم، بەڵام ئـازارێکی تیـژ بێـدەنگی کـردم. پێپـرس مـستەکۆڵەیەکی توندی بە دەموچاومدا کێشا و بەرەو دیـوارەکە ڕەتـی پێدام. ئەمە یەکەم جار نەبوو ئاوهـا لێم بدەن، مەعمیلێکی زۆر لێیـان دابووم، بەڵام نەک بەم دڵڕەقییە.

* * *

پێپرس لە سەر زەوییەکە تەختی کردم و بە جنێودان بە توندی بە پێڵەقە کەوتە وێـزەی باسـکەکانم و لاقەکـانم. هەسـتم کـرد لە ژیانمـدا سـەمەرەترین ئەزموونم بینی. لەو ساتەدا پێچم دەخوارد و ئازارم دەچەشت، جەستەم لەبەر زەبری هەر لێدانێکدا دەپلیشایەوە، ئیدی ڕۆحـم - یان وام هەسـت دەکرد کە ئەوە ڕۆحمە- لە جەستەم جیادەبێتەوە و دەبم بە کۆلارەیەکی کاغەزینی ئازاد.

دوای کەمەکێک لە بۆشاییدا دەستم بە خـولانەوە کـرد، ئیدی وەک ئەوەی تـووڕدرابێتمە نێـو سـەرەتای دروسـتبوونێکی هێمـنەوە و بەر هـیچ شـتێک نەکەویت و شوێنێکیش نەبێت پەنای بۆ ببەیت، بە ئاسانی دەستم بە خـولانەوە کرد و بەسەر پەرێزی گەنمی تازە درەوکراودا فڕیم. لەوێ (با) لەچکی سـەر کچانی جوتیـاری دەفڕاند، لە شەویشدا لێرەولەوێ گوڵەئەسـتێرەکان چەشـنی ئـاگری یـاری تروسـکاییان دەدا. وا دیـاربوو خەریکبـووم دەکەوتـم، بەڵام مـن ڕووەو حەوا دەکەوتم، بەرەو ئاسمانی قووڵ و بێبن.

ئاخۆ من لە گیانەڵادا بووم؟ ئەگەر ئەمە مردن بێت، ئیدی نامترسێنێت. کەمێ پەژارەکەم سووک بوو. لە شوێنێکی پاک و ڕەها سووک کەوتم، ناوچەیەکی ئەفسووناویی وا بوو لە توانای هیچ شتێکدا نەبوو بەرەو خوار ڕامبکێشێت. لەناکاو زانیم کە من لە سەختترین دۆخی ترسدام، کەچی لە نەترسانی خۆم سەرم سوڕما. ئەی هەر ترسی ئەو ئازاردانە نەبوو وای لێکردم بە درێژایی ئەم ماوەیە نەوێرم سۆزانیخانەکە جێ بهێڵم؟ ئیدی مادام لە مردن ناترسم، بە خۆشحاڵییەوە زانیم کە من ئەم کونی جرجانە جێدەهێڵم.

شەمسی تەورێزی ڕاستی دەوت، تەنها پیسییەک ئەو پیسییەیە کە لە ناوەوەی مرۆڤدا مۆڵی خواردووە. چاوەکانم نوقاند و کەسێتییەکەی ترمم وێناکرد، پاک، تۆبەکار، گەنج. ئیدی سۆزانیخانەکەم بەجێ هێشت و دەستم بە ژیانێکی نوێ کرد، کە پڕبوو لە لاوێتی و بڕوابەخۆبوون، ژیانێک لێوانلێو لە ئاسایش و ئارامی و خۆشەویستی. هەرچەندە خوێنم لەبەر دەڕۆیشت و باسکەکانم تریوەتریویان دەکرد، بەڵام دیدێکی دڵبزوێن و یەکجار ڕاستەقینە بوو. بێ دەستی خۆم، بزەم کەوتە سەر لێوان.

# کیمیا

## قۆنیا، کانوونی دووەم ١٢٤٦

بەتەمابووم دەربارەی قووڵترین ئاستەکانی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز لەگەڵ شەمسی تەورێزی قسە بکەم و پرسیاری لێ بکەم، لێ چەند هەفتەیەک بوو هەلم بۆ هەڵنەدەکەوت. هەرچەندە ئێمە لەژێر یەک میچدا دەژیاین، بەڵام قەت چاومان بە یەکتر نەدەکەوت. ئەم بەیانییە خەریکی حەوشەماڵین بووم، لە تەنیشتمەوە پەیدا بوو و وام بە خەیاڵدا هات کە سەرودڵی لە دۆخێکدایە دەکرێ قسەی لەگەڵدا بکرێ. ئەم جارە نەک هەر توانیم بۆ ماوەیەکی زۆرتر قسەی لەگەڵدا بکەم، بەڵکو توانیم تەماشای چاوەکانیشی بکەم.

"کیمیای ئازیزم، کاروبار چۆن دەڕوات؟"، بە خۆشییەوە پرسیی.

شەمس وەک ئەوەی هەر ئێستا لە خەو ڕابووبێت یان خەونێکی دیکەی دیبێت، خاووخلیچک دیاربوو. زانیبووم کە خەون دەبینێت و ئەمێستا فێربووبوو ئاماژەکانی لێکدەدایەوە. ئاخر هەر جارێ خەونی دیبا ڕەنگی زەرد هەڵدەگەڕا و چاوەکانی خەواڵوو دەبوون.

"بەم زووانە زریانێک هەڵدەکات"، شەمس ورتەورتێکی کرد و چاوی بەرەو ئاسمان هەڵبڕی کە خەریک بوو کرێوەیەکی خۆڵەمێشی دەکرد و یەکەم بەفربارینی ساڵەکەی ڕادەگەیاند.

پێم وا بوو هەلەکەی لەبارە تا ئەو پرسیارەی لێ بکەم کە دەمێ بوو لە خەیاڵمدا بوو. بە وریاییەوە وتم: "لە یادمە کاتێ پێتگوتم کە هەموومان بەپێی قووڵیی بیرکردنەوەمان لە قورئان تێدەگەین؟ لەوساوە دەمەویست دەربارەی ئاستی چوارەم پرسیارت لێ بکەم".

شەمس ئاوڕی لێ دامەوە و خەریکبوو نیگای ڕوخسارم بسووتێنێت. حەزم دەکرد بە بایەخەوە تەماشام بکات، چونکە تا دەهات قۆزتر دەهاتە بەرچاوم، بە تایبەتی ئەو دەمەی لێوەکانی کرژ دەکردەوە و کەمێ تەوێڵی تێکدەنا.

گوتی: "ناکرێ وەسپی ئاستی چوارەم بکرێ، چونکە دوای ئەوە قۆناغێک هەیە زمان لە ئاستیدا دەستەوسانە. کاتێ دەچیتە هەرێمی عەشقەوە ئیدی حەوەجەی زمان نابێت".

وتم: "ئومێدەوارم ڕۆژێ بێت بچمە نێو هەرێمی عەشقەوە"، دەسبەجێ شەرم دایگرتم، بەڵام لەسەری ڕۆیشتم: "مەبەستم ئەوەیە تا بتوانم قورئان بە دیدێکی قووڵترەوە بخوێنمەوە".

سووکە بزەیەکی سەیر لەسەر لێوەکانی شەمس نەخش بوو و گوتی: "گەر ئەوە لە ناوەوەتدا خۆی مت کردبێت، دەتوانیت ئەوە بکەیت، هەروەها دەتوانیت لە شەپۆلی چوارەمدا خۆت نوقم بکەیت تا دەگەیتە جۆگەلەکە".

من ئەم هەستە تێکەڵەیەم بیرچووبووەوە کە جگە لە شەمس کەسێکی تر نەیدەتوانی بیورووژێنێت. ئەو دەمەی بە تەنیشتییەوە دەوەستم، هەست دەکەم کیژۆڵەیەکم و سەرلەنوێ فێری بنەماکانی ژیان دەبم، یان ئافرەتێکم و ئامادەم گڕی ئاگری ژیان لە منداڵدانی خۆم بەربدەم.

لێم پرسی: "مەبەستت لەوە چییە ئەگەر لە ناوەوەتدا خۆی مت کردبێت؟ مەبەستت چارەنووسە؟".

"بەڵێ ئەمە ڕاستە"، شەمس سەری لەقاند.

"بەڵام واتای چارەنووس چییە؟".

"ناتوانم پێت بڵێم چارەنووس چییە. هەموو ئەوەی دەربارەی چارەنووس بتوانم بۆتی باس بکەم لە یەکێ لە چل ڕێساکەی عەشقدا بەرجەستە دەبێت: **(چارەنووس ئەوە ناگەیەنێت کە ژیانت بە چارەنووسێکی حەتمییەوە بەندە، بۆیە گەر هەموو شتەکان بۆ چارەنووس جێ بهێڵیت و هاوبەشی لە ژەنینی مۆسیقای گەردوون نەکەیت، بەڵگەی نەزانینی ڕەهایە. مۆسیقای گەردوون هەموو شوێنێک دەگرێتەوە و لە چل ئاستی جیاواز پێکدێت. چارەنووسی تۆ**

**ئەو ئاستەیە کە ئاوازی خۆتی تێدا دەژەنیت، ڕەنگە ئامێری مۆسیقاکەت نەگۆڕێت، بەڵکو ئەو پلەیە دەگۆڕێت کە لە ژەنینیدا دەستڕەنگینیت)".**

بە نیگایەکی شڵەژاوەوە تەماشایم کرد، چونکە شەمس هەستی کرد پێویستم بە لێکدانەوەی قسەکەیەتی. دەستی خستە سەر دەستم و بە ناسکی گوشیی و بە دووچاوی قووڵ و خومارەوە گوتی: "با چیرۆکێکت بۆ بگێڕمەوە".

ئەمە چیرۆکەکەیە کە بۆی گێڕامەوە:

ڕۆژێکیان کچێکی جحێڵ دەربارەی چارەنووسی خۆی پرسیاری لە دەروێشێک کرد. دەروێشەکە وتی دەی با پێکەوە بڕۆین و چاوێک بە دنیادا بگێڕین. ئەوەندەی نەبرد تووشی کەژاوەیەک بوون، بکوژێکیان بۆ مەیدانێک دابووەپێش تا لەسێدارەی بدەن. دەروێش پرسیی: "ئایا ئەم پیاوە لەبەر ئەوە لەسێدارە دەدرێ، چونکە یەکێک بۆ کڕینی ئەو چەکەی کە ئەم یەکێکی پێ کوشتووە، پارەی پێداوە؟ یان لە کاتی تاوانەکەدا یەکێک ڕێی لێ نەگرتووە تا تاوانەکە نەکات؟ یان لەبەر ئەوەی دواجار دەستگیر کراوە؟ ئایا لەم مەسەلەیەدا هۆ و ئەنجام لە کوێن؟".

قسەکەم پێی بڕی و گوتم: "ئەم پیاوە بۆیە لەسێدارە دەدرێ، چونکە ئەوەی کردوویەتی کارێکی قێزەونە و ئەمەش پاداشتی کردەوەکەیەتی. کەواتە هۆکار هەیە و ئەنجامیش هەیە. شتی باش هەیە و شتی خراپیش هەیە، لە نێوان هەردووکیانیشدا جیاوازی هەیە".

"هێی کیمیای جوان"، شەمس وەک ئەوەی لەپڕ ماندوو بووبێت بە دەنگێکی نەرم وەڵامی دایەوە، "تۆ حەزت لە جیاکردنەوەیە، چونکە پێت وایە ئەو جیاکردنەوەیە ژیان ئاسان دەکات. ئەی ئەگەر شتەکان بە شێوەیەکی ڕوون نەبوونایە؟".

"بەڵام خودا داوامان لێدەکات کە ڕوون بین، ئەگینا چەمکی حەڵاڵ و حەرام نەدەبوون، بەهەشت و دۆزەخیش نەدەبوون. ئەوە بێنە بەرچاوت گەر

نەتوانیت بە ئاگری دۆزەخ خەڵکی بترسێنیت، یان بە چوونە بەهەشت پاداشت نەکرێن و هان نەدرێن، ئەوە لە دنیادا خراپەکاری زۆرتر دەبوو".

بەفرەکە بەدەم باوە پەرتدەبوو، شەمس داچەمایەوە تا لەچکەکەم توندبکاتەوە. کەمەکێک بە پێوە وشک وەستام، بۆنێکی خۆشی لێدەهات کە تێکەڵەیەک بوو لە بۆنی درەختی سەندەل و کارەمان، سووک وەک بۆنی خاکی پاش باران. هەستم بە گڕێکی گەرمی نێو هەناوم و شەپۆلێکی ئارەزوو لە نێوان لاقەکانم کرد. شتەکە سەیر و تێدامان بوو، بەڵام ئەو بە هیچ جۆرێ تێدا نەمابوو.

"لە عەشقدا سنوورەکان تێکەڵ دەبن"، شەمس بەدەم قسەوە بە جۆرە میهر و بایەخێکەوە تێی دەڕوانیم.

تۆ بڵێیت دەربارەی عەشقی خودایی بدوێت یان عەشقی نێوان ئافرەت و پیاو؟ یان ئاماژە بۆ هەردووکیان دەکات؟ ئەی شتێک هەیە کە ناوی (ئێمە) بێت؟

شەمس بەبێ ئەوەی ئاگای لە غایلەکانی من بێت، لەسەر قسەکانی ڕۆیشت و گوتی: "بە لای منەوە حەڵاڵ و حەرام گرینگ نین. من حەزدەکەم ئاگری دۆزەخ بکوژێنمەوە و ئاگر لە بەهەشت بەربدەم تا خەڵکی لەپای خۆشەویستییەکی پاک و بێگەرددا، خودایان خۆشبوێ".

وتم: "گەرەکە لەنێو خەڵکی باسی ئەم شتانە نەکەیت. خەڵکی خراپن، ئەوەی تۆ دەیڵێیت هەموویان تێناگەن".

لەسەر ڕوخساری شەمس بزەیەک دەرکەوت کە نیشانەی ئازایەتی و بوێریی دەگەیاند. ئیدی ڕێگەم پێدا دیلم بکات، ناولەپە گەرم و قورسەکەی خستە ناو لەپم.

"ڕەنگە تۆ ڕاست بکەیت، بەڵام پێت وا نییە کە ئەوە زاتێکی گەورەترم پێدەدات تا بە ئاشکرا بۆچوونی خۆم دەرببڕم؟ سەرباری ئەوە، ئەو کەسانەی کە کەچبین و گوێشیان گرانە. بە هەرجۆر بەوای گوێچکە داخراوەکانیانەوە، وای دادەنێن هەموو ئەوەی من دەیڵێم کفرێکی تەواوە".

"هەموو ئەوانەی بە منی دەڵێیت شیرین و جوانن".

شـەمس نیگـایەکی کـردم کە نیـشانەی بـاوەڕنەکردن و تـا ڕادەیەک سەرسوڕمان بوو، لێ من لەو پتر سەرم سوڕما، ئاخر چۆن دەکرێ شتێکی ئاوها بڵێم؟ تۆ بڵێیت جلەوم بۆ هەستی خۆم شل کردبێت؟ دیارە جنۆکەیەک یان شتێکی لەو جۆرە دەستی لێ وەشاندووم.

"بەداخەوەم، باشتر وایە ئێستا بڕۆم"، بەدەم قسەوە ڕاپەڕیم.

لە شـەرماندا ڕوومەتەکـانم داگیرسـابوون، بەوای ئەو شـتانەی کە وتبوومان و ئەوانەشی کە نەمانوتبوون دڵم کەوتبووە خورپەخورپ. بە پەلە لە حەوشەکە بەرەو ماڵەوە ڕۆیشتم، بەڵام کاتێ ڕامدەکرد، هەرئەوەتا زانیم کە لە دالآنەکە تێپەڕیوم. ئیدی لەمەولا ناتوانم ئەو ڕاستییە فەرامۆش بکەم کە پێی گەیشتووم: ئەویش ئەوەیە کە من شەمسی تەوریزیم خۆشدەوێ.

# شەمس

## قۆنیا، کانوونی دووەم ١٢٤٦

بۆ هەندێ کەس دووزمانی و ناوزڕاندنی خەڵکی و جوێن پێدانیان، سروشتی دووەمن. واتەوات و پڕوپاگەندەی زۆرم دەربارەی خۆم پێگەیشتوونەتەوە. لەوساوە هاتوومەتە قۆنیا، قسەوباسی هەڵبەستراوی زۆر بڵاوبوونەتەوە، بەڵام بەوە سەرم سوڕنامێنێت. هەرچەندە قورئان دەڵێت کە دووزمانی و ناتۆرەهەڵبەستن بۆ خەڵکی گوناهێکی گەورەیە، لێ زۆربەی بەشەر، مەگەر چۆنها، دەنا هەوڵنادەن لەم بارەیەوە خۆیان بەرزەوت بکەن. ئەوان واز لە لاقرتێکردن بە سمێڵە تاشراوەکەم ناهێنن، یان بەدوای ئەو ئافرەتە زیناکارانەدا دەگەڕێن تا بەردبارانیان بکەن، لێ کاتێ شتەکە دێتە سەر دووزمانی کە لای خودا گوناهێکی گەورەیە، نازانن گوناهێکی گەورە دەکەن.

هەموو ئەمانە چیرۆکێکم بیردەخەنەوە.

ڕۆژێک پیاوێک لە سۆفییەک نزیک دەبێتەوە و بە هەناسەبڕکێ پێی دەڵێت: "هۆ سۆفی، ئەها تەماشای ئەوێ بکە، ئەوانە سینییان پێیە".

سۆفییەکە بە هێمنی وەڵامی دایەوە: "جا ئەوە چ پەیوەندییەکی بە ئێمەوە هەیە؟ ئایا شتەکە تایبەتە بە ئێمەوە؟".

پیاوەکە هاواری کرد: "ئاخر ئەوانە ئەو سینییانە بۆ ماڵی ئێوە دەبەن. ئەی هێشتا شتەکە پەیوەندیی بە تۆوە نییە؟".

مەخابن! خەڵکی بەردەوام چاویان بڕیوەتە سەر سینیی ئەوانی تر، جا لەبری ئەوەی خەریکی کاروباری تایبەتی خۆیان بن، بڕیار لەسەر ئەوانی دیکە دەدەن. سەرم لەو شتانە سوڕدەمێنێ کە هەڵیدەبەستن! ئاخر کاتێ گومان لە یەکێک دەکەن و ناوی دەزڕێنن، خەیاڵی سەرکێشیان سنوور

تیدەپەڕێنێت. لەم شارەدا هەندێ پێیان وایە کە من سەرکردەیەکی نهێنیی گرووپێکی تلیاکییەکانم، بەڵکو هەندێکیان لەوە دوورتر دەڕۆن و بانگەشەی ئەوە دەکەن کە گوایا من کوڕێکی دیکەی ئیمام ئیسماعیلیم لە قەڵای ئەڵەموت، هەروەها دەڵێن کە من خەریکی ئەفسوون و جادووی ڕەشم و نەفرەت لە هەر کەسێک بکەم دەسبەجێ دەمرێت، هەروەها هەندێکی دیکە تۆمەتێکی قێزەونیان خستووەتە دووم کە گوایا جادووم لە ڕۆمی کردووە، جا بۆ ئەوەی ئەم جادووە بەتاڵ نەبێتەوە، ناچارم کردووە کە بەرەبەیانی هەموو ڕۆژێ شۆربای مار بخوات.

کاتێ ئەو چەنەچەنە دەژنەوم، پێدەکەنم و جێیان دەهێڵم. ئاخر لەوە زیاتر چیم لەدەست دێت؟ ئەو ڕقەی ئەوان هەڵیان گرتووە چ زیانێک بە دەروێشێک دەگەیەنێت؟ ئەگەر دەریا هەموو دنیا قووت بدات، مراوی چ باکی هەیە؟

بەڵام من هەست دەکەم هەندێ کەسی دەوروبەرم پەژارە دایگرتوون، بە تایبەتی سوڵتان وەلەد، کە لاوێکی ژیرە و دڵنیام بەم زووانە دەبێتە یارمەتیدەری باوکی. ئینجا کیمیا، کیمیای جوان.. کە ئەویش دوودڵ دیارە، بەڵام لەنێو هەموو ئەم زۆربڵێییەدا لەهەمووی خراپتر ئەوەیە کە تانەوتەشەرێکی زۆر بەر ناوبانگی ڕۆمی دەکەوێت. ئاخر ئەو وەک من ڕانەهاتووە قسەی ناشیرینی خەڵکی بژنەوێت. کە دەبینم هەندێ کاڵفام قسەی سووکی لەبارەوە دەکەن، خەمبار دەبێت، زۆر ئازار دەکێشم. لە ناخی مەولانادا جوانییەکی یەکجار زۆر هەیە، بەڵام لە ناوەوەی مندا بڕێکی جوانی و بڕێکی دزێوی هەیە، بۆیە من لەو زیاتر دەتوانم مامەڵە لەگەڵ کرێتی خەڵکیدا بکەم، بەڵام زانایەکی سەنگین کە لەگەڵ پەروەشی و بەرەنجامی لۆژیکی ڕاهاتبێت، چۆن بتوانێت بەرەنگاری قسەی پڕوپووچی نەزانان ببێتەوە؟

سەیر نییە کە محەمەد پێغەمبەر وتوویەتی: "من بەزەییم بە سێ جۆرە کەسدا دێتەوە: ئەو دەوڵەمەندەی سامانەکەی لەدەست داوە، ئەو بەڕێزەی کە ڕێزی لەدەست داوە، ئەو زانایەی نەفامان دەوریان داوە".

ڕەنگە ئەوە لە قازانجی ڕۆمیدا بێت. ناوزڕاندن ڕەگەزێکی ئازاربەخشە، بەڵکو بۆ گۆڕینی ناوەوەی ڕۆمی پێویستە. ئەوێک بە درێژایی ژیانی هەموان ڕێزیان لێگرتبوو و سەرسامی بوون و لاساییان دەکردەوە و خاوەن ناوبانگێکی بێگەرد بوو، ئێستا نازانێت چۆن دەبێ خەڵکی خراپ لێی تێبگەن و ڕەخنەی لێبگرن. قەت هەستی بەو لاوازی و تەنیاییە نەکردووە کە ناوبەناو خەڵکی تر هەستی پێدەکەن، خۆ کەسیش نەفسی بەرزی ئەوی نەڕووشاندووە، بەڵام ئەو ئاتاجی ئەوەیە. لەگەڵ ئەوەی ناوزڕاندن و قسەبۆهەڵبەستن ئازاربەخشە، بەڵام بۆ سۆفییەکی گەڕیدە سوودبەخشە، ئەمەی خوارەوە ڕێسای سییەمینە: **سۆفیی ڕاستەقینە ئەوەیە، تەنانەت گەر لە هیچیش تاوانبار بکرێ و لە هەموو لایەکەوە هێرشی بکرێتە سەر، ئەو تەنها وشەیەکی ناشیرین بەرەو ڕووی ڕەخنەگرەکانی ناکاتەوە و بە ئارامییەوە بەرگەدەگرێت. سۆفی گازاندە لە کەس ناکات. ئاخر چۆن دەکرێ دوژمنێک یان ڕکابەرێک یان تەنانەت (ئەوانی دیکەیەک) هەبن، لە کاتێکدا لە پلەی یەکەمدا (نەفسێک) نەبێت؟ چۆن دەکرێ یەکێک هەبێت گلەیی لێ بکات، لە کاتێکدا جگە لە (تاک و یەکتا) کەسی تری تێدا نییە؟**

# ئێلا

## نۆرتامبتۆن، ١٧ی حوزێران ٢٠٠٨

بـاوانەکەم ئـێلا، ئەوسـا بەوپەڕی نیـانییەوە داوات لێکردبـووم کە دەربارەی خۆم زۆرترت بۆ باس بکەم. لە ڕاستیدا ئاسان نییە دەربارەی ئەم ماوەیەی ژیانمت بۆ بنووسم، چونکە هەندێ شتم دێنێتەوە یاد، نامهەوێ دووبارە بیری خۆمیان بێنمەوە. لەگەڵ ئەوەشدا بۆتیان باس دەکەم:

دوای ئەوەی کە مارگۆ مرد، گۆڕانێکی گەورە بەسەر ژیانمدا هات. دوای ئەوەی هاونشینی کۆمەڵێ (مدمن- خووپێوەگر)م کرد، لە ئەمستردام شەوانە هاتوچۆی یانەکانی سەمام دەکرد کە لەوە پێش هاتوچۆم نەدەکردن. ئیدی لە شوێنە ناشایستەکاندا بەدوای ڕابواردن و دەستکەرمکردنەوەدا دەگەڕام. ئاوها بووم بە بوونەوەرێکی شەوگەڕ و تووشی کەسانێک بووم کە نەدەبوو تووشیان ببم، لەنێو نوێنی کەسانی نەناسدا بێداردەبوومەوە. بەم ئاوهایە لە ماوەی چەند مانگێکدا کێشم پتر لە بیستوپێنج ڕەتڵ کەمیکرد.

بۆ یەکەم جار لە ژیانمدا هیرۆیینم هەڵمژی و ڕشامەوە و نەخۆشکەوتم، نەخۆشی گەیاندمییە دۆخێک بە درێژایی ڕۆژەکە نەمدەتوانی سەرم هەڵبڕم، چونکە جەستەم ماددەی سرکەری ڕەتدەکردەوە، ئەمەش ئاماژەیەک بوو بەرەو ڕووم بووبووەوە، بەڵام پەندم لێ وەرنەدەگرت. دوای ماوەیەکی کەم لەجیاتی هەڵمژین، دەرزیم بەکار دەهێنا، وەک ماریوانا و تلیاک و کۆکایین – ئیدی ئەوەی بەردەستم کەوتبا تاقیم دەکردەوە. زۆری نەبرد تا بە جەستە و ئاوەزەوە کەوتمە دۆخی سەرلێشێوان و شڵەژانەوە – هەموو شتێکم دەکرد تا خۆم بەسەر پێوە بهێڵمەوە.

که دەچوومە دۆخی سەرگەرمییەوە، پلانی سەیرم بۆ خۆکوشتن دادەنا، تەنانەت جارێکیان وەک چۆن سوکرات خۆی ژەهرخواردوو کرد، هەوڵم دا خۆشاوی شەوکەرانی* ژەهراوی بخۆمەوە، بەڵام دیاربوو کاریگەریی ژەهرەکە بایی ئەوە نەبوو کارم تێبکات، یان ئەو گیایە ڕەشەی کە بە نهێنی لە چێشتخانەیەکی چینی کریم کە خواردنی ئامادەیان دەفرۆشت، تەنها گیایەکی ئاسایی بوو، یان ڕەنگە فێڵیان لێکردبم و جۆرە چایەکی سەوزیان پێ فرۆشتبم. چەندین ڕۆژ کە بەیانی لە خەو ڕادەبووم، خۆم لە شوێنی نامۆ دەبینییەوە و کەسێکی تازەم بە تەنیشت خۆمەوە دەبینی. ئافرەتان دەیانلاواندمەوە و ئاگادارییان دەکردم، لەگەڵ ئەوەشدا لە ناوەوەمدا هەمان بۆشایی هەڵیدەکۆڵیم. ئەو ئافرەتانەی دەیانلاواندمەوە و ئاگایان لێم بوو، هەندێکیان لە تەمەندا لە خۆم منداڵتر بوون و بڕێکیان لە خۆم زۆر بەتەمەنتر بوون. لە ماڵەکانیان دەمامەوە و لەسەر جێخەوەکانیان دەنووستم و کۆتایی هەفتەم لە کوختەکانیان بەسەردەبرد، خواردنیان بۆ دروست دەکردم و جلی خەوتنی مێردەکانیانم لە بەر دەکرد، بۆ کڕینی پێویستییەکانم لە بازاڕ کارتی متمانەی ئەوانم بەکار دەهێنا، لەگەڵ ئەوەشدا ئامادە نەبووم کەمترین ئەو خۆشەویستییەیان پێ ببەخشم کە لێیان دەویستم و بێگومان شایستەی بوون.

ئەو ژیانەی کە هەڵم بژاردبوو بە خێرایی زیانی گەورەی لێدام. ئیدی کارەکەم و هاوڕێکانم لەدەست دا، لە کۆتاییدا ئەو باڵەخانەیەشم لەدەست دا کە من و مارگۆ ڕۆژانێکی زۆر بەختەوەریمان تێدا بەسەربردبوو. دوای ئەوەی دەرکەوت کە ئیدی من توانای ئەم جۆرە شێوازی ژیانەم نەماوە، لە نێوان چەندین ماڵی هاوبەشی سادەدا دەستم بە گوزەگوز کرد. لە ڕۆتردام لە یەکێ لەم ماڵانە پانزە مانگ زیاتر مامەوە، کە نە دەرگای حەشەی هەبوو، نە هی ژوورەوە، تەنانەت گەرماوەکەیشی دەرگای نەبوو. ئەوانەی لەوێ نیشتەجێبووین لە هەموو شتێکدا هاوبەشبووین: سترانەکانمان، خەونەکانمان،

* شەوکەران: درەختێکی ژەهراوییە و گوڵێکی سپیی هەیە و لاسکەکەی سەوزە. لە کۆندا یۆنانییەکان وەک شێوازێکی کوشتن دەرخواردی ئەو کەسانەیان دەدا کە فەرمانی لەسێدارەدانیان بۆ دەردەچوو. (وەرگێڕی کوردی).

خەرجییەکانمان، ماددەهۆشبەرەکانمان، خواردنمان و جێ خەوتنمان. ئیدی جگە لە ئازار، لەهەموو شتێکدا هاوبەش بووین، دوای ساڵانێک لە ژیانی نێو ماددەهۆشبەرەکان و بەرەڵلایی، بەرەو خوارەوەی خوارەوە شۆڕبوومەوە و بووم بە تارماییەکی ئەو پیاوەی کە جاران هەبووم. بەیانییەک کاتێ دەموچاوم دەشت، تەماشای ئاوێنەکەم کرد، لاوێکی ئاوها داهێزراو و غەمگینم بەو شێوەیە قەت نەبینیبوو. گەڕامەوە سەر جێگەکەم و مینا منداڵێک لە سەلای گریانم دا. لە هەمان ڕۆژدا ناو ئەو سندووقانەم پشکنی کە شتەکانی مارکۆم وەک یادگارییەک یەک لەدوای یەک تێدا پاراستبوون: کتێبەکانی، جلوبەرگەکانی، شریتی گۆرانییەکانی، تەوقەکانی قژی، دەفتەرەکانی، وێنەکانی. ئەوەبوو هەمووم لەنێو سندووقەکان دانایەوە و بەسەر ئەو منداڵە ئاوارانەدا دابەشم کردن کە خۆی سەرپەرشتی و چاودێریی دەکردن، ئەمانە هەمووی لە ساڵی ١٩٧٧دا بوون.

لەسایەی خوداوە کارێکی وێنەگریم لە گۆڤارێکی گەشتیاری ناوداردا دۆزییەوە. بەم جۆرە جانتایەک و مارکۆم لەگەڵ خۆمدا هەڵگرت و سەفەری باکووری ئەفریقیام کرد و وازم لەو پیاوە هێنا کە بووبووم بە ئەو.

لە چیاکانی ئەتڵەس لە بیابانی گەورە تووشی زانایەکی ئەنترۆپۆلۆگیای بەریتانی بووم و بیرۆکەیەکی دامێ. لێی پرسیم ئاخۆ دەمەوێ ببم بەو یەکەم وێنەگرە ڕۆژئاواییەی بەرەو پیرۆزترین شارەکانی ئیسلام دزە بکەم. نەمدەزانی باسی چی دەکات. ئینجا گوتی لە سعودییە یاسا حەرامی کردووە کە جگە لە موسڵمان کەسی دیکە بچێتە ناو مەککەی پیرۆز و مەدینەی منەوەرەوە، هەروەها ڕێگە بە کریستیان و جوولەکە نادرێ بچنە نێو ئەو دوو شارەوە، کەسیش نەیتوانیوە ڕێگەیەک بدۆزێتەوە تا بچێتە ناو ئەو دوو شارەوە و هەندێ وێنە بگرێت، هەروەها ئەوەشی پێ گوتم گەر دەستگیرم بکەن، ئەوا لە زیندان بەندم دەکەن، یان ڕەنگە شتێکی لەوە خراپترم بەسەر بێت. بە بایەخەوە گوێم بۆ هەڵخستبوو، چونکە ڕۆیشتن بۆ خاکێکی قەدەغەکراو و جێبەجێکردنی شتێک کە لەوەوپێش کەس بۆی نەکرابوو، سەرباری ئەو ناوبانگ و پارەیەی لە کۆتاییدا دەستم دەکەوتن، وایان لێکردم

ڕژێنـی ئەدرینـالین لە جـستەمدا قوڵـپ بـدات. ئیـدی بیـرۆکەکە وەک چـۆن مەنجەڵێک هەنگوین هەنگ ڕادەکێشێت، ئاوها ڕایکێشام.

زانـا ئەنترۆپۆلۆگیـاکە پێـی وا بـوو کە مـن بە تەنیـا نـاتوانم ئەوە بـکەم و حەوەجەم بە میانگیری و پەیوەندی هەیە، پێشنیاری کرد پەیوەندی بە خوشکە سـۆفییەکانی نـاوچەکەوە بکەم، ئینجـا وتـی: "تـۆ چووزانیت. ڕەنـگە قایـل بـن یارمەتیت بدەن".

هـیچ شـتێکم دەربـارەی سـۆفیگەریتی نەدەزانـی و بایەخیـشم پـێ نەدەدا. کـاتێ ڕەزامەنـدییان پیـشان دا کە یـارمەتیم بـدەن، شـادمان بـووم چـاوم بەو سـۆفییانە دەکەوێـت کە تەنیـا وەک ئامرازێـک بـۆ وەدیهێنـانی ئامـانجەکەم تەماشام دەکردن و هیچی تر.

ئێلا، ژیان سەیرە. لە کۆتایی شتەکەدا، نە ئەوسا و نە لەدواییدا و تەنانەت نە دوای ئەوەی بـووم بە موسـڵمان، نە بـۆ مەککەی پیـرۆز چـووم و نە بـۆ مەدیـنەی مـنەوەرە. ئەوەبـوو چـارەنووس بەرەو ڕێگەیەکـی تەواو جیـاواز بردمـی، بەرەو گـۆڕانێکی چـاوەڕواننەکراوی ڕووداوەکـان، گـۆڕانێکی ئەوتـۆ دوای ماوەیەک ئامانجە ڕاستەقینەکەش بایەخی نەما. هەرچەندە نیازەکانی من سەرەتا لە نیازێکی ماددیی ڕووتەوە هەڵقوڵابوو، لە کۆتـایی گەشـتەکەدا بـووم بە پیاوێکی تر.

بەڵام سۆفیگەریتی، لە توانای کێدایە بزانێت کە ئەوەی من بۆ وەدیهێنـانی مەبەستەکەم دامنابوو، خۆی بوو بە مەبەست؟ من ئەو بەشـەی ژیـانم ناونـاوە دیدارم لەگەڵ پیتی (ۆ) لە وشـەی سۆفی.

دڵخواز
عەزیز

# گوڵی بیابانی لەشفرۆش

## قۆنیا، شوباتی ١٢٤٦

بەو بەفرەی باریبوو، شەقامە پێچاوپێچ و تەنگەکان دەدرەوشانەوە، هەر ئەو ڕۆژە سۆزانیخانەکەم جێهێشت کە ڕۆژێکی ناخۆش و خەمین بوو و ساردترین ڕۆژەکانی چل ساڵ لەمەوبەر بوو. بە گوێسوانەی ماڵەکان و منارەی مزگەوتەکاندا چلوورەی تیژ شۆڕبووبووەوە و جوانییەکی دڵڕفێنی هەبوو. کە ئێوارە داهات سەرما توندی کرد و لە شەقامەکە چەند پشیلەیەکم دی، مووەکانی سمێڵیان بووبوو بە تاڵی تەنک و بەستوو، خێرا دەڕۆیشتن و لەپڕ دەوەستان. چەند خانوویەک لە ژێر قورسایی بەفردا بەلادا هاتبوون و ڕووخابوون. لە شاری قۆنیادا بێنەواکان لەدوای پشیلەکان سەختترین دەردەسەرییان دەچەشت. شەش لاشەی بەستووم بینی، هەموویان وەک دۆخی مەلۆتکەیی وێکهاتبوونەوە و مینا بۆ ژیانێکی باشتر و گەموگوڕتر چاوەڕوانی سەرلەنوێ لەدایکبوونەوە بکەن، زەردەخەنەیەکی خۆشنوودی لەسەر دەموچاویان بوو.

ڕۆژێکیان دەمەوخۆراوا، ئەو دەمەی هەموو کچەکان پێش دەست پێکردنی چالاکیی شەویان، سەرخەوێک دەشکێنن، لە ژوورەکەی خۆم دزەم کرد و جگە لە کەمێ جلوبەرگی سادە، هیچم لەگەڵ خۆمدا هەڵنەگرت. پۆشاکەکانم و ئەو جلە ئاوریشمانەی کە بۆ مەعمیلە تایبەتییەکان لە بەرم دەکردن، جێم هێشتن. هەموو ئەو شتانەی لە سۆزانیخانەکە دەستم کەوتبوون، دەبوو هەر لەوێ بمێننەوە.

لە ناوەڕاستی پەیژەکەدا مانۆلیام دی کە لە لای دەرگاسەرەکییەکە وەستابوو و گەڵای درەختێکی سووربووی دەجوی کە خووی پێوە گرتبوو.

مانۆلیا کۆنترین کچ بوو لە سۆزانیخانەکە، بەم دواییە لەناکاو تایەکی گەرم دایدەگرت. شەوانە گوێم لێی بوو لەسەر جێگەکەی ئەمدیو و ئەودیوی دەکرد. هەموان دەیانزانی کە تا دێت مێیایەتی وشک دەکات. ئەو کچانەی لە تەمەندا لەو بچووکتر بوون بە لاقرتێوە دەیانگوت ئێرەیی بە مانۆلیا دەبەین، چونکە ئیدی خەمی ئەوەی نییە، مانگانە تووشی بێنوێژی ببێت، یان دووگیان بێت، یان منداڵ لەبارخۆی ببات. ئیدی دەتوانێت بە درێژایی مانگەکە هەموو ڕۆژێ لەگەڵ پیاوێکدا جووت بێت، بەڵام ئێمە دەمانزانی کە لەشفرۆشێک لە تەمەنی ئەودا بێت، ئیدی ژیانی ئەوەندەی بە بەرەوە نامێنێت.

کاتێ بینیم مانۆلیا لەوێ وەستاوە، زانیم تەنها دوو هەڵبژاردنم لە بەردەمدایە، ئەوانەش: یان بەرەو ژوورەکەی خۆم بگەڕێمەوە و مەسەلەی هەڵاتن لە بیر خۆم ببەمەوە، یان لەو دەرگایە خۆم دەربازبکەم و ئەنجامەکەی قەبووڵ بکەم، ئەوەبوو دڵم هەڵبژاردنی دووەمی پەسەند کرد.

"هێی مانۆلیا، ئایا هەست دەکەیت باش بوویت؟"، ئاواتەخوازبووم کە بەدەم پرسیارەکەمەوە دەنگم هێمن و سروشتی بێت:

ڕووی مانۆلیا گەشایەوە، لێ کە سەرنجی جانتاکەی دەستمی دا، یەکسەر چارەی تێکنا. بواری درۆکردنم نەبوو، چونکە دەیزانی کە خاوەنی سۆزانیخانەکە چوونە دەرەوەمی لە ژوورەکەم لێ قەدەغەکردبووم، چجای سۆزانیخانەکە جێبهێڵم.

"ئایا دەڕۆیت؟"، مانۆلیا وەک ئەوەی بترسێت پرسیار بکات هەناسەیەکی هەڵکێشا.

وەڵامێکم بۆ نەهات، ئەمێستا شتەکە کەوتبووە دەست ئەو تا سەرپشک بێت. ئیدی ئەو دەیتوانی ڕێگەم لێ بگرێت و هەموان لە پلانەکەم ئاگاداربکاتەوە، یان وازم لێ بێنێت و بە ئاسانی بڕۆم. مانۆلیا دیقەتی دام. دەموچاوی گرژ و پڕ لە کەسەر بوو.

وتی: "گوڵی بیابان، بۆ ژوورەکەت بگەڕێوە، چونکە خاوەنی سۆزانیخانەکە سەرچەقەڵ بەدواتدا دەنێرێت. ئەی نازانیت چی بە... کرد؟".

بەڵام ڕستەکەی تەواونەکرد. ئەوە لە سۆزانیخانەکەدا ڕێنماییەک بوو لە ڕێنماییە تۆمارنەکراوەکان: باسی چیرۆکەکانی ئەو کچە کڵۆڵانە یان ئەوانەی

له ناوەختدا کۆتاییان هاتووە نەکەین کە لێرە کاریان کردووە، هەروەها لەو بۆنە دەگمەنانەی کە باسمان دەکردن، هەوڵمان دەدا ناویان نەهێنین، چونکە پێویستی نەدەکرد لەناو گۆڕەکانیان بێزاریان بکەین، ئاخر ئەوان ژیانێکی سەختیان بەسەربردبوو، باشتر وا بوو وازیان لێ بێنین تا لە مردنەکەیاندا ئاسوودە بن.

"تەنانەت گەر توانیت ڕاشبکەیت، ئەی چۆن بژیویی خۆت پەیدا دەکەیت؟"، مانۆلیا بە پێداگرییەوە ئەمەی گوت و لەسەری ڕۆیشت: "ئاخر لە برسان دەمریت".

ئەوەی لە چاوەکانی مانۆلیادا دەمبینی ترس بوو – نەک لە ترسی ئەوەی کە سەرکەوتوو نەبم و سزا بدرێم- ، بەڵکو لە ترسی ئەوەی کە سەربکەوم. گەر بۆی کرابا ئەویش ئەو شتەی دەکرد کە من خەونم پێوە دەدی، بەلام هیچ زاتی نەدەکرد خەونەکەی بێنێتە دی، بۆیە ئێستا بەوای بوێرییەکەمەوە ڕێزی دەگرتم و هاوکات ڕقیشی لێم دەبووەوە. زوو کەوتمە دوودڵی و گومانەوە، خۆ ئەگەر دەنگی شەمسی تەورێزی لە سەرمدا دەنگی نەدایەتەوە، لەگوین بوو بگەڕێمەوە.

گوتم: "مانۆلیا، لێمگەڕێ با بڕۆم. ئیدی ڕۆژێکی تر لێرە نامێنمەوە".

دوای ئەوەی پێپرس لێی دام و مەرگم بە چاوی خۆم بینی، هەستم دەکرد شتێکم تێدا گۆڕاوە و ئیتر گەڕانەوەی بۆ نییە، هەستم دەکرد ترس لە ناخمدا ڕەویوەتەوە. بە هەر جۆر ئیدی گوێم پێ نەدەدا و بڕیارم دا پاشماوەی ژیانم بۆ خودا تەرخان بکەم. ئەوە گرینگ نییە ئەو ماوەیە یەک ڕۆژ یان چەندین ساڵی تر دەخایەنێت. ئاخر شەمسی تەورێزی وتی بڕوا و عەشق بنیادەم دەکەن بە پاڵەوان، چونکە ترس و دڵەڕاوکێ لە دڵیدا بنبڕ دەکەن. ئاوها خەریک بوو لە مەبەستەکەی تێدەگەیشتم.

سەیر لەوەدابوو کە مانۆلیاش لەوە تێگەیشتبوو، بە نیگایەکی دوورودرێژ و ڕوون تەماشای کردم و خۆی دایە لاوە و ڕێگەی پێدام تا دەربچم.

# ئێلا

## نۆرتامبتۆن، ١٩ی حوزەیران ٢٠٠٨

بەڕێز ئێلا،

سوپاس بۆ ڕێزنواندنەکەت. خۆشحاڵم کە تۆ ڕۆمانەکەمت بەدڵە و زۆر بیری لێدەکەیتەوە. هەرچەندە من ڕانەهاتووم باسی ڕابردوو بکەم، پێم سەیرە کە باسکردنی ڕابردوو بۆ تۆ وای لێکردم هەست بە بارسووکی بکەم.

هاوینی ١٩٧٧م لە مەغریب لەگەڵ کۆمەڵێ سۆفی بەسەر برد. ژوورەکەم سادە و بچووک و سپی بوو، لە کەلوپەلی پێویست زیاتری تێدا نەبوو: حەسیرێک بۆ نوستن، چرایەک، تەسبیحێکی عەنبەر، چەند ئینجانەیەکی گوڵ بە تەنیشت پەنجەرەکەوە، نوشتەیەکی چاوەزار، مێزێک لە داری گوێز دروستکراو کە دیوانێکی ڕۆمی لە یەکێک لە چاوەکانیدا بوو. ئیدی نە تەلیفۆن و نە سەعات و نە کارەبای تێدا بوو. هەر گوێشم بەوە نەدەدا. ئاخر منێک چەندین ساڵ لە خانووگەلێکی میللی و ساکاردا ژیابووم، ئیدی لە تەکییەکی دەروێشەکاندا ژیانم لە لا قورس نەبوو. سەید سامید یەکەم ئێوارە لە تەکێکە بۆ ئەوەی لە دۆخم دڵنیا بێت هات بۆ ژوورەکەم و گوتی ئەوان زۆر خۆشحاڵن لەگەڵیاندا بمێنمەوە تا ئەو دەمەی کاتی ڕۆیشتنم بۆ مەککەی پیرۆز دێت، بەڵام بە مەرجێ نابێت هیچ جۆرە هۆشبەرێک بەکار بهێنیت.

لە یادمە چۆن منداڵێک دایبابی ببینن وا دەستی خستووەتە نێو پاکەتە پسکویتێکەوە، دەموچاوم سوورهەڵگەڕا. چۆن زانییان؟ ئایا کاتێ لە دەرەوە بووم ناو جانتاکەمیان پشکنیوە؟ دوای ئەوە تا لە ژیاندا ماوم ئەوەم بیرناچێت کە سەید پێی گوتم: 'کاکە کریگ، ئێمە پێویستمان بەوە نییە ناو کەلوپەلەکانت بپشکنین تا بزانین ئاخۆ ماددەهۆشبەرەکان بەکار دێنیت یان نا، بەڵکو چاوەکانت گەواهی دەدەن کە تۆ خووپێوەگری'.

ئیلا ئەوەی مایەی پێکەنینە، ئەوەیە من تا ئەو ڕۆژە خۆم بە خووپێوەگر-مدمن دانەدەنا، بەڵکو دڵنیا بووم کە خۆم بەسەر شتەکەدا زاڵ دەبم و ماددەهۆشبەرەکان یارمەتیم دەدەن کێشەکانم چارەسەربکەم. ئەوەبوو سەید سامید گوتی: "هێورکردنەوەی ئازار بە ماددەی هۆشبەر بنبڕناکرێ، کاتێ کاریگەرییەکەی نامێنێت، ئازارەکە وەک خۆی دەمێنێتەوە".

دەمزانی ئەو ڕاست دەکات. بە شێوازێکی خۆنەشکاندنەوە هەرچی ماددەی هۆشبەرم پێ بوو ڕادەستم کردن، تەنانەت ئەو حەبی خەولێکەوتنانەشم دانێ کە دەمخواردن. زوو بۆم دەرکەوت کە پلانەکەم ئەوەندە بەهێز نەبووە تا لەمەولا لەتەنگژە دەرم بهێنێت. لە ماوەی ئەو چوار مانگەی کە لەو تەکێ بچووکە نیشتەجێ بووم، بەڵێنەکەم نەبردەسەر. ئیتر بۆ کەسێک کە پێی باش بێت گێژوور بێت نەک بەئاگا، تەنانەت گەر لایدەش بێت زەحمەت نییە ماددەی هۆشبەر بدۆزێتەوە. شەوێکیان بە سەرخۆشی بۆ تەکێکە گەڕامەوە، بینیم هەموو دەرگاکان لە ناوەوە داخراون، ئیدی لێبڕام لە باخچەکە بنووم. ڕۆژی دوایی سەید سامید هیچ شتێکی لێ نەپرسیم و منیش هیچ تەوازۆیەکەم بۆی نەهێنایەوە.

سەرباری ئەم ڕووداوە شەرماوەرانە، لەگەڵ سۆفییەکاندا گونجام و ئێواران چێژم لەو هێمنییە وەردەگرت کە لە تەکێکەدا هەبوو و هەستم بە ئارامییەکی تایبەتی دەکرد، لێ ئارامییەکە سەیر بوو، هەرچەندە ڕاهاتبووم کە لەژێر یەک میچدا لەگەڵ کەسانی تر بژیم، لەوێ شتێکی ترم دەستکەوتبوو کە لەوەوبەر نەمبینیبوو، ئەویش ئاشتیی ناخ بوو.

لە ڕواڵەتدا هەموومان ژیانێکی هاوبەش دەژیاین، پێکەوە دەمانخوارد و دەمانخواردەوە، هەموومانیش هەمان کارمان دەکرد، بەڵام چاوەڕوانی ئەوەمان لێ دەکرا کە لە ناوەوەماندا بە تەنیا بمێنینەوە و لە ناوەوەی خۆمان ڕابمێنین، بۆ ئەمەش هانیان دەداین: لە ڕێگەی سۆفیگەرێتییەوە یەکەم شتێ کە دەیدۆزیتەوە هونەرێکە کە دەبێت لە ناوجەرگەی هەموو خەڵکیدا بە تەنیا بیت، ئینجا دەگەیتە ئەوەی کە هەموو خەڵکی لەنێو تەنیایی تۆدا خۆیان حەشارداوە و دەنگیشیان لە ناوەوەی تۆدایە.

کاتێ لە مەغریب چاوەڕێی یارمەتیی سۆفییەکان بووم تا بەبێ کێشە بۆ مەککەی پیرۆز و مەدینەی منەوەرە بڕۆم، دەستم بە خوێندنەوەی فەلسەفەی سۆفیێتی و شیعری سۆفییەکان کرد. سەرتا ئەمەم بۆ ڕەواندنەوەی بێتاقەتی و بێزاری دەکرد و لەوە باشتریشم دەست نەدەکەوت بیکەم، دواجار بە بایەخێکی زۆرترەوە دەستم پێکرد، ئیتر وەک کەسێک تا یەکەم قومی ئاو نەخواتەوە نازانێت کە تینووە، بینیم هەرئەوندە سۆفیگەریم ناسی، پتر ئەڵهای کەوتە سەرم. لەنێو هەموو ئەو کتێبانەی کە لەو هاوینە درێژەدا خوێندمنەوە، شیعرەکانی ڕۆمی بوون کە کاریکی گەورەیان لێکردم.

دوای سێ مانگ، سەید سامید لەناکاو وتی کە من کەسێکی دێنمەوە یاد، دەروێشێکی گەڕیدە کە ناوی شەمسی تەورێزییە. هەندێ کەس شەمس بە دووڕوویەکی بێچاووڕوو دادەنێن، بەڵام گەر پرسیار لە ڕۆمی بکەیت، ئەو لە وەڵامدا پێت دەڵێت کە شەمس مانگ و خۆرە. گیرۆدەی بووم، بەڵام شتەکە تەنها خۆتێهەڵقورتاندنێک بوو. کە گوێم لە سەید سامید دەگرت و ئەویش باسی شەمسی دەکرد، تەزوویەک بە بڕبڕەی پشتمدا تێدەپەڕی و ئەو هەستە سەیرەم لە لا دروست دەبوو کە من لەوەوپێش ئەوم بینیوە.

ئەمێستا، ڕەنگە بڵێیت کە من دینم، لێ سوێند بە خودا دەخۆم، لەو ساتەدا لە پشتەوە گوێم لە دەنگێکی سووکی ورشەی ئاوریشمێک بوو، سەرەتا لە مەودایەکی دوورەوە بوو، ئینجا دەنگەکە تا دەهات زۆر و زۆرتر نزیک دەبووەوە، ئینجا لە نەبوو سێبەری کەسێکم بینی. لەوەیە شنەی ئێوارە بوویێت کە لەنێو چڵەکانەوە دەبزوا. لەناکاو زانیم کە من لەمەولا پێویستم بەوە نییە بۆ هیچ شوێنێک بڕۆم. لەو ئارەزووە بەردەوامە بێتاقەت و بێزار بووم، کە بەبێ دەستی خۆم و بە تەکانی بەردەوام بۆ شوێنانی تر، بۆ شوێنی دوور سەفەرم دەکرد.

هەر شوێنێکم ویستبا لەوێ بووم، ئەوەی ئاتاجی بووم مانەوە و ڕامان بوو لە ناوەوەی خۆم. ناوی ئەم بەشە نوێیەی ژیانم دەنێم دیدارم لەگەڵ پیتی (ف) لە وشەی سۆفی.

**لەگەڵ خۆشەویستیم**

**عەزیز**

# شەمس

## قۆنیا، شوباتی ١٢٤٦

بەیانیی ئەو ڕۆژە لە هەموو ڕۆژانی تر خێراتر ڕۆیشت و ئاسمان نزم و خۆڵەمێشی بوو. چاوەڕوان دەکرا ڕۆژێکی پڕ ڕووداو بێت. درەنگە عەسرێکی ئەو ڕۆژە، ڕۆمیم لە ژوورەکەی خۆی بینی، لە نزیک پەنجەرەکە دانیشتبوو، رامابوو و تەوێڵی خاوبووبووەوە، بە پەژارەوە ئەنگوستەکانی بەسەر دەنکەکانی تەسبیحەکەیدا دەجوولاند. ژوورەکەی بەوای پەردە مەخمەڵی و قورس و نیمچە داخراوەکانییەوە نیوە تاریک بوو، لێ لەو شوێنەی کە ڕۆمیی لێ دانیشتبوو گورزە تیشکێکی سەیری خۆرەکەی دەکەوتە سەر و شتێکی لە شێوەی خەونی بە دیمەنەکە بەخشیبوو. لە خۆم پرسی ئاخۆ دەبێ ڕۆمی ئەو نیازە ڕاستەقینەیە ببینێت کە لە پشت ئەو شتەوەیە من داوای لێدەکەم بیکات، یان تووشی شۆک دەبێت و بێزار دەبێت؟

لە کاتێکدا وەستابووم و لە بێگەردیی چرکەساتەکە تێدەگەیشتم و جۆرە شڵەژانێکیش دایگرتبووم. بەرچاوم ڕووناکبووەوە، کەچی ڕۆمیم لە تەمەنی خۆی گەورەتر و لاوازتر هاتە بەرچاو. عەبایەکی سەوزی تێری لە بەر بوو و لە هەمان شوێن دانیشتبوو. لە هەر کاتێکی تر بەسۆزتر و بەخشندەتر دیاربوو، بەڵام نیشانەیەکی هەمیشەییم لە شێوەی خۆمدا لە دڵیدا بینی. دەسبەجێ لە دوو شت تێگەیشتم کە ئەمانەن: ڕۆمی سەردەمی پیرێتی هەر لەم ماڵەدا بەسەر دەبات، دووەمیان ئەو برینەی دوای من جێدەمێنێت قەت ساڕێژ نابێتەوە. ئیدی چاوەکانم فرمێسکیان تێزا.

"ئایا تۆ باشیت؟ تۆ ڕەنگت زەرد هەڵگەڕاوە" ڕۆمی وتی.

زۆرم لە خۆم کرد زەردەم بێتێ، بەڵام قورسایی ئەوەی نیازم بوو بیڵێم بارگرانییەکی خستە سەرم. دەنگم پەژارەئامێز و لەوە کەمپەرۆشتر بوو کە خۆم دەمەویست، هەرچۆنێ بێت وتم: 'ئەمە ڕاست نییە. من یەکجار تینووم و لەمماڵەدا شتێ نییە تینوێتیم بشکێنێت'.

ڕۆمی پرسیی: 'ئایا دەتهەوێ داوا لە کیرا بکەم ئاخۆ دەتوانێت چی بکات تا گڕی تینوێتییەکەت دابمرکێتەوە؟'.

'نەخێر، چونکە ئەوەی من پێویستمە لە ناندین دەست ناکەوێت، بەڵکو لە مەیخانە هەیە، وەک دەبینیت هەست دەکەم حەزم لێیە سەرخۆش ببم'.

وام پیشان دا کە من سەرنجی نیشانەکانی ئەو تێگەیشتنەم نەداوە کە لە دەموچاوی ڕۆمی نەخش بوون، لەسەر قسەکەم بەردەوام بووم: 'لەجیاتی ئەوەی بۆ ناندین بچیت تا ئاو بخۆیتەوە، ئایا دەتەوێ بۆ مەیخانە بچیت تا شەراب بخۆیتەوە؟'.

'مەبەستت ئەوەیە کە تۆ داوام لێدەکەیت شەرابت بۆ پەیدا بکەم؟'. ڕۆمی بەدەم پرسیارکردنەوە، وشەکەی دوایی بە جۆرە جەختێکی ئەوتۆ درکاند مینا نەوێرێت بیڵێت.

'ڕاستە. زۆر منەتبارت دەبم گەر تۆزێ شەرابمان بۆ پەیدا بکەیت. دوو قاپ بەشمان دەکات، یەکێ بۆ تۆ و یەکێ بۆ من، بەڵام تکایە چاکەیەکم لەگەڵدا بکە. کاتێ بۆ مەیخانە دەچیت، نەکەی تەنیا دوو قاپەکە بێنیت و بگەڕێیتەوە، بەڵکو کەمێ بمێنەوە و بۆ خەڵکی قسە بکە. من لێرە چاوەڕێت دەکەم و پێویست ناکات پەلە بکەیت'.

ڕۆمی نیگایەکی نیمچە تووڕە و نیمچە سەرسوڕمانی کردم. دەموچاوی ئەو فەقێیەم لە بەغدا هاتەوە یاد، ئەوەی کە دەیەویست یاوەریم بکات، بەڵام لەوە دەترسا گەر شەراب بخواتەوە ئابڕووی دەچێت، چونکە ئەوەندە لە قسەوقسەڵۆکی خەڵکی دەترسا، وای لێهات ئەوە نەکات. ئەمێستا پرسیم: ئایا ناوبانگی ڕۆمیش وای لێدەکات کە ئەوە نەکات؟

بەڵام کاتێ ڕۆمی هەستایە سەر پێ و سەری لەقاند، هەستم بە ئاسوودەییەکی گەورە کرد.

"قەت سـەرم بە مەیخانەیەکـدا نەکـردووە و لە ژیانمـدا تـامی شـەرابم نەکردووە، پێمیش وا نییە کە شەرابخواردنەوە ئەوەندە شتێکی لەبار بێت کە دەبێ بیکەم، بەڵام مـن بڕوایەکـی تەواوم بە تـۆ هەیە، چـونکە بـڕوام بەو خۆشەویستییە هەیە کە پێکەوە گرێیداوین. بێگومـان هـۆیەک هەیە تـا ئەو داوایەم لێ بکەیت. گەرەکە ئەو هۆیە بزانم. وا دەڕۆم تا شەرابەکە بێنم".

ئینجا دوعاخوازیی لێکردم و ڕۆیشت.

کە ژوورەکەی جێهێشت، لەسـەر زەوییەکە ڕاکشام و کەوتمە دۆخێکی کەیفسازیی قووڵەوە.

تەسبیحە عەنبەرەکەی ڕۆمیم هەڵگرت کە جێی هێشتبوو. سوپاسی خودام کـرد، چـونکە هـاوەڵێکی ڕاسـتگۆی پێبەخـشیم. لە خـودا پـاڕامەوە کە ڕۆحە جوانەکەی لە سەرخۆشیی عەشقی خودایی بێبەش نەکات.

# سلێمان سەرخۆش

## قۆنیا، شوباتی ١٢٤٦

بە کاریگەریی مەی سەرخۆش دەبم و تووشی غایلەی زۆر دەبم، بەڵام ڕۆمیی مەزن و بێتە بەردەرگای مەیفرۆشەکە! شتێ بوو بڕوانەکردەنی بوو. هەرچەندە خۆم کووڕ کردەوە، دادی نەدام و ئەوی لێ نەشاردمەوە.

هاوارم کرد: "خریستۆس، هۆ پیاو، ئەوە تۆ چیت داومەتێ؟ بێگومان قاپەکەی دوایی شەرابێکی نایابی تێدا بوو. دڵنیام قەت باوەڕ بەوە ناکەیت کە ئەوەی ئێستا من دەیبینم".

"بێدەنگ بە هەی گەمژە"، یەکێ لە پشتمەوە بە چپە وای پێگوتم.

دیقەتی دەوروبەری خۆم دا تا بزانم ئەوە کێیە هەوڵی بێدەنگکردنم دەدات. کە بینیم هەموو پیاوەکانی ناو مەیخانەکە بە خریستۆسیشەوە چاویان بڕیوەتە دەرگاکە، ئاوەز لە مەژگمدا نەما. بێدەنگییەکی بەسام باڵی بەسەر شوێنەکەدا کێشا، تەنانەت ساکۆ، سەگی مەیخانەکە کە وەرکەوتبوو و گوێیەکانی بەسەر زەوییەکەدا شۆڕبووبوونەوە، نیشانەی سەرسوڕمانی پێوە دیاربوو. بازرگانە فارسە فەرشفرۆشەکەش لە ئاوازە ناخۆشەکانی وەستا کە سترانی دەچڕی، هەستایە سەرپێ و بە ئەتواری سەرخۆشان چەنەی بەرزکردەوە و هەوڵی دا وا دەربکەوێ کە ئەو لەسەرخۆیە.

خریستۆس یەکەم کەس بوو کە بێدەنگییەکەی شکاند و گوتی: "هۆ مەولانا، بەخێربێیت بۆ مەیخانەکەم"، دەنگی بەدەم قسەوە ڕێزی لێدەتکا: "شانازییەکی گەورەیە کە لەژێر ئەم میچەدا دەتبینم. نازانم چۆن خزمەتت بکەم؟".

چەند جارێ چاوەکانم پرووکاند و لە کۆتاییدا دڵنیابووم کە ئەوە ڕۆمی خۆیەتی لەوێ وەستاوە.

ڕۆمی گوتی: "سوپاس"، زەردەخەنەیەکی ئاشکرا، بەڵام ساردوسڕ کەوتە سەر لێوەکانی و لەسەری ڕۆیشت،" نەختێ مەیم دەوێ".

خریستۆسێ بەستەزمان کە ئەوەی بیست سەری سوڕما و دەمی بەشکردەوە. کە دووبارە جووڵەی تێگەڕا، ڕۆمیی بەرەو یەکەم مێزی بەتاڵ برد، ڕێکەوت وا بوو بە تەنیشت ئەو مێزەوە دانیشت کە من لەسەری دانیشتبووم.

"سڵاوی خوداتان لێ بێت"، ڕۆمی دانیشت و سڵاوی لێکردم.

وەڵامیم دایەوە: سڵاو لە تۆش، هەندێ قسەی هەڵەقوبەلەقم کرد، لێ دڵنیا نەبووم کە ئەو وشانەی لە دەمم دەرچوون گونجاون یان نا. بە سیمای هێمنی و بە عەباگرانبەهاکەی و کراسە ئاودامانە سوورخنە نایابەکەی دیاربوو کە ئەم شوێنە قەت بۆ ڕۆمی شایستە نییە.

بەرەو پێشەوە خۆم نوشتاندەوە و ئەوەندە دەنگم نزم کردەوە هەر ئەوەتا دەبیسترا، وتم: "ئایا بێویڵی نییە بپرسم پیاوێکی وەک تۆ لێرە چی دەکات؟".

"من بە ئەزموونێکی سۆفییانەدا تێدەپەڕم"، ڕۆمی بەدەم قسەوە وەک ئەوەی دوو هاوڕێی کۆن بین چاوەکانی پرووکاند و لەسەری ڕۆیشت: "شەمس بۆ ئێرە ناردمی تا ناوبانگم لەکەدار بێت؟".

لێم پرسی: "ئایا ئەمە شتێکی باشە؟".

ڕۆمی پێکەنی و گوتی: "دەی باشە، ئەوە دەوەستێتە سەر شێوازی تێڕوانینت بۆ شتەکە. هەندێ جار دەبێ هەموو پەیوەندییەکانت تێک بشکێنیت تا نەفسی خۆت سەربخەیت. تەنانەت گەر پەیوەندییەکانمان بەخێزانەکانمانەوە توندوتۆڵ بوو و لەناو کۆمەڵدا پێگەمان بەرز بوو، گەر پەیوەندیمان بە سوختەخانەکەمان یان مزگەوتەکەمانەوە ئەوەندە باش بوو، بەڵام کاتێ دەبێتە ڕێگر لە بەردەم یەکبوونمان لەگەڵ خودادا، ئەو دەمە گەرەکە ئەو پەیوەندییانە تێکبشکێنین".

دڵنیا نەبووم کە بە  باشی لێی تێگەیشتووم، بەڵام ئەم لێکدانەوەیە تا ڕادەیەک ئاوەزە شڵەژاو و شێواوەکەمی ئاسوودەکرد. ئاخر وام بە خەیاڵدا دەهات کە ئەم سۆفییانە شێتن، کۆمەڵێکی جیاوازن و هەموو شتێکی نامۆیان لەدەست دێت.

ئەمێستا نۆرەی ڕۆمی هات تا بنوشتێتەوە و بە هەمان ڕیتمی چپەدوو بپرسێت: "ئایا بێویڵی نییە گەر لێت بپرسم هۆی ئەو شوێنبرینەی سەر دەموچاوت چییە؟".

گوتم: "ئەمە چیرۆکێکی سەیر نییە، لە کاتێکی درەنگی شەودا بەرەو ماڵ دەگەڕامەوە، ئەو حەسحەسە ڕێی لێگرتم و تێروپڕی لێ دام".

"ئاخر لەبەر چی؟"، ڕۆمی بەدەم پرسیارکردنەوە نیشانەی نیگەرانی کەوتە سەر ڕوخساری.

"چونکە مەیم خواردبووەوە"، بەدەم وەڵامدانەوەوە ئاماژەم بۆ ئەو قاپە کرد کە ئێستا خریستۆس لە بەردەم ڕۆمی داینا.

ڕۆمی سەری بادا. سەرەتا تەواو شڵەژاو دیاربوو، وەک ئەوەی بروانەکات کە ڕەنگە شتگەلی ئاوها ڕوودەدەن، بەڵام هەر زوو بە زەردەخەنەیەکی دۆستانە لێوەکانی کشان. ئاوها درێژەمان بە قسەکانمان دا. لە کاتێکدا خەریکی خواردنی نان و پەنیری بزن بووین، دەربارەی بڕوا و برادەرایەتی قسەمان دەکرد، هەروەها دەربارەی شتگەلێکی دیکەی ژیان کە پێم وا بوو زۆر لەمێژبوو بیرم چووبوونەوە، لێ ئەمێستا شادمان بووم کە دووبارە لە دڵمەوە دەستیان بە هەڵقوڵین کرد.

کەمێ دوای شێوان، ڕۆمی هەستاو خۆی ئامادەی ڕۆیشتن کرد. هەموو ئەوانەی لە مەیخانەکە بوون بۆ بەڕێخستنی هەستانە سەرپێ. دیمەنێکی کاریگەر بوو، بۆیە وتم: "تا پێمان نەڵێیت مەی بۆچی حەرام کراوە، نابێ بڕۆیت".

خریستۆس بە ڕوخسارێکی گرژەوە بە پەلە هاتە تەنیشتمەوە، خەمی ئەوەی بوو کە پرسیارەکەم مەعمیلە بەڕێزەکەی بێزار دەکات، گوتی: "سلێمان، بێدەنگ بە. بۆچی دەربارەی ئەم شتانە پرسیار دەکەیت؟".

"نەخێر بەڕاستیمە"، بە جەختەوە ئەمەم گوت و دەمڕوانییە ڕۆمی، "خۆ ئێمەت بینی، ئێمە خراپەکار نیین، لێ بەردەوام وامان پێدەڵێن. پێم بڵێ گەر ڕەفتارمان باش بێت و ئازاری یەکتر نەدەین، مەیخواردنەوە زیانی چییە؟".

هەرچەندە پەنجەرەکەی لای سووچەکە کرابووەوە، هەوای ناو مەیخانەکە بۆگەن و پڕبوو لە دووکەڵ و قورس بووبوو بە چاوەڕوانی و هەموان پەرۆشی بیستنی وەڵامەکە بوون. ڕۆمی لێم نزیکبووەوە، ناسک و بەئاگا، بیری دەکردەوە و ئەمەی خوارەوەی گوت:

**"گەر لە مەیخۆردا**
**ناسکی و نیانییەکی قووڵ هەبوو،**
**لە کاتی سەرخۆشیدا پێیەوە دیار دەبێت**
**خۆ ئەگەر کینە و لووتبەرزیی لەخۆ حەشاردابوو**
**ئەوەیشی هەر پێوە دیار دەبێت**
**لەبەر ئەوەی زۆربەی خەڵکی وا دەکەن**
**بۆیە مەی لە هەموو خەڵکی حەرام کراوە".**

لە کاتێکدا بیرمان لەم وشانە دەکردەوە بۆ ماوەیەکی کەم خامۆشییەک باڵی کێشا.

"برادەرانم، خواردنەوەی مەی بێزیان نییە"، ڕۆمی بە دەنگێکی لێوانلێو لە چالاکی و فەرماندارانە و سەنگین و تۆکمە ڕووی تێکردین، "چونکە خراپترین شتمان تێدا دەردەهێنێت، بۆیە پێم وایە بۆ هەمووومان باشتر وایە واز لە خواردنەوەی بهێنین. لەبەر ئەوە ئەو شتەی کە خۆمان لە کردنی بەرپرسین بۆمان نییە گلەییەکە بخەینە سەر مەی. لەوەش گرینگتر دەبێ خۆبەزلزانی و تووڕەییمان جڵەو بکەین. لە کۆتاییدا ئەوەی دەیهەوێ با بخواتەوە، ئەوەیشی

نایهەوێ با نەخواتەوە. بۆمان نییە شێوازی خۆمان بەسەر ئەوانی تردا بسەپێنین و لە ئایینیشدا زۆرلێکردن نییە".

بەدوای قسەکانیدا نیشانەی خۆشی و گەشی لە هەندێ لە مەعمیلەکان پەیدا بوو، بەڵام پێم باش بوو پەرداخەکەم بەرز بکەمەوە، چونکە بڕوام وایە نابێت پەند و ئامۆژگارییەک تێپەڕێت بێ ئەوەی بە خۆشیی ئەوەوە نەخۆمەوە.

گوتم: "دەربارەی ئەوەی ئەمڕۆ کردت خەڵکی هەرچییەک بڵێن، تۆ پیاوێکی باشیت و خاوەن دڵێکی مەزنیت، چونکە دڵنیام خەڵکی دەربارەی تۆ زۆر دەڵێن. لەبەر ئەوەی وتاربێژ بوویت، بێ ئەوەی هیچمان بەسەردا بسەپێنیت، قسەت بۆ کردین، هاتنەکەتیش بۆ مەیخانە بۆ خۆی ئازایەتییەکی گەورەیە".

ڕۆمی نیگایەکی دۆستانەی کردم، ئینجا ئەو دوو قاپە شەرابەی هەڵگرت کە دەستی بۆ نەبردبوون، ئیدی چووە دەرەوە تا پێشوازی لە شنەی ئێوارە بکات.

# عەلائەدین

## قۆنیا، شوباتی ١٢٤٦

بۆ ئەوەی بە باوکم بڵێم داخوازیی کیمیام بۆ بکات تا شووم پێ بکات، ئەوە سێ هەفتەیە چاوەڕێی ئەو ساتە گونجاوە دەکەم. چەندین سەعات لە خەیاڵی خۆمدا دەمدواند و هەمان ئەو ڕستانەم چەندین جار دادەڕشتەوە و دووبارەم دەکردنەوە، بەدوای باشترین شێوازدا دەگەڕام تا نیازی خۆمی پێ دەرببڕم. بۆ ئەگەری هەر ڕەتکردنەوەیەک وەڵامێکی ئامادەم پێ بوو. گەر پێی گوتم کە من و کیمیا برا و خوشکین، بیری دەخەمەوە کە هیچ پەیوەندییەکی خوێن لە نێوانماندا نییە. لەبەر ئەوەی دەمزانی کە باوکم یەکجار کیمیای خۆش دەوێ، بۆیە بڕیارم دا ئەوەیشی پێ بڵێم گەر ئێمە بووین بە ژن و مێرد، ئەوا بە درێژایی ژیانی لە ماڵەکەدا لەگەڵماندا دەژی، ئیدی لە خەیاڵی خۆمدا بۆ هەر شتێک ڕێوشوێنێکم دانابوو، بەڵام نەمتوانی بۆ چرکەیەکیش بە تەنها لەگەڵ باوکمدا قسەبکەم.

ئێوارەی ئەمڕۆ باوکمم لە خراپترین دۆخدا بینی. خەریکبووم لە ماڵ دەردەچووم و بۆ دیدەنیی هەندێ لە برادەرەکانم خۆم ئامادە دەکرد، کاتێ دەرگاکە کرایەوە و باوکم هاتە ژوورەوە و دوو شووشە (مەی)ی بە دەستەوە بوو.

بە بێدەنگی و واقوڕمانەوە وەستام، ئینجا لێم پرسی: "باوکە، ئەوەی بە دەستتەوەیە چییە؟".

"ئا. ئەمە!"، بەبێ هیچ بەخۆداشکانەوەیەک وەڵامی دایەوە و گوتی: "ڕۆڵە، ئەوە مەیە".

"بەڕاستیتە؟"، هاوارم کرد، "ئەرێ مەولانای مەزن وای لێهات؟ پیاوێکی بەساڵەوەچوو و مەیخواردنەوە؟!".

"ئاگات لە قسەی خۆت بێت"، لە پشتەوەم گوێم لە دەنگێکی تووڕە بوو.

شەمس بێ ئەوەی چاو بپرووکێنێت چاوی لە دەموچاوم بڕی و وتی: "تۆ بۆت نییە بەم شێوازە باوکت بدوێنیت. ئەوە من بووم داوام لێی کرد بۆ مەیخانە بچێت".

"سەیر نییە"، ئەمەم گوت و زەردەخەنەیەکی دەستکردم نواند.

گەرچی قسەکانی من بۆ شەمس سووکایەتی بوو، بەڵام نەیبردە سەر خۆی و گوتی: "عەلائەدین، گەر هەوڵبدەیت تووڕەییەکەت دووربینیت نەشێوێنێت، ئەوە دەتوانین دەربارەی ئەوە قسەبکەین".

ئینجا سەری لارکردەوە و وتی کە دەبێت دڵی خۆم نەرم بکەم.

پاشان وتی: "ئەمە یەکێکە لە چل ڕێساکە : **ئەگەر ویستت بڕوات بەهێز بکەیت، دەبێت لە ناوەوەت نەرم بێت. بۆ ئەوەی بڕوات توندوتۆڵ بێت و وەک بەرد ڕەق بێت، دەبێت دڵت وەک پەڕ سووک بێت. ئەگەر تووشی نەخۆشییەک بووین، یان کارەساتێکمان بەسەر هات، یان تووشی زیانێک بووین، یان ترسێک دایگرتین، ئەوا هەریەکەمان بە شێوەیەک ڕووبەڕووی ئەو ڕووداوانە دەبینەوە و فێریشمان دەکات کە چۆن کەمتر خۆپەرست بین و زۆرتر بە حیکمەت بین و بەسۆزتر و بەخشندەتر بین. هەرچەندە لەمەدا هەندێکمان پەند وەردەگرێت و میانڕەوتر و ناسکتر دەبێت، هاوکات هەندێکی تر دڵڕەقتر دەبن. ئەو شێوازەی کە وات لێدەکات لە ڕاستییەوە نزیکتر بیت ئەوەیە کە دڵت جێگەی مرۆڤایەتیی تێدا ببێتەوە و شوێنێکی زیاتری بۆ خۆشەویستی تێدا بمێنێتەوە؟**".

گوتم: "بیبڕەوە، جگە لە باوکم من فەرمان لە دەروێشانی سەرخۆش وەرناگرم و هەموو شتەکەش ئەمەیە".

باوکم هاتە نێوانەوە و گوتی: "عەلائەدین، ئەوەی تۆ دەیڵێیت شوورەییە".

هەستم بە تاوانێکی گەورە کرد، بەڵام هەستەکە درەنگ کەوت، هەستێکی بێزاری و تووڕەیی وا دایگرتم پێم وا بوو دەمێ بوو شتی وام لە خۆمدا نەبینی بوو.

شەمس وتی: "بێگومان بەگوێرەی ئەوەی دەیڵێیت و دەیکەیت تۆ ڕقت لە منە، بەڵام لەو باوەڕەدا نیم کە تۆ بۆ ساتێکیش باوکت خۆش نەوێ. ئەی بۆ لە ناخەوە برینداری دەکەیت؟".

وەڵامیم دایەوە: "ئەی تۆش نابینیت کە ژیانمانت وێران کردووە؟".

لەو ساتەدا باوکم داچەمایەوەو زاری نوقاند و دەستی ڕاستەی بەرەو لای سەری بەرزکردەوە، وامزانی زللەم لێدەدات، بەڵام کە ئەوەی نەکرد، پتر شڵەژام.

"تۆ ئابڕووم دەبەیت"، باوکم بێ ئەوەی تەماشای دەموچاوم بکات وای پێگوتم.

چاوەکانم فرمێسکیان تێزا. دەموچاوی خۆم لێی شاردەوە و لەپڕ خۆم ڕووبەڕووی کیمیا دیتەوە. نەمزانی لەکەیەوە لەوێ وەستاوە و بە دووچاوی پڕ لە ترس لە سووچێکی ژوورەکە خۆی لێ داگرتووین؟ ئاخۆ دەبێ چەندی لە دەمەقاڵێکەی نێوانمان بیستبێت؟

شەرمەزارییەکەم لەبەر ئەوە بوو کە باوکم لە بەردەم ئەو کچەی دەمەویست بیخوازم سووکایەتیی پێکردم، ئەمەش لە ناخمدا ئازارێکی پەیداکرد و تامێکی ناخۆشی لە زارمدا جێهێشت. ئیدی هەستم کرد ژوورەکە بە دەورمدا دەخولێتەوە و خەریکە دادەڕمێم.

ئیدی لە توانامدا نەما چرکەیەکی تر لەوێ بمێنمەوە، چاکەتەکەم هەڵگرت و شەمسم دایەلاوە و دوور لە کیمیا و دوور لە هەموویان، لە ماڵ دەرچوومە دەرەوە.

# شەمس

## قۆنیا، شوباتی ١٢٤٦

بۆنی شووشە مەیەکان کە لە نێوانماندا قیت دانرابوون، بۆنی خاکی گەرم و گیای کێوی و تووی ڕەشیان لێدەهات. دوای ئەوەی عەلائەدین ماڵی بەجێ هێشت، ڕۆمی ماوەیەک خەمێکی زۆر دایگرت و قسەیەکی نەکرد. پێکەوە بۆ ناوحەشەکە چووینە دەرەوە کە بەفر دایپۆشیبوو. ئەوە لە ئێوارەی ڕۆژێ لە ڕۆژە غەمگینەکانی شوباتدا بوو، بایەکی سارد هەڵیکردبوو و کپییەکی سەیر باڵی کێشابوو. وەستابووین و چاومان بڕیبووە هەورەکان کە دەجمان، گوێمان بۆ دنیایەک هەڵخستبوو جگە لە بێدەنگی هیچی دیکەی پێ نەدەبەخشین. بایەکە لە دارستانە دوورەکانەوە کزەیەکی بۆ هێناین، کە بۆنی گەڵمەخاوی ماسیی لێدەهات. بۆ چرکەساتێک ئارەزوومان کرد بۆ هەتاهەتایە ئەم شارە جێبهێڵین.

ئینجا شووشەیەکم هەڵگرت و بە تەنیشت گوڵەباخێکی ڕووتەوە کە بە خۆی و دڕکەکانییەوە لەنێو بەفرەکەدا قیت بووبووەوە، داچەمامەوە و شەرابەکەم کردە سەر خۆڵی ژێر گوڵەباخەکە. دەموچاوی ڕۆمی لە خۆشییان گەشایەوە، زەردەخەنەیەک گرتی کە تێکەڵ بوو لە جۆشوخرۆش و سەنگینی.

گوڵەباخە ڕووتەکە هێدی هێدی ژیانی کەوتەوە بەر و تویکڵی قەدەکەی مینا پێستی بنیادەم نەرم بووەوە و بە بەرچاومانەوە گوڵێکی گرت. کە لەسەر ڕژاندنی شەرابە بەسەر خۆڵی ژێر درەختەکە بەردەوام بووم، گوڵەکە سێبەری ڕەنگێکی پرتەقاڵیی هێمن و جوانی لێنیشت.

ئینجا شووشەی دووەمم هەڵگرت و بە هەمان شێوە لێیم ڕژاند، ئیدی ڕەنگە پرتەقاڵییەکەی گوڵەکە گۆڕا و بوو بە سوورێکی درەوشاوە و ژیانی

لێدەچۆڕا. کە لە بنی شووشەکە پڕ پەرداخێک مایەوە، کردمە نێو پەرداخێکەوە و نیوەیم خواردەوە و نیوەکەی دیکەم بە ڕۆمی دا.

بە دوو دەستی لەرزۆکەوە، بە زەردەخەنەیەکی گەشەوە کە نیانی و سەنگینیی لێدەتکا، ئەو پیاوەی کە لە ژیانیدا دەستی بۆ مەی نەبردبوو، بە پیر ئامازەکەمەوە هات.

وتی: 'بیروباوەڕ و کۆتە ئایینیەکان گرینگن، لێ نابێت بۆ حەرامکراوەکان بگۆڕێن. هەر بەم تێگەیشتنەوە ئەم مەیە دەخۆمەوە کە ئەمڕۆ پێمی دەدەیت. لە هەموو دڵمەوە بڕوام وایە کە دوای سەرخۆشی عەشق ڕاستی و سەنگینییەکی عەقڵ هەیە'.

لەو دەمەیدا کە ڕۆمی پێکەکەی لە لێوەکانی نزیک دەخستەوە، لە دەستیم ڕاڕفاند و فڕێمدایە سەر زەوییەکە، ئیدی شەرابەکە مینا دڵۆپی خوێن ڕژایە سەر بەفرەکە.

گوتم: 'مەی مەخۆرەوە. ئەمە گەر لە کاتێکدا خۆت مەبەستت نییە لەسەر ئەم ئەزموونە بەردەوام بیت'.

'تۆیەک کە داوام لێدەکەیت ئەم مەیە نەخۆمەوە، ئەی لە بنەڕەتدا بۆچی بۆ مەیخانەکە ناردمت؟' ڕۆمی بە ڕیتمێک ئەوەندەی بە سۆز بوو، لاقرتێ نەبوو لێی پرسیم.

بە زەردەخەنەوە وتم: 'تۆ خۆت هۆیەکەی دەزانیت، چونکە گەشەکردنی ڕۆحی لە وشیاریماندایە، نەک بە چاوگێڕان لە هەندێ شتی دیاریکراو. ئەمەی خوارەوە ڕێسای سیودووەمینە: **پێویستە هیچ شتێ نەکەوێتە نێوان نەفست و خودا، بڕوات نە بە ڕابەرێکی ئایینی و نە قەشەیەک و نە زانایەکی ئایینیی باش، نە بە هیچ دەمڕاستێکی دیکەی سەرکردەی ئاکاری یان ئایینی، نە گەورەپیاوانی ڕۆحی، تەنانەت بڕوات بڕواکەی خۆتیش نەبێت، بەڵام بەسەر خەڵکانی دیکەدا مەیانسەپێنە. ئەگەر دڵی کەسانی تر بشکێنیت، ئیدی ئەو بڕوا ئایینییەی کە بڕوات پێیەتی، بڕوایەکی باش نییە'.**

'لە هەموو جۆرەکانی بتپەرستی خۆت بپارێزە، چونکە دیدگات دەشێوێنێت. با هەر خودا، خودا هەر خۆی بە تەنها ڕێنیشاندەرت بێت. هۆ

هاوڕێم، فێری ڕاستی ببە، بەڵام وریابە لەو حەقیقەتانەی کە لە لات دروست دەبن، بت دروست نەکەیت".

هەرچەندە زۆر بە کەسایەتی و سۆزی ڕۆمی سەرسام بووم، کەچی لە ژیانیدا بێدەسەڵات بوو، بۆیە تا دەهات پتر پێی سەرسام دەبووم.

ئەم دنیایە پڕە لەو کەسانەی چاویان بڕیوەتە سامان یان ناوبانگ یان دەسەڵات، تا زیاتریان دەست بکەوێت، هەست دەکەن هێشتا پێویستیان پێیەتی. بە چاوچنۆکی و تەماحکاری سامانی دنیایان کردووەتە ڕووگەی خۆیان و ئیدی جگە لەو ئاراستەیە، بەرەو شوێنێکی تر ناڕوانن و هەست ناکەن بوون بە کۆیلەی ئەو شتانەی کە بە هەڵپەوە بۆی تێدەکۆشن. ئەمە شێوازێکی هاوبەشە و بەردەوام ڕوودەدات. بە دەگمەن، بەقەد دەگمەنیی مرواری پیاوێک دەبینیت بەرەو باڵایی ڕێگەی خۆی بڕبێت، یان پیاوێک بڕێکی زۆری لە زێڕ و ناوبانگ و دەسەڵات هەبێت و لەپڕ دەست لە هەمووی هەڵبگرێت و ناوبانگی خۆی بخاتە مەترسییەوە و بەرەو سەفەرێکی ناوەوەی خۆی هەیپای لێ بکات و کەس نەزانێت لە کوێ یان چۆن کۆتایی دێت. بەڵێ ڕۆمی ئەو مرواریيە دەگمەنەیە.

وتم: "خودا داوامان لێدەکات میانڕۆ و خاکەڕا بین".

ڕۆمی بە ناسکی لەسەری ڕۆیشت: "ئەو دەیهەوێ بناسرێ. ئەو داوامان لێدەکات کە بە هەموو گەردیلەیەکی بوونمانەوە بیناسین، بۆیە گەرەکە وریا و بەئاگابین، نابێت سەرخۆش بین و ئاوەزمان شڵەژاو بێت".

قسەکانی بە دڵمەوە نووسان. لە حەوشەکە دانیشتین، جگە لە گوڵێکی سوور، هیچ شتێکی تر لە نێوانماندا نەبوو، تا تاریکی داهات و سەرماکە توندتر بوو. لەژێر ئاسمانی ڕچیودا، هەستت بە وردە شتێکی تەڕ و تازە و جوان دەکرد. ئیدی شەرابی عەشق وای لە سەرمان کرد کە بە ناسکی بخولێنەوە، بە خۆشی و پێزانینەوە زانیم کە ئیدی بایەکە بە نائومێدی ناسرەوێنێت.

## ئێلا

### نۆرتامبتۆن، ٢٤ی حوزێران ٢٠٠٨

" باوانم، چێشتخانەیەکی نوێی تایلاندی لەشارەکەدا کراوەتەوە"، دەیڤید وای گوت، "دەڵێن گوایا چێشتخانەیەکی باشە، بۆچی ئەمشەو تەنها هەردووکمان بۆ ئەو چێشتخانەیە نەچین؟".

لە رۆژی سێشەممەدا ئێلا دواشتێ کە دەیەویست بیکات، ئەوەبوو لەگەڵ شووەکەیدا بۆ نانخواردنی شێوان دەربچێت، بەڵام دەیڤید پێی داگرت و ئێلاش دەسەڵاتی ئەوەی نەما رەتی بکاتەوە.

چێشتخانەی (مانگی زیوین)، چێشتخانەیەکی بچووک بوو و بە گڵۆپی جوان رازابووەوە، شوێنی تایبەتی خێزانی تێدا بوو و بە کورسیی چەرمین و سەرچەفی رەش پۆشتە کرابوو، چەندین ئاوێنە بە نزمی لەسەر دیوارەکانی هەڵواسرابوون تا مەعمیلەکان هەست بکەن لەگەڵ رەنگدانەوەی خەیاڵەکانیاندا لەناو ئاوێنەکان وا نان دەخۆن. ئێلا زوو هەستی بە دڵتەنگی کرد، ئەم دڵتەنگییە بەوای چێشتخانەکەوە نەبوو، بەڵکو بەوای مێردەکەیەوە بوو. ئەوەبوو لە چاوانی دەیڤیددا درەوشانەوەیەکی نائاسایی بەدی کرد کە شتێکی نائاساییان تێدا بوو. وا دیاربوو بیر لە شتێک دەکاتەوە، بەڵکو تەنانەت پەژارەیشی پێوە دیاربوو. ئەوەی بە راستی بێزاری کرد ئەوەبوو چەند جارێ دەمی تێکئاڵا. ئاخر دەیزانی دەیڤید ئەو کاتەی لە قسەکردندا دەمی تێک دەئاڵێت کە تووشی خەمێکی قورس دەبێت، ئەمەیشی لە منداڵییەوە لەگەڵدا بوو.

کچە خزمەتگوزارێکی جحێڵ کە جلێکی کلاسیکی لە بەر بوو، هات تا داواکارییەکانیان جێبەجێ بکات. دەیڤید داوای قرژاڵی دەریای بە رێحانە و

بیبەری تیژەوە کرد، ئیلاش داوای سەوزە و توفۆی بە زەلاتەی گوێزی هندییەوە کرد، چونکە لە جەژنی لەدایکبوونی چلەمینییەوە بەڵێنی بە خۆی دا بوو واز لە خواردنی گۆشت بێنێت، هەروەها داوای دوو پەرداخ شەرابیان کرد.

بۆ ماوەی چەند خولەکێک باسی ڕێکوپێکی دیکۆری چێشتخانەکەیان کرد، ئینجا باسی کاریگەریی دەسماڵە ڕەشەکانیان بەرانبەر دەسماڵە سپییەکان کرد، پاشان بێدەنگییەکی کەڕولاڵ کەوتە نێوانیانەوە. بیست ساڵ ژن و مێردایەتی، بیست ساڵ نوستن لەسەر یەک جێخەو و پێکەوە خۆشتن لە هەمان گەرماو و هەمان خۆراک خواردن و پەروەردەکردنی سێ منداڵ... هەموو ئەمانە بێدەنگییان لێکەوتەوە، یان ئێلا لە دڵی خۆیدا وای لێکدایەوە.

دەیڤید گوتی: "دەبینم تۆ ڕۆمی دەخوێنیتەوە".

ئێلا بە هەندێ سەرسوڕمانەوە سەری لەقاند. نەیزانی کە ئەوەی تووشی سەرسوڕمانی کرد ئەوەیە کە: بیستی دەیڤید دەربارەی ڕۆمی شتێ دەزانێت، یان ئەوەی ئەم دەیخوێنێتەوە ئەو بایەخی پێدەدات.

"خەریکم چامەکانی دەخوێنمەوە، تا لە نووسینی ئەو ڕاپۆرتەی دەربارەی (کفری شیرین) دەینووسم، یارمەتیم بدات، بەڵام خەریکە ئارەزووم دەکەوێتە سەر چامەکانی، خەریکم بۆخۆم دەیانخوێنمەوە"، ئێلا بۆ پاساوهێنانەوە ئەمانەی گوت.

دەیڤید بەدەم خەیاڵەوە چاوی بڕییە ئەو پەڵە شەرابەی سەر قوماشی بان مێزەکە، ئینجا نرکەیەکی لێ هەستا و گوتی: "ئێلا من دەزانم چی ڕوودەدات. هەموو شتێک دەزانم".

"ئەوە تۆ باسی چی دەکەیت؟"، ئێلا بەدەم پرسیارەکەیەوە دڵنیا نەبوو کە دەیهەوێ گوێی لێ بگرێت .

"دەربارەی.... دەربارەی پەیوەندییە ئەڤینییەکانت..."، دەیڤید بە دەمی تێکئالاوەوە ئەمەی وت، "من دەزانم".

ئێلا بە واقوڕمانەوە دیقەتی شووەکەی دا. دەموچاوی دەیڤید لەبەر ڕووناکیی ئەو مۆمەی کە کچە خزمەتگوزارەکە بۆی داگیرساندن، لە بارێکی زۆر نائومێدانە دەرکەوت.

"پەیوەندیی ئەڤینی من؟"، ئێلا بە پەلە و بە دەنگێکی لەوە بەرزتر کە خۆی نیازی بوو هاتە گۆ. سەرنجی ئەو ژن و پیاوەی دا کە لە دەوری مێزەکەی تەنیشتیان دانیشتبوون، ئەوانیش ئاوڕیان بە لایاندا دایەوە. بە خۆیدا شکایەوە و دەنگی بە جۆرێ کزکرد تا بوو بە چپە و پرسیارەکەی دووبارەکردەوە: "کام پەیوەندی ئەڤینی؟".

"من گێل نیم"، دەیڤید لەسەری ڕۆیشت، "پۆستە ئەلیکترۆنییەکەتم کردەوە و ئەو نامانەتم لەگەڵ ئەو پیاوەدا خوێندەوە".

"چیت کرد؟"، ئێلا هاواری کرد.

ڕوخساری دەیڤید لەژێر قورسایی ئەو شتەی کە خەریکبوو بیڵێت گرژ بوو و خۆی لە پرسیارەکە دزییەوە: "ئێلا، گلەیی لە تۆ ناکەم. من شایانی ئەوەم. من تۆم فەرامۆش کرد و تۆش لە شوێنێکی تر بەدوای سۆزدا دەگەڕێیت".

ئێلا چاوەکانی داخست و تەماشای پەرداخەکەی کرد. شەرابەکە ڕەنگێکی ئەفسووناویی یاقووتی قووڵ و تێری هەبوو. بۆ ماوەیەکی کەم وای بە خەیاڵدا هات کە لەسەر ڕووی شەرابەکە چەند خاڵێک دەبینێت ڕەنگی کوڵکەزێڕینەیەکی درەوشاوەیان هەیە و وەک دەوسی ئەو ڕووناکییانەیە کە ئاراستەی دەکەن. ڕەنگە لەوێ دەوسێکیان هەبێت. ئەمانە هەموو بە شێوەیەکی سوریالی دەرکەوتن.

ئەمێستا دەیڤید لە قسەکردن وەستابوو و بیری لە باشترین ڕێگەچارە دەکردەوە، یان دەبوو ئەوەی لە خەیاڵیدایە ئاشکرای بکات. لە کۆتاییدا وتی: "من ئامادەم بتبەخشم و ئەوەی ڕووی داوە لە بیری بکەین".

لەوساتەدا چەندین شتی توند و تەوساوی و شڵەژاو و دراماتیکی لە دڵی ئێلادا بوون و دەیەویست بیانڵێت، بەڵام سووکترینیانی هەڵبژارد، بە دوو چاوی درەوشاوەوە لێی پرسی: "ئەی دەربارەی پەیوەندییە ئەڤینییەکانی خۆت چی دەڵێیت؟ ئایا تۆش لە بیریان دەکەیت تا لەدوای خۆمانەوە جێیان بهێڵین؟".

کچە خزمەتگوزارەکە خواردنەکەی بۆ هێنان. ئێلا و دەیڤید بێدەنگ بوون و تەماشای کچەکەیان دەکرد کە خەریکبوو قاپەکانی لەسەر مێزەکە دادەنا و بە لێزانینێکی زێدەڕۆییانەوە دووبارە پەرداخەکانی بۆ پڕکردنەوە. کە جێی

هێشتن، دەیڤید تەماشـایەکی ئـێلای کـرد و لێـی پرسـی: "کەواتە ئاوهـا؟ ئەمە تۆڵەسەندنەوەیە؟".

"نەخێــر"، ئــێلا بەدەم قــسەوە نائومێــدانە ســـەری ڕاوەشـــاند، "ئەمە تۆڵەسەندنەوە نییە، قەتیش وا نەبووە".

"ئەی چییە؟".

ئێلا دەستەکانی تێکپەڕاند و هەستێکی وا دایگرت مینا هەمـوو شـتێک و هەمـوو ئەوەی لەنـاو چێشتخانەکەدایە – بە مەعمیلەکـان و کارگوزارەکـان و چێشتلێنەرەکان و بەڵکو تەنانەت بە ماسیی ناو حەوزی کەمەری زەویشەوە – ئامادەن گوێ لەوە بگرن کە ئەم دەیڵێت.

"شتەکە پەیوەندیی بە خۆشەویستییەوە هەیە"، ئاخرێکەی بە دەمیدا هـات، "من عەزیزم خۆش دەوێ".

ئێلا پێی وا بوو کە مێردەکەی پێدەکەنێت، بەڵام لە کۆتاییدا زاتـی وەبەر خـۆ نـا تـا تەماشـای چاوەکـانی بکـات. لە دەموچاویـدا جـگە لە ترسـێک، هـیچ شتێکی دیکەی نەبینی، هەر زوو گۆڕا و بوو بە سیمای کەسێک هەوڵبدات تـا کێشەیەک بە کەمترین زیـان چارەسـەر بکـات. لەناکـاو ساتەوەختێکی ڕوون و بـێ پێچوپەنـا دایگـرت. ئـاخر ئافرەتێـک لەمەوبەر وا ڕاهـاتبوو زۆر بە خراپـی باسی خۆشەویستی بکات، کەچی ئێستا وشەی خۆشەویستی بۆ ئەو بووبوو بە شتێکی ڕاستەقینە و بارگاوی نەک خواسایی.

دەیڤید بە دەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی: "ئاخر سێ منداڵمان هەیە".

"بەڵـێ، زۆر خۆشـم دەوێـن"، ئـێلا بەدەم قـسەوە شـانی هەڵتەکانـد، "بەڵام عەزیزیشم خۆش دەوێ".

"واز لە وتنەوەی ئەم وشەیە بێنە"، دیڤید قسەکەی پێ بڕی و پێش ئەوەی دەست بە قسەکردن بکاتەوە، قومێکی گەورەی لە پەرداخەکە دا، ئینجا وتـی: "هەڵەیەکـی گەورەت کـردووە، بەڵام ئـێلا مـن دەسـت لە خۆشەویـستیی تـۆ هەڵناگرم و لە تۆ زیاتر کەسێکی دیکەم خۆش ناوێ. هەردووکمـان دەتـوانین پەند لە هەڵەکانمان وەربگرین. لە لای خۆمەوە پەیمانت دەدەمـێ کە ئەم شـتە دووبـارە نـابێتەوە، تـۆش ئێـستا ئاتـاجی ئەوە نیـت بچیـتە دەرەوە و مـنەی خۆشەویستی بکەیت".

"من دەرنەچووم تا منەی خۆشەویستی بکەم"، ئێلا ورەورێکی کرد کە پتر خۆی دەدواند نەک ئەو، "ڕۆمی دەڵێت ئێمە لە دەرەوەی خۆمان حەوەجەی ئەوە نیین منەی خۆشەویستی بکەین، بەڵکو ئەوەی لەسەرمان پێویستە بیکەین، ئەوەیە بتوانین ئەو کۆسپانە لابەین کە لە خۆشەویستیی ناوەوەی خۆمان دوورمان دەخاتەوە".

دەیڤید گوتی: "ئای خودایە! ئەوە تۆ چیت بەسەر هاتووە؟ ئەمە تۆ نییت! ئەرێ تۆ دەست لەم ڕۆمانسییەتە هەڵناگریت؟ بگەڕێوە بۆ جارانی خۆت"، ئەمەشی خستەسەری: "تکات لێدەکەم".

ئێلا برۆکانی تێک نا، وەک ئەوەی شتێک پەژارەی کردبێت، تەماشای نینۆکەکانی خۆی کرد. لە ڕاستیدا چرکەساتێکی تری ڕۆژگاری هاتەوە یاد، ئەو کاتەی کە خۆی خۆی بوو هەمان شتی بە کچەکەی دەوت، ئیدی هەستی کرد بازنەکە تەواو بوو. بە هێواشی سەری بادا و دەسماڵەکەی سەرمێزەکەی دایە لاوە.

ئینجا گوتی: "بە یارمەتیت، ئایا دەتوانین ئێستا بڕۆین؟ من برسیم نییە".

ئەو شەوە لەسەر دوو جێگەی جیا نوستن. ئێلا بەیانی زوو یەکەم شتێ کە کردی، ئەوە بوو نامەیەکی بۆ عەزیز نووسی.

# دەمارگیر

## قۆنیا، شوباتی ١٢٤٦

"بۆ لەوە خراپتر خۆت ئامادە بکە! هۆ شێخ یاسین! هۆ شێخ یاسین! ئایا ئابڕووچوونەکەت بیستووە؟". عەبدوڵڵای باوکی یەکێ لە فەقێکانم لێم نزیکدەبووەوە و بانگی دەکردم: "دوێنێ ڕۆمی لە گەڕەکی جوولەکەکان لە مەیخانەیەک بینراوە".

گوتم: "بەڵێ، ئەوەم بیستووە، بەڵام سەرم سوڕنەما. ئاخر هاوسەرەکەی ئەم پیاوە کریستیانە، نزیکترین برادەریشی خودانەناسە، ئیدی چاوەڕێی چیی لێدەکەیت؟".

عەبدوڵلا بە پەرۆشەوە سەری لەقاند و گوتی: "پێم وایە تۆ ڕاست دەکەیت. دەبوو پێشبینیی ئەوەمان کردبا".

ژمارەیەک خەڵکی ڕەوتەنی لە دەورمان کۆبوونەوە و گوێیان بۆ قسەکانمان هەڵخستبوو. یەکێکیان پێشنیاری کرد، تەنانەت ئەگەر ڕۆمی بۆ کارەکەی تەوازۆی لە خەڵکەکەش خواستەوە، نابێت ڕێگەی پێ بدرێ لە مزگەوتی گەورە وتار بخوێنێتەوە. لەبەر ئەوەی بۆ لای فەقێکانم لە سوختەخانەکە دواکەوتبووم، بۆیە بە پەلە دوورکەوتمەوە و جێم هێشتن و ئەوان هەر قسەیان دەکرد.

زۆر جار گومانم دەکرد کە لایەکی تاریکی لە ڕۆمیدا هەیە و ڕۆژێ هەر دێت ئاشکرا دەبێت، بەڵام قەت لەو باوەڕەدا نەبووم کە مەی بخواتەوە، چونکە ئەوە کاری نەکردەنییە. خەڵکی دەڵێن کە شەمس هۆی سەرەکیی ڕووخانی ڕۆمییە، ئێستاش هەر لەگەڵیدایە، خۆ ئەگەر وا نەبوایە، ئەوا ڕۆمی بۆ ژیانی ئاسایی خۆی دەگەڕایەوە، بەڵام من بۆچوونێکی جیام هەیە، ئەویش ئەوەیە

گومـــانم نيـــيه كه شــــەمس پيــاوێكی خراپەكــاره – كه ئاوهـــايه – يــان گەر كـاريگەريی خراپــی لەســـەر ڕۆمـــی نيـــيه –كه هەيەتـــی– بەڵام شـــتەكه ئەوەيه بـــۆچی شـــەمس زانايـــانی ديـــكەی وەک مـــن له ڕێ دەرناكـــات؟ له كۆتـــايی شتەكەدا، ئەم دوو پياوه له زۆر ڕووەوه له يەكتر دەچن، بەڵام خەڵكی ددانی پێدا نانێن.

هەندێ كەس گوێيان لێ بووه شەمس وتوويەتی: "زانای ئايينی لەسەر ئامۆژەكانی قەڵەم دەژی، بەڵام سۆفی عاشق دەبێت و لەسەر دەوسی شوێنپێ دەژی. ئاخر ئەوه چی دەگەيەنێت؟ ئاشكرايه شەمس پێی وايه كه زاناكان له شـــوێنه بەرزەكـــان خۆيـــان حەشـــارداوه، كەچـــی ســـۆفی نـــوقمی نێـــو ژيـــانی ڕاستەقينەيه، بەڵام ئەی ڕۆميش زانای ئايينی نييه، يان ئەو خۆی به يەكێک له ئێمه دانانێت؟

ئەگەر شـەمس بێته نـاو ئەو هـۆڵەی كه تێيـدا وانه به فەقێكـان دەڵێمەوه، ئەوا وەک مێـشێكدەری دەكەم و ڕێـگەی نـادەم له بەردەم منـدا باســـی ئەو تووڕەهاتانه بكات. ئەی بۆچی ڕۆمی هەمان شت ناكات؟ بێگومـان بێمەڵامەت نيـيه. ئەو پيـاوه هەر زوو ئـافرەتێكی كريـستيانی خواسـت، ئيـدی به لامەوه گرينگ نييه بووه به موسڵمان يان نـا، چونكه ئـايينەكەی چووەته نـاو خوێنی خـۆی و خـوێنی منداڵەكەيـشی، بەڵام بـۆ بەدبەختيـی خەڵكـی شـــارەكه، ئەو هەڕەشـەيەی كه كريستيانی پيادەی دەكـات به هەنـد وەرنـاگرن و دەڵێن ئێمه دەتوانين پێكەوه بژين. من به وساويلكانەی كه ئاوها بيردەكەنەوه دەڵێم: "ئايا دەكـرێ ئـاو و ڕۆن تـێكەڵ بـن؟ ئـا ئەمه ئەو مەودايەيه كه موســڵمانەكان و ديانەكان دەتوانن لەسەری بڕۆن".

لەبەر ئەوەی ڕۆمـی ئـافرەتێكی ديانی خواسـتووه، هەروەهـا لەبەر ئەوەی لەگەڵ كەمينەكاندا زۆر باش و لێبوردەيه، كەواته به لای منەوه پياوێكه نابێت پشتی پـێ ببەسـترێ، هەروەهـا لەو كـاتەوه شەمـسی تەورێـزی له مـاڵەكەی نيشتەجێ بووه، به تەواوی له ڕێگەی ڕاست لای داوه. وەک هەمـو ڕۆژێ به فەقێكانم دەڵێم دەبێ له حەناس فێڵەكانی شەيتان چاوكراوه بن، چونكه شەمس بۆخـۆی شـەيتانه. من دڵنيـام هەر ئەو ڕۆميـی هانـداوه تـا بـۆ مەيخـانه بچێت، ئيدی مەگەر هەر خـودا خـۆی بزانێت چـۆن فريـوی داوه، بەڵام ئايـا فريـودانی

خوداناسان بەو ڕادەیەی وایان لێ بکرێ سووکایەتی بە پیرۆزییەکان بکەن، لە داهێنانی شەیتان نین؟

هەر لە سەرەتاوە لە خراپەکاری شەمس تێگەیشتم، ئاخر چۆن زات دەکات پێغەمبەرمان محەمەد سڵاوی خودای لێ بێت لەگەڵ بوستامی، ئەو سۆفییە خودانەناسە بەراورد بکات؟ ئەی هەر بوستامی نییە گوتوویەتی: 'تەماشام بکەن! شکۆی من چەند مەزنە!'، ئەی هەر ئەو نییە وتوویەتی: 'کابەم بینی بە دەورمدا دەسووڕایەوە؟'، بەڵکو لەوەش دوورتر ڕۆیشتووە تا ئەو ڕادەیەی بڵێت' من ئافەرێنەری خودی خۆمم'. گەر ئەمە کفر نەبێت، ئەی دەبێ کفر چی بێت؟ ئەمە ئاستی ئەو پیاوەیە کە شەمس بە ڕێزەوە شتی لێ وەردەگرێت، هەر وەک چۆن بوستامی زەندیقە، ئەمیش (خودانەناس – زەندیق)ە.

ئێستا بەوەی باشە خەڵکی شارەکە خەریکە لە حەناس ڕاستییەک بێداردەبنەوە و ژمارەی ئەوانەی ڕەخنە لە شەمس دەگرن ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لە زیادبووندایە. هەندێ جار لەو قسەوباسانە دەترسم کە لە گەرماوەکان و چایخانەکان و سەرپەرێزی گەنم و ناو بێستانەکان دەکرێن، کە گوایا دەیانەوێ پارەپارەی بکەن.

* * *

زۆر لە کاتی ئاسایی خۆم درەنگتر گەیشتمە سوختەخانەکە و بەم بیرکردنەوانە سەرم قورس بووبوو. هەر ئەوەندە دەرگای ژووری وانەوتنەوەم کردەوە، لەپڕ هەستێکم لە لا دروستبوو کە شتێکی نائاسایی ڕوودەدات. ئەوەبوو فەقێکانم بە ڕیزێکی ڕاست دانیشتبوون، وەک ئەوەی مۆتەکەیەکیان دی بێت بە شێوەیەکی سەیر ڕەنگیان هەڵبزڕکابوو و بێدەنگ بوون.

دوایی هۆیەکەی تێگەیشتم، کە ئەو پیاوەی لە نزیک پەنجەرەکراوەکەوە دانیشتووە و پشتی داوەتە دیوارەکەوە و دەموچاوە بێتووکەکەی بە زەردەخەنەیەکی بە فیزەوە دەدرەوشێتەوە، جگە لە شەمسی تەورێزی کەسی تر نییە.

'شێخ یاسین سڵاوتان لێ بێت'، بەدەم قسەوە تێی دەڕوانیم.

دوودڵ بووم، چونکە نەمدەزانی ئاخۆ دەبێ وەڵامی سڵاوەکەی بدەمەوە یان نا، بڕیارم دا وەڵامی نەدەمەوە، بەڵکو ئاوڕم لە فەقێکان دایەوە و لێم پرسین: "ئەم پیاوە لێرە چی دەکات؟ بۆچی ڕێگەتان دا بێتە ژوورەوە؟".

فەقێکان واقیان وڕما بوو و شڵەژابوون، کەسیان زاتی نەکرد وەڵام بداتەوە، بەڵام شەمس بێدەنگییەکەی شکاند.

بە ڕیتمە بێچاوڕووانەکەی و نیگا جێگیرەکەیەوە وتی: "شێخ یاسین، سەرکۆنەیان مەکە. ئەوە بیرۆکەی من بوو. ئەوە بوو لەم نزیکەوە تێدەپەڕیم، بەخۆم وت بۆچی لای سوختەخانەکە هەڵوەستەیەک نەکەم و سەردانێکی ئەو کەسە نەکەم کە لەم شارەدا لە هەموان زیاتر ڕقی لێمە؟".

# فەقێ حوسام

## قۆنیا، شوباتی ١٢٤٦

بەڕیز و بە پاڵ یەکترەوە و بە چاوەگەشەکانمانەوە هەموومان لە ژووری وانەوتنەوەکە لەسەر زەوییەکە دانیشتبووین، کاتێ شەمسی تەورێزی دەرگاکەی کردەوە و هاتە ژوورەوە. ئێمە شتی زۆر خراپ و سەیرمان دەربارەی بیستبوو، زۆربەشیمان لە مامۆستاکەمانەوە بیستبوو، تووشی شۆک بووین، کاتێ منیش بە زرپوزیندوویی لە ژووری خوێندنەکەمان بینیم، گرژبوومەوە، کەچی ئەو خاوو خلیچک و دۆستانە دیاربوو. دوای ئەوەی سڵاوی لە هەموومان کرد، گوتی هاتووە لەگەڵ شێخ یاسیندا قسە بکات.

"مامۆستاکەمان حەزناکات کەسانی نەناس بێن و لە سوختەخانەکە سەری لێبدەن، ڕەنگە باشتر وا بێت کاتێکی تر بیبینیت"، بەو نیازەوە ئەمەم وت تا لە دیداری نێوانیاندا شتێکی نەویستراو ڕوونەدات.

"لاوۆ، سوپاس بۆ بەهۆڵەوە بوونت، بەڵام دیدارە خراپەکان هەندێ جار نەک هەر کردەنی نین، بەڵکو پێویستیشن"، شەمس وەک ئەوەی بیرکردنەوەکانی منی خوێندبێتەوە، وەڵامی دامەوە، ئینجا وتی: "لەگەڵ ئەوەشدا نیگەران مەبە، دیدارەکەمان ئەوەندە ناخایەنێت".

ئیرشاد کە لە تەنیشتمەوە دانیشتبوو، لە نێوان ددانە قرمساوەکانییەوە ترمەترمێکی کرد و وتی: "دە تەماشای ئەو حەوسەڵەیەی بکە! ئەمە شەیتانێکە بۆخۆی!".

سەرم بادا، لەگەڵ ئەوەی پێم وا نەبوو کە شەمش لە شەیتان بچێت، زۆرم لە خۆم کرد و بە قسەلەڕوویەکەی و بوێرییەکەی سەرسام بووم.

دوای چەند خولەکێک، شێخ یاسین بە ڕوخسارێکی گرژ و تێرامانەوە هاتە ژوورەوە. هەر ئەوەندە چەند هەنگاوێکی نا، لەپڕ وەستا و چاوەکانی بەرەو میوانە خۆتێهەڵقورتێنەرەکە کەوتنە پرتەپرت.

"ئەم پیاوە لێرە چی دەکات؟ بۆچی ڕێگەتان دا بێتە ژوورەوە؟".

من و هاوڕێکانم بە نیگای پڕ سەرسوڕمان و چپەی ترساوەوە، تەماشای یەکترمان دەکرد، بەڵام پێش ئەوەی یەکێکمان زات بکات و شتێ بڵێت، شەمس وتی کە ئەو لە نزیک سوختەخانەکەوە تێپەڕیوە و ویستوویەتی سەردانی یەکێک بکات کە لە قۆنیادا لە هەموو کەس زیاتر ڕقی لێ دەبێتەوە.

ژمارەیەک لە فەقێکان نەرمەکۆکەیەکیان کرد، بینیم ئیرشاد بە قووڵی هەناسەیەکی هەڵکێشا. گرژیی نێوان دوو پیاوەکە بە ڕادەیەک چڕ بووبووەوە، چەقۆ هەوای دەبڕی.

"من نازانم تۆ لێرە چی دەکەیت، بەڵام من کارم هەیە و لەوش گرینگترە تا لەگەڵ تۆدا قسە بکەم"، شێخ یاسین بە تەوەسەوە ئەمەی وت و لەسەری ڕۆیشت: "ئەمێستا، بۆچی ناڕۆیت تا لەسەر وانەکانمان بەردەوام بین؟".

شەمس وتی: "تۆ دەڵێیت قسە لەگەڵ مندا ناکەیت، بەڵام لە پاشملە دەربارەم قسە دەکەیت. دەربارەی من و دەربارەی ڕۆمی و هەموو سۆفییەکان و ڕێبازی سۆفیگەری، لە وتەی خراپ دەمی خۆت ناپارێزیت".

شێخ یاسین لە لووتە ئێسکن و گەورەکەیەوە هەناسەیەکی دا و وەک ئەوەی شتێکی تاڵ لەسەر زمانی بێت، دەمە داچەقاوەکەی گردکردەوە، "وەک وتم، شتێکم نییە دەربارەی قسەت لەگەڵدا بکەم، من دەزانم دەمەوێ چی بزانم، بۆچوونی تایبەتی خۆم هەیە".

شەمس بەرەو لای ئێمە ئاوڕی دایەوە و نیگایەکی تەوسامێزی خێرای کردین و وتی: "پیاوێک بۆچوونی زۆری هەبێت، بەڵام پرسیاری پێ نەبێت! لەوەدا هەڵەیەک هەیە".

"بەڕاستیتە؟"، شێخ یاسین بەدەم قسەوە گوڕێکی هاتەوە بەر، "کەواتە بۆچی لە فەقێکان نەپرسین ئایا لەو دووە کامیان باشترن: ئەو پەندیارەی کە وەڵامی پێیە، یان ئەو پیاوە سەرلێشێواوەی جگە لە پرسیارکردن هیچی تری پێ نییە؟".

هەموو برادەرەکانم تای شێخ یاسینیان گرت، بەڵام هەستم کرد زۆربەیان لە دڵەوە ئەوەیان نەکرد، بەڵکو لەبەر دڵی مامۆستاکەیان و لەبەر خاتری ئەو بوو، بۆیە من بێدەنگیم پێ باشتر بوو.

"ئەو کەسەی کە پێی وایە هەموو وەڵامێکی پێیە، ئەوە لە هەموو کەس نەزانترە"، شەمس بەدەم قسەوە لای بەلای مامۆستاکەماندا کردەوە، "بەڵام مادام تۆ لە وەڵامدانەوەدا باشیت، ئایا بۆم هەیە پرسیارێکت لێ بکەم؟".

لێرەدا خەمی ئەوەم لێ نیشت کە ئەم قسەوباسە بەرەو شوێنێکی خراپ سەربکێشێت، بەڵام هیچ دەسەڵاتێکم نەبوو کە نەیەڵم گرژییەکە تەشەنە بکات.

"لەبەر ئەوەی تۆ ناتۆرەی ئەوەت خستووەتە دووم کە گوایا من خزمەتکاری شەیتانم، کەواتە دەفەرموویت پێمان بڵێیت دەربارەی شەیتان بیرۆکەی تۆ چییە؟"، شەمس پرسیاری لێکرد.

"بێگومان"، شێخ یاسین کە بۆ پەنددادان هەلی لەدەست نەدەدا، وەڵامی دایەوە، "ئایینەکەمان کە دواهەمین ئایینەکانی ئیبراهیمە و گرینگترینیانە، پێمان دەڵێت کە بەوای شەیتانەوە ئادەم و حەوا لە بەهەشت وەدەرنران، جا لەبەر ئەوەی ئێمە نەوەی دایبابێکی دەرکراوین، گەرەکە چاوکراوە بین، چونکە شەیتان بە چەندین شێوە خۆی دەگۆڕێت، هەندێ جار لە شێوەی قوماربازێکدا دەردەکەوێت و داوامان لێدەکات قوماربکەین، برێ جاری دی لە شێوەی کچێکی جوان و جحێڵ خۆی پیشان دەدات و هەوڵدەدات لەخشتەمان بیات، ڕەنگە شەیتان بە جۆرێ خۆی پیشان بدات قەت بە خەیاڵیشماندا نەیەت، وەک دەروێشێکی گەڕیدە".

شەمس وەک ئەوەی چاوەڕێی ئەم قسەیەی کردبێت، زەردەیەکی زانایانەی هاتێ و گوتی: "مەبەستت تێدەگەم. دەبێ ئەو بیرۆکەیەی کە شەیتان لە ڕواڵەتماندا خۆی مەڵاس دەدات، ئاسوودەییەکی گەورە و ڕێگەی ڕزگاربوونێکی ئاسانمان پێ ببەخشێت".

"مەبەستت چییە؟"، شێخ یاسین پرسیاری کرد.

"باشە، وەک تۆ دەڵێیت گەر شەیتان ئاوها خراپەکار بێت و دەرەقەت هاتنی هەستەم بێت، ئیدی پێویست ناکات ئێمەی بنیادەم سەبارەت بەو هەڵانەی کە دەیانکەین، خۆمان سەرکۆنە بکەین، چونکە شتە باشەکان کە

ڕوودەدەن هەموویـان لە دەسـتی خـوداوان و هەمـوو شـتێکی خـراپیش لە دەستی شەیتاندایە. لە هەردوو بارەکەدا ئێمە لە ڕەخنەگرتن و پشکنینی نەفس بەدەر نین. لەوە ئاسانتر هەیە؟".

شـەمس لە کـاتی قسەکردندا بەنێو ژوورەکەدا دەهـات و دەچـوو، لەگەڵ درکاندنی هەر پەیڤێکدا دەنگی بەرز دەبووەوە: "بەڵام با بۆ تەنها چرکەیەک وای دابنێین کە شەیتان نییە و شـەیتانگەلێکیش لە پارێزماندا نین تـا لەنێو مەنجەڵێکـی کوڵەکوڵـدا بمانـسووتێنن. هەمـوو ئەم وێنە ترسـناکانە بـۆ ئەوە دانراون تـا شـتێکمان پیشان بدەن، بەڵام گۆڕان و بوونەوار بە کڵێشەگەلێکی دووبارەوە بوو، پەیامی ڕاستەقینەی خۆیان لەدەست داوە".

"ئەی ئەم پەیامە دەبێت چی بێت؟"، شێخ یاسـین بە بێزارییەوە پرسـی و هەردوو باسکی لەسەر سینگیتێک پەراند.

شەمس وتی: "کەواتە پرسیارت هەیە"، ئینجا لەسـەری ڕۆیشت: "پەیامەکە ئەوەیە ئەو ئازارەی کە مرۆڤ بەخۆی دەگەیەنێت بێکۆتاییە. دۆزەخ لە نـاخی خۆمانـدایە، هەروەهـا بەهەشـتیش، چـونکە قورئـان دەڵێت مـرۆڤ لە هەمـوو بوونەوەرەکـان پایەدارترە، گەر توانیمـان بە باشی لەمە بگەین، ئیدی واز لەو بیـرۆکەیە دێنـین کە شــەیتان لە ڕواڵەتمانــدا خـۆی حەشـارداوە، ددانیـشمان بەوەدا دەنـا کە شــەیتان لە نـاخی خۆمانــدایە. ئیـدی ئەوەی پێویـستمانە بە ڕاستگۆیی لە نەفسی خۆماندا بگەڕێین، نەک چاو ببرینە خەوشەکانی خەڵک و ڕاویان بکەین".

"بـڕۆ نەفـسی خـۆت تـاقی بـکەوە، گەر خـودا بـیەوێ گوناهەکانـت پـاک دەبنەوە"، شێخ یاسین باگۆی دایەوە، "بەڵام پیاوی ئایینی ڕاستەقینە ئەوەیە کە کۆمەڵگەکەی خۆی دەپارێزێت".

"کەواتە ڕێـگەم بـدە بـا چیرۆکێکـت بـۆ بگێـڕمەوە"، شــەمس هەر بەو ناسکییەوە کە نەمانتوانی دڵنیا بین ئاخۆ چیرۆکێکی ڕاستەقینە بوو یان هەر بۆ تەوس بوو، ئەمەی خوارەوەی بۆ گێڕاینەوە:

چوار بازرگان لە مزگەوتێکدا نوێژیان دەکرد، بینییـان وا بانگدەرەکە دێتە ژوورەوە. بازرگانی یەکەم نوێژەکەی بڕی و پرسیی: "هۆ بانگدەر، ئایا بـانگی داوە؟ یان هێشتا ماویتی؟".

بازرگانی دووەم نوێژەکەی بڕی و ئاوڕی لە برادەرەکەی دایەوە و وتی: "هۆ پیاو، تۆ لە کاتی نوێژکردندا قسەت کرد و نوێژەکەت بەتاڵ بووەوە، دەبێ سەرلەنوێ دەست پێبکەیتەوە". کە بازرگانی سێیەم گوێی لەوە بوو، هاتە ناوەوە و گوتی: "هەی گەمژە بۆچی سەرکۆنەی دەکەیت؟ دەبێ ئاگات لە نوێژەکەت بێت. ئەوە نوێژەکەی تۆش بەتاڵ بووەوە". بەڵام بازرگانی چوارەم زەردەخەنە گرتی و بە دەنگێکی بەرز وتی: "دە تۆ تەماشایان بکە! ئەوە هەرسێکیان هەڵەیان کرد، بەڵام من سوپاسی خودا دەکەم کە ڕێگەی خۆم ون نەکرد".

شەمس دوای ئەوەی ئەم چیرۆکەی گێڕایەوە، بەرانبەر فەقێکان وەستا و پرسیی: "کەواتە پێتان چۆنە بە بۆچوونی ئێوە نوێژی کام لەو بازرگانانە دروست نییە؟".

کە لەنێو خۆماندا لەسەر وەڵامەکە گفتوگۆمان کرد، ماوەیەکی کەم لە هۆڵەکەدا غەڵبەغەڵبێک پەیدا بوو، لە کۆتاییدا یەکێ لە دواوە گوتی: "نوێژی بازرگانی دووەم و سێیەم و چوارەم دروست نییە، بەڵام نوێژی بازرگانی یەکەم دروستە، چونکە هەموو ئەوەی ویستی بیکات ئەوەیە پرسیاری لە بانگدەرەکە کرد".

"بەڵێ، بەڵام نەدەبوو نوێژەکەی ببڕێت"، ئیرشاد قسەکەی ڕەتکردەوە، "ئاشکرایە کە هەموو بازرگانەکان هەڵە بوون، جگە لە بازرگانی چوارەم کە تەنها نەفسی خۆی دواند".

نیگام کەلاخست و بە هیچ یەکێ لە دوو وەڵامەکە قایل نەبووم، بەڵام بڕیارم دابوو کە زار هەڵنەهێنم، چونکە پێم وا بوو بایەخ بە بۆچوونەکەم نادەن، بەڵام هاوکات ئەم بیرۆکەیەم بە خەیاڵدا هات، شەمسی تەورێزی ئاوڕی لێدامەوە و پرسیی: "ها تۆ لەوێ! چی دەڵێیت".

بەر لەوەی گوێم لە دەنگی خۆم بێت، بەهەستەم تفەکەم بۆ قووتدرایەوە، ئینجا وتم: "ئەگەر ئەو بازرگانانە هەڵەیەکیان کردبێت، ئەوە نییە لە کاتی نوێژکردندا قسەیان کردووە، بەڵکو لەبری ئەوەی نوقمی نێو نوێژەکە ببن و پەیوەندییان بە خواوە هەبێت، مژوولی دەوروبەری خۆیان بوون، بەڵام ئەگەر ئێمە بڕیارێکیان لەسەر بدەین، ئەوە من دەترسم هەمان هەڵە بکەین".

"کەواتە وەڵامەکەی تۆ کامەیە؟"، شێخ یاسین لەپڕ پرسی و بایەخی بە گفتوگۆکە دا.

"وەڵامی من ئەوەیە کە هەرچوار بازرگانەکە هەموویان بەوای هۆکاری لەیەکترچووەوە هەڵەیان کردووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ناکرێ بوترێ کە یەکێ لەوان هەڵەی کردووە، چونکە ئێمە لە کۆتاییدا بۆمان نییە بڕیاریان لەسەر بدەین".

شەمسی تەورێزی هەنگاوێک بەرەو لام هاتە پێشەوە و دۆستانە و بە سۆزەوە تەماشای کردم. هەستم کرد منی مێردمنداڵ خۆشەویستییەکی باوکانەم پێ بەخشراوە، لە ناوی پرسیم، کاتێ ناوی خۆم پێی گوت، گوتی: "حوسامی هاوڕێتان دڵێکی سۆفییانەی هەیە".

کە ئەوەم ژنەوت، لە شەرمان دەموچاوم سوورهەڵگەڕا. پێم وا بوو کە شێخ یاسین دوای تەواوبوونی وانەکە سەرزەنشتم دەکات و هاوڕێکانمیش گاڵتەم پێدەکەن، بەڵام پەژارەکەم زوو ڕەوییەوە. شێوەی دانیشتنەکەم ڕێکخست و زەردەخەنەیەکم بە ڕووی شەمسدا پژاند، کە هێشتا زەردەی دەهاتی، چاوی لێ داگرتم و لەسەر لێکدانەوەکەی بەردەوام بوو.

"سۆفی دەڵێت: لەبری ئەوەی بڕیار لەسەر ئەوانی تر بدەم، گەرەکە بە قووڵی بیرم لای پەیوەندیی ناوەوەم لەگەڵ خودادا بێت، چونکە پیاوی ئایینی دەمارگیر بەردەوام هەڵەی ئەوانی تر بەدرۆ دادەنێت، بەڵام فەقێینە لە بیرتان نەچێت ئەو کەسەی کە زۆر جار لەوانی تر دڕدۆنگ دەبێت، ئەو خۆی هەڵەیە".

"دەست لە شێواندنی بیری فەقێکانم هەڵگرە"، شێخ یاسین ئەمەی وت و قسەکەی پێ بڕی، "بەڵام ئێمەی پیاوانی ئایینی، گەرەکە بایەخ بەوە بدەین کە خەڵکی دەیکەن، چونکە خەڵکی پرسیاری زۆرمان لێدەکەن و چاوەڕێن وەڵامیان بدەینەوە تا بتوانن ئەرکە ئایینییەکانی خۆیان بە تەواوی و بە دروستی جێبەجێ بکەن. ئاخر ئەوان لێمان دەپرسن ئایا گەر خوێنیان بەربوو دەبێ دووبارە دەستنوێژ هەڵبگرنەوە، یان لە کاتی سەفەردا ڕۆژوویان

لەسەرە یان نا و زۆر شتی تر. ڕێوشوێنەکانی مەزەبی شافیعی و حەنەفی و حەنبەلی و مالیکی دەربارەی ئەم شتانە بۆچوونیان جیایە. ئیدی هەر مەزەبێک لەم مەزەبانە کۆمەڵێ وەڵامی ورد و تایبەت بەخۆی داناوە کە دەبێت لێی بکۆڵرێتەوە و فێری بین".

"ئەمە باشە، بەڵام خۆت بە جیاوازییە ڕواڵەتییەکان مەبەستەوە". شەمس بە هەناسەهەڵکێشانێکەوە ئەمەی گوت، "وشەی خودا تەواو و بێکەموکووڕییە، لەسەر حیسابی هەمووەکی لە وردەکاری مەگەڕێ".

"وردەکاری؟"، شێخ یاسین بە ڕیتمێکی تژی لە گومان وەڵامی دایەوە و لەسەری ڕۆیشت، "بڕواداران ئەم ڕێسا و میتۆدانە بە پەرۆشەوە وەردەگرن، ئێمەی زانایانیش لە هەوڵەکانیان ڕێنماییان دەکەین".

شەمس وتی: "واتا مادام بیرت ناچێت کە ڕێنماییەکەت سنووردار بێت، کەواتە لەسەر کاری ڕێنماییکردن بەردەوام بە، ئەگینا لەسەرووی وشەی خوداوە وشەی تر نییە"، ئینجا ئەمەی خستەسەر، "بەڵام هەوڵ مەدە ئامۆژگاریی ئەوانە بکەیت کە گەیشتوونەتە قۆناغی ڕۆشنگەری، چونکە ئەوان چێژی جیا لە ئایەتەکانی قورئان وەردەگرن و پێویستیان بە ڕێنمایی یان ڕێپیشاندانی شێخێک نییە".

کە شێخ یاسین ئەوەی ژنەوت، بە جۆرێ تووڕە بوو کە هەردوو ڕوومەتە داچۆڕاوەکەی بە شەپۆلی سووورباو دەستیان بە هەڵلەرزین کرد و سێوەکەی ئادەم -گرێی قوڕقوڕاگە-ی بە توندی دەرکەوت و گوتی: "ئێمە ڕێنمایی ئێرەتی پێشکەش ناکەین. شەریعەت ئەوەیە کە ئەو ڕێسا و ڕێنماییانە پێشکەش دەکات کە دەبێت هەموو موسڵمانێک لەسەر بێشکەوە تا ناو گۆڕ پەیڕەوی بکات و وابەستەی بێت".

"شەریعەت تەنها پاپۆڕێکە بەناو ئۆقیانووسی حەقیقەتدا دەڕوات. ئەوەی بە ڕاستی لە خودا دەگەڕێت، درەنگ یا زوو پاپۆڕەکە جێدەهێڵێت و خۆی نوقمی نێو دەریا دەکات".

"بۆ ئەوەی ماسیی قرش بیخۆن"، شێخ یاسین بە پێکەنینێکی خنکاو وەڵامی دایەوە، "ئەمە لەو کەسانە ڕوودەدات کە ڕێنمایی ڕەت دەکەنەوە".

ژمارەیەکی کەم لە فەقێکان بەشداریی پێکەنینەکەیان کرد، ئەوانی ترمان بە هێمنی و بێزارییەوە دانیشتین. گفتوگۆکە لە تەواوبووندا بوو و نەمدەتوانی پێشبینیی ئەوە بکەم کە ئەم باسوخواسە چۆن بە بارێکی باشدا دەشکێتەوە.

بێگومان شەمسی تەورێزیش هەمان هەستی خەمینی هەبوو، چونکە دیاربوو لە فکرانڕاچووبوو، بەڵکو نائومێدیش دیاربوو. مینا لەپڕ ماندوو بووبێت، چاوەکانی لێک نا و بەئاستەم جووڵەیەکی کرد.

"لەمیانەی سەفەرەکانمەوە شێخگەلێکی زۆرم ناسی"، شەمس ئەمەیشی گوت "هەندێکیان پیاوانی دڵسۆز بوون و برێکی دیکەیان لووت بەرز بوون و هیچیان دەربارەی ئیسلام نەدەزانی. من ئامادە نیم گەردی سەر پێڵاوێکی کۆنی عاشقێکی ڕاستەقینەی خودا بە سەری شێخەکانی ئەمڕۆ بگۆڕمەوە. ئەو خەیاڵبازە سێبەرانەی کە لە پشت پەردەوە وڕێنەدەکەن لەوان باشترن، چونکە لانی کەم ددان بەوەدا دەنێن کە ئەوەی ئەوان پێشکەشی دەکەن تەنها خەیاڵپڵاوە".

شێخ یاسین وتی: "ئیدی بەسە! پێم وایە بە زیادەوە گوێمان لە زماندرێژییەکەت گرت. دەی ئێستا برۆ دەرەوە".

"نیگەران مەبە، من خۆم خەریکبووم بڕۆم"، شەمس بە مەکرەوە ئەمەی گوت، ئینجا لای بە لای ئێمەدا کردەوە و گوتی: "ئەوەی ئەمڕۆ لێرە بینیتان گفتوگۆیەکی کۆنە و دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی محەمەدی پەیامبەر دروودی خودای لێ بێت، بەڵام ئەم دەحکەیە پەیوەندیی بە مێژووی ئیسلامەوە نییە، بەڵکو لە دڵی هەموو ئایینە ئیبراهیمییەکاندا خۆی حەشارداوە. ئەمە ململانێی نێوان پیاوی ئایینی و سۆفییە، ململانێی نێوان ئاوەز و دڵە".

شەمس کەمەکێک بێدەنگ بوو تا بوارمان بدات بەتەواوی هەست بە کاریگەریی پەیڤەکانی بکەین. هەستم کرد نیگای کەوتووەتە سەر من، ئەوەش

ئـالۆگۆڕێکی شـار راوە بـوو، بـۆ چـوونە نێـو برایەتییەکـی ئاشـکرانەکراو و تۆمارنەکراوەوە.

ئینجا لەسەری ڕۆیشت: "لە کۆتاییدا، نە مامۆستاکەتان دەتوانێت و نە من دەتوانم لەوە زیاتر بزانین کە خودا بۆی داناوین بیزانین. هەریەکێ لە ئێمە ڕۆڵی خۆی دەگێڕێت، بەڵام گرینگ ئەوەیە ئەو مرۆڤەی کە نایهەوێ ببینێت تیشکی خۆر چاوی نادیدە و کوێرو کەچبین نەکات".

بەم ئاوهـایە، شەمسی تەوریـزی دەسـتی ڕاسـتەی خـستە سـەر دڵـی و دوعاخوازیی لە هەمووومان و تەنانەت لە شێخ یاسینیش کرد، کە خۆی دابووە لاوە و دەموچـــاوی گرژکردبـــوو و وەڵامـــی دوعـــاخوازییەکەی نەدایەوە. دەروێـشەکە چـووە دەرەوە و دەرگـاکەی لە پـشت خـۆیەوە داخـست و لە بێدەنگییەکی قووڵدا جێی هێشتین و بۆ ماوەیەکی زۆر نەمانتوانی قسەیەک یان جووڵەیەک بکەین.

ئیرشـاد بـوو کە لەو سـەرەگێژکەیە دەریهێنـام، ئەوە بـوو سـەرنجم دا بە جۆرێ تەماشای دەکردم کە نیشانەی ئەوە بوو خەوشێکم هەیە. ئەوسا زانیم کە دەستی ڕاستەم لەسەر دڵم وەک سڵاوێک بۆ ئەو ڕاستییەی دۆزیبوومەوە، خاوبووەتەوە.

# پێپرسی جەنگاوەر

## قۆنیا، ئایاری ١٢٤٦

باوەڕم بە گوێیەکانم نەکرد کە بیستم شەمس زاتی کردووە و لە بەردەم فەقێکان بەرەنگاری مامم بووەتەوە. ئەرێ ئەم پیاوە نرخ بۆ هیچ کەسێک دانانێت؟ ئای چەند حەزم دەکرد کاتێ چووە بۆ لای مامم، من لە سوختەخانەکە بوایەم پێش ئەوەی بتوانێت زارە نەفرینەکەی بکاتەو، دەرم بکردایە، بەڵام ئەفسووس لەوێ نەبووم. دیارە باسوخواسێکی زۆر لە نێوان ئەو و ماممدا ڕووی داوە، ئیدی فەقێکان لەوساوە هەر باسی دەکەن، پێم وایە بە دروستی قسەکان ناگێڕنەوە، چونکە بە ئاوەژوو باسی دەکەن و ڕاستییەکی زۆر دەدەنە پاڵ ئەو دەروێشە گەندەڵە.

وا دیارە ئەمشەو بەوای ئەو لەشفرۆشەوە، کە ناوی گوڵی بیابانە زۆر شڵەژاوم و لەو زیاتر ناتوانم بیر لە هیچی تر بکەمەوە. ئەو سندووقگەلێکی خشڵ و مرواریم بیردەخاتەوە کە شتی نهێنیی تێدا شاردرابێتەوە و وات بە خەیاڵدا بێت کە هی تۆن، بەڵام گەر کلیلەکانیت پێ نەبێت، ئەوا تەنانەت گەر لە باوەشیتیش بن هەروا بە داخراوی و دوورەدەستی دەمێننەوە.

ئەوەی زۆرتر دەهریم دەکات خۆ ڕادەستکردنەکەیەتی، ئێستاش لە خۆم دەپرسم بۆچی بەرەنگاری نۆرە شێتایەتییەکانم نەبووەوە، چۆن لە ژێر پێیەکانمدا بە خامۆشی و بەبێ جووڵە لەسەر ڕایەخێکی کۆن و پیس لەسەر زەوییەکە پاڵکەوت؟ خۆزگە لە تۆڵەی ئەو لێدانەی من لێیم دا، لێی دابامەوە، یان کاشکێ هاواری کردبا و داوای فریاکەوتنی کردبا، ئیدی دەستم لە لێدانی هەڵدەگرت، بەڵام بە کپی پاڵکەوتبوو و هیچ جووڵەیەکی نەدەکرد، چاوەکانی هەڵاوس بوون و بەقووڵدا چووبوون. وەک ئەوەی بیهەوێ شتەکە بە

شێوەیەکی نالەبار قەبووڵ بکات، دەمی نوقاندبوو، بە هەرحاڵ هەرچییەک بێت. ئەرێ بەڕاستی بە لایەوە گرینگ نەبوو بمکوشتایە یان نەمکوشتایە؟

هەموو هەوڵێکم دا کە جارێکی تر سەر بە سۆزانیخانەکەدا نەکەم، وەلێ ئەمڕۆ ئارەزوویەکی توند بۆ بینینی زۆری بۆ هێنام، بەدەم ڕۆیشتنەوە بۆ سۆزانیخانەکە پرسیارم لە خۆم کرد ئاخۆ کە چاوی پێم دەکەوێت کاردانەوەی چۆن دەبێت، ئەی ئەگەر شکاتی لێ کردبووم و شتەکە خراپ شکابووەوە، ئەوسا دەمی خاوەنە قەڵەوەکەی سۆزانیخانەکە چەور دەکەم، یان هەرەشەی لێدەکەم. لە مەژگی خۆمدا پلانم بۆ هەموو شتێک دانا، جگە لە ئەگەری ئەوەی ڕەنگە هەڵاتبێت. ئیدی بۆ هەموو ئەگەرێک خۆم ئامادە کردبوو.

تەقیمەوە و گوتم: "مەستت چییە، گوڵی بیابان لێرە نییە؟ ئەی لە کوێیە؟".

"ئەو لەشفرۆشە لەبیر خۆت ببەوە"، خاوەنی سۆزانیخانەکە بەدەم قسەوە لوقمێکی خستە دەمییەوە و دەستی بە لستنەوەی شیلەی شیرینی سەر پەنجەکانی کرد. کە بینیی زۆر تووڕەم، بە دەنگێکی نەرمتر وتی: "پێپرس، بۆچی چاوێک بە کچەکانی دیکەدا ناگێڕیت؟".

"هەی پیرەژنی قەڵەو و خەرفاو. لەشفرۆشە هەرزانەکانتم ناوێ. گوڵی بیابانم دەوێ، دەمەوێ هەر ئێستا بیبینم".

کە ئەوەم بە نێرەمووکەکە وت، بێ ئەوەی زات بکات دەحکەم لەگەڵدا بکات، هەردوو برۆ تیژ و ڕەشەکەی هەڵبڕی، وەک ئەوەی پێی شەرم بێت قسەکە بکات، دەنگی نزمکردەوە و بە چپە وتی: "ئیدی ئەو ڕۆیشتووە. دیارە کاتێ هەموان لە پرخەی خەودا بوون ئەو هەڵاتووە".

شتەکە تووڕەهات دیاربوو، بەڵکو پێکەنیناویش بوو. لێم پرسی: "ئەمە لەکەیەوە لەشفرۆشەکان لە سۆزانیخانەکە دەردەچن؟ گەرەکە هەر ئێستا بیدۆزیتەوە".

خاوەن سۆزانیخانەکە وەک ئەوەی یەکەم جاری بێت بمبینێت، چاوی تێبڕیم و بە وژەوژێک گوتی: "تۆ کێیت تا فەرمانم بەسەردا بکەیت؟"، چاوە نەترسەکانی و بچووکەکانی بە پێچەوانەی چاوەکانی گوڵی بیابان بروسکەیان دا و بە تیژی تێی ڕوانیم.

"من حەسحەسم و مامم پایەیەکی گرینگی هەیە، دەتوانم ئەم حەشارگەیە دابخەم و هەمووتان تووڕدەمە سەر شەقام"، بەدەم قسەوە دەستم بۆ ئەو قاپە فەخفوورییە درێژکرد کە لە باوەشی دایدابوو، لوقمێکم هەڵگرت، لوقمەکە تەڕ و نەرم بوو.

پەنجە لیقاویبووەکانم بە ملپێچە ئاوریشمەکەی سڕییەوە. لە تووڕییان دەموچاوی سوور هەڵگەڕا، بەڵام نەیوێرا ڕووبەڕووم ببێتەوە.

وتی: "بۆچی سەرکۆنەم دەکەیت؟ پێویستە ئەو دەروێشە سەرکۆنە بکەیت کە گوڵی بیابانی قایل کرد سۆزانیخانەکە جێبهێڵێت و لە خودا بگەڕێت".

' ساتەوەختێک تێنەگەیشتم دەربارەی کێ قسە دەکات، بەڵام زوو زانیم کە مەبەستی شەمسی تەورێزییە.

یەکەم جار لە بەردەم فەقێکان گاڵتەی بە مامم کرد، ئێستاش ئەمەی کردووە. بێگومان ئەم خودانەناس و زەندیقە سنووری خۆی نازانێت.

## ئێلا

### نۆرتامبتۆن، ٢٦ی حوزێران ٢٠٠٨

بەڕێز عەزیز

لەم کاتەدا بڕیارم دا، بە شێوازێکی کۆن، بە قەڵەمێکی پاندان و کاغەزێکی بۆندار زەرفێکی هاوشێوە بۆندار و پوولێکی پۆست، نامەیەکت بۆ بنووسم. دوای نیوەڕۆی ئەمڕۆ بۆ ئەمستردام دەینێرم. دەمەوێ دەسبەجێ ئەوە بکەم، خۆ ئەگەر لەناردنی دوابکەوم، ڕەنگە دوای ئەوە نەتوانم بینێرم.

سەرەتا چاوت بە کەسێک دەکەوێت – کەسێک لە هەموو ئەو کەسانەی دەوروبەرت جیایە. کەسێک هەموو شتێک لە دیدێکی جیاوە دەبینێت و وات لێدەکات دیدگات بگۆڕێت و سەرلەنوێ سەرنجی هەموو شتێ لە ناوەوە و لەدەرەوە بدەیت، وات بە خەیاڵدا دێت کە دەتوانیت ئەو مەودا ئارامەی نێوان خۆت و ئەو بپارێزیت، هەروەها بە خەیاڵتدا دێت کە دەتوانیت ملبنێیت و لە گەرمەی ئەم گەرداوە جوانەدا ڕێگەی خۆت ببڕیت، تا لەناکاو تێدەگەیت فڕێدراویتە دەشتێکی چۆڵ و ناتوانیت بڕیار لەسەر ئەوە بدەیت.

تەواو نازانم لەکەیەوە پەیڤەکانت دیلیان کردووم، بەڵکو هەموو ئەوەی دەیزانم، ئەوەیە ئەو نامانەی نێوانمان هەر لە سەرەتاوە دەستیان بە گۆڕینم کرد، ڕەنگە لەوەی دەیڵێم ژێوان ببمەوە، لێ هەموو ژیانم لەسەر ئەو شتانەی کە نەمتوانی بیانکەم بە پەشیمانی بردەسەر، بۆیە ئێستا بە خراپی نازانم بە مەبەستی گۆران شتێ بکەم.

لەوساوە کە لەمیانەی ڕۆمانەکەت و نامە ئەلیکترۆنییەکانتەوە (بە تۆ گەیشتم)، دەسەڵاتت بەسەر بیرکردنەوەمدا کێشاوە. هەر کە نامەیەکی ئەلیکترۆنیت بۆ دەناردم و دەمخوێندەوە، لە ناوەوەمدا هەستم بە شتێ دەکرد و وای لێدەکردم کە لە ناکۆتاییدا بخولێمەوە و هەستم دەکرد زۆر دەمێکە هەستم بە شتی وا نەکردووە. ئیدی بە درێژایی ڕۆژ ئەم بیرکردنەوانە بەرۆکیان بەرنەدەدام. بەب یدەنگی قسەت بۆ دەکەم، لە خۆم دەپرسم دەبێ چۆن بێیتە نێو ژیانی ڕۆژانەمەوە. کە ڕوو دەکەیتە خواردنگەیەکی باش، دەمەوێ لەگەڵتدا بم، کاتێ شتێ دەبینم و بە دڵمەوە دەنووسێت، خەمێک دامدەگرێت، چونکە ناتوانم پیشانی تۆی بدەم. چەند ڕۆژێ لەمەوبەر کچە بچووکەکەم لێی پرسیم ئاخۆ چیم لە پرچم کردووە، چونکە قەت دەقی پرچم ناگۆڕم! چونکە وا دیارە بووم بە ئافرەتێکی دیکەی جیا و خەریکە هەست دەکەم کە من جیام.

ئینجا دەگەڕێمەوە و بیری خۆمی دێنمەوە کە ئێمە هێشتا یەکترمان نەبینیوە، ئەمەش دەمگێڕێتەوە سەر دۆخی ڕاستەقینە. لە ڕاستیدا نازانم بەرانبەر بە تۆ چی بکەم. لە خوێندنەوەی ڕۆمانەکەت بوومەوە و ڕاپۆرتەکەمم ئامادەکردووە. (ئاە، بەڵێ، کە ڕاپۆرتم لەسەری دەنووسی، تا دەهات کاتەکە دەڕۆیشت و دەمەویست بۆچوونی خۆمت پێ بڵێم، یان لانی کەم ئەو ڕاپۆرتەت بۆ بنێرم کە بۆ پەخشکارە ئەدەبییەکەم ناردووە، بەڵام بە خۆمم وت ئەمە شیاو نییە، هەرچەندە من ناتوانم وردەکاریی ڕاپۆرتەکەمت پێ بڵێم. دەبێ ئەوە بزانیت من زۆر کتێبەکەتم بەدڵدا چووە، سوپاست دەکەم کە ئەو چێژەت بۆ ڕەخساندم. پەیڤەکانت بەردەوام لەگەڵمدا دەمێننەوە).

لە هەموو بارێکدا ڕۆمانی (کفری شیرین) پەیوەندیی بەوەوە نییە تا بڕیار بدەم ئەم نامەیەت بۆ بنووسم، یان ڕەنگە پەیوەندیی بە هەموو شتێکەوە هەبێت. هەر ئەو بوو بە مایەی گەشەکردنی نێوانمان و دەسەڵاتی کاریگەرییەکەی لەسەرم وام لێدەکات خۆم پێ بەرزەوت نەکرێ، وای لێهاتووە

کاریگەرییەکەی لەوە زیاتر بێت کە من بەرگەی بگرم. سەرەتا خەیاڵەکانت و چیرۆکەکانت بە دڵمەوە نووسان، ئینجا هەستم کرد من ئەو پیاوەم خۆش دەوێ کە لە پشت ئەو چیرۆکانەوە خۆی حەشارداوە.

وەک وتم، گەرەکە دەسبەجێ ئەم نامەیە بنێرم، ئەگینا دەیدڕێنم و وردوردی دەکەم. ئاخر بە شێوەیەک ڕەفتار دەکەم وەک ئەوەی هیچ شتێکی نوێ لە ژیانمدا ڕووی نەدابێت، شتێکی نائاسایی.

بەڵێ، دەکرێ ئەوە بکەم کە هەمیشە دەیکەم، خۆمیش وا نیشان بدەم کە هەموو شتێ خواسایی و سروشتییە.

دەتوانم لافی ئەوە لێبدەم گەر ئەوە لەپای ئەم ئازارە شیرینەی دڵم نەبێت، ئەی دەبێ لەپای چی بێت.

**لەگەڵ خۆشەویستیم**

**ئێلا**

## کیرا

### قۆنیا، ئایاری ١٢٤٦

بەرایی مەینەتییەکە. نازانم چۆن بتوانم ئەم شتە چارەسەر بکەم.

ئەم بەیانییە، ئافرەتێـک بـێ ئەوەی بـزانم لە کوێـوە هـاتووە، هـات و پرسیاری شەمسی تەورێزیی کرد. داوام لێی کرد کاتێکی تر بێتەوە، چونکە لە مـاڵ نیـیە. وتـی شـوێنێکی نیـیە ڕووی تێبکـات، حەز دەکـات لە حەوشـەکە چـاوەڕێی بکـات. ئیدی چەنـدین گومـانم لا پەیـدابوون و لە خـۆم پرسـی ئەم ئافرەتە کێیە و لە کوێوە هـاتووە. چۆکی دادا و پەچەکەی لادا و دەموچاوێکی هەلاهەلابـووی برینـداری دەرخست کە لە ئەنجـامی لێدانێکی تونـد ئاوسـابوو. لەگەڵ شینهەڵگەڕان و برینەکانی یەکجار جوان و باریکەلە بوو. ئەو کە بەکوڵ دەگریا و فرمێسکی دەڕشت، بە شێوازێکی یەکجـار شـارەزایانە لەو گومـانـانە دڵنیا بووم کە هەمبوون. دەرکەوت سۆزانییەکە و لە سۆزانیخانەوە هاتووە.

گوتی: "بەڵام من ئەو شوێنە ئابڕووبەرەم بەجێ هێشتووە و بۆ گەرمـاوی گشتی چووم و چل جار وسڵم کرد و چل نوێژم کرد، سـوێندم خـوارد کە ئیدی توخنی پیاوان نەکەوم. لە ئێستا بەدواوە ژیـانی خـۆم بـۆ خـودا تەرخـان دەکەم".

نەمزانی چیی پێ بڵێم، تەماشای چاوە برینـدارەکانیم کرد و پرسیم ئەوێـک کە جحێڵ و کاڵفامە چۆن ئەو بوێرییەی هەبووە تا واز لەو تاقە شتە بێنێت کە لە ژیانیدا هەر ئەوە دەزانێت. نەمدەویست ئافرەتێک ببینم کە لە نزیک مـاڵەکەم بکەوێت، لێ شتێکی تێدا بوو بەندی دڵی پساندم، کە جۆرێ بوو لە ساکاری و هەندێ لە بێتاوانی، کە لەوەو پێش لە هیچ کەسـێکدا نەمدیبوو. چـاوە کاڵەکـانی چـاوانی دایکە مارییـان بیرخستمەوە، بـۆیە نەفسم ڕێگەی نەدام دەری بـکەم.

ئیدی وازم لێی هێنا تا لە حەوشەکە چاوەڕێ بکات. ئەوەش هەموو شتێ بوو کە لەدەستم هات. جێم هێشت و ئەویش لەوێ دانیشت و پشتی بە دیوارەکەوە دا و وەک پەیکەری لە بەردی گرانبەها دروستکراو بەبێ جوولە تەماشای ڤالایی دەکرد.

دوای نزیکەی سەعاتێ، شەمس و ڕۆمی لە گەشتەکەیان گەڕانەوە، ڕام ئکرد تا هەواڵی میوانێکی چاوەڕوان ئنەکراویان پێ ڕابگەیەنم.

"ئەرێ وتت لەشفرۆشێک لە حەوشەکەمانە؟"، ڕۆمی بەدەم پرسیارکردنەوە سەرسوڕمانێک لە دەنگیدا دەرکەوت.

"بەڵێ، ئەو دەڵێت بۆیە وازی لە سۆزانیخانەکە هێناوە تا بەدوای خودادا بگەڕێت".

شەمس هاتە دەنگ: "ئاە، بێگومان ئەوە گوڵی بیابانە". لە دەنگیدا ڕیتمێکی شادمانی دیاربوو، نەک سەرسوڕمان، ئینجا گوتی: "بۆ هێشتت لە دەرەوە بێت؟ با بێتە ژوورەوە".

"ئاخر دراوسێکانمان گەر بزانن کچێکی بەدڕەوشت لە ژێرمیچی ماڵەکەمانە چی دەڵێن؟"، بە ناقایلییەوە وام گوت و دەنگم شڵەژانێکی تێکەوت.

"ئەی لە هەموو بارێکدا هەموومان لە ژێر یەک میچدا ی؟"، شەمس بەدەم قسەوە ئاماژەی بۆ بەرزایی ئاسمان کرد، "پاشاکان و سواڵکەرەکان و پاکیزەکان و لەشفرۆشەکان، هەموویان لەژێر یەک ئاسماندا دەژین".

چۆن بتوانم لەگەڵ شەمسدا دەحکە بکەم، ئاخر بەردەوام بۆ هەموو شتێ، وەلامی ئامادەی پێیە.

بانگی گوڵی بیابانم کرد تا بێتە ژوورەوە، پاڕامەوە کە چاوی دراوسێ خۆتێهەڵقورتێنەرەکان نەمانبینن. هەر کە هاتە ژوورەوە پەلاماری دەستی شەمسی دا و ماچی کرد و دەستی بە هەنسکدان کرد.

"بە هاتنت شادمانم"، شەمس وەک ئەوەی لەگەڵ هاوڕییەکی کۆنیدا قسە بکات، بە زەردەخەنەوە دەدوا،" ئیدی بەرەو ئەو شوێنە ناگەڕێیتەوە و ئەو قۆناغە لە ژیانتدا بەتەواوی کۆتایی هات، خودا سەفەرەکەت بەرەو حەقیقەت بەرهەمدار بکات".

گوڵی بیابان لە کوڵی گریانی دا و وتی: "بەڵام خاوەنی سۆزانیخانەکە لێم ناگەڕێت بە ئاسوودەیی بژیم، چونکە سەرچەقەڵ بەدوامدا دەنێرێت. ئاخر تۆ نازانیت چۆن...".

شەمس قسەکەی پێ بڕی و گوتی: "کیژۆڵەکەم، ئاوەزی خۆت پاک ڕابگرە"، ئینجا لەسەری ڕۆیشت، "ڕێسایەکی دیکەت لەبیر بێت: **(لەگەڵ ئەوەی لەم دنیایەدا بنیادەم هەوڵدەدات شتێک وەدەست بێنێت و ببێتە کەسێکی گرینگ، کەچی دوای مردنی هەموو شتێک جێدەهێڵێت. تۆ کە لە عەدەمدا ئامانجت ئەوەیە بگەیتە قۆناغە باڵاکە، لەم ژیانەدا وەک ژمارە سفر بە سووکی و بەتاڵی بژی. ئێمە لەمەرکانەیەکی گوڵ جیانیین. جوانی لە دەرەوە نییە، بەڵکو لەو بۆشاییەی ناوەوەماندایە کە وامان لێدەکات ڕاست لەسەرپێ بوەستین. هەستکردن بە عەدەم تەواو وەک ئەوەیە، نەک ئەوەی هەوڵی بەدەستهێنانی دەدەین، هەر ئەمەشە بۆ بەردەوامیی ژیان دەمانهێڵێتەوە)**".

* * *

ئێوارە درەنگ، ئەو جێخەوەم پیشانی گوڵی بیابان دا کە لەسەری دەنوست، کاتێ دەسبەجێ خەوی لێکەوت، بۆ ژوورە سەرەکییەکە گەڕامەوە کە لەوێ ڕۆمی و شەمس قسەیان دەکرد.

"پێویستە ئامادەی ئەو سەمایە بیت کە پێشکەشی دەکەین"، شەمس کە بینیمی وا دیم وای پێگوتم.

لێم پرسی: "کام سەما؟".

"کیرا، سەمایەکی ڕۆحییە و لەمەوپێش وێنەیت نەدیوە".

بە دوو چاوی ئەبڵەقەوە تەماشای شووەکەمم کرد. ئەوە چی ڕوودەدات، دەربارەی کام سەما قسە دەکەن؟

"مەولانا، تۆ زانایەکی پایەداریت و کەسێکی خواناسیت. خەڵکی چیت پێدەڵێن؟"، بەدەم پرسیارەکەوە هەستم بە گەرمییەک کرد کە دەموچاومی داگیرساند.

"نیگەران مەبە"، ڕۆمی پێی وتم، "من و شەمس ماوەیەکە دەربارەی ئەم شتە قسەمان کردووە. دەمانەوێ سەمای دەروێشان پێشکەش بکەین، هەر

پێی دەوترێ (سەما) و ئێمەش پێشوازیی ئەوانە دەکەین کە دێنە ناومانەوە و ئەڵهای عەشقی خودایین".

سەرم بە توندی هاتە ژان، وەلێ ژانەکەی بەچاو ژانی ناو دڵم سووک بوو.

"ئەی ئەگەر خەڵکی حەزیان لێی نەبوو؟ خۆ هەموو خەڵکی ڕێزی سەماکردن ناگرن"، بەو ئومێدەی ئەوەی وتم کاریگەریی لەسەر قسەکانی لە مەولانا هەبێت، بە شەمسم وت، "بە لای کەمەوە ئەم سەماکردنە بۆ ماوەیەک دوابخرێ".

"ئاخر هەموو خەڵکی وەک پێویست ڕێزی خودا ناگرن"، شەمس وتی، "ئایا لەبەر ئەوە واز لە بڕوای خۆمان بهێنین؟".

ئەم دەربڕینە کۆتایی گفتوگۆکە بوو. ئیدی هیچ وشەیەکی تر نەما و ماڵەکە پڕبوو لە (با) کە لەمیانەی درزی دیوارەکانەوە دزەی دەکرد و لە گوێماندا وڕەی دەهات.

# سوڵتان وەلەد

## قۆنیا، حوزەیرانی ١٢٤٦

"بێگومـان جـوانی لە چـاوی بینەرەکەیـدایە"، شـەمس لەسـەر وتەکەی ڕۆیشت، "چونکە هەموان هەمان سەما دەبینن، لێ هەر کەسێ بە شێوازی جیا دەیبینێت، کەواتە نیگەرانیی بۆ چییە؟ هەندێک حەزی لێدەکەن و هەندێکی تر حەزی لێناکەن".

لەگەڵ ئەوەشدا لە ئێوارەی (سەماکردنەکە)دا بە شەمسم وت من دەترسم کەس ئامادەی سەماکە نەبێت.

بە جەخـتەوە وەڵامـی دایەوە: "نـیگەران مەبە، ڕەنـگە خەڵکـی شـارەکە خۆشیان نەویم، تەنانەت ئیتر باوکتیشیان خۆش ناوێ، لێ نـاتوانن پشتگوێمان بخەن، چونکە هەستی خۆهەڵقورتانیان هانیان دەدات ئامادە بن".

بەم ئاوهـایە، ئەو ئێوارەیەی کە سـەماکەی تێدا بەڕێوە دەچـوو، هـۆڵەکە پڕبـوو لە خەڵکی هەمەجۆر و هەمەکارە، ئیدی لە بازرگانـان و ئاسـنگەران و دارتاشـان و جوتیـاران و سەنگتاشـان و بۆیاخچییـان و گژوگیـای پزیـشکی فرۆشـان و سـەرۆکانی تـایەفە پیـشەییەکان و نووسـەرەکان و نانەواکـان و سەردولکەدادەرەکان و لێزانەکان و ڕاوکەری ڕسقان و وردەواڵەفرۆشەکان و تەنانەت تا دەگاتە شێخ یاسین کە بە خۆی و ژمارەیەک لە فەقێکانی هاتبوو — و ئافرەتانیش لە ڕیزی پشتەوە دانیشتبوون.

کـاتێ بینـیم شاکەیخەسـرەو لەگەڵ ڕاوێژکارەکانیـدا لە ڕیـزی پێـشەوە دانیـشتووە، هەسـتم بە ئاسـوودەیی کـرد. ئیدی پیاوێـک بەم پـایەبەرزەییەوە پشتی باوکم بگرێت، ئەوا هەموو زمانەکان لاڵ دەکات.

ئامادەبوان برێ کاتیان ویست تا جێگەی خۆیان بگرن، تەنانەت تا دوای ئەوەی جێگەی خۆیان گرت، ژاوەژاوی نێو هۆڵەکە نەنیشتبووەوە و هێشتا منجەمنجی گفتوگۆی ئاگرین دەبیسترا. لەبەر ئەوەی دەمەویست بە تەنیشت کەسێکەوە دانیشم جنێو بە شەمس نەدا و بە خراپە باسی نەکات، ئەوەبوو لەتەک سلێمان سەرخۆشەوە دانیشتم، کە بۆنی (مەی)ی لێدەهات، بەڵام گوێم بە نۆنەکەی نەدا.

هەردوو لاقم دەلەرزین و ناو هەردوو لەپم ئارەقەیان لێ دەچۆڕایەوە. هەرچەندە هەواکەی خۆش بوو و دەمانتوانی عەباکانمان داکەنین، چەقەی ددانەکانم دەستی پێکرد. ئاخر ئەم سەماکردنە بۆ ناوبانگی باوکم یەکجار گرینگ بوو کە خەریکبوو لێژدەبووەوە. لە خودا پاڕامەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی بەتەواوی نەمدەزانی داوای چیی لێ بکەم، جگە لەوەی شتەکە بە خۆشی تێپەڕێت، بۆیە پاڕانەوەکانم لاواز دیاربوون.

ئەوەندەی نەبرد دەنگێک بەر گوێم کەوت، سەرەتا دوور و ئینجا تا دەهات نزیک دەبووەوە. دەنگێکی دڵگیر و کاریگەر بوو، بۆیە هەموان هەناسەیان لەبەرخۆ بڕی و گوێیان هەڵخست.

'جۆری ئەم ئامێرە مۆسیقایە چییە؟'، سلێمان بە شێوەیەک تێکەڵ لە ڕێز و خۆشەویستی بە چپە گوتی.

'ئەوە پێی دەڵێن نای' بەدەم وتنەوە، قسەیەکی باوکم و شەمسم هاتەوە یاد 'دەنگی لە هەناسەهەڵکێشانی دڵدار بەرانبەر دولبەرەکەی دەچێت'.

کە دەنگی نایەکە خامۆش بوو، باوکم بە هەنگاوی سەنگین و لەسەرخۆ و ناسکەوە بەرەو سەکۆکە ڕۆیشت، کە نزیکبووەوە سڵاوی لە ئامادەبووان کرد. ئینجا شەش دەروێش دوایکەوتن کە هەموویان مریدی باوکم بوون و جلی ئاودامان سپی و دامێن فراوانیان لە بەر بوو، دەستیان لەسەر سینگیان تێکپەڕاندبوو. ئینجا بۆ پیرۆزی و فەڕوەرگرتن بەرانبەر باوکم دانوشتانەوە. دواتر مۆزیک لێدرا و دەروێشەکان دەستیان پێکرد. یەک لەدوای یەک سەرەتا لەسەرخۆ بە دەوری خۆیاندا دەستیان بە خولانەوە کرد، ئینجا خێراتر و دامێنی کراسە ئاودامانەکانیان مینا گوڵە لوتس کرانەوە.

دیمەنێکی نایاب بوو، ئیدی خۆم پێ نەگیرا و بە شانازی و خۆشحاڵییەوە زەردەخەنەم هاتێ. بەتیل چاو چاودێریی بەپیرەوەهاتنی ئامادەبووانم دەکرد، تەنانەت ئەوانەی لە هەموان چەنەدرێژتر بوون، بینیمن بە سەرسامییەکی ئاشکراوە تەماشای سەماکەیان دەکرد.

دەروێشەکان بۆ پیشاندانی نەمری هەر بە دەوری خۆیاندا سوڕانەوە و سوڕانەوە، ئینجا دەنگی مۆسیقا بەرزبووەوە، دەنگی ڕەبابەیەک لە پشت پەردەوە هاوشانی دەنگی نای و دە، پاشان شەمسی تەورێزی وەک گەردەلوولی بیابان سەرکەوتە سەر سەکۆکە. عەبایەکی لەوەی ئەوانی لە بەر بوو، بەڵام ڕەنگی تێرتر بوو و لە هەموان باڵابەرزتر دیاربوو و لەوان خێراتر دەخولایەوە. هەردوو ناولەپی ڕووەو ئاسمان کرابوونەوە، دەموچاویشی وەک درەختی گوڵەبەڕۆژە لە خۆر دەگەڕا.

گوێم لێبوو هەندێ لە ئامادەبووان بە ڕێزەوە هەناسەبڕکێیان بوو، تەنانەت ئەوانەی کە ڕقیان لە شەمسی تەورێزی بوو، وا دیاربوو کەوتوونەتە ژێر ئەفسوونی سەما و مۆسیقاکەوە. تەماشای باوکم دەکرد، لەو ساتەدا شەمس زۆر بە خێرایی دەخولایەوە، مریدەکانی هەریەکەو لە خولگەی خۆیدا دەستیان بە خولانەوەیەکی زۆر هێواشتر کرد، کەچی باوکم مینا پیرەداربەڕوویەک لە جێگەی خۆی مایەوە، پەندیار و هێمن، لێوەکانی لە جووڵەی نزا و پاڕانەوەدا بوون.

مۆسیقا خاوبووەوە و لەناکاو دەروێشەکان لە خولانەوە کەوتن و هەریەکێ لە گوڵەلوتسەکان بەسەر خۆیدا داخرا. باوکم لەسەر سەکۆکە بە سلاوێکی ناسک هەموو سەماکەرەکان و هەموو ئامادەبووانی پیرۆزکرد. بۆ ساتێک هەستم کرد کە هەمووومان لە دۆخێکی تەبایی تەواودا پێکەوە گرێدراوین، بێدەنگییەکی چڕ و کتوپڕ بەدوای ئەوەدا هات. کەسێک لەو خەڵکە نەیزانی چۆن ڕەفتار بکات، چونکە کەس لەوەپێش شتی وای نەدیبوو.

دەنگی باوکم کپییەکەی سمی و گوتی: "هاوڕێیانم، ئەمە پێی دەوترێ سەما، واتا سەمای دەروێشان. ئیدی لە ئێستا بەدواوە دەروێشەکان لە هەموو ڕۆژگارێکدا ئەم زیکر و سەمایە دەکەن. دەستێک بەرەو ئاسمان و دەستەکەی

تر ڕووەو خوار و بەرەو زەوی، هەر خاڵێکی خۆشەویستی کە لە خوداوە دەستمان دەکەوێت، بەڵێن دەدەین بەسەر هەموو خەڵکیدا دابەشی بکەین*.

زەردەخەنە کەوتە سەر لێوی ئامادەبووان و بە قایلبوونەوە دەستیان بە ورەور کرد. شڵەژانێکی دۆستانە و فێنک هۆڵەکەی گرتەوە. بینیم ئەم بەدەنگەوەهاتنە باشە کاری تێکردم و چاوەکانم فرمێسکیان تێزا. لە کۆتاییدا سڵاوی خۆشەویستی و ڕێز لە باوکم و شەمس کرا کە شایانی بوون.

دەکرا ئەو ئێوارەیە بەو گەرموگوڕییە کۆتایی بێت، هەروەها دەکرا بە سەرودڵێکی خۆشەوە بەرەو ماڵ بگەڕێمەوە و دڵنیابم کە شتەکان خەریکە باش دەبن، گەر ئەو شتە ڕووی نەدابا کە لەوەولا ڕووی دا، ئەوەی کە هەموو شتێکی وێران کرد.

# سلێمان سەرخۆش

## قۆنیا، حوزێرانی ١٢٤٦

بروسکە و خوێن! ئای لەو ئێوارەیەی کە بیرناچێتەوە! هێشتا کاریگەرییەکەی بەری نەداوم، لەنێو هەموو ئەو شتانەی کە ئەمشەو بینیمن، کۆتاییەکەی لە هەمووی کاریگەرتر بوو.

دوای تەواوبوونی سەماکە، کەیخەسرەوی دووەمی مەزن هەستایە سەرپێ و بە لەخۆڕازیبوون و شانازیی بەخۆکردنەوە چاوی بە هەموو هۆڵەکەدا گێڕا. بە فیزێکی زۆرەوە دوای ئەوەی لە قاقای پێکەنینێکی بەرزی دا، وتی: "دەروێشینە، پیرۆزباییتان لێ دەکەم! سەماکەتان زۆر سەرسامی کردم".

ڕۆمی زۆر بە ناسکی سوپاسی کرد، هەروەها دەروێشە وەستاوەکانی سەر سەکۆکەش بە هەمان جۆر، ئینجا مۆزیکژەنەکان هەستان و دوا ئیکلامیان بۆ پاشا کێشا، ئینجا کەیخەسرەو کە ئاسوودەیی لە دەموچاوی دەتکا، ئاماژەی بۆ یەکێک لە پاسەوانەکانی کرد کە کیسەیەکی مەخمەڵی دایە دەستی. کەیخەسرەو لەناو لەپیدا دەستی بە ڕاوەشاندنی کیسەکە کرد تا بزانێت چەند قورس و پڕە لە پارەی زێڕ، پاشان بەرەو سەکۆکە فڕێی دا. ئەو کەسانەی لە دەوروبەرم بوون هەناسەیەکیان هەڵکێشا و چەپڵەیان لێدا. ئەوە بوو بەخشندەیی دەسەڵاتدارەکەمان کاری لە هەموومان کرد.

کەیخەسرەو کە لێوانلێو بوو لە ڕەزامەندی و دڵنیایی، وەرسوڕایەوە تا بڕوات، بەڵام هەر کە بەرەو دەرگا هەنگاوی نا، ئەو کیسەیەی تێسرەوێنرا کە فڕێی دابووە سەر سەکۆکە، ئیدی پارەکان لەژێر پێیەکانیدا پەرت بوون و وەک زڕەی بازنگی نۆبووکێک زرینگەیان لێ هەستا، شتەکان زۆر بە خێرایی

ڕوویان دا، بە جۆرێ بۆ چەند ساتێ بەتەواوی لە شوێن خۆمان وشک بووین و واقمــان وڕمــا و نەمــانتوانی لەوە تێــبگەین کە لە دەوروبەرمــان چــی ڕوودەدات. بێگومـان ئەو کەسـەی بـووە هـۆی ئەوەی ڕووی دا، کەیخەسـرەو خۆی بـوو کە بەڕاسـتی گـڕی گـرت. ئـاخر سـووکایەتیکردنەکە لە هەمـوانەوە دیـاربوو و گومـانی تیـدا نەبـوو ئاراسـتەی ئەو کـرا، ئەمەش شـتێک بـوو لێخۆشبوونی بۆ نەبوو. بە دوو چاوی باوەڕنەکردەنییەوە تەماشای دواوەی کرد تا بزانێت ئەوە کێیە زاتی کردووە ئەم ڕەفتارە نابەجێیە بکات.

ئەوە شەمسی تەورێزی بوو. هەمـوو سـەرەکان ڕووەو ئەو وەرسـوڕان. لە کاتێکدا لە ناوەندی سـەکۆکە وەسـتابوو، هەردوو دەستی لەسـەر کەمەری دانابوو و چاوە سوورهەڵگەڕاوەکانی زەق زەقدەیانڕوانی.

بە دەنگێکی قووڵ وتی: "ئێمە لەپێناو پارەدا سەما ناکەین، سـەما زیکرێکی ڕۆحییە و لەپای خۆشەویستیدا دەیکەین، تەنها خۆشەویستی. ئەی خاوەنشکۆ، لەبەر ئەوە زێڕەکانت وەربگرەوە! پارەکانت لێرە دادێک نادەن".

بێدەنگییەکی سامناک باڵی بەسەر هۆڵەکەدا کێشا. کوڕەکەی ڕۆمـی وەک ئەوەی خوێن لە دەموچاوە بچووکەکەی وشک بووبێت هەڵدەلەرزی، کەسێک زاتی نەکرد دەنگێک دەربکات، هەمووموان هەناسـەی خۆمـان قەتیس کردبوو. وەک ئەوەی ئاسمان چاوەڕێی ئەم ئامـاژەیەی کردبێت، بـاران بە لێزمە تێـی کرد، ئیدی دڵۆپەکانی بارانەکە هەمـوو شـتێک و هەمـوو کەسێکی نـوقم کـرد. "دەی با بڕۆین"، بەدەم قسەوە دەی لە پیاوەکانی کرد.

پاشـا ڕووی کـردە دەرگـاکە و بەو سـووکایەتی پێکـردنە ڕوومەتەکـانی دەلەرانەوە و لێوەکانی دەلەرزین و شانەکانی داکەوتبوون.

پاسەوانەکانی و خوبزەکانی یەک لەدوای یەک بەدوایدا هەیپایان لێکرد، بە پێڵاوە قورسەکانیان پێیان لە پارە کانزاییە پەرتبووەکانی سەر زەوییەکە دەنا، ئیدی خەڵکەکە بۆ هەڵگرتنەوەیان دەستیان بە پاڵەپەستۆ کرد.

هەر کە پاشـا ڕۆیـشت، بۆڵەبـۆڵی نـاڕەزایی و نائومێـدی لە ڕیـزی ئامادەبووان بەرزبووەوە.

"ئەوە خۆی بە کێ دەزانێت"، ئەمە بۆڵەبۆڵی هەندێ بوو.

"چۆن دەوێرێت سووکایەتی بە پاشاکەمان بکات"، هەندێکی تر هاواریان کرد، "ئاخر بۆچی وا لە کەیخەسرەو دەکات کە ئێستا هەموو شارەکە باجەکەی بدەنەوە؟".

هەندێ کەس وەستابوون و سەری باوەڕنەکردەنییان بادەدا، ئینجا بەرەو دەرگا ڕۆیشتن و نیشانەی ناڕەزایی لەسەر دەموچاویان نەخش بووبوو. لە سەرووی ناڕازییەکانەوە شێخ یاسین و مریدەکانی بوون. ئەوەی تووشی سەرسوڕمانی کردم، ئەوە بوو لەنێو ناڕازییەکاندا دوو مریدی ڕۆمی و عەلائەدینی کوڕیم دی.

# عەلائەدین

**قۆنیا، حوزێرانی ١٢٤٦**

بە خودا سوێند دەخۆم لە ژیانمدا قەت وەک ئێستا هەستم بە شوورەیی و تێدامان نەکردووە. ئاخر دیمەنی باوکم و برادەرە زەندیقەکەی ئابڕووبەرانە بوو، کاتێ بینیم ئەم سەمایە دەکات، هەستم بە سووکایەتی کرد. ئاخر چۆن توانیی بەرانبەر بە خەڵکی شارەکە بەم شێوەیە ئابڕووی خۆی ببات؟ ئەوەی لە هەموو شتێ زیاتر دایچڵەکاندم ئەوە بوو بیستم کە لەشفرۆشێکی سۆزانیخانەکە لەنێو ئامادەبووانیدایە. ئەو کاتەی لەوێ دانیشتبووم لە خۆم پرسی کە خۆشەویستیی باوکم بۆ شەمسی تەورێزی ئەو شێتایەتی و کاولکارییەمان بەسەردا دێنێت. بۆ یەکەم جار لە ژیانمدا ئاواتەخوازبووم، کە کوڕی پیاوێکی تر بوایەم.

من سەماکردن بە پیسکردنی پیرۆزییەکان دەزانم، بەڵام ئەو شتەی دوای ئەوە ڕووی دا لە عەقڵ بەدەر بوو. ئاخر ئەو پیاوە بێچاوڕووە چۆن زاتی کرد گاڵتە بە فەرمانڕەواکەمان بکات؟ ئەو بەختی یار بوو، چونکە کەیخەسرەو دەستگیری نەکرد و دەسبەجێ لەسێدارەی نەدا.

ئەو دەمەی بینیم شێخ یاسین بەدوای کەیخەسرەودا دەرچوو، زانیم دەبێ منیش وەک ئەو بکەم. دوا شتێ کە مەبەستمە ئەوەیە خەڵکی شارەکە وا تێنەگەن من پشتی خوانەناسێک دەگرم، جگە لە براکەم، گەرەکە هەموان ئەوە ببینن کە من گەمەیەک نیم بە دەستی باوکمەوە.

لەو شەوەدا بۆ ماڵەوە نەڕۆیشتم، بەڵکو لەگەڵ ژمارەیەک لە برادەرەکان لە ماڵی ئیرشاد مامەوە و بە جۆشەوە باسی ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژەمان کرد و بەدرێژی گفتوگۆمان لەسەر ئەوە کرد کە دەبێ چی بکەین.

"ئەم پیـاوە کـاریگەرییەکی گەورەی لەسـەر باوکـت هەیە"، ئیرشـاد بە جەختەوە پێی وتم، "ئەوەتا لەشفرۆشێکیشی هێناوەتەماڵەکەتان. عەلائەدین گەرەکە ناوی خانەوادەکەت پاک بکەیتەوە".

لە دۆخێکدا وەستابووم و گـوێم بـۆ قسەکانیان گرتبـوو، لە شـەرمان دەموچاوم دایسابوو، تەنها یەک شت لای من ڕوون بوو، ئەویش ئەوە بوو کە شەمس جگە لە بەدبەختی، هیچی دیکەی بۆ نەهێناوین.

هەموومـان گەیشتینە ئەو بـڕوایەی پێویـستە شـەمس ئەم شـارە جـێ بهێڵێت، گەر بە خوایشتی خۆی نەڕوات گەرەکە بەزۆر بڕوات.

* * *

ڕۆژی دواتر بۆ ماڵەوە گەڕامەوە و بڕیارم دا دووبەدوو لەگەڵ شەمسی تەوریزی قسە بکەم. بە تەنیا لە حەوشەی ماڵەوە بوو و نای دەژەنی. سەری لارکردبـووەوە و چاوەکـانی نوقانـدبوون و پشتی لە مـن بـوو. لەبەر ئەوەی نـوقمی نێـو ئـاوازەکەی بووبـوو، ئاگـای لە مـن نەبـوو. وەک مـشک بە هێمنـی نزیکبوومەوە و چاوەڕێی هەلێک بووم تا چاودێریی بکەم و دوژمنەکەم باشتر بناسم.

دوای چەند خولەکێک شەمس لە ژەنین وەستا و کەمـێ سەری هەڵبڕی. بێ ئەوەی تەماشـای لای مـن بکـات، مینـا خـۆی بدوێنێت، وڕەوڕێکی کـرد و گوتی: "عەلائەدین، سڵاوت لێ بێت. ئەوە منەی من دەکەیت؟".

هـــیچم نەوت. شـــارەزای توانـــای بـــووم، ئەوێـــک لەمیـــانەی دەرگاداخراوەکـانەوە شـت ببینێـت، ئیـدی سـەرم سـوڕنەما کە لە پـشتی سەرییەوە چاوی هەیە.

"چێـژت لە بینینـی دیمەنـی سـەماکەی دوێنـێ وەرگـرت؟"، شـەمس بەدەم پرسیارەوە دەموچاوی بەرەو لای من وەرسووڕاند.

دەسبەجێ وەڵامیم دایەوە "پێم وایە ئەوە شەرمەزاری بوو. بـا بە ئاشـکرا قسە بکەین. من تۆم خۆش نـاوێ و قەتیش خۆشـم نەویستوویت، ڕێگەت پێ نادەم لەوە زیاتر ناوبانگ و ئابڕووی باوکم وێران بکەیت".

گرێک لە چاوەکانی شەمسدا بریسکەیان دا. نایەکەی لە لاوە دانا و وتی: "کەواتە ئاوها؟ ئەگەر من بەم جۆرە ئابڕووی ڕۆمیم ویران کردبێت، ئیدی خەڵکی وەک پیاوێکی سەنگین تەماشای تۆش ناکەن. ئایا لەمە دەترسیت؟".

بڕیارم دا بواری نەدەم سۆزم بورووژێنێت، بۆیە سەرنجە برینداركەرەکانیم پشتگوێ خست. پێش ئەوەی بتوانم شتێک بڵێم، زۆری نەخایاند و وەڵامیم دایەوە: "بۆچی نارۆیت و بە ئاسوودەیی جێمان بهێڵیت؟ ئاخر پێش هاتنی تۆ بە ئارامی دەژیاین و لە باشترین دۆخدا بووین. باوکم زانایەکی بەڕێز و سەرۆک خێزانێکی نایاب بوو. هیچ شتێ لە نێوان ئێوەدا نییە تا کۆتانبکاتەوە".

شەمس بەرەو پێشەوە ملی درێژ کرد و بە توندی برۆکانی تێک نا، هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و لەپڕ وەک پیرەمێردێکی لاواز دەرکەوت. وام بە خەیاڵدا هات کە دەتوانم لێی بدەم، ئیدی پێش ئەوەی یەکێ فریای ڕزگارکردنی بکەوێت، تێروپڕی لێدەدەم. بیرۆکەکە ترسناک و قێزەون بوو، بەڵام بە شێوەیەکی ترسناک حەزبزوێن بوو، بۆیە دەبوو ڕووی خۆمی لێ بشارمەوە.

کاتێ دووبارە دەستم بە تەماشاکردنی کردەوە، بینیم بە وردی تێم دەڕوانێت و لێم ورددەبێتەوە. نیگای کونکەر و بەهەڵپە بوو. ئایا ڕێی تێدەچێت بیرکردنەوەکانم بخوێنێتەوە؟ هەستێکی ترسناک دایگرتم و وەک ئەوەی هەزار دەرزیم پێدا بچەقێنرێ لە دەستەکانمەوە تا پێیەکانم تەزووی پێدا هات، هەستم کرد ئەژنۆکانم بە جۆرێ شل بوون، توانای هەڵگرتنمیان نییە. بێگومان ئەو جادووی ڕەش دەکات، بچووکترین گومانم نەمابوو کە شەمس لە بەهێزترین و تاریکترین شێوەکانی جادوودا داهێنەرە.

دوای کەمێ شەمس وتی: "عەلائەدین، تۆ لە من دەترسیت. دەزانیت تۆ کێم دێنیتەوە یاد؟ شاگردە خێلەکە".

لێم پرسی: "دەربارەی کێ قسە دەکەیت؟".

"ئەوە چیرۆکێکە. ئایا حەزت لە بیستنی چیرۆک هەیە؟".

شانم هەڵتەکاند و گوتم: "کاتی بیستنیم نییە".

لێوەکانی شەمس لەرزین، ئینجا گوتی: "ئەو پیاوەی کە کاتی بیستنی چیرۆکی نەبێت لەپێناو خوداشدا هەر کاتی نییە". ئینجا لەسەری ڕۆیشت: "ئایا دەزانیت کە خودا باشترین گێڕەرەوەیە؟".

بێ ئەوەی چاوەڕێی وەڵامی من بکات، ئەم چیرۆکەی گێڕایەوە:

پیشەگەرێک شاگردێکی هەبوو بەردەستیی بۆ دەکرد، شاگردەکە زۆر خێل بوو، بەردەوام شتەکانی بە دوان دەبینی. ڕۆژێکیان پیشەگەرەکە داوای لە شاگردەکە کرد کە گۆزەیەک هەنگوینی لە کۆگاکە بۆ بێنێت. شاگردەکە بە دەستی بەتاڵەوە گەڕایەوە و بە بێزارییەوە وتی: "بەڵام گەورەم، دوو گۆزە هەنگوینی لێیە"، ئینجا وتی، "دەتەوێ کام گۆزەیانت بۆ بێنم؟". جا لەبەر ئەوەی پیشەگەرەکە باش شارەزای شاگردەکەی بوو، وتی: "بۆچی یەکێ لە گۆزەکان ناشکێنیت و گۆزەکەی دیکەم بۆ بێنیت؟".

ئەفسووس، شاگردەکە لە پەندی پشت ئەم وشانە نەگەیشت، ئیدی وەک پێی وترابوو ئەوەی کرد و یەکێ لە دوو گۆزەکەی شکاند. کاتێ بینیی گۆزەکەی تریش وا دەشکێت، سەری سوڕما.

"دەتەوێ چیم پێ بڵێیت؟"، ئەم پرسیارەم لێی کرد، تا وا دەربکەوم کە بەرانبەر شەمس سەرودڵم تەواو نییە، بەڵام ئەوەم بۆ نەکرا. "نەفرەت لە خۆت و لە چیرۆکەکانت. ئەرێ ناتوانیت ئەوەی دەتەوێ ڕاستەوخۆ بیڵێیت؟".

"بەڵام عەلائەدین، ئەوە زۆر ڕوونە. من دەمەوێ پێت بێژم کە تۆ وەک شاگردە خێلەکەیت، چونکە لە هەموو شوێنێ شتەکان بە دوان دەبینیت"، شەمس ئەمەی وت و لەسەری ڕۆیشت، "من و باوکت یەکێکین. گەر منت شکاند، ئەویشت شکاندووە".

بەرپەرچیم دایەوە: "هیچ شتێکی هاوبەش لە نێوان تۆ و باوکمدا نییە. ئەگەر گۆزەی دووەمم شکاند، ئەوا گۆزەی یەکەم ئازاد دەکەم".

لە ڕادە بەدەر تووڕە بووم و بێزارییەکی زۆر دایگرتم و ئیدی بیرم لە ئەنجامی قسەکانم نەدەکردەوە، نە ئەو کاتە و نە دواتریش.

هێشتا کاتەکە بە بەرییەوە مابوو.

# شەمس

## قۆنیا، حوزەیرانی ١٢٤٦

بێحەوسەڵە و توندڕەو و کەچبینەکان دەڵێن سەما حەرامە.

کە خـودای (بەرز و مەزن) مۆسـیقای پـێ بەخـشیوین – نەک تەنهـا ئەو مـۆزیکەی بە دەنگـی خۆمـان و ئامێرەکانمـان دروسـتی دەکەیـن، بەڵکـو ئەو مۆزیکەش کە هەمـوو شێوەکانی ژیـان دەگرێتەوە، پێم وا نییە بیستنیمان لێ حەرام بکات. ئەی نابینن تێکڕای سروشت ستران دەچڕێت؟ هەموو شتێک لەم گەردوونەدا بە ڕیـتم دەجووڵێـت: تـرپەی دڵ، ورشـەی باڵەکـانی پەلەوەر، هەڵکردنی با لە شـەوی زریانـدا، زرینگەزرینگی ئاسنگەر کە ئاسـن دەکوتێت، یان ئەو دەنگانەی لەناو منداڵداندا کە دەوری کۆرپەلەیان داوە.. هەمـوو شـتێک بە جۆشوخرۆشـەوە و لەخـۆڕا، بە یەک ڕیتمـی نایاب لە هەڵقوڵیندا بەشـدارن. سـەمای دەروێشانیش هەر حەڵقەیەکە لەو زنجیـرە بەدەوامە. هەروەک چـۆن دەریـا لە نـاوەوەی خۆیـدا تێکڕای ئـاوی ئۆقیـانووس هەڵدەگرێت، سـەماکەی ئێمەش نهێنییەکانی گەردوون دەگرێتەوە و پیشانی دەدات.

پێش دەست پێکردنی سـەماکە بە چەند سـەعاتێ، من و ڕۆمـی بۆ رامـان چـووینە ژوورێکـی هێمـنەوە، ئینجـا ئەو شـەش دەروێـشەی کە ئەم ئێوارەیە سـەماکەیان دەکرد هـاتنە پاڵمـان. هەموومـان دەسـتنوێژمان شـت و نوێژمـان کرد، ئینجـا جلەکانمـان لە بەر کرد. بە وردی باسـی ئەوەمـان کرد کە دەبێت درێژیـی کراسـەکە چەنـد بێـت، جـۆرە قوماشـێکی سـادەمان هەڵبـژارد کە ڕەنگەکانی زەوی لەخۆ بگرێت. ئەوە تاس کڵاوە ڕەنگ هەنگوینییەکە نیشانەی کێلی گۆڕ و کراسە ئاودامانە سپی و درێژەکە لەجیاتی کفن و عەبارەشـەکەش

لەجیاتی گۆڕ، سەماکەمانیش هێمایەکە بۆ ئەوەی کە چۆن سۆفییەکان وەک چۆن پێستەیەکی کۆن لەخۆ دامالّن، بەتەواوی نەفرەت لە نەفس دەکەن.
بەر لەوەی هـۆڵەکە جـێ بهێڵـین و ڕوو بکەیـنە سـەر سـەکۆکە، ڕۆمـی چامەیەکی خوێندەوە کە ئەمەیە:

**"سۆفی هەر پێنج هەستەکە و**
**هەر شەش ئاراستەکەی تێپەڕاندووە و**
**وای لێهاتووە**
**هەست بە شتە متبووەکانی پشتەوەیان بکات".**

ئـێمە بەم هەسـتانەوە خۆمـان ئامـادە کردبـوو. سـەرەتا دەنگـی نـایەکە بەرزبووەوە، ئینجا ڕۆمی وەک سەردەستەی سەماکەرەکان لەسـەر تەختەی سەماکە هاتە پێشەوە، دوایی دەروێشەکان یەک لەدوای یەک دوایکەوتن و بە خاکەراییەوە سەریان بەردابووەوە، شێخیش دواکەس بوو دەرکەوت.
هەرچەنـدە هەوڵێکـی زۆرم دا، بەڵام ڕۆمــی پێـی داگـرت کە دەبـێ لەو شەوەدا سەمابکەم.
قورئانخوێنەکە سوورەتێ قورئانی خوێندەوە: (وفی الارض ایات للموقنین وفی انفسکم افلا تبصرون - لەسەر زەوی و لە دەروونی خۆتاندا نیشانەگەلێ بۆ بڕواداران هەن، ئەی ئێوە نایانبینن).
ئینجا دەنگی دەف لەگەڵ دەنگی تیژی نای و ڕەبابە بەرزبووەوە.

**گوێ بۆ قامیش و ئەو حەکایەتە هەڵبخە کە دەیگێڕێتەوە**
**کە چۆن لەتاو لێکدابڕان دەناڵێنێت:**
**لەوساوە کە لە قامیشەلان هەڵبڕاوم**
**ئەمێستاش زیرەم پیاوان و ئافرەتان دەگریێنێ**

دەروێشی یەکەم بە موسڵمانێتی خۆی ڕادەستی خودا کرد و دەستی بە خولانەوە کرد، دامێنی کراسەکەی وەک ژیانێکی جیاواز و تـایبەت بە خـۆی دەستی بە خشەخشێکی ناسک کرد، ئینجا هەموومـان چووینە پاڵ ئەو و بە دەوری خۆماندا دەستمان بە خولانەوە کرد تا جگە لە (تاک و تەنیایی خۆی) هیچ شتێکی دیکە بە دەورمانەوە نەما. ئیدی ئەوەی لە خوداوە لە ئاسمانەوە پێمان دەگەیشت، بۆ خەڵکی بۆ سەر زەوی دەمانگواستەوە. ئاوها هەریەکەمان

بـوو به حەڵقەیەکـی پەیوەنـدیی نێـوان دڵخـواز و دولـبەر. کە مۆسـیقاکەش لە ژەنین کەوت، خۆمان بۆ هێزە پێکهێنەرەکانی گەردوون نوشتاندەوە: ئاگر و با و خاک و ئاو و توخمی پێنجەمی ڤالا.

* * *

بۆچی خەمی ئەوەم بێت کە لە دوای تەوابوونی سەماکە لە نێوان من و کەیخەسرەو ڕووی دا، لێ داخی ئەوەم بـوو کە ڕۆمـیم خـستە هەڵوێستێکی ناخۆشـەوە. ئـاخر پیاوێکی خـاوەن پـایە بـوو و بەردەوام دەپـارێزرا. هەمـوو والییەکـان و فەرمانڕەواکـان خۆشـیان دەویـست و گلەیـان لێـی نەبـوو، بەڵام ئەمێستا وای لێهاتووە دەربارەی ژیانی خەڵکی خواسایی شتێکی کەم دەزانێت — ئەو بۆشاییە هەراوەی نێوان فەرمانڕەوای دەستەبژێر و خەڵکی ڕەمەک—.

وام بە خەیاڵدا دێت کە ڕۆژگـاری مـن لە قۆنیـا خەریـکە بەرەو کۆتـایی دەڕوات.

هەموو خۆشەویستی و دۆستایەتییەکی ڕاستەقینە چیرۆکی وەرچەرخـانە چـاوەڕوان نەکراوەکـانن. گەر ئـێمە هەمـان ئەو کەسـەی پـێش و دوای عاشقبوونەکەمان بین، وا دەگەیەنێت کە عەشقەکەمان ئەوتۆ نەبووە.

لە سایەی شیعر و مۆسیقا و سەماوە، ڕۆمی لە وەرچەرخانەکەیدا بڕێکی زۆر پێگەیـشتووە، ئـاخر ئەو لەوەوبەر زانـایەکی تونـد بـوو و شـیعری خـۆش نەدەویست، وتاربێژ بوو و لەو کاتەی وتـاری بـۆ خەڵکی دەخوێندەوە، چێژی لە دەنگی خـۆی وەردەگرت، وەلێ نها گۆڕاوە و خەریکە دەبێتە هۆزانڤان و دەنگی ڤـاڵاییەکی بێگەرد، بەڵام پێم وا نییە هێشتا ئەوەی بەتەواوی هێنابێتە دی. منـیش بۆخـۆم گـۆڕاوم و هێـشتا هەر لە گۆڕانـدام، خەریـکە لە بـوونەوەرێکەوە دەگـۆڕێم بـۆ عەدەم، لە وەرزێـکەوە بـۆ وەرزێکـی تـر، لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی تر، لە ژیانەوە بۆ مردن.

هاوەڵێتییەکەمان بەپیت و فەڕ بوو، دەستکەوتێک بوو خودا پێی بەخشین. گەشەمان کرد، گەشاینەوە و پەرەمـان سەند و لە هـاوڕێیەتیی یەکتر چێژمـان وەرگرت، لەزەتمان لە پڕبوون و خۆشیی ڕەها وەرگرت.

ئەو گوتەیەی باوەزەمانم کەوتەوە یاد کە ڕۆژێکیان پێی گوتم، بۆ ئەوەی ئاوریشممان دەست بکەوێت، گەرەکە کرمی ئاوریشمەکە بمرێت. کاتێ لە هۆڵی سەماکردنی دەروێشەکان بە تەنیا دادەنیشتم، دوای ئەوەی هەموان دەڕۆیشتن، کپییەک باڵی دەکێشا، زانیم کە ئەو ماوەیەی لەگەڵ ڕۆمیدا ماومە خەریکە بەرەو کۆتایی دەڕوات. لەو ماوەیەی کە پێکەوە بووین، من و ڕۆمی چەندین جوانیی بێوێنەمان بینی، فێری ئەوە بووم کە مرۆڤ ببینێت چی دەگەیەنێت، مینا ڕێکەوتێکی بێکۆتایی، لەمیانەی دوو ئاوێنەوە کە شتێکی بێکۆتایی پیشان بدەن، لێ پەندە دێرینەکە هێشتا لەکاردایە: لە کوێ عەشق هەبێت، خەمیش هەیە.

# ئێلا

## نۆرتامپتۆن، ٢٩ی حوزێران ٢٠٠٨

بۆ پێشوازیی شتە نائاسایی و چاوەڕواننەکراوەکان مرۆڤ ئامادە نەبێت وەک عەزیز گوتی، ئەوا لە پشت جوانترین خەونەوە، شتەهای نامۆ خۆ حەشاردەدەن. لە جەستەی ئێلاشدا هیچ ئامادەگییەک نەبوو تا ئەو شتە سەیرە قەبووڵ بکات کە ئەم هەفتەیە ڕووی دا: ئەوە بوو عەزیز . ز . زاهارا بۆ بۆستن هات تا چاوی پێ بکەوێت.

لە ئێوارەی ئەو یەکشەممەیە دوای ئەوەی ئەندامانی خێزانەکەی ڕۆبنشتاین بە دەوری مێزەکەدا جێی خۆیان گرت، ئێلا سەرنجی دا نامەیەک لەسەر مۆبایلەکەیەتی، پێی وابوو کە ڕەنگە یەکێ لە خانمان لە یانەی خۆراکدروستکردنەوە بۆی ناردبێت. بۆ خوێندنەوەی پەلەی نەکرد، بەڵکو خواردنێکی تایبەتی پێشکەشی خێزانەکەی کرد کە ئەم ئێوارەیە بۆی ئامادە کردبوون: مراوییەکی برژاو بە هەنگوینەوە لەگەڵ پەتاتە و پیازی پێشاوی سەر برنجی بە ڕبەهەنار لێنراو. کە مراوییەکەی لەسەر مێزەکە دانا، هەموویان جۆرە شادمانییەکیان لێ دەرکەوت، تەنانەت جانێتیش کە هەستی بە خەمۆکی دەکرد، چونکە سکۆتی لەگەڵ کچێکی تردا بینیبوو و زانیی کە هێشتا خۆشی دەوێ، هەستی بە برسێتی کرد.

ئێوارەیەکی دوورودرێژ بوو، شەرابێکی باشیان خواردەوە و باسوخواسی ئاساییان لە نێو خۆیاندا کرد. ئێلا لە هەموو ئەو قسەوباسانەی کە لەسەر مێزەکە کران بەشداریی کرد.

ئەوەبوو لەگەڵ شووەکەیدا باسی ئەوەیان کرد دووبارە باڵکۆنەکەیان بە بۆیەی شینی درەوشاوە بۆیە بکەنەوە. لەگەڵ جانێتیشدا باسی بەرنامەکانی لە

زانکۆدا کرد، هەروەها لەگەڵ هەردوو منداڵە جمکەکەیدا باسی چەند فیلمێکی ڤیدیۆیی کرد، یەکێ لەوانە بەناوی (دزانی دەریای کاریبی) بوو. دوای ئەوەی قاپە پیسەکانی خستە ناو پاککەرەوەی قاپ و کاتۆی بە شکۆلاتەی سپییەوە پێشکەش کرد، بە خەیاڵیدا هات کە نامە تۆمارکراوەکەی سەر مۆبایلەکەی بخوێنێتەوە:

ئێلا سڵاو. بە کارێکی گۆڤاری سمیتۆنیانەوە بۆ بۆستن هاتووم. هەر ئێستا فڕۆکەکە نیشتەوە. ئایا حەزدەکەیت یەکتر ببینین؟ لە هۆتێلی ئۆنیکس دابەزیوم و حەزدەکەم بتبینم.

عەزیز

ئێلا مۆبایلەکەی لە لاوە دانا و لەسەر مێزەکە لە جێی خۆی دانیشت تا شیرینی بخوات، هەستی بە سەرگێژکە کرد.

"ئایا نامەت بۆ هاتووە؟"، دەیڤید دوای ئەوەی سەری لەسەر قاپەکە هەڵبڕی، پرسیاری لێ کرد.

"بەڵێ، لە مێشێلەوەیە"، بەبێ هیچ دوودڵییەک وەڵامی دایەوە.

دەیڤید دەموچاوە خەمبارەکەی شاردەوە و بە دەستەسڕەکەی دەمی سڕییەوە، ئینجا دەستەسڕەکەی لە شێوەی چوارگۆشەیەکدا، بە هێواشی و وردەکارییەکی سەیرەوە لوول کرد. کە لێبووەوە وتی: "باشە".

ئێلا هەستی کرد شووەکەی باوەڕی پێ ناکات، لێ لەگەڵ ئەوەشدا هەستی کرد گەرەکە لەسەر قسەهەڵبەستەکەی خۆی سوور بێت، ئەمەش نەک بۆ قایلکردنی شووەکەی یان خەڵەتاندنی منداڵەکانی، بەڵکو لەبەر خۆی تا بتوانێت ڕێوشوێنێ بۆ ئەو هەنگاوە دابنێ کە لە ماڵەکەی خۆیەوە دەیبات بۆ ئەو هۆتێلەی عەزیز لێی دابەزیوە، بۆیە لەسەر قسەکەی بەردەوام بوو و لە هەموو وشەیەک ورد دەبووەوە، ئینجا گوتی: "پەیوەندیی پێوەکردم تا پێم بڵێت کە سبەی بەیانی لەگەڵ پەخشکارە ئەدەبییەکە کۆبوونەوەیەک سازدەدرێ بۆ گفتوگۆکردن دەربارەی بەرنامەکانی ساڵی ئاییندە، دەیەوێ لە کۆبوونەوەکەدا بەشدارییان بکەم".

"دەی باشـــە، کەواتە دەبــێ برۆیــت"، دەیڤیـد بەدەم قــسەوە چاوەکــانی پرووکاند، ئەمەش ئاماژەیەک بوو کە بەشداریی گەمەکە دەکات، گوتی: "بۆچی بەیـانی بە ئۆتۆمبیـل نەتگەیەنـم، ئەوسـا دەتـوانین پـێکەوە بـۆ ئەوێ بچـین؟ دەتوانم هەندێ دیدار دوابخەم".

ئـێلا بە واقورمـانەوە لە مێـردەکەی ڕوانـی. دەیـهەوێ چـی بکـات؟ ئایـا دەیەوێ لە بەردەم منداڵەکاندا بەشەڕ بێن؟

"ئەوە باشتریـشە"، بەدەم قــسەوە زۆری لە خــۆی کــرد تــا زەردەخەنە بیگرێ، ئینجا لەسـەری ڕۆیشت: "بەڵام گەرەکە پێش حەوتـی بەیـانی لە مـاڵ دەربچین، چونکە مێشێل گوتی کە دەیەوێ پێش کۆبوونەوەکە بە تەنـا قسەم لەگەڵدا بکات".

"کەواتە بـابەتەکە لە بیـر خـۆت ببەوە"، ئۆرلی کە دەیزانـی بـاوکی ڕقـی لە زوو هەستانە، هاتە نێوانەوە و گوتی: "باوکە ناتوانێت زوو لە خەو ڕابێت".

ئێلا و دەیڤید تەماشـای یەکتریـان کـرد. تەماشـاکردنەکەیان بە بەرچـاوی منـداڵەکانیانەوە بـوو، هەریەکەیـان چـاوەڕێی ئەوی دیـکەی دەکـرد کە یەکەم جووڵە بکات.

"ڕاستە"، لە کۆتاییدا دەیڤید ددانی پێدا نا.

ئـێلا بە ئاسـوودەیی سـەری لەقانـد و دەموچـاوی سـوورایییەکی تەنـک و شــەرمێون دایپۆشـی، چـونکە هەر لەو سـاتەدا بیرۆکەیەکـی بـوێرانەتری بە خەیاڵدا هات.

ئەوەبوو وتی: "بەڵێ، ئەوە کاتێکی زۆر زووە. ئەی بۆچی ئێستا نەڕۆم؟"، بیرۆکەی ڕۆیشتنی سبەی بەیانی بۆ بۆسـتن و لەگەڵ عەزیزدا قاوەڵتیکردن وای لێکرد دڵی بە خێرایی لێ بدات. هەستی کرد دەیـهەوێ هەر ئێستا عەزیز ببینێت و ئیدی نەیـدەتوانی تـا سـبەینێ چاوەڕێ بکات، چونکە لەپڕ کاتەکە لە بەرچاوی بوو بە ماوەیەکی زۆر، ڕۆیشتنیش لە مـاڵەکەی خـۆیەوە بۆ بۆسـتن نـزیکەی دوو سـەعاتێک دەخایەنێت، بەڵام گـوێی بەوە نەدا. ئاخر ئەو هەمـوو

ئەم ڕێگەیەی لە ئەمستردامەوە لەپێناو ئەمدا بڕیوە، بێگومان ئەمیش دەتوانێت بۆ ماوەی دوو سەعات ئۆتۆمبیلەکەی بهاژوێت.

"دەتوانم ئەمشەو پێش سەعات دە بگەمە بۆستن، بۆ ئەوەی بگەمە کۆمپانیاکە و پێش کۆبوونەوەکە میشێل ببینم".

توێژە ئازارێک کەوتە سەر دەموچاوی دەیڤید. وا دەردەکەت کە پێش ئەوەی شتێک بڵێت، کاتەکە ساڵێک بەردەوام بووە. لەو چرکەساتە دوورودرێژەدا، چاوەکانی ئەوەیان دەگەیاند کە ئیتر هێز و توانای ئەوەی تێدا نەماوە تا ڕێگە لە ڕۆیشتنی ژنەکەی بگرێت بۆ بینینی پیاوێکی دیکە.

"دەتوانم بۆ بۆستن ئۆتۆمبیل لێبخوڕم و ئەمشەو لە شوقەکەی خۆمان دەمێنمەوە"، ئێلا بە ڕواڵەت ئەمەی بە منداڵەکانی گوت، لە ڕاستیدا ڕووی قسەکەی لە دەیڤید بوو. ئەو شێوازەی بۆ ئەوە بوو کە مێردەکەی دڵنیا بکاتەوە وەک ئەو پێی وایە ئەم هیچ پەیوەندییەکی جەستەیی لە نێوان خۆی و هیچ کەسێکی تر لەئارادا نییە.

دەیڤید لەسەر کورسییەکەی هەستا و پەرداخێ شەرابی بە دەستەوە بوو. تەماشای دەرگاکەی کرد و زەردەخەنەیەکی دڵنیایی بە ڕووی ئێلادا پژاند، بە کەمێ پەرۆشییەوە وتی: "باشە خۆشەویستم، گەر خۆت ئاوهات دەوێ، گەرەکە ئێستا بڕۆیت".

ئافی گوتی: "بەڵام دایکە، پێم وا بوو کە ئەم ئێوارەیە لەوانەی بیرکاریدا یارمەتیم دەدەیت".

ئێلا هەستی کرد دەموچاوی دایساوە، وتی: "ئازیزم دەزانم. بۆچی ئەوە نەخەینە سبەینێ؟". ئۆرلی ئاوڕی لە براکەی دایەوە تا پەستی بکات، وتی: "ئاه، دە لێیگەڕێ با بڕوات. خۆ نابێت هەموو کاتێ دایکە بەدیارتەوە بێت. ئەوە تۆ کەی گەورە دەبێت؟". ئافی چارەی تێک نا، بەڵام وەڵامێکی نەدایەوە. ئۆرلی جیددی بوو، کەچی جانێت گوێنەدەرە بوو. بەم ئاوهایە ئێلا مۆبایلەکەی هەڵگرت و بەرەو نهۆمی سەرەوە سەرکەوت. هەر ئەوەندە دەرگای ژووری

نوستنەکەی داخست، خۆی بەسەر جێخەوەکەیدا دا و نامەیەکی تۆمارکراوی بۆ عەزیز نارد.

ناتوانم بڕوابکەم کە تۆ لێرەیت. دوای دوو سەعات لە ئۆنیکس دەبم.

بە ترسێکی زۆرەوە چاوی بڕییە مۆبایلەکەی و بینیی وا نامەکەی دەڕوات. چی بکات؟ بەڵام کات ئەوەندەی بەدەمەوە نییە بۆ بیرکردنەوە، خۆ ئەگەر ئەم ئێوارەیە تووشی پەشیمانی ببێت، ئەوا ڕەنگە لەمەولاش هەر لە پەشیمانیدا بێت. دەبێ ئێستا پەلە بکات. تا خۆی شت، بیست خولەکی پێ چوو، قژی وشککردەوە و ددانەکانی پاککردەوە و کراسێکی عەزێی هەڵبژارد و لە بەری کرد و دوایی دایکەندەوە، ئینجا عەزێیەکی تری تاقیکرەوە، ئینجا یەکێکی تر و سەری شانەکرد وکەمێ ئارایشی کرد، ئینجا لە گوارە بچووکەکانی گەڕا، کە (ڕۆت)ی داپیرەی لە هەژدەمین جەژنی لەدایکبوونیدا پێشکەشی کردبوو. دووبارە عەزێکەی گۆڕی.

هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و کەمێ عەتری (ئیتیرنتی)ی کۆمپانیای کالفین کلاینی لە خۆی دا. عەترەکە زۆر دەمێ بوو لە گەرماوەکە هەر لەناو قاوغەکەی خۆیدا بوو. دەیڤید زۆر حەزی لە عەتر نەدەکرد و دەیگوت دەبێ بۆنی ئافرەت هەمان بۆن وبەرامی ئافرەت خۆی بێت، نەک هەندێ بۆنی وەک ڤانیلا، یان توێکڵەهەناری بۆگەنی لێ بێت، بەڵام ئێلا بە خۆی گوت، ڕەنگە بۆچوونی پیاوی ئەوروویی لەم شتەدا جیا بێت، ئینجا پرسیی، ئایا لەئەورووپا عەتر شتێکی گرینگ نییە؟

کە لێبووەوە، دیقەتی ئەو ئافرەتەی دا کە لەناو ئاوێنەکەدا لێوەی دیاربوو. بۆچی زووتر پێی ڕانەگەیاند کە ئەو دێت؟ گەر پێش ماوەیەک زانیبای ئەوا دەچووە کن پرچڕێکخەر و نینۆکەکانی بۆیە دەکرد و دەموچاوی ئارایشت دەکرد و ڕەنگە لوولکردنێکی نوێی پرچی تاقی بکردایەتەوە. ئەی ئەگەر بە دڵی عەزیز نەبوو؟ ئەی ئەگەهیچ سەرنجراکێشانێک لە نێوانیاندا ڕووی نەدا و لەوە ژێوانبووەوە کە هەموو ئەم مەودایەی بۆ بۆستن بڕیوە؟

لەناکاو وەئاگاهاتەوە. ئەریٚ بۆچی دەیەویست دیمەنی خۆی بگۆڕێت؟ جیاوازی چییە گەر دڵڕاکێشان لە نێوانیاندا ڕوو‌بدات یان نا؟ بێگومان هەر سەرکێشییەک لەگەڵ ئەم پیاوەدا ڕەوتەنی دەبێت. ئەمێک خێزاندارە و خاوەن ژیانی تایبەتی خۆیەتی. ڕابردوو و بانەڕۆژیشی هەر لێرەیە. لە خۆی بێزار بوو، چونکە خەریکبوو بیری لەم سیناریۆیانە دەکردەوە کە لەگوێن نەبوون، ئیدی ئاوەزی خۆی کڵۆم کرد، تەنیا بیری لەو شتە دەکردەوە کە بۆی سەلمابوو ئاسانترین شتێکە بیکات.

لە سەعات هەشت چارەک کەمدا، ئێلا منداڵەکانی ماچ کرد و ئاواتی شەوێکی خۆشی بۆ خواستن و لە ماڵ دەرچوو، بەڵام دەیڤیدی نەبینی.

کە بەرەو لای ئۆتۆمبیلەکەی ڕۆیشت، بە کلیلەکانی شوقەکەی بۆستنیان کە لەناو دەستیدا بوون، زرینگەزرینگی دەکرد. هێشتا ئاوەزی توانای بیرکردنەوەی نەبوو، دڵی بە توندی و بە خێرایی لێی دەدا.

# بەشی پێنجەم

# عەدەم

# ئەو شتانەی لەمیانەی نادیارییانەوە هەن

# سوڵتان وەلەد

## قۆنیا، تەممووزی ١٢٤٦

باوکم کە بۆ ژوورەکەم هات، بەهەستەم هەناسەی بۆ دەدرا و هەر ئەوەتا دەیتوانی لەسەر پێیەکانی بووەستێت. وەک ئەوەی تارمایی ئەو پیاوە بێت کە من دەمناسی. وەک ئەوەی بە درێژایی شەو شەونخوونیی کردبێت، ژێر چاوەکانی هەڵاوساوییەکی تاریکی پێوە دیاربوو، وەلێ ئەوەی تووشی سەرسوڕمانی کردم ریشی زۆرتر سپی بووبوو.

"ڕۆڵە یارمەتیم بدە"، بەدەنگێک کە لە دەنگی خۆی نەدەچوو، ئەمەی گوت.

بە پەلە بەرەو لای چووم و قۆڵیم گرت و وتم: "باوکە چیت دەوێ، هەرچییەکت دەوێ داوابکە". وەک ئەوەی لەژێر قورسایی ئەوەی دەیڵێت پڵیشابێتەوە، ماوەیەک بێدەنگ بوو، ئینجا وتی: "ئەوە شەمس ڕۆیشت و جێی هێشتم".

چرکەساتێک شڵەژام و هەستم بە ئاسوودەییەکی سەیر کرد، بەڵام هیچم نەگوت. سەرباری خەم و شۆکەکەم، وای بۆچووم کە ڕەنگە ئەوە بە چاک بگەڕێت. ئەی ئاوها ژیان ئاسانتر و ئاسوودەتر و هێمنتر نابێت؟ ئاخر بەوای شەمسەوە دوژمنێکی زۆر بۆ باوکم پەیدا بوون. ئای حەزم دەکرد کە شتەکان بۆ دۆخی پێش هاتنی شەمس بگەڕێنەوە. تۆ بڵێیت عەلائەدین لەسەر هەق بێت؟ ئەی پێش هاتنی شەمس هەمووومان لە دۆخێکی باشتردا نەبووین؟

"بیرت نەچێت شەمس بۆ من چی دەگەیەنێت"، باوکم وەک ئەوەی غایلەکانمی خوێندبێتەوە ئەمەی وت، "ئاخر من و ئەو یەک کەسین. یەک مانگ

دوو تەنیشتی هەیە، لایەکی ڕووناک و لایەکی تاریک. شەمس لایە درەوشاوەکەمە".

سەرم بادا و شەرم دایگرتم. دڵم لەنێو سینگمدا نوقم بوو. باوکم وشەیەکی لە دەم دەرنەچوو. لە ژیانمدا ئازارێکی بەو جۆرەم لە چاوانی هیچ پیاوێکدا نەدیبوو. هەستم کرد زمانم لەنێو زارمدا قورسە. بۆ ماوەیەک نەمتوانی دەم هەڵێنم.

"دەمەوێ لە شەمس بگەڕێیت -ئەگەر خۆی مەبەستی بوو- بۆمی بگەڕێنەوە، پێی بڵێ کە یەکجار دڵم بۆی خەمینە"، دەنگی باوکم بە ڕادەیەک نزم بووەوە تا بوو بە چپە: "پێی بڵێ ڕۆیشتنی ئەو دەمکوژێت".

بەڵێنم پێی دا کە شەمسی بۆ بگەڕێنمەوە. دەستی گرتم و بە خۆشەویستی و پێزانینەوە گوشیی، چاوەکانم لێ کەلا خست، چونکە نەمدەویست شڵەژانەکەم ببینێت.

* * *

بەو ئومێدەی شوێنپێی شەمس هەڵبگرم، هەموو هەفتەکەم لە شەقامەکانی قۆنیادا بە سووڕانەوە بەسەربرد. هەموو خەڵکی شارەکە هەواڵی ونبوونی شەمسیان ژنەوتبوو. واتەواتەکە دەربارەی ئەوەی بۆ کوێ چووە کەوتبووە سەر هەموو زارێک. پیاوێکی گەڕبووم بینی کە زۆر شەمسی خۆش دەویست، ناونیشانی ژمارەیەک لە کەسانی بەدبەخت و نەفرەتلێکراوی دامێ کە دەروێشە گەڕیدەکە یارمەتی دابوون. نەمدەزانی کەسانێکی ئاوها زۆر هەن کە خۆشیان دەوێ، بەڵام لەو دەستە خەڵکە بوون کە من نەمدەبینین.

ئێوارەیەک بە ماندوویێتی و شڵەژاوییەوە بۆ ماڵ گەڕامەوە. کیرا پڕی قاپلەمەیەک برنج بەشیری بۆندار بە ئاوی گوڵی بۆ هێنام و بە تەنیشتمەوە دانیشت و منیش خەریکی خواردن بووم و ئەو تەماشای دەکردم، زەردەخەنەیەکی خەمین گرتی. سەرنجم دا کە ئەمساڵ تەواوێ بەساڵدا چووە.

لێی پرسیم: "بیستوومە کە دەتهەوێ لە شەمس بگەڕێیت. ئایا دەزانیت بۆ کوێ چووە؟"

"هەندێ دەڵێن گوایا بۆ دیمەشق ڕۆیشتووە، بەڵام لە هەندێ کەسم بیستووە دەڵێن گوایا بۆ ئەسفەهان یان بۆ قاهیرە ڕۆیشتووە، بەڵکو تەنانەت باسی تەورێزی شوێنی لەدایکبوونیشی دەکەن. گەرەکە لە هەموو ئەم شاران بگەڕێین. من بۆ دیمەشق دەڕۆم و هەندێ لە مریدەکانی باوکم بۆ سێ شارەکەی دیکە دەڕۆن".

دەموچاوی کیرا سیمای بەهۆڵەوەبوونی لەخۆ گرت و مینا بە دەنگی بەرز بیربکاتەوە هەمهەمەیەکی کرد: "مەولانا هۆزانی جوان دەنووسێت، ڕۆیشتنی شەمس کردوویەتی بە هۆزانڤان".

ئینجا سەری بەردایەوە و تەماشای فەرشە فارسییەکەی کرد. گۆناکانی تەڕبوون و دەمی کرژ کردبووەوە و هەناسەیەکی هەڵکێشا، ئینجا دەستی بە خوێندنەوەی ئەم کۆپلەیە کرد:

"پاشام بە دەموچاوە پڕ شکۆکەیەوە بینی
ئەوە چاوی ئاسمان و خۆرەکەی بوو".

ئێستا شتێ پەیدابوو کە پێش چەند چرکەیەک نەبوو. کیرام بینی لە ناخەوە پسابوو، کە تەماشای دەموچاویت دەکرد، هەستت دەکرد ئازارێکی توند بۆ مێردەکەی دەکێشێت، ئامادەبوو هەرچی لە توانایدایە بیکات تا زەردەخەنە بۆ سەر لێوەکانی مێردەکەی بگێڕێتەوە، بەڵام ئاسوودەش بوو، بەڵکو هەستی بە شادمانی دەکرد، چونکە لە ئەنجامدا لە شەمس ڕزگاربووبوو.

"ئەی ئەگەر بەدوایدا نەگەڕێم"، گوێم لە خۆم بوو پرسیارم لێی کرد.

"ئەوسا شتێکی ئەوتۆ نامێنێت کە بکرێ، ئەوکاتە دەتوانین وەک جاری جاران درێژە بە ژیانی خۆمان بدەین"، وای گوت و چاوەکانی بە جۆرە ئومێدێک گەشایەوە.

لەو ساتەدا بە ڕوونی و بەبێ هیچ گومانێک تێگەیشتم کە مەبەستی چییە، ئەویش ئەوەیە نابێت لە شەمسی تەورێزی بگەڕێم و نابێت بۆ دیمەشق بڕۆم. دەمتوانی سبەینێ قۆنیا جێ بهێڵم و بۆ ماوەیەک بە ناوچەکەدا بسووڕێمەوە و لەسەر ڕێگە خانێکی باش بدۆزمەوە و تێیدا بمێنمەوە، ئینجا دوای چەند هەفتەیەک بە ڕێی خۆمدا بگەڕێمەوە و بڵێم لە هەموو شوێنێ بۆ شەمس

گەڕام. جا لەبەر ئەوەی باوکم بڕوا بە قسەکانم دەکات، ئیدی بە یەکجاری شتەکەی بیردەچێتەوە. ئەوە نەک هەر بۆ کیرا و عەلائەدین کە تەنها گومانێکیان هەر لە شەمس بوو، بەڵکو بۆ فەقێکانی باوکم و مریدەکانی و بۆ منیش ڕەنگە باشترین شت بێت.

گوتم: "کیرا، چی بکەم؟"

کیرا بە نیگایەکی ئازاراوییەوە تەماشای کردم و دەمی هەڵنەهێنا. ئاخر ئەم ئافرەتە بوو بە موسڵمان تا شوو بە باوکم بکات، ئافرەتێکە تا بڵێیت بۆ من و بۆ براکەم باشە و شووەکەی ئەوەندە خۆش دەوێ، تا ئەو ڕادەیەی ئەو شیعرانەی لەبەر کردبوو کە بۆ کەسێکی تر نووسیبوونی نەک بۆ ئەو، ئیدی لەپڕ قسەکانی چکیان کرد.

دەبێ خۆم وەڵامەکە بدۆزمەوە.

# ڕۆمی

## قۆنیا، ئابی ١٢٤٦

**ب**ە ڕۆیشتنی شەمسی تەوریزی، دنیا وشکوبرینگ و ڕووتەن دیارە و ئیدی خۆری تێدا هەڵنایات. شارەکە بووە بە شوێنێکی خەمگین و ساردوسڕ و ڕۆحم بەتاڵ بووەتەوە. شەوانە خەو ناچێتە چاوم و بە پەرۆشەوە بە شەقامەکانی شاردا دەسووڕێمەوە و هیچی تر ناکەم. من لێرەم و لێرەش نیم – من تارماییەکی نێو خەڵکم. من لە هەموان تووڕەم. ئاخر وەک ئەوەی هیچ شتێ نەگۆڕابێت، چۆن دەتوانن لە ژیان بەردەوام بن؟ ئاخر بەبێ شەمسی تەوریزی چۆن دەکرێ ژیان وەکو خۆی بمێنێتەوە؟

وام لێهاتووە هەموو ڕۆژێ هەر لە خۆراوابوونەوە تا ڕۆژ هەڵدێت بە تەنیا لەنێو کتێبخانەکەم دادەنیشم و جگە لە شەمس بیر لە هیچ شتێکی تر ناکەمەوە. ئەوەم بیردەکەوێتەوە کە ڕۆژێکیان بە دەنگێکی هەندێ نووساوەوە پێی وتم: "ڕۆژێک دادێت دەبیتە دەنگی عەشق".

دەربارەی ئەوە شتێک نازانم، بەڵام خەریکە لەنێو بێدەنگیدا تروسکاییەک دەدۆزمەوە، پەیڤەکانیش تاریکیی ناو دڵم دەسڕن. ئەی هەر لەم ڕێگەیەوە نەبوو کە شەمس دەیەویست بمکات بە شاعیر؟

ژیان واتا بەرکەماڵی، هەر ڕووداوێک کە ڕوودەدات، گەورە بێت یان بچووک، هەر دەردەسەرییەک ڕووبەڕووی دەبینەوە، لایەنێکە لە پلانێکی خودایی و تا کۆتایی ڕوودەدات. بەرخۆدان لە دەروونی بنیادەمەوە هەڵێنجراوە، لەبەر ئەوەیە خودا لە کتێبە خۆشەویستەکەیدا دەڵێت: (**سنریهم اياتنا فی الافاق وفي انفسهم حتی يتبين لهم انه الحق**: "لە ئاسمانەکان و لەسەر زەوی و لە نەفس و خودی خۆیاندا نیشانەکانمانیان پیشان دەدەین تا بۆیان ڕوون بێتەوە و بگەنە ئەو ڕاستییەی کە خودا هەق و ڕەوایە"). لە ویستی خودادا هیچ شتێ نییە پێی بوترێ ڕێکەوت، بۆیە ڕێکەوت نەبوو کە پێش

نزیکەی دوو ساڵ و ڕۆژێک لە ڕۆژەکانی تشرینی یەکەم شەمسی تەورێزی ڕێم لێ بگرێت.

"مـن بەدەم بـاوە بـۆ لای تـۆ نەهـاتووم"، شـەمس ئەمەی گـوت و ئەم حەکایەتەی بۆ گێڕامەوە:

ڕۆژێک سۆفییەکی گەورە و لە زانستدا مەلەوان تا ئەوپەڕی هەناسـەی مەسیحی تێدا بوو، بەڵام جگە لە تاقە مریدێک، هیچی تری نەبوو و بەوەی پێی بەخشرابوو خۆشحاڵ بوو، بەڵام مریدەکەی بۆچوونێکی جیای هەبوو، چونکە دەیەویست خەڵکی تر بە تواناکانی گەورەکەی سەرسام بن. ئیدی زۆری لێکرد تا ژمارەیەکی زۆرتر لە مرید لە خۆی گرد بکاتەوە.

"باشـە"، گەورەکەی قایـل بـوو و گـوتی: "گەر ئەمە خۆشـحاڵت دەکـات، ئەوەی داوای دەکەیت جێبەجێی دەکەم".

هەر ئەو ڕۆژە، ڕوویان کردە بازاڕ و لە دوکانێکی شیرینیفرۆشدا پارچە شـیرینییەکیان بینـی لە شـێوەی باڵنـدە دروسـت کرابـوو. هەر کە گەورەکەی فووی پێداکرد، ئیدی گیـانی کەوتەبەر و بەدەم بـاوە فـڕی. خەڵکی شـارەکە دەسبەجێ دەوریان لێی دا و سەریان سوڕما و بەوەی کردی سەرسام بوون. ئیدی لەو ڕۆژەوە خەڵکی شارەکە دەستیان بە پێدا هەڵگوتنی سۆفییەکە کرد و ئەوەندەی نەبرد خەڵکێکی زۆر لە مرید و هەوادارانی بۆ پەیدا بوون و ئیتر مریدە کۆنەکەی ئەوەندە نەیدەبینی.

"ئاە، گەورەم، من هەڵە بووم. جاران دۆخەکە زۆر باشـتر بوو"، فەقێکە بەنک نائومێدی ئەمەی گوت، "شتێ بکە. تکات لێدەکەم دەریان بکە".

"دەی باشە، گەر ئەوە خۆشحاڵت دەکات، ئەوا دەریان دەکەم".

ڕۆژی دواتر، لەو دەمەدا کە گەورەکەی وتاری دەخوێندەوە، بایەکی لـێ بەربـووەوە، ئیدی فەقێکـانی یەک لەدوای یەک ئاوڕیـان دایەوە و بێزارییـان دەربڕی و هەموویان جێیانهێشت و جگە لە فەقێ کۆنەکەی کەس نەمایەوە.

گەورەکەی لێی پرسی: "بۆچی لەگەڵ ئەوانی تردا نەڕۆیشتیت؟".

فەقێکە وەڵامی دایەوە: "بەوای یەکەم ترەوە نەهـاتم وانەت لە لا بخـوێنم، بەوای دوا تریشەوە جێت ناهێڵم".

* * *

شـەمس ئەوەی لەدەسـتی هـات کـردی تـا بگەمە پلەی بەرکەمـاڵی، بەڵام خەڵکی شار قەت لەوە نەگەیشتن. شەمس بەئەنقەست ئاگری زۆربلێیی خۆش دەکرد و دەماری هەستەوەری دەورووژاند و هەندێ پەیڤی لە دەم دەردەچوو کە بـۆ گـوێچکەی ئاسـایی کفرێکـی تەواو بـوو، تەنـانەت ئەوانەی خۆشـیان دەویست بەگژیاندا دەچوو و ڕقی هەڵدەستاندن. ئەوەبوو کتێبەکانمی تووڕدایە ناو ئاوەوە و ناچاری کردم هەموو ئەوانەی دەمزانین لەبیر خۆمم بردنەوە. هەمـوان گوێیـان لێی بـوو ڕەخنەی لە پیاوچاکـان و زانایـان دەگـرت، جگە لە کەسـانێکی کەم، کەس نەیـدەزانی کە ئەو پیـاوێکە لە زانـستەکانی لێکـدانەوەی قورئاندا مەلەوانە. شەمس لە کیمیا و ئەستێرەناسی و ئاسماننـاسی و لاهـووت و فەلـسەفە و لۆژیکدا مەلەوان بـوو، وەلـێ زانیـاریی خـۆی لە چاوەنەزانەکـان دەشاردەوە. لەگەڵ ئەوەی زانـا بـوو، کەچـی وەک دەروێشێکی دەست لە دنیا هەڵگرتوو ڕەفتاری دەکرد.

دەرگای ماڵەکەمانی لە ڕووی لەشفرۆشێک والاکرد و وای لێکرد بەشداریی نـان و خوانمـان بکـات. داوای لێکـردم بـۆ مەیخـانە بچـم وهـانی دام لەگەڵ سەرخۆشـەکاندا تـێکەڵ بـم. جارێکیـان ئەو دەمەی کە وتـاربێژبووم، وای لێکـردم لە بەردەم مـزگەوتەکە سـواڵ بـکەم و زۆری لێکـردم لە جـێگەی سـواڵکەرێکی گەڕبوو دانیشم. سەرەتا لەو کەسـانە دووری خستمەوە کە پێم سەرسـام بوون، ئینجا لە دەسەڵاتدارانی دەستەبژێر دایبڕیم و وای لێکردم تێکەڵـی خەڵکی عەوام بم. لە سایەی ئەوەوە خەڵکانێکم ناسـی گەر ئەو نەبوایە چـاوم پێیـان نەدەکەوت. بـڕوای وا بـوو کە دەبێـت هەمـوو ئەو بتـانە، تەنـانەت بەناوبانـگ و سـامان و پایەشەوە، بەڵکو بە ئایینیشەوە، تێک بشکێنرێن کە دەبنە کۆسپ لە نێوان خـودا و بەنـدەدا. شـەمس هەمـوو ئەو کۆتوبەنـدانەی لـێ دامـاڵیم کە بە ژیـانەوە بەنـدیان کردبووم. هەر کە کۆسپێکی هزری یـان بەلاداتاشـینێک یـان دەمـارگیرییەکی دیبـا، ڕادەپەڕی و بە توندی ڕووبەڕووی دەبووەوە.

بەگـوێرەی بـڕوای ئەو کە گوایـا مـن بە قۆنـاغی تـاقیکردنەوە و هەڵە و بە چەنـدین قۆنـاغ و دۆخـدا تێـدەپەڕم و ئەمـانەش وام لێدەکەن کە لە بەرچـاوی شوێنکەوتووە دڵسۆزەکانم بکەوم. ئاخر منێک ژمـارەیەکی زۆر لە خەڵکی پێم سەرسـام بـوون، لـێ ئەمێستا ئەو هەسـتەم نەمـاوە کە ئاتـاجی سەرسـامبوونی

دەوروبەرم بم و لەوە ڕزگار بووم. شەمس وردەوردە ناوبانگمی تێکشکاند و لە سایەی ئەوەوە نرخی شێتیم زانی، تامی تەنیایی و بێدەسەڵاتی و نەرمی و گۆشەگیریم چەشت، لە کۆتاییشدا تامی حەسرەتم چەشت.

**لە هەموو ئەو شتانە دووربکەوەوە کە وا دەزانی سوودبەخشن**
**ژەهر و زوڵاڵترین ئاوی ژیان بنۆشە**
**دەست لە ئارامی هەڵبگرە و لە شوێنە ترسناکەکان بمێنەوە**
**دەست لە ناوبانگ هەڵبگرە و دەست لە ملی ئابڕووچوون و نەفرەتلێکراوی بکە**

ئەی لە دواقۆناغدا هەموومان دادگایی ناکرێین؟ هەموو ڕۆژێک و هەموو خولەکێک خودا لێمان دەپرسێت کە لەو ڕۆژەدا چیمان کردووە. زۆر جار بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە ترسناکانە ئامادەنیین، بەڵام خودا بەسەبرە و لە دووبارەکردنەوەی ئەم پرسیارە وەڕس نابێت. گەر ئەم خەمەش بەشێک بێت لە تاقیکردنەوە، ئەوا تاقە ئاواتم ئەوەیە کە شەمس بدۆزمەوە. من ئامادەم دەست لە کتێبەکانم و وتارەکانم و خێزانەکەم و سامانەکەم هەڵبگرم، تەنانەت دەست لە ناوی خۆمیش هەڵبگرم. من ئامادەم تا جارێکی تر ڕوخساری شەمس ببینمەوە، واز لە هەر شتێک و لە هەموو شتێک بهێنم.

چەند ڕۆژێ لەمەوبەر کیرا وتی کە من بەبێ دەستی خۆم بووم بە شاعیر. هەرچەندە من زۆر ڕێزی شاعیرەکانم نەدەگرت، بۆیە بیستنی ئەو قسەیە بۆ من کتوپڕ نەبوو. گەر ئەوە لە ڕابردوودا بوایە، بەو قسەیە قایل نەدەبووم، بەڵام ئێستا لاریم لێی نییە.

شیعر خەریک بوو هەر لەخۆوە بەردەوام لە زارم سەری دەکرد، شیعرگەلێ گەر یەکێ بیژنەوتنایە بۆی دەردەکەوت کە بەڕاستی من بووم بە شاعیر. سوڵتانی ڕۆژگار! لێ لە ڕاستیدا دەتوانم بڵێم کە ئەم چامانە هیچ پەیوەندییەکیان بە منەوە نییە. من بۆ گواستنەوەی ئەو پیتانەی کە لەسەر زارمن لە میانگیرێک پتر نیم، من وەک ئەو خامەیەم کە پەیڤان تۆماردەکات، چونکە فەرمانی پێدراوە تا بیاننووسێت، یان ئەو نایەی کە بە نۆتەی مۆسیقا دەژەنرێ، منیش ئەوە دەکەم کە پێویستە لەسەرم بیکەم.

هۆ شەمسی تەورێزیی بێوێنە تۆ لە کوێیت؟

# شەمس

## دیمەشق، نیسانی ١٢٤٧

بەهار لە دیمەشق سەرلەنوێ خۆی ئارایشت کرد، دوای ئەوەی دە مانگ بوو قۆنیام بەجێهێشتبوو، سوڵتان وەلەد دۆزیمییەوە. ئەوەبوو لەگەڵ ڕەبەنێکی کریستیانیدا کە ناوی فرانسیس بوو لەژێر ئاسمانی شین و بێگەرددا شەترەنجم دەکرد. ڕەبەنەکە پیاوێک بوو زوو تووڕە نەدەبوو، بەڵکو واتای خۆبەدەستەوەدانی دەزانی. لەبەر ئەوەی ئیسلام ئارامی ناوەوە دەگەیەنێت و وشەکەش لە پەیڤی خۆڕادەستکردنەوە دارێژراوە، بۆیە بە بۆچوونی من فرانسیس گەلێ لەوانە موسڵمانترە کە لافی موسڵمانێتی لێدەدەن، چونکە یەکێ لە چل ڕێساکە دەڵێت: **خۆڕادەستکردن ئەوە ناگەیەنێت کە بنیادەم لاواز یان خراپ بێت، هەروەها نابێتە مایەی بڕواکردن بە قەزاوقەدەر یان خۆ بەدەستەوەدان، بەڵکو تەواو بە پێچەوانەوەیە، چونکە هێزی ڕاستەقینە لە خۆڕادەستکردندایە -ئەو هێزەی لە ناخەوە هەڵدەقوڵێت- جا ئەوانەی لە ژیاندا خۆ ڕادەستی گەوهەری خودایی دەکەن، تەنانەت گەر هەموو دنیا ژێرەوژوور بێت، بە دڵنیایی و ئارامییەوە دەژین.**

وەزیرەکەم بزواند، تا فرانسیس ناچاربکەم شا بگوێزێتەوە، بە بڕیارێکی بەلەز و بوێرانە قەڵاکەی گواستەوە، ئیدی گومانی ئەوەم لا پەیدا بوو کە من ئەم یارییە دەدۆڕێنم. کە سەرم هەڵبڕی چاوی سوڵتان وەلەد ئامبازی چاوم بوو.

پێم وت: "بە بینینت شادمانم، کەواتە بڕیارت دا ئاوها بەدوامدا بگەڕێیت".

زەردەخەنەیەکی خەمینی بە ڕوومدا نواند، ئینجا دەموچاوی کرژ بوو. سەری سوڕما کاتێ بیستی کە من ئاگام لەو کێشمەکێشمەی ناخێتی. لەبەر ئەوەی پیاوێکی ڕاستگۆ بوو، نکووڵیی لە ڕاستییەکە نەکرد.

"پێش ئەوەی منەی تۆ بکەم ماوەیەکم بە سووڕانەوە بەسەر برد، بەڵام دوای ماوەیەک ئیتر تاقەتم لەوە چوو، نەمدەتوانی درۆ لەگەڵ باوکمدا بکەم، بۆیە بۆ گەڕان بەدوای تۆدا بۆ دیمەشق هاتم و بۆ دۆزینەوەی تۆ ئاستەنگی زۆرم دی".

پێم وت: "تۆ پیاوێکی ڕاستگۆ و کوڕێکی باشیت و دەبیتە هاوەڵێکی مەزنی باوکت".

سوڵتان وەلەد بە خەمبارییەوە سەری بادا و گوتی: "تۆ تاقە هاوەڵێکیت کە باوکم ئاتاجی هاوەڵێتییەتی، بۆیە دەمەوێ لەگەڵمدا بۆ قۆنیا بگەڕێیتەوە. باوکم ئاتاجی تۆیە".

کاتێ ئەم داواکارییەم ژنەوت، بیری جۆراوجۆر بە خەیاڵمدا هاتن، سەرەتا هیچ شتێکم لێوە دیارنەبوو، بەڵام نەفسم دەستی لە گەڕانەوەم بۆ ئەو شوێنە هەڵگرتبوو کە ئیدی تێیدا ئەوەندە ویستراو نەبووم.

گوێی لێ مەگرە. ئیدی ئەرکی تۆ کۆتایی هات و نابێ بۆ قۆنیا بگەڕێیتەوە. ئەو وتەیەی باوەزەمان بێنەوە یادت، وتەیەکە لەوپەڕی ترسناکیدایە، ئەگەر بگەڕێیتەوە بۆ ئەو شارە، ئەوا جارێکی تر لێی دەرناچیتەوە.

دەمهەوێ لە سەفەرەکانمدا بەردەوام بم و بە هەموو دنیادا بگەڕێم و چاوم بە خەڵکانی تر بکەوێت و شارانی دیکە ببینم. دیمەشقم لێ خۆش هاتووە و دەتوانم تا زستانی ئایندە تێیدا بمێنمەوە. بەزۆری جێگۆڕکێ و شوێنی تازە هەستی ترس و تەنیایی و خەم لە ڕۆحی بنیادەمدا دروست دەکات، بەڵام لەبەر ئەوەی خودام لەگەڵدایە لە خەڵوەتی خۆمدا هەست بە ڕەزامەندی و بەختەوەری دەکەم.

بەڵام باش دەزانم کە دڵم ئێستاش هەر لە قۆنیایە و یەکجار ئەڵهای ڕۆمی دەکەم، بەجۆرێ هەر بە ناوهێنانی زۆر ئازاردەکێشم. لە دواقۆناغدا، مادام ڕۆمیم بە تەنیشتەوە نەبێت، ئیدی لە کام شار بم چ جیاوازییەکی هەیە؟ ئاخر ئەو لە هەر کوێیەک بێت ڕووگەی من ئەوێیە.

شام لەسەر تەختەی شەترەنجەکە بزواند. فرانسیس کە بۆی دەرکەوت دۆڕاوە، چاوەکانی ئەبڵەق بوون، بەڵام لە شەترەنجدا هەر وەکو لە ژیانیشدا

وایە، بۆ ئەوەی سەرکەوتن بەدەست بێنیت، هەندێ جووڵە هەیە دەکەیت، چونکە جووڵەگەلێکن کە گەرەکە هەر بیانکەیت.

"تکات لێدەکەم لەگەڵمدا وەرەوە"، سوڵتان وەلەد بە پاڕانەوەوە وای گوت، ئیدی زنجیرەی بیرکردنەوەمی پساند و لەسەری ڕۆیشت: "ئەوانەی دەربارەی تۆ پڕوپاگەندەیان بڵاودەکردەوە، ئەوانەش کە خراپەیان دەرهەقت کرد، پەشیمانن. ئەم جارە شتەکە باشتر دەبێت، من بەڵێنی ئەوەت دەدەمێ".

ویستم پێی بێژم کوڕەکەم لە توانای تۆدا نییە ئەم بەڵێنانە بدەیت، کەسیش ئەوەی بۆ ناکرێ! بەڵام سەرم لەقاند و گوتم: "دەمەوێ جارێکی دی لە دیمەشق خۆرئاوابوون ببینم. دەتوانین سبەی بەیانی بەرەو قۆنیا بەڕێ بکەوین".

"بەڕاستیتە؟ سوپاس"، سوڵتان وەلەد بەدەم قسەوە زەردەیەکی خۆشنوودی هاتێ، "تۆ نازانیت باوکم بەمە چەند شادمان دەبێت".

ئینجا لام بە لای فرانسیسدا کردەوە کە بۆ درێژەپێدانی یارییەکە بە بێئارامی چاوەڕێی دەکردم. کە بیری خۆم کۆکردەوە، زەردەخەنەیەکی خۆش لەسەر دەموچاوی نەخش بوو.

بە دەنگێک کە نیشانەوەی بردنەوە بوو، وتی: "هاوڕێم، وریابە. کش مەلیک".

# کیمیا

## قۆنیا، ئایاری ١٢٤٧

بینیم نیگایەکی ئاڵۆز لە چاوەکانیدا و دووریـیەک لە ڕەفتاریـدایە کە لەوەوبەر نەمبینی بوو. شەمسی تەوریزی گەڕایەوە ناو ژیانم و وا دیاربوو گۆڕانێکی گەورەی بەسەردا هاتبوو. پرچی درێژکردبوو و بەسەر چاوەکانیدا هاتبووە خوارێ، بە خۆرەتاوی دیمەشق پێستی ئەسمەر بووبوو و گەنجتر و قۆزتر دیاربوو، بەڵام شتێکی دیکەی تێدا گۆڕابوو کە نەمتوانی بە وردی دەستنیشانی بکەم. لەگەڵ ئەو درەوشانەوە و سەرکێشییەی لە چاوە ڕەشەکانییەوە دەبریسکانەوە، درەوشانەوە و بریسکانەوەکەیان زیاتر بووبوو. ئیدی زانیم کە دوو چاوی پیاوێکی هەیە، هەموو شتێکی بینیوە و تاقیی کردووەتەوە.

پێم وایە گۆڕانکارییەکی قووڵتر بەسەر ڕۆمیدا هاتووە. وام بیردەکردەوە دوای گەڕانەوەی شەمس پەژارە و ترسەکانی سووک دەبن، بەڵام شتەکە وا دەرنەچوو. لە ڕۆژی گەڕانەوەکەیدا، ڕۆمی لە دەرەوەی شووراکانی شار بە گوڵ پێشوازیی لێکرد، بەڵام هەرئەوەندە خۆشییەکانی ڕۆژانی یەکەم کەمێ هێور بووەوە، ئیدی پەژارەی ڕۆمی زیادی کرد و زۆر لەفکران ڕۆدەچوو. پێم وایە من هۆیەکەی دەزانم. ئاخر دوای ئەوەی جارێک شەمسی لەدەست چوو، ئیدی دەترسا کە جارێکی تر لەدەستی بچێتەوە. دەتوانم لەوە تێبگەم کە کەسی دیکە ناتوانێت لێی تێبگات، چونکە منیش دەترسم لەدەستی بدەم.

گەوهەر، ژنە مردووەکەی ڕۆمی تاکە کەسێک بوو هەستی خۆم لە لای دەربڕی. دەی باشە، خۆ ئەو کەسێکی ڕاستەقینە نییە، بەڵام ناوی تارماییشی لێ نانێم، چونکە

ئافرەتێکە لە هەموو ئەو تارماییانەی کە دیومن کەمتر خەوبین و خەیاڵ ڕۆیشتووە، ئاخر لەوەتەی هاتوومەتە ئەم ماڵە، وەک دەراوی ئاو لەسەرخۆ بە دەورمدا هەڵدەقولێت و بە ئاسانی دەبزوێت. هەرچەندە دەربارەی هەموو شتێ قسەمان دەکرد، کەچی قسەکردنەکەی نێوانمان بە دەوری یەک بابەتدا دەخولایەوە، ئەویش شەمس بوو.

ئەمڕۆ بە گەوهەرم وت: "ڕۆمی بە دۆخێکی خەمۆکیی توندا تێدەپەڕێت. ئومێدەوارم بتوانم یارمەتیی بدەم".

گەوهەر بە جۆرە ئاڵۆزییەک وتی: "ڕەنگە ئەوەت بۆ بکرێ، لەم ڕۆژانەدا شتێکی گرینگ بیرکردنەوەی مژوول کردووە و بە هیچ کەسێکی نەوتووە".

لێم پرسی: "ئەو شتە چییە؟".

"ڕۆمی پێی وایە ئەگەر شەمس ژن بهێنێت و خێزان پێکەوە بنێت، ئەوا خەڵکی شار دوژمنایەتیی ناکەن و قسەوقسەلۆکەکانیان لەسەری سووک دەبێت، ئیدی جارێکی تر ناڕوات".

دڵم بە توندی کەوتە خورپە. شەمس و ژنهێنان؟! بەڵام کێ دێنێت؟

گەوهەر تیل نیگایەکی کردم و وتی: "ڕۆمی دەپرسێت ئاخۆ تۆ حەزدەکەیت شوو بە شەمس بکەیت؟".

سەرم بە گێژەوە هات. ئاخر ئەوە یەکەم جار نەبوو بیر لە شووکردن بکەمەوە، بەڵام ئێستا، دوای ئەوەی تەمەنم گەیشتووەتە پانزە ساڵی، زانیم کە کاتی شووکردنم هاتووە، هەرچەندە ئەوەش دەزانم کە ئەو کچانەی شوودەکەن هەتاهەتایە دەگۆڕێن، چونکە بە چاوێکی تازەوە دەڕوانن و ئەتواریان شێوازێکی دیکە وەردەگرێت و خەڵکیش بە جۆرێکی تر مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەن، تەنانەت منداڵانی بچووکیش دەتوانن ئافرەتی مێرددار و کچی پاکیزە لە یەکتر جیابکەنەوە.

گەوهەر زەردەخەنەیەکی ناسک گرتی و دەستی گرتم. ئیدی سەرنجم دا ئەو شووکردنەی پەژارەی کردووم، شووکردنە بە شەمس.

* * *

دوانیوەڕۆی ڕۆژی دواتر، چووم ڕۆمی ببینم. سەیرم کرد نوقمی نێو خوێندنەوەی کتێبێک بووە بە ناونیشانی (تهافت التهافت)*.

"کیمیا، پێم بڵێ"، بە سۆزەوە پێی وتم، "چیم لە تواناداییە تا بۆت بکەم؟".

"کاتێ باوکم بۆ لای تۆی هێنام، تۆ پێت وت کچ وەک کوڕ بەکەڵکی زانیاری نایات، چونکە چارەنووسی کچ شووکردن و منداڵخستنەوە و پەروەردەکردنی منداڵە، من ئەوەم باش لە یادە".

"بێگومان منیش لە یادمە"، بەدەم وەڵامدانەوەوە چاوە بادەمییەکانی تژی بوون لە خۆتێهەڵقورتاندن.

"لەو ڕۆژەوە بەڵێنم بە خۆم دا کە قەت شوو نەکەم، بۆ ئەوەی هەتاهەتایە هەر فەقێی تۆ بم"، ئەوەم گوت و لەژێر زەبری ئەوەی نیازم بوو بیڵێم دەنگم کزبوو: "بەڵام دەکرێ شوو بکەم، ئەگینا ئەم ماڵە جێدەهێڵم. مەبەستم ئەوەیە، کە شوو بە کەسێک بکەم هەر لێرە دەژی...".

ڕۆمی لێی پرسیم: "ئایا دەتەوێ بڵێیت کە حەزدەکەیت شوو بە عەلائەدین بکەیت؟".

"عەلائەدین؟"، بە سەرسوڕمانەوە بەپەرچیم دایەوە، بەڵام چی وای لێکردووە کە وا بزانێت من حەزدەکەم شوو بە عەلائەدین بکەم؟ ئاخر من بە برای خۆمی دادەنێم.

بێگومان ڕۆمی سەرسوڕمانەکەمی بۆ دەرکەوتووە، بۆیە گوتی: "ماوەیەک لەمەوبەر عەلائەدین هات و داخوازیی تۆی لێکردم".

دەمم داچەقاند، ئاخر دەمزانی لە کچێک ناوەشێتەوە کە دەربارەی ئەم شتانە پرسیاری زۆر بکات، بەڵام من ئەڵهای زانینی زۆرتر بووم، "گەورەم، ئەی چیت پێی گوت؟".

ڕۆمی وتی: "پێم وت دەبێ یەکەم جار پرس بە تۆ بکەم".

"گەورەم..."، بەدەم وەڵامدانەوەوە دەنگم یەکجار کزبووبوو، "ئێستا بۆ ئەوە هاتووم تا پێت بڵێم کە من دەمەوێ شوو بە شەمسی تەورێزی بکەم".

---

*تهافت التهافت: لە منجددا بە واتای بەسەریەکدا کەوتوو، یان زۆربڵێی، یان بابردوو هاتووە.( و.ک)

ڕۆمی بە نیگایەکی باوەڕنەکردەنی سەیری کردم و وتی: "ئایا تۆ لەوە دڵنیایت؟".

وتم: "ڕەنگە ئەوە لە زۆر ڕووەوە باش بێت"، هەرچەندە دەمەویست زۆرتر بزانم، کەچی هەستم کرد زۆرم وتووە، ئینجا ئەمەشم گوت: "شەمس دەبێتە بەشێک لە خێزانەکەمان و پێویستە جارێکی تر جێمان نەهێڵێت".

ڕۆمی لێی پرسیم: "کەواتە بۆچی دەتەوێ شووی پێ بکەیت؟ تا یارمەتیی بدەیت کە لەگەڵماندا بمێنێتەوە؟".

وتم: "نەخێر، مەبەستم ئەوەیە بڵێم بەڵێ، بەڵام ئەمە هەموو شتێک نییە... پێم وایە کە ئەو کەسەی لە چارەم نووسراوە، شەمسە".

هەر ئەوەندەم لەدەست هات ددانم بەوەدا نا کە من شەمسم خۆش دەوێ.

* * *

کیـــرا یەکەم کەس بـــوو هەواڵـــی هاوســـەرگیرییەکەی ژنەوت و بە زەردەخەنەیەکی نابەدڵییەوە و بە سەرسوڕمانەوە بەپیری هەواڵەکەوە هات، بەڵام هەرئەوەندە بە تەنیا لە ماڵەوە ماینەوە، ئیدی دەستی بە پرسیارکردن کرد و گوتی: "ئایا تۆ دڵنیایت لەوەی کە بەڕاستی ئەوەت دەوێ؟ تۆ بۆ یارمەتیدانی ڕۆمی ئەوە ناکەیت، وا نییە؟ تۆ کچێکی جحێڵیت! ئایا پێت وا نییە کە دەبێ شوو بە یەکێک بکەیت لە تەمەنی خۆتەوە نزیک بێت؟".

پێم وت: "ئاخر شەمس دەڵێت هەموو سنوورەکان لەنێو عەشقدا تێکەڵ دەبن".

کیرا هەناسەیەکی درێژی هەڵکێشا و گوتی: "کیژۆڵەکەم، هیوادارم شتەکان ئاوها ئاسان بن"، ئینجا تەڵێ لە قژە خۆڵەمێشییەکەی خستە ژێر سەرپۆشەکەیەوە و لەسەری ڕۆیشت: "ئاخر شەمس دەروێشێکی گەڕیدەیە، پیاوێکی سەرکێشە، پیاوانی وەک ئەو لەسەر ژیانی ناو ماڵ ڕانەهاتوون و نابنە مێردێکی باش".

"قەیناکات، ڕەنگە بگۆڕێت"، گردەبڕ ئاوهام وت، "خۆشەویستییەکی زۆری پێدەبەخشم و بەختەوەری دەکەم، بۆیە هەر دەبێ بگۆڕێت. فێر دەبێت چۆن بتوانێت ببێتە مێردێکی باش و باوکێکی باش".

قسەکانمان لێرە کۆتاییان هات، ئیدی ئەو شتەی کە کیرا لە دەموچاومدا خوێندییەوە هەرچییەک بووبێت، هیچ ناقابلییەکی پێوە دیارنەبوو کە دەکرا بیورووژێنێت.

لەو شەوەدا خەوێکی هێمنم کرد و هەستێکی خۆشی و بەپلان دایگرتم. نەمدەزانی من هەمان ئەو هەڵانە دەکەم کە ئافرەتان بە درێژایی سەردەمەکان کردوویانە: لەو بڕوا ساویلکانەیانەوە کە گوایا بە خۆشەویستیی خۆیان دەتوانن ئەو پیاوانە بگۆڕن کە خۆشیان دەوێن.

# کیرا

## قۆنیا، ئاياری ١٢٤٧

بابەتێکی قووڵ و هەستیاری وەک خۆشەویستی و قسەکردن لەسەری وەک ئەوەیە هەوڵبدەیت گفتوگۆ لەسەر گرتنی گەردەلوول بکەیت. ڕەنگە بەوای بایەکەوە ئازارت پێ بگات، بەڵام هیچ ڕێگەچارەیەک بۆ هێورکردنەوەی خێراییەکەی نییە. لەوەولا ئیدی پرسیاری زیاترم لە کیمیا نەکرد، نەک لەبەر ئەوەی بە وەڵامەکانی قایل بووم، بەڵکو لە چاوەکانیدا ئافرەتێکی عاشقم بینی. ئیدی دەربارەی ئەم هاوسەرگیرییە پرسیارم لێی نەکردەوە و شتەکەم وا وەرگرت کە ئەمیش یەکێکە لەو شتە سەیرانەی ژیان کە دەسەڵاتم بەسەریاندا ناشکێت. مانگی ڕەمەزان خێرا ڕۆیشت، لەبەر ئەوەی بە کارکردنەوە مژوول بووم، کاتی ئەوەم نەبوو دووبارە بیر لەم شتە بکەمەوە. ڕۆژی یەکشەممە جەژنی ڕەمەزان هات و دوای چوار ڕۆژ کیمیامان لە شەمس مارەکرد.

شەوی پێش زەماوەندەکە، شتێ ڕووی دا سەرودڵمی تێک دا. ئەوەبوو بە تەنیا لە نانەدینەکە بووم و بەرانبەر دەرخۆنەیەکی دارین دانیشتبووم کە هەویری لەسەر بوو و نانم بۆ میوانەکان ئامادە دەکرد، لەپڕ بەبێ ئەوەی ئاگام لەوە بێت چی دەکەم، خەریک بووم لە گونکە هەویرەکە وێنەیەکی دایکە مریەممانم دروست دەکرد، دایکم مریەم، ئینجا بە چەقۆ عەبا درێژەکەیم دروست کرد، ئینجا دەموچاوە هێمن و میهرەبانەکەی. لەبەر ئەوەی سەرقاڵی ئەوە بووم، ئاگام لێ نەبوو کە یەکێ لە پشتمەوە وەستاوە.

"کیرا، ئەوە چی دەکەیت؟".

دڵم لەنێو سینگمدا ڕاچەنی. کە ئاوڕم دایەوە بینیم شەمس بە تەنیشت دەرگاکەوە وەستاوە و بە دووچاوی خۆخەڵقورتاندنەوە تەماشام دەکات. بیرم

کـردەوە کە هەویـرەکە بـشارمەوە، بەڵام کـاتی ئەوە نەمـابوو. شـەمس لە دەرخۆنەکە نزیکبووەوە و تەماشای وێنەکەی کرد کە دروستم کردبوو.

لێی پرسـیم: "ئایـا ئەمە مـریەمە؟"، کە وەڵامـیم نەدایەوە، بە ڕوخـسارێکی درەوشاوە و زەردەخەنەوە ئاوڕی لێدامەوە و وتـی: "ئەمە جوانە، ئایا ئەڵهای مریەم دەکەیت؟".

"زۆر دەمێکە بووم بە موسڵمان. من ئافرەتێکی موسڵمانم"، بە پچڕپچڕی وەڵامم دایەوە.

شەمس وەک ئەوەی گوێی لە من نەبووبێت، لەسەر قسەکەی ڕۆیشت و وتی: "ڕەنگە بپرسـیت بۆچی لە ئیسلامدا هێمـایەکی مێینەی وەک مـریەم نییە. بێگومان ئایشەمان هەیە، بێگومان فاتیمەش هەیە، بەڵام ڕەنگە پێت وا بێت کە ئەمانە شتێکی ترن".

هەستم بە شڵەژان کرد و نەمزانی چی بڵێم.

شەمس لێی پرسیم: "ئایا بۆم هەیە چیرۆکێکت بۆ بگێڕمەوە؟".

ئەمە ئەو چیرۆکەیە کە بۆی گێڕامەوە:

چـوار ڕێبـواری یۆنـانی و عەرەبـی و فارسـی و تـورکی کە گەیـشتنە شارۆچکەیەک، بڕیاریان دا کە شتێ بخۆن. لەبەر ئەوەی پارەیەکی زۆریان پێ نەبوو، بۆیە تەنها یەک ڕێگەیان بەدەستەوە بوو. ئیدی هەریەکەیـان گوتی ئەو خواردنەی ئەو دەیخوات لە هەموو خواردنی دنیا نایابترە و لەوە زیاتر هیچی تر ناخوات. کە پرسیاری ئەو خواردنەیان لێکردن، هەریەکەیان بە زمانی خۆی وەڵامی دایەوە. فارسەکە وتی (ترێ)، یۆنـانییەکە وتـی: (تـرێ)، عەرەبەکە وتـی: (تـرێ)، تـورکەکەش گـوتی: (تـرێ). هیچیـان نەیتـوانی لە زمـانی ئەوی دیـکە تێبگات، ئیدی لەنێو خۆیاندا لێیان بوو بە دەحکە.

هەر دەماقاڵێیان بوو و تا دەهات بێزارتر دەبوون، تا سۆفییەک بە لایاندا تێپەڕی و قسەکەی پێ بڕین. بەو پارەیەی لە نێو خۆیانـدا کۆیـان کـردەوە، سۆفییەکە هێشووە ترێیەکی کڕی، ئینجا دەنکە ترێکانی کردە ناو دەفرێکەوە و گوشـی، ئینجـا داوای لێکـردن خۆشـاوەکەی بخـۆنەوە و تڵـپەکەی فڕێبـدەن، چونکە دەبێ بایەخ بە ناوەخنی میوەکە بدەن نەک تڵپەوتوێکڵەکەی.

"کریستیانەکان و جوولەکەکان و موسڵمانەکان لەم ڕێبوارانە دەچن. لە کاتێکدا ئەوان لەسەر شێوەی دەرەوە دەمەقاڵێیان بوو، کەچی سۆفییەکە لە گەوهەر و کرۆک دەگەڕا". شەمس بەدەم قسەوە زەردەخەنەیەکی خۆشی هاتێ.

"ئەوەی دەمهەوێ بیڵێم ئەوەیە کە هۆیەک نییە وات لێ بکات ئەڵهای دایکە مریەم بکەیت، گەرەکە بە پلەی یەکەم دەست لەو هەڵنەگریت. هەرچەندە تۆ ئافرەتێکی موسڵمانیت، بۆتیش هەیە هەر بە وابەستەیی ئەو بمێنیتەوە".

"نەخێر.. پێم وا نییە کە ئەم شتە گونجاو بێت"، بە زمانێکی گیراوەوە ئەمەم وت.

"بۆ نا، ئاخر ئایینەکان وەک ڕوبارن: هەموویان دەڕژێنە نێو هەمان دەریاوە، چونکە دایکە مریەم هێمایە بۆ سۆز و میهرەبانی و خۆشەویستییەکی بێمەرج. ئاخر ئەو هێمایەکە بۆ هەموان. تۆش وەک ئافرەتێکی موسڵمان دەتوانیت بەردەوام خۆشت بوێ، بەڵکو تەنانەت دەتوانیت ناوی کچەکەتیش بە ناوی مریەمەوە بنێیت".

وتم: "ئاخر من کچم نییە".

"کچێکت دەبێت".

"ئایا پێت وایە؟".

"من ئەوە دەزانم".

کە ئەم قسانەم بیست، ختووکەم هات، لێ ئەوەندەی نەبرد ختووکەکە ڕەوییەوە و هەستێکی دیکە جێی گرتەوە: هاوکاری. ئەوەبوو ساتێکی نائاساییمان لە پاکی و گونجان پێکەوە بەسەربرد و پێکەوە دیقەتی شێوەکەی دایکە مریەممان دا. دڵم لەحەناس شەمس نەرم بوو. ئاخر لەوساوە هاتبووە ماڵەکەمان یەکەم جار بوو ئەو شتەم تێدا دەبینی کە ڕۆمیی تێیدا دەیبینی: پیاوێکە خاوەنی دڵێکی گەورەیە.

بەڵام هێشتا گومانم هەیە کە ئەو بۆ کیمیا ببێتە مێردێکی باش.

# ئێلا

## بۆستن، ٢٩ی حوزەیران ٢٠٠٨

بە بێئارامی و شڵەژاوییەوە ئێلا گەیشتە ئوتێلەکە. کۆمەڵێ گەشتیاری ژاپۆنی لە هۆڵی پێشوازیی هۆتێلەکە بوون کە هەموویان لە تەمەنی حەفتاکاندا بوون، تراشی قژیان ئەوەندە لە یەکتر دەچوو، بە ڕادەیەک دەتوت یەک کەسن. ئێلا بە شوێنی پێشوازییەکەدا تێپەڕی و چاوێکی بە تابلۆ هەڵواسراوەکانی قەد دیوارەکاندا گێڕا تا تەماشای چاوی خەڵکەکەی دەوروبەری نەکات، بەڵام ئەوەندەی نەبرد هەڵپەکەی بەسەر شەرمەکەیدا زاڵ بوو. ئیدی هەر کە نیگای بەرەو هۆڵی کۆبوونەوەکان ئاراستەکرد، بینیی وا تەماشای دەکات.

کراسێکی ڕەنگ خاکی و پانتۆڵێکی کورتی تاریکی لە بەر بوو. وا هاتە بەرچاوی کە دوو ڕۆژە ڕیشی نەتاشیوە، ئەمەش وای کردبوو کە سەرنجڕاکێش بێت. قژە قاوەیی سوورباوە لوولەکەی بەسەر چاوە سەوزەکانیدا هاتبووە خوارێ و بڕێ باوەڕبەخۆبوون و هاوکات جۆرە مەکرێکی پێ بەخشیبوو. لاواز و بالابەرز بوو، ڕۆحسووک و ناسک، بەتەواوی لە دەیڤید جیابوو کە بەردەوام جلی گرانبەهای لەبەردەکرد کە بە تایبەتی بۆی دەدروورا. بە زاری ئوسکۆتلەندی دەدوا کە ئەفسوونێکی تێدا بینی. بە ناسکی و ئاسانی زەردەخەنەی دەهاتێ، دیاربوو بە بینینی شادمان بوو. ئێلا بە خۆی گوت چی تێدایە قاوەیەکی لەگەڵدا بخواتەوە.

دوایی بیری چوو کە چۆن کوپێک قاوە بوو بە چەندین کوپ، یان چۆن قسەوباسی نێوانیان دەستی پێکرد و ڕیتمێکی خۆییانەی وەرگرت، یان چۆن لە ساتەوەختێکدا ماچێکی سەر پەنجەی کرد و نەیزانی بۆچی هیچی نەکرد تا

نەیەڵێت ئەوە بکات. مادام ئەو قسەدەکات، ئیدی ئەو گوێی بە هیچ شتێ نەدەدا، مادام چاوەکانی دەتوانن ئەو لۆچە بچووکەی کە لە لالیوی مت بووە، ببینن، لە خۆی پرسی ئاخۆ دەبێ هەستی چۆن بێت گەر ماچێکی ئەو لۆچە بکات. سەعات دەونیوی شەو بوو. لەگەڵ پیاوێکدا لە هۆتێلێکە و جگە لە هەندێ نامەی ئەلیکترۆنی و ئاڵوگۆڕکردنی قسەی نێو تەلیفۆن و ئەو ڕۆمانەی نووسیوێتی هیچ شتێ لەبارەیەوە نازانێت و هیچ شتێ کۆیان ناکاتەوە.

ئێلا لێی پرسی: "کەواتە لەبەر گۆڤاری سمیتۆنیان هاتوویت؟".

عەزیز وەڵامی دایەوە: "لە ڕاستیدا لەبەر خاتری تۆ هاتم. دوای ئەوەی نامەکەتم خوێندەوە، ویستم بێم تا بتبینم".

چەندین شێوازی کردەیی بۆ دەربازبوون لەم ڕێگە پەلەیە هەبوون کە خێرا دەجووڵا، تەنانەت تا ساتێکی دیاریکراو دەکرا وا پیشان بدرێ کە هەموو شتێ بە شێوەیەکی دۆستانە بەڕێوە دەچێت، نامە ئەلیکترۆنییەکان، قسەکردن بە تەلیفۆن، بەڵکو تەنانەت چاوبڕکێش، ڕەنگە ڕۆحێکی ئەڤینی و جۆرە ڕابواردنێک لە خەیاڵیدا بووبێت، لێ لەوە زیاتر نەبوو. خۆ دەیتوانی سنوورێک دابنێت، ئیدی ئەوە بوو لێی پرسی: "ئێلا، ئایا دەتەوێ بۆ ژوورەکەی من بێیت؟".

گەر ئەوە گەمەیەک بووبێت کە هەردووکیان دەیانکرد، ئەوەندەی نەبرد شتەکە بوو بە ڕاستی. ئاخر ئەم پرسیارەی کارێکی وای کرد کە هەموو شتێک بە شێوە ڕاستەقینەکەی دەربکەوێت. ئیدی وەک ئەوەی پەردەیەک بێت و لادرابێت و ڕاستییەکە دەرکەوتبێت، ڕاستییەکی ڕوون و ئاشکرا و ئەمێستا تەماشای چاوی هەردووکیانی دەکرد. ئێلا هەستی کرد شتێ لە هەناویدا دەجوڵێت، هەستێک لە شێوەی تەنگەتاوی و ترسناسا، بەڵام داواکەی ڕەت نەکردەوە. ئەم بڕیارەی لە هەموو ئەو بڕیارانەی کە لە ژیانیدا دابوونی هەڵەشانەتر بوو، لەگەڵ ئەوەشدا هەستی کرد وەک ئەوەیە کە لەجیاتی ئەو بڕیارەکە درابێت. ئیدی ئەوەی لەسەر ئەو بوو پێی قایل بێت.

* * *

ژوورەکە ژمـارە ٦٠٨ بـوو، بە شـێوەیەکی جـوان و بە ڕەنگـی ڕەش و سـوور و بێجـی ڕازابـووەوە. گەرموگـوڕ و فـراوان بـوو. ئـێلا ویـستی ئەو دواجـارە بێنێـتەوە یـادی خـۆی کە لە هۆتێلێـک دابەزی بـوو، ئەو سـەفەرەی هاتەوە یاد کە ماوەیەکی زۆر لەمەوپێش لەگەڵ مێردەکەی و منداڵەکانیدا بۆ مۆنتریال چووبوو. پاشماوەی پشووەکەیان لە ماڵەکەی خۆیان لە ڕۆدئایلاند بەسەر برد، چونکە هیچ پاساوێکی وای نەدەبینی تا لە شـوێنێک بمێنێتەوە، خەڵکانی تر سەرچەفەکان بگۆڕن و ڕۆژانە قاوەڵتی ئامادە بکەن، چونکە گەر لە ژووری هۆتێلێکدا بێت وەک ئەوەیە لە وڵاتێکی دیکە بێت، ڕەنگە شتەکە وا بووبێت. خەریکبوو وەک کەسێک کاتێ دەچێتە شارێک، تەواو تێیدا نامۆیە و چێژ وەردەگرێت، هەستی بەو ڕەهاییە دەکرد.

هەر کە چـوونە نـاو ژوورەکەوە، دووبـارە شـڵەژا. هەرچەنـدە دیکـۆری ژوورەکە جوان و فراوانیش بوو، لە ناوەڕاستیدا جێخەوێکی فراوان دانرابوو، بەڵام کە بە تەنیشت جـێخەوەکەوە وەسـتا و هەسـتی بە تەنگەتـاوی و گونـاه کرد، کۆمەڵە پرسیارێک لە ناخیدا کەوتنە شەڕەشـان، لـێ نەگەیشتە وەڵامێکی تێروتەسـەل. ئایـا ئێـستا لەگەڵ یەکتـردا جـووت دەبـن؟ ئایـا هەر دەبـێ ئەوە بـکەن؟ ئەی ئەگەر ئەوەیـان کـرد دوایـی چـۆن بتوانێـت تەماشـای چـاوانی مێردەکەی بکات؟ بەڵام دەیڤید سـەرباری پەیوەندییە سێکسییە زۆرەکانی، بە لایەوە قورس نەبوو تەماشای چاوەکانی ئەم بکات، ئـێ وا نییە؟ ئەی دەبـێ بە لای عەزیزەوە جەستەی چۆن بێت؟ ئەی ئەگەر بەدڵی نەبوو؟ ئەی پێویست نییە ئێستا بیر لە منداڵەکانی بکاتەوە؟ ئاخۆ لەم کاتەدا نوستوون یان بێدارن و تەماشای تەلەڤزیۆن دەکەن؟ ئەی ئەگەر زانییان ئێستا خەریکی چییە، ئایا لێی خۆش دەبن؟

عەزیـز هەسـتی بە پەژارەکەی کـرد، بـۆیە دەسـتی گـرت و بەرەو ئەو کورسـییە قۆڵـدارە بـردی کە دوور لە جـێخەوەکە لە سـووچێکی ژوورەکە دانرابوو.

بە چپە گوتی: "بێدەنگ بە. ئاوەزت لە بیرکردنەوە جمەی دێت و دەنگێکی زۆری تێدا بەرزدەبێتەوە".

"خۆزگە زووتر بەیەک گەیشتباین"، ئێلا گوێی لە خۆی بوو وای دەگوت.

عەزیز وتی: "لە ژیاندا شتێ نییە پێی بوترێ زوو یان درەنگ، هەموو شتێ لە کاتی خۆیدا ڕوودەدات".

"ئایا بەڕاستی پێت وایە؟".

عەزیز زەردەخەنە گرتی و تاڵێ لە قژەکەی لەسەر چاوی دوور خستەوە، ئینجا جانتاکەی کردەوە و ڕایەخێکی لێ دەرهێنا کە لە گواتیمالا کڕیبووی، هەروەها قوتوویەکی بچکۆلەی دەرهێنا کە ملوانکەیەکی زیوی تێدا بوو و میرووی پیرۆزەیی و مەرجانی سووری پێوە لکێنرابوو و وێنەی دەروێشێکی لەسەر نەخش کرابوو کە بە دەوری خۆیدا دەخولایەوە.

ئێلا ڕێگەی پێدا کە ملوانکەکە بکاتە گەردنی، هەستی کرد ئەو شوێنەی پەنجەکانی بەری کەوتن، گەرمییەکی تێگەڕا، لێی پرسی: "ئایا وەک چاوەڕێت دەکرد ئاوها دیارم؟".

عەزیز بە زەردەخەنەوە وتی: "خۆشم ویستیت".

"بەڵام هێشتا نامناسیت".

"پێویست بەوە ناکات کە دەبێ یەکێ بناسم ئینجا خۆشم بوێ".

ئێلا پشوویەکی خواردەوە و وتی: "ئەمە شێتایەتییە".

عەزیز دەستی درێژکرد و ئەو تەوقەیەی لابرد کە پرچەکەی لە شێوەی کێکێکدا گرتبوو، پرچی کرایەوە و هەردوو شانی داپۆشی. ئینجا بە سۆزەوە بەرەو جێخەوەکە بردی. بەکاوەخۆ و بە ناسکی بەسەر هەردوو پێیەوە تا هەردوو گۆزینگی، لە نێوچەوانییەوە تا سینگی بە بازنەی بەردەوام و یەک لەدوای یەک هەردوو ناولەپی جووڵاند، لێوەکانیشی بە پەیڤگەلێ کە بۆ ئێلا لە کۆدێکی کۆن و نهێنی دەچوو لە چپە نەدەکەوتن. لەناکاو تێگەیشت ئەوەی دەیکات چییە. ئاخر ئەو نزای دەکرد و دەستەکانی هەموو شوێنێکی جەستەیان تەی دەکرد و چاوەکانی نووقابوون و لێوەکانی لەپای ئەودا بە ورەور دروودیان دەخوێند. ئەوە مەزنترین تاقیکردنەوەی ڕۆحی بوو کە لە ژیانیدا دەیبیست. هەرچەندە هێشتا جلەکانی لە بەر بوو، هەروەها ئەویش، لەگەڵ ئەوەی هیچ شتێکی جەستەیی لە نێوانیاندا ڕووی نەدابوو، کەچی ئەوە بەجۆشترین هەستی جووتبوونێک بوو لە ژیانیدا.

کتوپڕ هەستی کرد ختووکەیەک بە ناولەپەکانی و شانەکانیدا تێدەپەڕێت، ئینجا هەموو جەستەی گرتەوە و وزەیەکی سەیری پێ بەخشی. ئارەزوویەکی خۆش دایگرت و هەستی کرد کەوتووەتە سەر ئاوێکی شەپۆلاویی فێنک و ئیدی ئەوەی لە توانایدا بوو بیکات خۆبەدەستەوەدان و زەردەخەنە بوو، وەک ئەوەی شەپۆلی ڕووناکییەک بەسەریاندا ڕژابێت و نوقمیان بکات، لە دەوری ئەو و لە دەوری خۆی هەستی بە شتێکی زیندوو کرد.

ئێلا چاوەکانی لێک نا و بێ ئەوەی دەست بە شتێکەوە بگرێت، خۆی دایە دەست شەپۆلەکانی ڕوبارێکی تیژەوە. ئیدی ڕەنگە لە کۆتاییدا تاڤگەیەک هەبێت، بەڵام تەنانەت گەر توانیشی خۆی بگرێتەوە، ئەوا دڵنیا نەبوو کە بەڕاستی خۆی ئەوەی ویستووە.

کاتێ دەستەکانی گەیشتنە سەر زگی و بازنەیەکیان لەسەر دروست کرد، ئێلا هەستی کرد گرێک لە نێوان لاقەکانییەوە دەئایسێت. متمانەی بە جەستەی خۆی نەبوو، ئاخر دوای تێپەڕبوونی ئەم هەموو ساڵە، دوای خستنەوەی سێ منداڵ، هەردوو کەفەڵی و ڕانەکانی و مەمکەکانی ئەو جوانی و تەڕوبڕییەیان نەمابوو، بۆیە پەژارەکەی دەمێ سووک دەبوو وەمێ توند دەبوو. هەستی بە پارێزراویی خۆی کرد و خۆشییەکی تێگەڕا، ئینجا دۆخێک لە بەختەوەری ڕایماڵی. ئەوسا زانیی کە ڕەنگە ئەم پیاوەی خۆش بوێ و بۆی هەیە شەیدایشی بێت.

بەم هەستەوە هەردوو باسکی لە عەزیز وەرێنا و بەرەو خۆی ڕایکێشا و هەستی کرد کە ئامادەیە لەوە دوورتر بڕوات، بەڵام ئەو چاوەکانی کردەوە و ماچێکی پەڕەکەی لووتی کرد و لێی دوورکەوتەوە.

"دیارە تۆ منت بەدڵ نییە؟"، ئێلا بەدەم پرسیارەوە لە کزیی دەنگی خۆی سەری سوڕما.

"نامەوێ شتێ بکەم وات لێ بکات لە دواییدا پێی خەمبار بیت".

نیوەی جەستەی خەمین بوو و نیوەکەی تری شادمان. هەستی بە بارسووکییەکی سەیر کرد. زۆر شڵەژا بوو، بەڵام لەناکاو هەستی بە ئاسوودەیی کرد.

سەعات یەک و نیوی بەیانی، ئێلا لە بۆستن دەرگای شوقەکەی کردەوە. لەسەر قەنەفەیەکی بە چەرم پۆشراو ڕاکشا، چونکە حەزی لێ نەبوو لەسەر سیسەمەکە بنوێت، نەک لەبەر ئەوەی کە دەیزانی مێردەکەی لەگەڵ ئافرەتانی دیکەدا لەسەری نوستووە، بەڵکو لەبەر ئەوەی هەستی کرد باشتر وایە وای دابنێت کە ئەمماڵە هی ئەو نییە و لە ژووری هۆتێلێک زیاتر نییە و لێرە وەک میوانێکە. لە کاتێکدا نەفسی ڕاستەقینەی لە شوێنێکی تر چاوەڕێی دەکرد.

## شەمس

### قونیا، ئایاری ١٢٤٧

**بڕوکە جوانەکەم مەگری**
**ماڵئاوایی لە دایک و باوکت بکە**
**سبەینێ گوێت لە خوێندنی باڵندەکان دەبێت**
**لەگەڵ ئەوەشدا ئەو خۆی، خۆی نابێت**

لە شەوی پەردەماندا، دزەم کرد و بۆ ناو حەوشەکە دەرچووم و کەمێ لەوێ دانیشتم و گوێم بۆ گۆرانییەکی ئەنادۆڵ هەڵخست کە لە نێو چەندین دەنگی تری نێو ماڵەکە بەرز دەبووەوە، دەنگی قاقای پێکەنین و مۆزیک و زۆربڵێیی. ئافرەتە ژەنیارەکان لە بەشی حەرەمسەرا مۆزیکیان دەژەنی. لەوێ وەستام و بیرم دەکردەوە و سروودم دەچڕی، هەستم بە سڕبوونی جەستەم کرد. هەستم لە پەیڤەکانی سترانەکە ڕاگرت. بۆچی ئافرەتان هەمیشە لە شەوی پەردەدا گۆرانیی خەمناک دەچڕن؟چونکە سۆفییەکان مردن بە ئاهەنگەکانی بووکگواستنەوە دەبەستنەوە و ئاهەنگ بۆ ئەو ڕۆژە دەگێڕن کە تێیدا دەمرن و ئەو ڕۆژە بەوە دادەنێن کە لەگەڵ خوودادا یەک دەگرن، هەروەها ئافرەتانیش شەوی پەردە بە مردنەوە گرێ دەدەن، بەڵام بە چەندین هۆکاری جیاوە، تەنانەت کاتی مارەبڕینیان کە شادمان دەبن، جۆرە خەمێک دایاندەگرێت. لە هەموو ئاهەنگی بووکگواستنەوەیەکدا خەمێک بەسەر ئەو کچەدا باڵ دەکێشێت کە ئەوەندە نابات دەبێتە هاوسەر و دایک.

دوای ئەوەی هەموو داوەتکراوەکان ڕۆیشتنەوە، بۆ ماڵەوە گەڕامەوە و لە سووچێکی هێمن دانیشتم و دەستم بە ڕامان کرد، ئینجا ڕووم کردە ئەو

ژوورەی کە لەوێ کیمیا چاوەڕێی دەکردم. لەسەر جێگەکە دانیشتبوو و عەبایەکی سپیی لە بەر بوو کە بە سوورمەی زێڕین نەخشێنرابوو. پرچی کردبوو بە چەند پەلکێکەوە و هەر پەلکەی بە چەند میروویەک ڕازابووەوە. نەمتوانی شێوەی دەموچاوی ببینم، چونکە بە تارایەکی ئاوریشمی سوور و ئەستوور داپۆشرابوو. مۆمێک بە تەنیشت پەنجەرەکەوە دانرابوو کە ژوورەکەی ڕووناک دەکردەوە. ئەو ئاوێنەیەی کە بەقەد دیوارەکەوە هەڵواسرابوو و بە قوماشێکی مەخمەڵی ڕووەکەی داپۆشرابوو، چونکە بڕوایەک هەیە کە دەڵێت گەر تازەبووک لە ئاوێنەدا خۆی ببینێت بەدوێمە. بە تەنیشت جێخەوەکەمانەوە هەنارێک و چەقۆیەک دانرابوون تا هەنارەکە بخۆین و بەقەد ژمارەی دەنکە هەنارەکان منداڵ بخەینەوە. کیرا باسی هەموو دابونەریتە ناوخۆییەکانی بۆ کردبووم و بیری هێنامەوە کە کاتێ تاراکە لەسەر ڕووی لادەبەم، گەردانەیەک لە پارەی زێڕ پێشکەش بە بووکە بکەم، بەڵام منێک کە لە ژیانمدا پارەی زێڕم نەبووە و نەشم دەویست ئەو دراوە زێڕە پێشکەشی بووکەکەم بکەم کە لە کەسێکی تر قەرزی دەکەم، بۆیە کاتێ تاراکەم لە ڕووی کیمیا لادا، هەموو ئەوەی کە کردم شانەیەکم پێشکەشی کرد کە لە قەپیلکی کیسەڵ دروست کرابوو و بەئاستەم ماچێکی لێوەکانیم کرد. بە زەردەخەنەیەک لێوەکانی کشان و بۆ چرکەیەک مینا لاوێکی هەرزەکار و سەردەرنەکردوو شەرمێک دایگرتم.

پێم گوت: "تۆ جوانیت".

لە شەرمان دەموچاوی سوورهەڵگەڕا، ئینجا شانەکانی خاوکردەوە و تا لەتوانایدا بوو هەوڵی دا هێمنتر و پێگەیشتووتر دەربکەوێت.

وتی: "ئەمێستا من هاوسەری تۆم".

پاشان ئاماژەی بۆ ئەو فەرشە جوان و ڕاخراوەی سەر زەوییەکە کرد کە وەک بەشێک لە مارەییەکەی بە وردی دروستی کردبوو. ڕەنگەکانی هەریەکەو بە جۆرێ دەدرەوشایەوە. هەر ئەوەندە چاوم پێی کەوت زانیم کە هەر شێوە و وێنەیەکی سەر قالییەکە ئاماژەیە بۆ من. کیمیا خەونەکانی خۆی دەچنی.

دووبارە ماچم کردەوە. گەرمیی لێوەکانی شەپۆلێک لە ئارەزووی لە هەموو جەستەمدا ورووژاند، بۆنی یاسەمین و گوڵی کێویی لێدەهات. کە بە

تەنیشتییەوە ڕاکشام بۆنەکەیم هەڵمژی و دەستم بەسەر مەمکە بچووک و توندەکانیدا هێنا. دەمەویست بیورووژێنم. وەک گوڵێکی تازەپشکتوو پێشوازیی دڵۆپە باران بکات، خۆی ڕادەستم کرد.

خۆم لێی دوورخستەوە و وتم: "کیمیا، بەداخەوەم ناتوانم ئەوە بکەم".

بە وڕی و کاسییەوە تەماشای کردم و وا دیاربوو کە هەناسەدانی بیرچووەتەوە. نائومێدی لە چاوەکانیدا ئەوەندە بە ئاشکرا دیاربوو، نەمتوانی بەرگەی بگرم. هەستامە سەرپێ و گوتم: "دەبێ من بڕۆم".

"ناکرێ ئێستا بڕۆیت"، کیمیا بە دەنگێک کە بۆخۆیشی نامۆ بوو وای گوت، "ئاخر ئەگەر ئێستا ژوورەکە جێ بهێڵیت خەڵکی چی دەڵێن؟ وا دەزانن کە ئەم هاوسەرگیرییە هەڵوەشاوەتەوە و وا زەن دەکەن کە من هۆکارەکەیم".

"مەبەستت چییە؟"، ورەوڕێکم کرد، چونکە لە مەبەستی تێگەیشتم.

نیگای خۆی کەلا خست و ورتەورتێکی کرد کە تێی نەگەیشتم، ئینجا بە هێمنی وتی: "مەزەندەی ئەوە دەکەن کە من کچێنیم لەدەست داوە، ئیدی دەبێ ژیانم بە ئابڕووچوویی و چاوشۆڕی بەسەر ببەم".

ئەو بیرۆکەیەی کە کۆمەڵگە ئەم یاسا توورەهاتانە بەسەر ڕۆڵەکانی خۆیدا دەسەپێنێت، وای لێکردم خوێنم بێتە کوڵ، چونکە ئەو یاسا ئابڕوومەندییەی کە خودا سەپاندوویەتی لەگەڵ ئەو یاسایانەدا یەک ناگرێتەوە کە مرۆڤ بەسەر خۆیاندا سەپاندوویانە.

"ئەمە ژاوەژاوە. گەرەکە خەڵکی خەریکی کاری خۆیان بن"، بە ناقایلییەوە ئەمەم وت، بەڵام دەمزانی کە کیمیا ڕاست دەکات.

بە جووڵەیەکی خێرا، ئەو چەقۆیەم هەڵگرت کە بە تەنیشت هەنارەکەوە دانرابوو. جۆرە ترسێکم لە دەموچاوی کیمیادا بەدی کرد، دوایی وردەوردە سیمای کەسێک جێی ترسەکەی گرتەوە کە هەست بە شتێکی خەمین بکات و پێی قایل بێت، بەبێ دوودڵی ناولەپی دەستی چەپەی خۆم زامدارکرد، چەند دڵۆپێک لە خوێنەکەم کەوتنە سەر پەڕۆی ڕووسووری سەر جێگەکە و چەند پەڵەیەکی سووری تێریان دروست کرد.

"ئەم پەڕۆی ڕووسـوورییەیان پیشان بدە – ئەمە دەمیـان لێک دەنێت و ئیدی نـاوت بە بـێگەردی و پـاکی دەمێنێـتەوە، وەک چۆن لە ڕاستیـشدا هەر وایە".

"تکات لێدەکەم چاوەڕێ بکە! لێت دەپاڕێمەوە مەڕۆ"، کیمیا بە پاڕانەوەوە ئەمەی گوت و هەستایە سەرپێ و نەیدەزانی کە ئەو هەنگاوەی دواتر دەینێت بەرەو کـوێی دەبـات، دووبـارەی کـردەوە و وتـی: "ئـاخر ئێـستا بـووم بە هاوسەری تۆ".

لەوساتەدا زانیم بەو هاوسەرگیرییەی لەگەڵیدا کردم چ هەڵەیەکی گەورەم کردووە. سـەرم بە توندی هـاتەژان، ئیدی لە ژوورەکە دەرچووم و ملـم نـایە تاریکەشـەوەکەوە. ئاخر نەدەبوو پیـاوێکی وەک مـن ژن بهێنێت، مـن بۆ ئەوە نەخولقاوم تا ژیانێکی جێگیر بژیم. خۆ من ئەوەم زۆر بە ڕوونی دەبینی، بەڵام ئەوەی زۆر خەمباری دەکردم باجی ئەو زانینەم بوو.

ویستێکی بێقەوام دایگرتم کە لە هەموو شتێ هەڵێم، نەک تەنها هەر لەم مـاڵە و لەم هاوسـەرگیرییە و لەم شـارە، بەڵکـو لەم جەسـتەیەش کە پـێم بەخـشراوە بەڵام بەیـانیی ڕۆژی دوای ئەوە کە ڕۆمـیم بینـی وای لێکـردم بمێنمەوە، چونکە نەمدەتوانی جارێکی تر جێی بهێڵمەوە.

ئیدی بە تۆڕی تەڵەکەوە بووم.

# عەلائەدین

## قۆنیا، ئایاری ١٢٤٧

بڕیاری لێبڕاوانەم دا و سوور دەمزانی کە لێی ژێوان دەبمەوە. بێدەنگ بووم و بە ئاشکرا بەرانبەر بەم هاوسەرگیرییە ناڕەزاییم دەرنەبڕی، بەڵام لەو ڕۆژەوەی کە کیمیا لە شەمس مارە بڕدرا، بە جۆرێ سەرم دەئێشا لەوەپێش شتی وام تووش نەبووبوو. لەسەر جێگەکەم دانیشتم و وەک ئەوەی بخنکێم بەهەستەم هەناسەم بۆ دەدرا. ڕوومەتەکانی خۆم دەڕنییەوە و خۆم دەلاواندەوە. هەناسەیەکی خنکاو لە نێوان لێوەکانمەوە دزەی کرد. هەر ئەو دەنگە بوو وای لێکردم هەست بکەم کە ئیدی من کوڕی باوکم نیم.

ئیدی من نە دایکم هەیە نە باوک و نە برا و تەنانەت نە کیمیاش. لەم دنیایەدا بە تەنیا مامەوە، لە نێوان شەو و ڕۆژێکدا هەموو ئەو ڕێزەی کە مابووەوە و لە باکمم دەگرت، توایەوە. ئاخر کیمیا لەپایەی کچی ئەو بوو، پێم وا بوو تا ئەوپەڕی پارێزگاری دەکات و بایەخی پێدەدات، بەڵام وا دیارە تاکە کەسێک کە بایەخی پێدەدات هەر شەمسی تەورێزییە. ئاخر چۆن دڵی هات کیمیا لە پیاوێک مارە بکات کە لە تەمەنی خۆیدایە؟ ئاخر هەر کەسێک بگریت دەزانێت کە شەمس بۆ ژن و مێردایەتی ناشێت. هەرچەندە بیرم لە شتەکە دەکردەوە، بۆم دەردەکەوت کە باوکم قوربانیی بە بەختەوەری کیمیا و بە بەختەوەری منیش دا، تا وا لە شەمس بکات هەست بە ئارامی بکات. هەموو ڕۆژەکەم بە ململانێ لەگەڵ ئەم بیرکردنەوانە بەسەربرد و بە ناچاری تەماشای ئەو ئامادەکارییانەم دەکرد کە بە بەرچاومەوە بەڕێوەچوون. ماڵەکە بە جۆرێ پاککرایەوە، دەدرەوشایەوە، ئەو ژووری نوستنەی کە بووک و زاوا

تێیدا دەنوستن گوڵاوڕشێن کرا، تا ڕۆحە شەڕانگێزەکان دووربکەونەوە، بەڵام شەیتانە گەورەکەیان لەبیرچوو! ئاخر چۆن بتوانن شەمس دەربکەن؟

دواینیوەڕۆ، ئیدی نەمتوانی بەرگەی ئەوە بگرم، بۆیە بڕیارم دا نەبمە بەشێک لەم ئاهەنگە کە بۆ من ئازارێکی ڕاستەقینەیە. ئەوە بوو بەرەو دەرگا ڕۆیشتم.

"عەلائەدین ڕاوەستە! ئەوە بۆ کوێ دەڕۆیت؟"، لە پشتمەوە دەنگی بەرز و تیژی براکەم بەرگوێم کەوت.

"ئەمشەو لە ماڵی ئیرشاد دەمێنمەوە"، بەدەم قسەوە ڕووی خۆم لێی وەرگێڕا.

"ئایا شێت بوویت؟ ئەی نامێنیتەوە تا لە ئاهەنگی بووکگواستنەوەکەدا ئامادە بیت؟ گەر باوکت ئەوە بزنەوێت دڵی پارەپارە دەبێت".

هەستم کرد توورەییەکی بێقەوام لە هەناومدا گڕدەگرێت، وتم: "ئەی چی لەو دڵانە دەکات کە خۆی پارەپارەیان دەکات؟".

"ئەوە تۆ باسی چی دەکەیت؟".

"بۆچی نازانیت؟ ئاخر باوکمان بۆ دڵڕاگرتنی شەمس ئەم هاوسەرگیرییەی ڕێکخست تا دووبارە ڕانەکات! بۆیە کیمیای لەسەر قاپێکی زیو پێشکەش کرد".

براکەم لێوەکانی هەڵقرچاند و دیار بوو ئەوە هەستی بریندار کردووە، گوتی: "دەزانم بیر لە چی دەکەیتەوە، بەڵام تۆ هەڵەیت. تۆ پێت وایە کە ئەم هاوسەرگیرییە بەزۆر کراوە، کەچی لە ڕاستیدا ئەوە کیمیا خۆی بوو دەیەویست شوو بە شەمس بکات".

بە توورەییەوە وتم: "وەک ئەوەیە شتەکە بەدەست کیمیا بێت".

"ئەی خودایە! ئەوە بۆ تێناگەیت؟"، براکەم وەک ئەوەی داوای کۆمەک لە خودا بکات، هاواری کرد و لەپەکانی بەرەو ئاسمان بەرز کردەوە، ئینجا وتی: "ئاخر ئەو شەمسی خۆش دەوێ".

"جارێکی تر وا مەڵێ، چونکە ئەمە ڕاست نییە"، دەنگم وەک بەفری هەرەسبردوو داڕما.

ئینجا سوڵتان وەلەد وتی: "براکەم، تکات لێدەکەم با هەستەکانت لە حەناس ڕاستییەکان کوێرت نەکەن. تۆ ئێرەییت پێی دێت، دەتوانین ئێرەیی بە

شێوازێکی بنیاتنەرانە بۆ ئامانجێکی پیرۆز بەکار بێنین. دەشێ هەندێ جار بـاوەڕنەکردن بـاش بێـت. ئەمە یەکـێکە لە ڕێـساکان، ئەویـش ڕێـسای سیوپێنجەمینە: **لەم دنیایەدا شتە لەیەکچووەکان یان ڕێکخراوەکان وامان لێ ناکەن هەنگاوێک بەرەو پێشەوە بڕۆین، ئەوە دژبەیەکەکانن پێشمان دەخەن. لە ناوەوەی هەریەکێکماندا هەموو دژبەیەکەکانی ئەم گەردوونە هەیە، بۆیە لەسەر هەر بڕوادارێک پێویستە تەماشای ئەو کەسە بێبڕوا متبووەی ناوەوەی خۆی بکات، هەروەها لەسەر ئەو بێباوەڕە پێویستە ئەو بڕواداره بناسێت کە لە ناوەوەی خۆیدایە. جا بۆ ئەوەی بگەینە ئەو ڕۆژەی کە مرۆڤ تێیدا دەگاتە قۆنـاغی بەرکەمـاڵ، قۆنـاغی مرۆڤـی نمـوونەیی، ئەوا بـڕوا لە کردەیەکـی ڕیزبەندیی یەک لەدوای یەک پتر نییە و هەبوونی هاوشێوەکەی پێویستە: بێبڕوایی.**

"سەیرکە، لەم وتە سۆفیگەرییە لووسانە بێزار بووم. جگە لەوەش چی وام لێدەکات تا گوێ لە تۆ بگرم؟ ئەوە هەڵەی تۆیە! دەبوو شەمس لە دیمەشق جێ بهێڵێت و وازی لێ بێنێت. ئاخر بۆچی هێناتەوە؟ گەر شتەکان بەرەو خراپی بڕۆن، کە من دڵنیام خراپتر دەبن، ئەوە تۆ بەرپرسیاریت".

براکەم هەناسەیەکی هەڵکێشا و بە ترسەوە تەماشای کردم. لەو ساتەدا لە ژیانمدا بۆ یەکەم جار بوو زانیم کە ئەو لێم دەترسێت و لەو شتانەش دەترسێت کە لێم دەوەشێتەوە بیانکەم. هەستێکی نـامۆ بـوو، بەڵام بە شێوەیەکی سەیر خۆشیش بوو.

بەرەو ماڵی ئیرشاد ڕۆیشتم و تا کەس نەمبینێت وا دەگریم، ئەو کۆڵانە لاوەکییانەم گرتەبەر کە بۆنی ناخۆشیان لێدەهات. تاقە شتێک کە لە مەژگمدا دەخولایەوە، ئەوە بوو کە شەمس و کیمیا لەسەر یەک جێگە نوستوون. بیرم لەوە دەکردەوە کە وا خەریکە کراسەکەی لە بەر دادەکەنێت و دەستە زبر و ناشیرینەکانی بەسەر پێستە شیرییەکەیدا دێنێت، بەم غایلانە ڕقم هەستا و دڵم گوشرا.

دەمزانی کە هێڵ و سنوورێک بەزێنراوە و دەبێ یەکێک شتێ بکات.

# کیمیا

## قۆنیا، کانوونی یەکەم ١٢٤٧

بووک و زاوا – دەبوو ئێمە بووک و زاوا بین. حەوت مانگ بەسەر هاوسەرگیرییەکەماندا تێپەڕی و تاقەجارێک وەکو مێردێک لەگەڵمدا نەنوست. هەرچەندە هەوڵم دەدا کە ڕاستییەکە لەوانی دیکە بشارمەوە، بەڵام پێم وا بوو کە ئەوان شتەکە دەزانن. بڕێ جار وەک ئەوەی هەست بکەم کە شەرمەزارییەکەم لە نێوچەوانم نووسرابێت، دەترسام بە دەموچاومەوە دیار بێت، چونکە بێگومان کە مرۆڤ تەماشات دەکات، یەکەم جار سەرنجی ئەوە دەدات. کە لەگەڵ دراوسێکانمدا قسەم دەکرد، یان لەناو باخەکەدا کارم دەکرد، یان لە بازاڕ لەگەڵ فرۆشیارەکاندا کاڵام ئاڵوگۆڕ دەکرد، خەڵکانی دیکە، تەنانەت بە نەناسەکانیشەوە بە تاقە نیگایەک دەیانزانی کە من ئافرەتێکی مێرددارم، بەڵام من هێشتا هەر کچ بووم.

ڕاست نییە کە بڵێم شەمس لە ژوورەکەمدا سەری لێ نەدەدام. ئاخر هەموو جارێک گەر ئێواران ویستبای سەرم لێبدات، داوای مۆڵەتی لێدەکردم تا بزانێت ئاخۆ لاریم هەیە یان نا، منیش هەموو جارێ هەمان وەڵامیم دەدایەوە، "بێگومان دەتوانیت، تۆ مێردی منیت".

بە درێژایی ڕۆژەکە بەوپەڕی بێئارامییەوە چاوەڕێم دەکرد و لە خودا دەپاڕامەوە کە لەم سەردانەیدا ژن و مێردایەتییەکەمان ببێتە ڕاستی، بەڵام کە لە دەرگای ژوورەکەمی دەدا، بۆم دەردەکەوت هەموو ئەوەی دەیهەوێ بیکات، ئەوەیە قسەم بۆ بکات. کە پێکەوە دەمانخوێندەوە چێژێکی زۆری وەردەگرت. پێکەوە قەیس و لەیلا، شیرین و فەرهاد، یوسف و زولێخا، گوڵ و بولبولمان خوێندەوە کە عەشقی یەکتر بوون و ئاستەنگی زۆریان بینیوە. هەرچەندە هێز

و توانای شاکەسەکانی ئەم چیرۆکانە وای لێدەکردم خەمبار بم، ڕەنگە هەر لەبەر ئەوەش بووبێت لە ناخەوە دەمزانی وەک ئەوان قەت تامی عەشق ناکەم.

ئەو کاتانەی چیرۆکمان نەدەخوێندەوە، شەمس دەربارەی چل ڕێساکەی سۆفییە گەڕیدە موسڵمانەکان قسەی دەکرد – میتۆدە بنچینەییەکانی ئایینی عەشق.

جارێ لەو جارانە سەری خستە باوەشمەوە و یەکێ لەو بنەمایانەی بۆ لێکدەدامەوە. لەسەرخۆ چاوەکانی خستە سەر یەک و دەنگی ئەوەندە کپ بووەوە، تا بوو بە چپە و خەوی لێکەوت. پەنجەکانم بەنێو قژە درێژەکەیدا دەهێنا و لێوەکانم خستە سەر تەوێڵی و ماچم کرد. وا دیاربوو پێش ئەوەی چاوەکانی هەڵێنێت ڕۆژگارێک بەسەرچووە، ئیدی بەرەو خۆی ڕایکێشام و بە ناسکی ماچی کردم. ئەوە نایابترین و خۆشترین سات بوو کە پێکەوە بەسەرمان برد، بەڵام ئەمە هەموو شتەکە بوو و تا ڕۆژی ئەمڕۆمان هێشتا جەستەی ئەو بۆ من کیشوەرێکی نەدۆزراوەیە، هەروەها جەستەی منیش بۆ ئەو بە هەمان شێوەیە.

لە ماوەی ئەو حەوت مانگەدا، منیش چەند جارێ بۆ ژوورەکەی چووم و هەموو جارێ لە ناخافڵی سەردانیم دەکرد و دڵم لە پەژارەدا دەگوشرا، لەبەر ئەوەی نەمدەزانی چۆن پێشوازیم دەکات، چونکە مەحاڵە تەبیاتی دەمدەمی شەمس پێشبینی بکرێ. وا دەبوو هەندێ جار گەرموگوڕ و خۆشمەشرەب بوو و هەموو خەمەکانم بیردەچوونەوە، هەندێ جاریش گرژومۆن بوو. جارێ لەو جارانە دەرگای ژوورەکەی بە ڕوومدا داخست و هاواری کرد کە دەیهەوێ بە تەنیا بێت. ئیدی منیش ڕاهاتم کە هەست بە سووکایەتی نەکەم، هەروەها فێر بووم کاتێ نوقمی نێو بیرکردنەوە دەبێت، تەنگەتاوی نەکەم.

دوای تێپەڕبوونی چەند مانگێک بەسەر زەماوەندەکەماندا، خەریک بووم وا خۆم پیشان دەدا کە من بە دۆخی خۆم قایلم، ڕەنگە ئەمەم بەرانبەر بە خۆم زیاتر پیشان دابێت وەک لەگەڵ کەسانی تردا. ئیدی خۆم ناچارکرد کە شەمس بە مێردێک دانەنێم، بەڵکو بە هاوڕێیەک، دۆستێک، گەورەیەک، هاوەڵێک، بەڵکو تەنانەت بە کوڕێکی خۆمی دابنێم. دیدگای من بۆ شەمس بە

جۆری سەرودڵی و بە دۆخی ئەو ڕۆژەوە بەند بوو کە تێیدا یەکترمان دەبینی، بۆیە بەردەوام لە خەیاڵی خۆمدا جلێکی جیام لە بەر دەکرد.

بۆ ماوەیەک لەم شتەدا سەرکەوتم و بەبێ ئەوەی چاوەڕێی شتی زۆر بکەم، لەو قسانەی کە لە نێوانماندا دەکران ورد دەبوومەوە. کە بیرکردنەوەکانمی بە هەند وەردەگرت و هانی دەدام بیرکردنەوەم فراوان بکەم، هەستم بە بەختەوەری دەکرد. زۆر شتی لێوە فێربووم و وردەوردە تێگەیشتم کە من دەتوانم شتی دیکەی فێربکەم، وەک لەزەتی ژیانی ناو خێزان کە لەوەو پێش و تا ڕۆژی ئەمڕۆمان نەیچەشتبوو. دەمتوانی بیهێنمە پێکەنین لە کاتێکدا کەس نەیدەتوانی ئەوە بکات.

بەڵام ئەوە بەس نەبوو، چەند هەوڵم دا نەمتوانی لەو بیرکردنەوەیە ڕزگاربم کە ئەو خۆشی ناوێم. لەگەڵ ئەوەی دڵنیا بووم کە ئەو خۆشی ناوێم و مەبەستیشی نییە خراپەم لەگەڵدا بکات، بەڵام ئەوە شتێک نەبوو لە خۆشەویستییەوە نزیک بێت. ئەو بیرکردنەوەیە ئەوەندە ترسناک بوو تا ئەو ڕادەیەی خەریک بوو لە ناوەوە هەڵی دەکۆڵیم و لە جەستە و ڕۆحمی دەخواردەوە. ئیدی لە هەموو ئەوانەی دەوروبەرم دوورکەوتمەوە، دەستەخوشکەکانم و ژنە دراوسێکان. حەزم دەکرد لە ژوورەکەمدا بمێنمەوە و لەگەڵ مردووەکاندا قسە بکەم، چونکە مردووەکان بە پێچەوانەی زیندووەکان، بڕیارت بەسەردا ناسەپێنن.

جگە لە مردووەکان، گوڵی بیابان تاکە دەستەخوشکم بوو. تاقە ویستێک یەکی خستبووین ئەویش ئەوە بوو کە لە چاوی خەڵکی دوور دوور بکەوینەوە. ئەوەبوو دوای ئەوەی بوو بە سۆفی و ژیانی گۆشەگیریی هەڵبژارد، دوای ئەوەی سۆزانیخانەکەی بەجێ هێشت، بووین بە دوو دەستەخوشکی گیانی بەگیانی. ڕۆژێکیان پێم وت کە من ئێرەیی بە بوێرییەکەی و بەو پلانەی دەبەم کە ئاوها ژیانێکی نوێی دەست پێکردووەتەوە.

سەری بادا و گوتی: "بەڵام من ژیانێکی نوێم دەست پێ نەکردووە. تاکە شتێک کە کردوومە ئەوەیە پێش ئەوەی مردن یەخەم بگرێت، من مردووم".

* * *

ئەمرۆ بە بۆنەیەکی تەواو جیاوازەوە بۆ سەردانی گوڵی بیابان چووم. ئەوە بوو بڕیارم دا خۆم بەرزەوت بکەم و بە هێمنی قسەی لەگەڵدا بکەم، بەڵام هەرئەوەندە چوومە ژوورەکەیەوە، لە سەلاّی گریانم دا.

لێی پرسیم: "کیمیا، خۆ هیچ نەبووە؟".

گوتم: "هەست بە جۆرە شەکەتییەک دەکەم، پێم وایە کە من پێویستم بە یارمەتیی تۆیە".

گوتی: "دڵنیابە. لە چ ڕوویەکەوە دەتوانم یارمەتیت بدەم؟".

"شتەکە پەیوەندیی بە شەمسەوەیە، ئاخر ئەو توخنم ناکەوێت، مەبەستم ئەوەیە بەو شێوەیە نییە"، قسەکانم بە پچڕپچڕی کرد، بەڵام بەمە کۆتاییم پێ هێنا: "دەمەوێ خۆم بۆی سەرنجڕاکێش بکەم، دەمەوێ فێرم بکەیت کە چۆن ئەوە بکەم".

گوڵی بیابان هەناسەیەکی هەڵکێشا و وتی: "کیمیا، سوێندم خواردووە"، لە دەنگیدا ڕیتمێکی ماندوویێتی دیاربوو، "بەڵێنم بە خودا داوە کە بە پاکی بمێنمەوە و بیر لەو ڕێگەیانە نەکەمەوە کە ئافرەت تێیدا لەزەت بە پیاو دەبەخشێت".

"بەڵام سوێندەکەت ناشکێت، چونکە تۆ تەنها یارمەتیم دەدەیت"، بە پاڕانەوەوە پێم وت، "دەبێ فێری ئەوە ببم چۆن دڵی شەمس خۆش بکەم".

گوڵی بیابان وتی: "ئاخر شەمس پیاوێکی ڕۆشنفکرە"، وەک ئەوەی بترسێت کە یەکێک گوێی لێ بێت، دەنگی کپ کردەوە و لەسەری ڕۆیشت: "پێم وا نییە بۆ خۆ نزیکخستنەوە ئەمە شێوازێکی دروست بێت".

پێم وت: "ئاخر ئەو پیاوە، وا نییە؟ ئەی هەموو پیاوانیش کوڕانی ئادەم نین و ڕمۆدەی جەستە نین؟ ئیدی ڕۆشنفکربن یان نا، بە هەموانیش جەستە بەخشراوە، تەنانەت شەمسیش جەستەی هەیە، ئێ وا نییە؟".

"بەڵێ، بەڵام..."، گوڵی بیابان بەدەم قسەوە تەسبیحەکەی بە دەستەوە گرت و دەنگ دەنگ تەسبیحاتی پێدەکرد و سەری بەردایەوە و کەوتە بیرکردنەوەوە.

"تکات لێدەکەم"، بە پاڕانەوەوە پێم وت، "تۆ تاقە کەسێکیت کە دەتوانم نهێنیی خۆمت لە لا بدرکێنم و دەردی دڵی خۆمت بۆ هەڵبڕێژم. ئەوە حەوت

مانگ بەسەر هاوسەرگیرییەکەماندا تێپەڕیوە، هەموو بەیانییەک کە لە خەو ڕادەبم هەست بە هەمان قورسیی سەر سینگم دەکەم و هەموو شەوێکیش بەدەم گریانەوە خەوم لێدەکەوێت. ئاخر ناکرێ شتەکان ئاوها بەردەوام بن، گەرەکە فێری ئەوە ببم کە چۆن بتوانم مێردەکەم لەخشتە ببەم".

گوڵی بیابان هیچ شتێکی نەوت. پەچەکەم لادا و سەریم‌گرت و ناچارم کرد تەماشام بکات، پێموت: "بەڕاستی پێم بڵێ، ئایا من بەو ڕادەیە ناشیرینم؟

"کیمیا، بێگومان نەخێر، تۆ کچێکی جوانیت".

"کەواتە یارمەتیم بدە. فێرم بکە چۆن بتوانم دڵی شووەکەم بهێنمە جۆش"، بە جەختەوە ئەمەم وت.

"ئازیزم، ڕێگەی بەرەو دڵی پیاو ڕەنگە هەندێ جار ئافرەت بەرەو دوور لە خودی خۆی ڕابماڵێت"، گوڵی بیابان بە نائومێدییەوە ئەمەی وت.

وتم: "بەلامەوە گرینگ نییە، من ئامادەم تا ئەوپەڕی دوور بڕۆم".

# گوڵی بیابان

## قۆنیا، کانوونی یەکەم ١٢٤٧

بەدەم گریانەوە هەر لێم دەپاڕایەوە تا یارمەتیی بدەم. دەموچاوی هەڵاوسابوو و بە توندی سینگی دەهەژی، تا لە کۆتاییدا قایل بووم یارمەتیی بدەم. هەرچەندە توانیم هێوری بکەمەوە، بەڵام لە ناخەوە دەمزانی کە هەموو ئەوانە دادێک نادەن و دەشمزانی دەبێت خۆم ڕادەستی ئارەزووی ئەو بکەم. لە خۆم پرسی چۆن پێشبینیی ئەم کارەساتانەم نەکردبوو؟ هەستکردن بە گوناه هەلاهەلای دەکردم و پرسیم چەند ساویلکە بووم و ئەوەم لە بەرچاو نەبوو کە شتەکان ئەم ڕێچکە پێچاوپێچە ترسناکە دەگرن؟

بەڵام کاتێ بۆ لام هات و داوای کۆمەکی لێکردم، نەمتوانی داواکەی ڕەت بکەمەوە.

"فێرم بکە، لێت دەپاڕێمەوە"، بەدەم قسەوە دەپاڕایەوە، وەک کچێکی ئابڕوومەند بە سەلاری و سەنگینی دەستەکانی لە کۆشیدا تێک پەڕاندبوو، ڕیتمی دەنگی ئەوەی دەگەیاند کە ئیدی هیچ ئومێدێکی نەماوە.

قەیدی چییە؟ لە خۆمم پرسی و ئەوەندە بەزەییم پێیدا هاتەوە دڵم پێی سووتا، چونکە دەیەویست لە بەرچاوی مێردەکەی خۆی شیرین بکات، نەک لە بەرچاوی پیاوی نەناس! تاقە بیانوویشی خۆشەویستی بوو، بۆیە لەو کارەدا نەنگییەک نییە، ڕەنگە سۆزەکەی بەجۆش بێت، بەڵام بە حەڵاڵی نەک بە حەرامی، ئێ وا نییە؟ هەستی خۆشەویستی بەحەڵاڵی.

شتێک لە ناوەوەمدا لە تەڵەیەک ئاگاداری کردمەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی کە خودا هەر خۆی ئەم سۆزەی تێدا دروست کردووین، ئیدی بە خراپم نەزانی

یــارمەتیی کیمیــا بــدەم، ئەم کــچە لادێــیە ســاکارە کە خەیــاڵی هەر لای خۆڕازاندنەوە و دەست لەخەنەگرتنە.

فێرم کرد چۆن وا لە خۆی بکات سەرنجڕاکێش و جوان بێت. شاگردێکی گوێڕایەڵ بوو و پەرۆشی فێربوون بوو. پیشانم دا چۆن گەرماوێکی بۆندار و دووورودرێژ بکات و چۆن دەتوانێت بە ڕۆن و مەرهەمی بۆندار پێستی خۆی تەڕوبڕ بکات، چۆن بە شیر و هەنگوین ماسکێک دروست بکات. چەند دەنکێک قەنەفڵم پێدا تا لە پەلکەکانی پرچی بدات بۆ ئەوەی بەردەوام بۆنێکی خۆشی لێ بێت: لـووتەوانە، بۆنخۆشکە، چەپکەگوڵی چیا، زەنجەفیل، گـوڵەزەنبەق و گوڵە یاسەمین و ڕۆنی زەیتوون – فێرم کرد کە چۆن هەر یەکێ لەمانە بەکار بێنێت و دەبێ لە شەودا کام جۆرە بخوور بسووتێنێت، ئینجا پیشانیم دا چۆن ددانەکانی سپی بکات و نینۆکەکانی هەردوو دەستی و هەردوو پێی بە خەنە ڕەنـگ بکـات، چـۆن چاوەکـانی بە کـل بڕێژێـت و برۆکـانی هەڵبگرێـت، چـۆن لێوەکانی و گۆناکانی سووراو بکات، چۆن وا لە پرچی بکات جوان و وەک ئاوریشم دیاربێت، چۆن وا لە مەمکەکانی بکات گەورەتر و خڕتر دەربکەون. ئیدی پێکەوە بۆ بازاڕ بۆ دوکانێک ڕۆیشتین کە لەوەوپێش هـاتوچۆیم دەکرد. چەند جلێکی ئاوریشممان بۆی کڕی، هەروەهـا جلی ئاوریشمیی ژێرەوشمان بـۆی کـڕی، شـتهایەک کە لە ژیانیـدا نە بینـی بـووی و نە دەسـتی بەریـان کەوتبوو.

ئینجـا فێـرم کـرد کە چـۆن لە بەردەم مێردەکەیدا سـەمابکات و چـۆن ئەم جەسـتەیە بەکـار بێنێـت کە خـودا لە لای خۆشەویـستی کـردووە. دوای دوو هەفتە فێرکردن، ئیدی ئامادە بوو.

لە عەسـری ئەو ڕۆژەدا، وەک چـۆن شـوان بەرخێـک بـۆ سـەربڕین ئامادەدەکـات، ئاوهـا کیمیـام بـۆ شەمـسی تەورێـزی ئامـادەکرد. سـەرەتا لە گەرماو خۆی شت و بە پارچە قوماشێک بە سابوون پێستی خـۆی هەڵگلۆفی و پرچی بە ڕۆن چەورکرد، ئینجا یارمەتیم دا جلێک لە بەر بکات کە ئافرەت تەنها بۆ مێردی خۆی لە بەری دەکات. دوایی ملوانکەیەکم لە ڕەنگی گێلاس

بـۆی هەڵبـژارد لەگەڵ عەبـایەکی گوڵگـوڵی کە بە گـوڵی یـاقووت زێڕکەفـت کرابوو، لەوجۆرەی کە مەمکەکانی بە خڕی و قوتی دەردەخـات. لە کۆتاییـدا دەموچاوی بە توێژێک بۆیە جوان کرد، سەرباری ئەوەش وەک دواڕازاندنەوە ڕستێک مرواریی بە دەوری تەوێڵیدا دانا. ئیدی ئەوەندە جوان دەهاتە بەرچاو، تەنانەت من بۆخۆم نەمتوانی چاوی لەسەر هەڵبگرم.

کە تەواوبووین، ئیدی کیمیا ئەو کچە شەرمن و بێئەزموونە نەبوو، بەڵکو ئافرەتێک بوو لە عەشق و ئەڵهادا گڕی گرتبوو، ئافرەتێک بـوو ئامـادەبوو بۆ ئەو پیـاوەی کە خۆشـی دەویـست هەرچـی کـارێکی بـوێرانەیە بیکـات و گەر پێویستی کرد باجەکەیشی بدات. وەسـتابووم و دیقەتیم دەدا، ئەو سـوورەتەم هاتەوە یاد کە لەقورئانی پیرۆزدا باسی یوسف و زولێخا دەکات.

هەروەک کیمیـا، زولێخـاش ئـارەزوویەکی سەرکێـشانەی بـۆ ئەو پیـاوە هەبوو کە بەپیر عەشقەکەیەوە نەدەچوو. **(وقال نسوة فی المدينة امرات العزيز تراود فتها عن نفسه قد شغفها حبا انا لنريها فی ضلل مبين* فلما سمعت بمكرهن ارسلت اليهن واعتدت لهن متكئا واتت كل واحدة منهن سكينا وقالت اخرج عليهن فلما راينه اكبرنه وقطعن ايديهن وقلن حاش لله ماهذا الا ملك كريم)**.**

کێ گازاندە لە زولێخا دەکات کە بەو ڕادەیە عاشقی یوسف بووە؟ "چۆن دەردەکەوم؟"، کیمیا پێش ئەوەی پەچەکەی بپۆشێت و پێش ئەوەی بڕوات، بە پەژارەوە لێی پرسیم.

وتم: "نازداریت. ئیدی تەنها هەر ئەمشەو نایەتە لات، بەڵکو سبەینێش ئەوە دەکات و داوای زیاتِرت لێدەکات".

---

* ژنانی شار قاویان داخست: ژنەکەی عەزیز حەز لە خزمەتکارەکەی خۆی دەکات، لە دڵداریدا سووتاوە، وا دیارە تەواو لە ڕێ دەرچووە.

** دوای ئەوەی تانەوتەشـەری ئەوانـی بیـست، لەدووی نـاردن، بـاڵگە و خـواردەمەنی لا دانـان و هەریەکەیان چەقۆیەکی پێدان. وتی: بۆیان وەرە دەرێ. کە دیتیان حەپەسـان و دەسـتی خۆیـان بڕی و وتیان: ئەی نامەخوا! ئەمە بنیادەم نییە و بێگومان فریشتەیەکی خۆشەویستە.

لە لێکدانەوەی ئەم سوورەتەدا سوودم لە وەرگێڕانەکەی هەژاری موکریانی وەرگرتووە. (و .ک).

دەموچـاوی کیمیـا لە شـەرمان سـوور هەڵـگەڕا و گۆناکـانی گەشـانەوە. پێکەنیم و ئەویـش لەگەڵمـدا پێکەنـی و وەک خـۆرێکی تـازە هەڵاتـوو گەرمـی کردمەوە.

ئەوەی دەموت بە ڕاستیم بوو، چونکە دڵنیا بووم وەک چۆن گوڵێکی پڕ لە هەڵاڵە هەنگ ڕادەکێشێت، ئاوها شەمس بۆخۆی پەلکێش دەکات. پێش ئەوەی دەرگاکە بکاتەوە، چاوەکانمان ئامبازی یەکتربوون و گومانێکم لە نیگایدا بەدی کرد، لەناکاو هەستم کرد دڵم هەڵدەشێوێت، ڕەنگە مەزەندەی ڕوودانی شتێکی نالەبار بوو‌بێت.

بەڵام ڕام نەگرت. ئـاخر دەبـوو بـزانم چـی ڕوودەدات. دەبـوو چـاوەڕێی ڕوودانی ئەوە بم. ئیدی بە درێژایی ژیانم لە خۆم خۆش نابم.

# کیمیا

## قۆنیا، کانوونی یەکەم ١٢٤٧

بەوێر و زیرەکێکی وەک شەمسی تەورێزی لێوانلێوبوو لە چالاکی، دەربارەی خۆشەویستی زۆری دەزانی، بەڵام ئەو شتەی کە نەیدەزانی: ئازاری خۆشەویستی یەکلایەنە بوو. لە ئێوارەی ئەو ڕۆژەی کە گوڵی بیابان ڕازاندمییەوە، لەو باوەڕەدا نەبووم کە ئاوها تژی بم لە وروژاندن و بوێری، ئاخر ورشەی جلە ئاوریشم و نەرمەکەی بەرم و بەو بۆنی عەترەی کە لێم دەهات و بەو تامی پەڕەی گوڵەی سەرزمانم، وەک ئافرەتێکی گێل دەردەکەوتم، بەڵام وایشیان لێ کردبووم هەست بە ئازایەتییەکی نائاسایی بکەم. کە بۆ ماڵەوە گەڕامەوە وێنەی خۆم لە پارچە شووشەکەدا بینی. جەستەم نە کووڕ بوو و نە شیری، مەمکەکانمیش وەک خۆم حەزم دەکرد پێ نەگەیشتبوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا جوان دیاربووم.

چاوەڕێم کرد تا دڵنیا بووم کە هەموو ئەوانەی لە ماڵەکەدان خەویان لێکەوتووە، ئینجا شاڵێکی درێژ و ئەستوورم بە سەر شانمدا دا و لەسەر نووکی پەنجەکانم بەرەو ژوورەکەی شەمس ڕۆیشتم.

"کیمیا چاوەڕێی هاتنتم نەدەکرد"، شەمس ئەوەی بەدەم دەرگاکردنەوەوە گوت.

"دەمەوێ بتبینم"، پێش ئەوەی فەرمووی هاتنەژوورەوەم لێ بکات، چوومە ژوورەوە، لەسەری ڕۆیشتم، "بە یارمەتیت دەرگاکە دابخە".

شڵەژانێک کەوتە سەر دەموچاوی شەمس، بەڵام داواکەمی جێبەجێ کرد.

که له ژوورەکەدا هەردووکمان بە تەنیا بووین، ئاتاجی چەند چرکەیەک بووم تا زات وەبەرخۆ بنێم. پشتم تێکرد و هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشا، بە جووڵەیەکی خێرا شاڵەکەم و ملوانکەکەم داکەند. لەسەر پشتم هەر لە ملمەوە تا پاژنەی پێیەکانم هەستم بە قورسایی چاوە ئەبڵەقبووەکانی شووەکەم کرد. هەستم کرد گەرمییەک بەو شوێنانەدا تێدەپەڕێت کە ئەو تەماشای دەکردن، بەڵام ئەوەندەی نەبرد لە جێگەی ئەو هەست بە گەرمیکردنە، ئیدی بە ڕاستی بوو یان خەیاڵکردە بێدەنگییەکی ساردوسڕ باڵی بەسەر ژوورەکەدا کێشا. لەڕکاتێکــدا لە چاوەڕوانیــدا ســینگم دەهەژی، بە ڕووتوقــووتی وەک ئەو پەرییانەی بەهەشت کە باسیان دەکەن، بەرانبەر شەمس وەستام.

لە سێبەری ئەو بێدەنگییەدا، وەستاین و گوێمان بۆ لوورە و گڤەی بایەکە هەڵخست کە لەناو شارەکەوە هەڵدەستا.

"ئەوە تۆ خەریکی چی بکەیت؟"، بە ساردییەکەوە لێی پرسیم.

هەوڵێکی زۆرم دا تا دەنگی ونبووی خۆم بدۆزمەوە، لێ لە کۆتاییدا توانیم بڵێم: "من تۆم دەوێ".

شەمس بە شێوەی نیوەبازنە بە دەورمدا سووڕایەوە، ئینجا ڕووبەڕوو بەرانبەرم وەستا و وای لێکردم ڕاستەوخۆ تەماشای چاوەکانی بکەم. هەستم کرد چۆکەکانم شل بوون، بەڵام دانەڕمام، بەڵکو بەرەو لای هەنگاوم نا و فشاری جەستەم خستە سەر جەستەی و هەروەک گوڵی بیابان فێری کردبووم کەمەکێک پێچم خوارد، تا گەرمیی جەستەمی پێ ببەخشم. دەستم بە سینگیدا هێنا و چەند پەیڤێکی عاشقانەی ناسکم بە گوێیدا چپاند و پەنجەکانم بە سەروخواری پشتە بەهێزەکەیدا هێناوبرد و بۆنی عەترئاسایم هەڵمژی.

ئیدی شەمس وەک ئەوەی گڕی ئاگری کوانوویەکی بەرکەوتبێت، لەپڕ کشایەوە و گوتی: "وا تێدەگەم کە تۆ ئارەزووت لە منە، بەڵام ئەوەی دەتەوێ ڕازیکردنی لەخۆباییبوونتە".

هەردوو باسکم لە گەردنی وەرێنا و ماچێکی گەرموگوڕم کرد. هەر وەک گوڵی بیابان پێی وتبووم، زمانم خستە ناو دەمی و جار لەدوای جار پاڵم پێوەدەنا: "کیمیا، پیاوان حەزدەکەن زمانی ژنەکانیان بمژن، هەموو پیاوان ئەوە دەکەن".

لێوەکانی تامی توویان لێدەهات، مزربوون، بەڵام هەرئەوەندە هەستم کرد کە گێژەڵووکەی چێژ خەریکە لە یەکتر توندمان دەکات، شەمس وەستاندمی و خستمییە لاوە، ئینجا وتی: "کیمیا، لێت نائومێدبووم"، ئینجا لەسەری ڕۆیشت: "تکات لێدەکەم هەر ئێستا بە تەنیا جێم بهێڵە".

هەرچەندە قسەکانی ڕەق بوون، بەڵام هیچ تووڕەبوونێک بە دەموچاوییەوە دەرنەکەت. جا نەمزانی کامیان زۆرتر هەستمی بریندارکرد: قسە ناخۆشەکانی، یان نەبوونی هیچ جۆرە دەربڕینێک لە دەموچاویدا.

ئەوە لە ژیانمدا ناخۆشترین سووکایەتییەک بوو کە تووشی بووم. داچەمامەوە تا ملوانکەکەم هەڵبگرم، لێ دەستەکانم دەلەرزین و نەمتوانی دەستم لێی گیربێت، شاڵەکەم هەڵگرت و خۆم پێی داپۆشی. لە کاتێکدا هێشتا هەنسکم دەدا و هەناسەبڕکێم پێکەوتبوو و هێشتا نیمچە ڕووت بووم، بەرەو دەرەوەی ژوورەکە ڕامکرد و لەو عەشقە دوورکەوتمەوە کە ئێستا زانیم لە خەیاڵی خۆم زیاتر هیچ بوونێکی نییە.

* * *

دوای ئەوەی هەرگیزاوهەرگیز شەمسم نەدیتەوە، ئیدی لەو ڕۆژە بەدواوە لە ژوورەکەم نەچوومە دەرەوە و هەموو کاتی خۆم بە ڕاکشاوی لەسەر جێگەکەم بەسەر دەبرد. ئاخر توانا و ویستێکی دەویست تا لە ژوورەکەم بێمە دەرەوە. هەفتەیەک ڕابرد، ئینجا هەفتەیەکی تر و دوای ئەوە وازم لە ژماردنی ڕۆژەکان هێنا. هەموو هێز و توانایەکم لەبەر بڕابوو و وردەوردە گلۆردەبوومەوە، جگە لە ناولەپی دەستەکانم کە هێشتا یادی بەرکەوتنی دەست و پێستی گەرمی شەمسیان تێدا مابوو، ژیان هیچ بوونێکی نەمابوو.

نەمدەزانی مردن بۆنی هەیە، بۆنێکی توند وەک بۆنی زەنجەفیلی سوێرکراو و بۆنی دارسەروویەکی شکاو، بۆنی تیژوتاڵە، بەڵام ئەوەندەش

خراپ نییه. تا ئەو دەمەی لەناو ژوورەکەمدا بۆنی دەرنەچوو و وەک تەمێکی چڕوشێدار دای ئەنپۆشیم، نەمدەناسی. تایەکی گەرم دایگرتم و خەریکبوو بەرەو هەڵدێری وڕێنەکردن دەخزام، خەڵکی دەهاتن سەریان لێدەدام، دراوسێکان و دەستەخوشکەکانم. کیرا لە لایەکی جێگەکەم دەوەستا و چاوەکانی هەڵاوسابوون و ڕەنگی زەرد هەڵگەڕابوو، گەوهەر لە لایەکەی ترەوە وەستابوو و وەک جاران بە لۆچە جوانەکەی لا لێوییەوە زەردەی دەهاتێ.

سەفییە گوتی: "نەفرەت لەو خوانەناسە. ئاخر ئەم کچە بەستەزمانە لە حەسرەت و داخدا لەدڵی دا و نەخۆش کەوت. هەمووی بەوای ئەوەوەیە".

هەوڵم دەدا زۆر لە خۆم بکەم تا قسەبکەم، بەڵام دەنگم هەر ئەوەتا لە گەرووم دەردەچوو.

"چۆن دەتوانیت وا بڵێیت؟ بۆچی ئەو خودایە؟"، کیرا وای پێگوت،"ئاخر چۆن دەتوانیت ئەم توانایە بدەیتە پاڵ مرۆڤێک کە خۆی لەناودەچێت؟".

ئافرەتەکان گوێیان لە کیرا نەدەگرت و منیش لە دۆخێکدا نەبووم بتوانم وەڵامی هەموو شتێکی ئەوان بدەمەوە. ئەوەندەی نەبرد ئیدی زانیم من قسەبکەم یان نەیکەم، هیچ شتێ ناگۆڕێت، چونکە ئەو کەسانەی کە خۆشییان بە شەمسدا نایات هۆکارێکی تر بۆ نەخۆشییەکەم دەدۆزنەوە تا ڕقی خۆیان پێی دەربکەن، بەڵام من گەر ئەو شتەشم بوێ، ناتوانم ڕقم لێی ببێتەوە.

ئەوەندەی نەبرد بەرەو عەدەم ڕامالْرام، بە جۆرێ هەموو ڕەنگەکان ون بوون و سپی هەڵگەڕان، هەموو دەنگەکان کپ بوون و بوون بە دەنگێکی ویزەویزاسای بەردەوام، ئیتر دەموچاوی خەڵکەکەم بۆ جیانەدەکرایەوە و ئەو دەنگانەم نەدەژنەوت کە دەوتران، تەنها ورتەورتێک بوون و لە دوورەوە دەهاتن.

نازانم ئاخۆ شەمس بۆ ژوورەکەم هات تا سەرم لێ بدات یان نا، ڕەنگە قەت بۆ سەردانم نەهاتبێت. ڕەنگە ویستبێتی بمبینێت، بەڵام ئافرەتەکانی نێو ژوورەکە ڕێگەیان نەداوە بێتە ژوورەوە تا بمبینێت، ڕەنگە هاتبێت و بە

تەنیشت جێگەکەمەوە دانیشتبێت و چەندین سەعات نای بۆ ژەنیبم و دەستی گرتبم و درووودی بۆ ڕۆحم خوێندبێت. دەمهەوێ بڕوا بەوە بکەم، بەڵام ئیدی هیچ شتێ گرینگ نییە، ئیدی نە لێی تووڕەم و نە ڕقم لێیەتی. ئاخر منێک لە جۆگەلەیەکی بەئاگایی تەواودا هەڵبقوڵێم، چۆن دەتوانم ئاوها بم؟

خودا دەهەندە و دلۆڤانە، بۆ هەر شتێ لێکدانەوەیەک هەیە، لە پشت هەموو ئەوانەوە سیستەمێکی نموونەیی هەیە. دوای دە ڕۆژ لەو سەردانەی کە بۆ ژوورەکەی شەمس کردم و ملوانکەیەکی ئاوریشمی بۆن عەترم لە مل بوو، نەخۆشکەوتم و لەنێو ڕوباری عەدەم و نەبوویەکی تەواودا نوقم بووم و بە ئارەزووی خۆم مەلەم دەکرد. لە کۆتاییدا زانیم کە ئەم هەستە لە قووڵیی خوێندنەوەی قورئاندا بنیادەم دادەگرێت – نوقمبوون لە ناکۆتاییدا.

ئاخر ئاوە هەڵقوڵاوەکان بوون کە منیان لە ژیانەوە بەرەو مردن گواستەوە.

# ئێلا

## بۆستن، ٣ی تەمموز ٢٠٠٨

بۆستن وەک ئێلا بە خۆی گوت جاران وەک ئەمڕۆ بە ڕەنگوڕوو نەبوو و ژیانی لێ هەڵنەدەقوڵا. ئایا ئەم هەموو ماوەیە من کوێر بووم کە جوانیی شارەکەم نەدەبینی؟ عەزیز پێنج ڕۆژی لە بۆستن بەسەربرد. ئێلا هەموو ڕۆژێ لە نۆرتامبتۆنەوە بۆ بینینی بۆ بۆستن دەڕۆیشت. نیوەڕۆژەیەکی سادە و بەلەزەتیان لە گەڕەکی (ئیتالیای بچووک) دەکرد و سەردانی مۆزەخانەی هونەرەجوانەکانیان دەکرد، ئینجا لە باخی گشتیی بۆستن لە کەناری ڕووبارەکە پیاسەیان دەکرد و تەماشای نەهەنگی نێو حەوزی ماسییان دەکرد و لە قاوەخانە بچووکەکان لە گۆڕەپانی هارفرد کە لە خەڵکی جمەی دەهات کوپ لەدوای کوپ قاوەیان دەخواردەوە و دەربارەی بابەتی هەمەجۆر قسەیان دەکرد، وەک خواردنە ناوخۆییەکان و شێوازە جیاکانی ڕامان و هونەرەکان لای تیرەکانی هندۆکە سوورەکان و حەکایەتەکانی قوتبییەکان و تەماشاکردنی باڵندە و باخداری و چاندنی تەماتە و لێکدانەوەی خەونەکان.

ئیدی هەریەکەیان قسەی ئەوی تری دەبڕی و ئەوی تر لەکوێوە دەستی پێکردبوو، ئەم بۆی تەواودەکرد. ئێلا لە یادی نییە بە درێژایی ژیانی لەگەڵ هیچ کەسێکدا ئەوەندە قسەی کردبێت.

کاتێ بەرەو شەقامەکە دەردەچوون، ئاگایان لەوە بوو کە یەکێکیان بەر ئەوی تر نەکەوێت، بەڵام بۆ هەردووکیان دەرکەوت کە ئەوە خەریکە زیاد لە پێویست قورس دەبێت و ئەو کەلەبەرە بچووکانەش ورووژێنەر بوون. ئەوەبوو ئێلا ئەڵهای ئەوەی دەکرد کە دەستیان بەریەک بکەوێت. بوێرییەکی سەیری پەیداکردبوو و نەیدەزانی بۆ گرتنی دەستی عەزیز و ماچکردنی

لێوەکانی ئەو زاتەی هەیە، جا لە چێشتخانە بوونایە یان لەسەر شەقام، گوێی بەوە نەدەدا کە یەکێ ببینێت، بگرە خەریک بوو هەست بکات هەندێ حەزیشی دەکرد کە ببینرێ. چەندین جار پێکەوە بۆ هۆتێل دەگەڕانەوە و لە هەموو جارێکدا لەوە نزیک دەبوونەوە کە کاری سێکسی بکەن، بەڵام قەت ئەوەیان نەکرد.

بەیانیی ئەو ڕۆژەی کە عەزیز بە فڕۆکە بۆ ئەمستردام سەفەری دەکرد، هەردووکیان لە ژوورەکەی عەزیز بوون و جانتاکەی لە نێوان هەردووکیان دانابوو و وەک نوقڵانەیەکی شووم کە نزیکبوونەوەی لێکدابڕانیان بیربخاتەوە، قیت بووبووەوە.

ئێلا پێی وت: 'دەمەوێ شتێکت پێ بڵێم کە ماوەیەکی زۆرە بیری لێدەکەمەوە'.

عەزیز دوای ئەوەی زانیی گۆڕانێکی کتوپڕ لە دەنگی ئێلا دەرکەوت، یەکێ لە برۆکانی هەڵبڕی و بە هۆڵەوەبوونەوە وتی: 'منیش دەمەوێ شتێکت پێ بڵێم'.

'دەی باشە یەکەم جار تۆ بیڵێ'.

'نەخێر، تۆ یەکەم جار بیڵێ'.

ئێلا بە بێدەنگی سەری بەردایەوە و هێشتا نیمچە زەردەخەنەیەک بە لا لێوییەوە بوو، بیری لەوە دەکردەوە کە چی بڵێت و چۆن بیڵێت، لە کۆتاییدا دەستی بە قسەکە کرد: 'پێش هاتنەکەت بۆ بۆستن، ئێوارەیەکیان من و دەیڤید پێکەوە دەرچووین وبە دووورودرێژی قسەمان کرد. ئەوە بوو پرسیاری تۆی لێکردم، چونکە دیاربوو بێ ئەوەی ئاگام لێ بێت نامەکانمانی خوێندبووەوە، بەوای ئەو کارەیەوە زۆر لێی تووڕە بووم، لێ من نکووڵیم لە ڕاستییەکە نەکرد، مەبەستم دەربارەی خۆمانە'.

ئەمێستا ئێلا چاوەکانی هەڵبڕی تا کاردانەوەی عەزیز سەبارەت بەوەی بۆی درکاند ببینێت، وتی: 'بەکورتی، بە مێردەکەم وت کە من پیاوێکی دیکەم خۆش دەوێ'.

لە دەرەوە شووتی چەندین ئۆتۆمبیلی ئاگرکوژێنەوە لە هەموو لایەکی شارەکەوە دەقی بێدەنگییەکەیان شکاند. ئێلا کەمێ خەیاڵ بردییەوە، بەڵام

ئەوەی کە بەتەمابوو بیڵێت تەواوی کرد: "دەزانم ڕەنگە شتەکە شێتانە بێتە بەرچاو، لێ بە وردی بیرم لە شتەکە کردەوە. دەمەوێ بۆ ئەمستردام لەگەڵتدا بێم".

عەزیز بەرەو پەنجەرەکە هەنگاوی نا و دەستی بە تەماشاکردنی ئەو جووڵە بزۆز و خێرایەی سەر شەقامەکە کرد. دووکەڵێکی بینی کە لە یەکێ لە تەلارە دوورەکانەوە هەڵدەستا – هەورێکی ڕەش و چڕ لە هەوادا چێ بووبوو، ئیدی خەریک بوو بە بێدەنگی نزای بۆ دانیشتوانی ئەو تەلارە دەکرد. کە هاتەوە قسە وەک ئەوەبوو تێکڕای شارەکە بدوێنێت.

"دەمهەوێ بۆ ئەمستردام لەگەڵتدابم، لێ ناتوانم بەڵێنی بانەڕۆژی ئەوێت پێ بدەم".

"مەبەستت چییە؟"، ئێلا بە دەمارگرژییەوە پرسیی.

ئەوسا عەزیز گەڕایەوە شوێنەکەی خۆی و بە تەنیشتییەوە دانیشت و بە خاوی دەستی خستە سەردەستی. لەو ساتەدا ختووکەی دەدا و بیری ڕۆیشتبوو، وتی: "سەرەتا کە بۆت دەنووسیم، یەکەم جار بوو لە ژیانمدا بە هەندێ کاتی سەیردا تێدەپەڕیم".

"ئایا مەبەستت ئەوەیە کە کەسێکی تر لە ژیانتدا هەیە...؟".

"نەخێر خۆشەویستم، نەخێر"، کەمێ زەردەخەنە گرتی، ئینجا زەردەخەنەکە ڕەوییەوە و لەسەری ڕۆیشت: "هیچ شتێک لەو بابەتە نییە. ئەوەبوو ڕۆژێکیان دەربارەی هەرسێ قۆناغەکەی ژیانم بۆم نووسییت، لە یادتە؟ ئەوەش هەرسێ پیتی یەکەمی پەیڤی (سۆفی) بوو و دەربارەی قۆناغی چوارەم لێت نەپرسیم، هەرچەند هەوڵیش بدەی، هەر پێت ناڵێم. گەیشتمە پیتی(ی). ئایا دەتەوێ ئێستا گوێت لێی بێت؟".

"بەڵێ"، ئێلا وەڵامی دایەوە، لەگەڵ ئەوەشدا لە هەر شتێ دەترسا کە لەگوێن بوو خۆشیی ئەم ساتە تێک بدات.

"بەڵێ، دەمهەوێ".

* * *

له ژوورێکی یەکێ له هۆتێلەکان له ڕۆژێکی مانگی تەمموزدا، عەزیز چەند سەعاتێ پێش ئەوەی بە فڕۆکە بۆ ئەمستردام بگەڕێتەوە، بۆ ئێلای گێڕایەوە کە چۆن لە ساڵی ١٩٧٧دا بووە بە سۆفی و ناوێکی تازەی لە خۆی ناوە و وەک خۆی ئاواتی بووە چارەنووسێکی تازەی بۆ خۆی دیاری کردووە. ئیدی لەوساوە وەک وێنەگرێکی پیشەکار و لە ناخدا دەروێشێکی گەڕیدە بە درێژایی و پانایی وڵاتەکەدا گەڕاوە. لە شەش کیشوەردا برادەرایەتیی گیانی بەگیانی لەگەڵ کەسانێکدا گرتووە کە بە ئەندامێک لە ئەندامانی خێزانەکانی خۆیانیان داناوە. لەگەڵ ئەوەی دووبارە ژنی نەهێناوەتەوە، بەڵام دوو منداڵی بێ دایک و باوکی لە ئەورووپای ڕۆژهەڵات هەڵگرتووەتەوە. عەزیز بۆ ئەوەی هەمیشە شەمسی تەورێزیی لە یاد بێت، لە ژیانیدا ئەو ملوانکەیەی لە ملی دانەکەنیوە کە وێنەی خۆری لەسەر هەڵکەنراوە، ژیانێکی پڕ لە سەفەر و خوێندنەوەی بەسەر بردووە و پەیڕەوی ڕێبازی دەروێشە سۆفییەکانی کردووە تا بگاتە ئەو ئاماژە و نیشانانەی کە لە هەموو شوێنێک و لە هەموو شتێکدا ئاماژە بە خودا دەدەن.

ئەوە دووساڵە بە نەخۆشییەکەی خۆی زانیوە. ئەوە بوو نەخۆشییەکە بە لوویەک لە بنهەنگڵی دەرکەوت، دیارە درەنگ هەستی پێکردبوو، دوایی پشکنینەکان دەریانخست کە لووەکە میلانۆمای پیسە و شێوەیەکی کوشندەیە لە شێرپەنجەی پێست. پزیشکەکان وتیان پێناچێت دۆخەکەی باش بێت، بەڵام بەرلەوەی لە دەستنیشانکردنی کۆتایی ئاگاداری بکەنەوە، دەبێ پشکنینی زیاتری بۆ بکرێ. دوای هەفتەیەک هەواڵی ناخۆشیان پێ ڕاگەیاند: ڕەنگە نەخۆشییەکە بە ئەندامەکانی هەناویدا بڵاوبووبێتەوە و سییەکانی گرتبێتەوە.

کە تەمەنی گەیشتە پەنجاودوو ساڵ، پێیان ڕاگەیاند کە ناگاتە تەمەنی پەنجاوپێنج ساڵی.

ئێلا لێوەکانی بزواند تا شتێ بڵێت، بەڵام وشەکان لە زاریدا قەتیس بوون و هەستی کرد دەمی وشکە. دوو دڵۆپە عەسر کەوتنە سەر گۆناکانی و خێرا سڕینییەوە.

عەزیز بە ڕیتمێکی بەهێز و باوەڕبەخۆبوونەوە لەسەر قسەکانی ڕۆیشت و وتی کە دەستی بە قۆناغێکی نوێی ژیانی کردووە و هەرچۆنێک بێت

بەرهەمدارترە. هێشتا هەندێ شوێن هەن کە دەیهەوێ بیانبینێت و لە ڕێگەیەک دەگەڕێت کە سەر لە هەموویان بدات. دەزگایەکی سۆفیگەریی لە ئەمستردام دامەزراند کە لق و پەیوەندیی نێودەوڵەتی هەیە. جا لەبەر ئەوەی حەزی لە ژەنینی نایە، ئەوەبوو لەگەڵ مۆزیکژەنە سۆفییەکاندا چەندین ئاهەنگی مۆسیقای لە ئەندۆنیسیا و پاکستان و میسر ساز دا و ئەلبوومێکی بۆ کۆمەڵێ سۆفیی جوولەکە و موسڵمانی لە قورتوبە لە ئیسپانیا ئامادەکرد.

ئینجا عەزیز بۆ مەغریب گەڕایەوە و سەردانی ئەو تەکیەیەی کرد کە لە ژیانیدا بۆ یەکەم جار چاوی بە ژمارەیەک لە سۆفییە ڕاستەقینەکان کەوت. ئەو کاتە ماوەیەکی زۆر بەسەر مردنی سەید سامیدا تێپەڕی بوو، بە تەنیشت گۆڕەکەیەوە نوێژی کرد و سرووتی ڕامانی جێبەجێ کرد و لەو ڕەوتەی سەید سامید وردبووەوە کە لە ژیانیدا پەیڕەوی کردبوو.

"بۆ نووسینی ڕۆمانەکە کە خەونم بە نووسینییەوە دەبینی، خۆم پەناگیر کرد، کە بەزۆری بەوای تەمەڵی یان زاتنەکردن نووسینیم دوادەخست"، عەزیز بە چاوداگرتنەوە گوتی: "وەک دەزانیت زۆر دەمێ بوو ئەوە یەکێک بوو لەو شتانەی کە دەمەویست بیکەم. ئیدی ناونیشانی (کفری شیرین)م بۆ ڕۆمانەکە دانا و لە ئەمریکا بۆ پەخشکارێکی ئەدەبیم نارد. چاوەڕێی زۆرم نەدەکرد و خۆمیش بۆ هەموو ئەگەرێک ئامادە کردبوو. دوای هەفتەیەک، لە بۆستنەوە بە پۆست نامەیەکی ئەلیکترۆنیی کاریگەرم لە ئافرەتێکەوە پێگەیشت کە نەمدەناسی".

ئێلا سووکە زەردەخەنەیەکی هاتێ کە نیشانەی سۆز و ڕێزگرتن و ناسکی و ئازاریش بوو.

عەزیز وتی لەو چرکەساتەوە هەموو شتەکان گۆڕان. ئیدی ئەو لە پیاوێکەوە کە خۆی بۆ مردن ئامادەکردبوو، بۆ پیاوێک گۆڕا کە لە کاتێکی چاوەڕواننەکراودا نوقمی نێو عەشق بوو. لەناکاو وای لێهات کە دەبوو هەموو ئەو پارچانە بجووڵێنێت کە وای دەزانی زۆر دەمێکە هەریەکەیانی لە شوێنی گونجاوی خۆیان داناوە: ڕەوانگەرایی و ژیان و خێزان و خۆلەنێوبردن و بڕوا و عەشق. پێی وا بوو کە دەبێ سەرلەنوێ بیر لە واتاکانیان بکاتەوە. ئیدی بەم جۆرە ویستی مردنی لە لا نەما.

ئەم قۆناغە نوێ و کۆتاییەی ناو ناوە گەیشتن بە پیتی (ی)ی لە پەیڤی (سۆفی) و گوتی ئەم قۆناغەی لە هەموو قۆناغەکانی پێشوو بە سەختتر زانیوە، چونکە لە کاتێکدا هاتووە، پێی وا بووە گەر بەسەر هەموویاندا زاڵ نەبووبێت، بەسەر زۆربەیاندا زاڵ بووە، ئەمەش وەک ململانێی ناوەوە وای بۆ دەچوو کە گەیشتووەتە قۆناغی پێگەیشتنی ڕۆحی.

"لە سۆفیگەریدا فێری ئەوە دەبیت چۆن پێش مردن بمریت. ئاخر من هەنگاوبەهەنگاو ئەو قۆناغانەم تاقیکردەوە. کاتێ خەریکبووم بیرم لەوە دەکردەوە کە من توانیومە بە شارەزاییەوە هەموو شتێ چارەسەر بکەم، لە ناخافڵدا ئەم ئافرەتەم لێ پەیدا بوو. ئەوە بوو بۆی دەنووسیم و وەڵامیم دەدایەوە. دوای هەر نامەیەک بە پەرۆشەوە چاوەڕێی وەڵامیم دەکرد، پەیڤەکان تا دەهات سەنگینتر دەبوون. ئیدی هەموو دنیا بوو بە شاشەیەکی سپی و بەتاڵ و چاوەڕێ بوو لەسەری بنووسرێ. وام لێهات ئارەزووی ناسینی ئەم ئافرەتە بکەم و کاتێکی زۆرتری لەگەڵدا بەسەرببەم. لەپڕ ئیدی ژیانم بەشی نەدەکردم و هەستم کرد کە من لە مردن دەترسم، بەشێکم ئامادەبوو لەو خودایە یاخی بێت کە بە گەورەم دەزانی و خۆم ڕادەستی کردبوو".

"کاتمان بەدەستەوە دەبێت..."، ئێلا بەدەم قسەکردنەوە دەنگی خۆی دۆزییەوە.

"پزیشکەکان پێیان ڕاگەیاندم گوایا شانزە مانگم ماوە"، عەزیز بە دەنگێکی کپ، بەڵام بە بڕواوە ئەمەی وت، "ڕەنگە بەهەڵەدا چووبن، یان ڕەنگە ڕاستیان وتبێت. ناتوانم ئەوە بزانم، هۆ ئێلا وەک دەبینیت هەموو ئەوەی پێم دەکرێ پێتی ببەخشم ئەم چرکەساتەی ئێستایە، لە ڕاستیدا کەس لەوە زیاتر شک نابات. خۆ حەزدەکەین لافی ئەوە لێ بدەین کە ئێمە لەوەی بەڕاستی هەمانە زیاترمان هەیە".

ئێلا تەماشای پێیەکانی خۆی کرد و وەک ئەوەی هاکا لایەکی هەرەس بێنێت و لایەکەی دیکەی خۆی ڕابگرێت، بەلادا لاربووە و لە سەڵای گریانی دا.

"نـا، تکـات لێدەکەم. دەمـهەوێ بـۆ ئەمـستردام لەگەڵمـدا بێیـت، دەمـهەوێ پێکەوە بە هەموو دنیادا سـەفەربکەین تـا وڵاتـانی دوور ببینین و گەلانـی دیکە بناسین و ڕێزی خەڵقەندەکانی خودا بگرین".

"ئەوە دێ نایاب بێت"، ئێلا مینا کیژۆڵەیەک بووکەڵەی ڕەنگاوڕەنگی پێ درابێ، بەدەم قسەوە دەستی بە گریان کرد.

دەموچـاوی عەزیـز گرژبـوو و چاوەکـانی لـێ کەلاخـست و بەرەو پەنجەرەکە هەڵیڕوانی.

"بەڵام من دەترسـام ئەو داوایەت لێ بکەم، تەنـانەت دەترسـام دەستیشم بەرت بکەوێت، چجـای ئەوەی دەسـتبازیت لەگەڵـدا بـکەم. ئـاخر چـۆن بتـوانم داوات لـێ بـکەم لەگەڵمـدا بێیـت و خێـزانەکەت بەجـێ بهێڵیـت، لە کاتێکـدا مـن بانەڕۆژێکی وام نەبێت کە پێشکەشتی بکەم؟".

ئێلا بەرپەرچی پرسیارەکەی دایەوە و گوتی: "ئەم ڕەشبینییە لەپای چی؟ تۆیەک بتوانیت بەرەنگاری نەخۆشـی ببیتەوە، دەشـتوانی لەپێنـاو منـدا دژی بجەنگیت".

"بۆچی لەسەرمان پێویست بێت کە دژی هەموو شتێک بجەنگین؟"، عەزیـز پرسـیی، "چـونکە بەردەوام باسـی بەرەنگابوونەوەی هەڵاوسـان و لەنـاوبردنی ئایـدز و لەنـاوبردنی شـێرپەنجە و لەنـاوبردنی گەنـدەڵی و تیـرۆر دەکەیـن، تەنانەت باسی لەنێوبردنی کێشی زیادەش دەکەین.. ئەرێ ڕێگەیەکی دیکەمـان بۆ تاوتوێکردنی شتەکان بەدەستەوە نییە؟".

"من سۆفی نیم"، ئێلا بەدەم قسەکردنەوە سەبری سووا. دەنگی لە دەنگی کەسێکی تر دەچوو، دەنگی کەسێک لە خۆی بەتەمەنتر.

لەوسـاتەدا چەنـد یـادەوەرییەک لەسـەری بڵاچەیـان دا: مردنـی بـاوکی، لەدەستدانی خۆشەویستێکی خۆکوژ، بۆ چەندین ساڵ خۆخواردنەوە و ژێوانی بەدوای ئەمـانەدا هـات. لە هەمـوو پـاژێکی یادگەیدا بە وردی لە هەر یەکێ لە کەسـە مردووەکـان ڕامـا و پرسـیی ئەگەر لە شـوێنێکدا بە شـێوەی جیـا وردەکارییەکان تێکەڵ بکرێن، ئایا شتەکان جیاواز دەبن؟

عەزیز زەردەخەنە گرتی و وتی: "دەزانم تۆ سۆفی نیت، پێویستیش ناکات ببیت بە سۆفی. تەنها ببە بەهەواداری ڕۆمی، ئەمە هەموو داوایەکی منە لێتی دەکەم".

لێی پرسی: "مەبەستت چییە؟".

"ماوەیەک لەمەوبەر پێت گوتم گوایا من لە شەمسی تەوریزی دەچم، ئایا لەبیرتە؟ وتت کە من ئەوت دێنمەوە یاد، بەقەد ئەوەی بیستم خۆشحاڵ بووم، چونکە من ناتوانم ببم بە شەمس، لەبەر ئەوەی پێم وایە یەکجار لەسەرووی منەوەیە، بەڵام تۆ دەتوانیت ببیت بە ڕۆمیزم، بە مەرجێ بهێڵیت لەنێو خۆشەویستی نوقم ببیت و بگۆڕێیت، ئەمەش سەرەتا لەمیانەی بوونی ئەو و ئینجا لەمیانەی نادیاری ئەودا بەدەست دێت".

ئێلا وتی: "بەڵام من شاعیر نیم".

"ڕۆمیش شاعیر نەبوو، بەڵام بوو بە شاعیر".

"ئەرێ تۆ تێناگەیت؟ ئاخر من لە کابانیماڵێک زیاتر نیم، بۆ خاتری خودا، دایکی سێ منداڵم"، ئێلا هاواری کرد و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا.

"ئێمە هەموومان ئەوەین کە هەین"، عەزیز ورتەورتێکی کرد، "هەروەها هەموومان بۆمان هەیە بگۆڕێین. ئەوە سەفەرێکە لێرەوە بۆ ئەوێ و دەتوانیت ئەم سەفەرە بکەیت، بە مەرجێ تەواو بوێر بیت و تەواو بوێر بم و لە کۆتاییدا پێکەوە بۆ قۆنیا دەڕۆین، چونکە دەمهەوێ لەوێ بمرم".

ئێلا وتی: "وا مەڵێ".

عەزیز بۆ ساتێک تێی ڕوانی، ئینجا چاوەکانی داخست. ئەمێستا وەک گەڵایەکی وشک کە بە خێرایی با ببیات، دەربڕینێکی نوێ لە دەموچاویدا زەق بووەوە و لە ڕیتمی دەنگیدا ڕەهەندێک دەرکەوت.

لەسەرخۆ وتی: "ئێلا، ئەگینا بۆ ماڵەکەی خۆت بگەڕێوە. بۆ لای منداڵەکانت و بۆ ماڵەکەی خۆت بگەڕێوە. ئازیزم بڕیار بدە. هەڵبژاردنەکەت هەرچییەک بێت، من ڕێز لە بڕیارەکەت دەگرم".

# سلێمان سەرخۆش

## قۆنیا، ئاداری ١٢٤٨

بادەی مەی و خوێن و فرمێسک. لایەدەکان وا دەزانن ئەوانەی مەی دەخۆنەوە کەسانێکی تەمەڵ و دەستبەتاڵ و بێکارن، بەڵام نازانن ڕۆژانە خواردنەوەی مەی ماندووبوونێکی زۆری گەرەکە. ئێمەومانان قورسایی دنیامان لەسەر شانی خۆمان هەڵگرتووە.

ماندوو بووم و سەرم خستە سەر مێزەکە و چاوێکم گەرم کرد و خەونێکی ناخۆشم دی. لە خەونەکەدا گایەکی ڕەش و گەورەم بینی، مینا دۆزەخ هار و دین بووبوو، بە چەندین شەقامی نامۆدا ڕاوەدووی دەنام. لەدەست گایەکە هەڵدەهاتم و بێ ئەوەی بزانم چ هەڵەیەکم کردووە تا ئاوها بەربێتە گیانم و دوکانەکان تێکوپێک بدات و هەموو شتێک بپلیشێنێتەوە، کە بوو بەوای تووڕەیی هەموو فرۆشیاری بازاڕەکە. هەر ڕامدەکرد، ئینجا بەرەو کۆڵانێک پێچم کردەوە و بۆم دەرکەوت کە کۆڵانێکی داخراوە، ئەوەبوو بەسەر هێلکەیەکی زەبەللاحدا کەوتم کە قەوارەکەی لە قەوارەی خانوویەک گەورەتر بوو. لەناکاو هێلکەکە تروکاو پەلەوەرێکی زۆر بچووک و یەکجار ناشیرینی لێ هاتەدەرەوە. ژاوەژاوێکی شەڕانگێزانەی لێ بەرزدەبووەوە. کە هەوڵم دا لە کۆڵانەکە دەربچم، باڵندە دایکانەکە لە حەوادا دەرکەوت. وەک ئەوەی من لە ناشیرینیی بەچکەکەی بەرپرسیاربم، ڕووەو خوارەوە تێی دەڕوانیم. کاتێ لە حەواوە داکشا، دەنووکە تیژ و چرنۆکە تیژەکانی ڕوو لە من بوون و بەئاگاهاتمەوە.

چاوم کردەوەو زانیم لەسەر مێزی نزیک پەنجەرەکە خەوم لێکەوتووە. لەگەڵ ئەوەی تامی دەمم لە تامی بزماری ژەنگن دەچوو، هەستم کرد زۆر

ئاتاجی خواردنەوەی شتێکم. یەکجار ماندووبووم و توانای جووڵەم نەبوو، بۆیە سەری قورسم لەسەر مێزەکە خاوکردەوە و نوقمی نێو سڕبوونێک بووم و چێژم لەو دەنگانە وەردەگرت کە لەگەڵیاندا ڕاهاتبووم. ئینجا دەنگەدەنگ و دەحکەیەک بەرگوێم کەوت کە چەشنی ویزەویزی کوورەهەنگ بەرزونزم دەبووەوە. دەنگەکە لای ئەو پیاوانەوە دەهات کە لە دەوری ئەو مێزەی تەنیشت مێزەکەی من دانیشتبوون. هەرچەندە بۆ ساتێک بە خەیاڵمدا هات کەمێ ئاوڕبدەمەوە تا بزانم ئەم پیاوانە کێن، بەڵام دوایی گوێم لەو وشە شوومە بوو، ئینجا جووڵامەوە: تاوانی کوشتن.

سەرەتا خۆم لە قسەکانیان نەبان کرد و بە وریێنەی سەرخۆشانم دانا، ئاخر بنیادەم لە مەیخانەدا زۆر شت دەژنەوێت و لەگەڵ ڕۆژگاردا فێردەبێت کە هەر شتێک وترا بەهەندی وەرنەگرێت، بەڵام ڕیتمی قسەکانیان بۆنی هەڕەشەی لێدەهات، ئیدی لە توانامدا نەما خۆمی لێ نەبان بکەم، بۆیە گوێم سووک کرد و بە وردی گوێم هەڵخست. کە بۆم دەرکەوت ئەوەی دەیڵێن بەڕاستییانە، مەلاشووم خاوبووەوە، بەڵام ئەوەی زۆر تووشی شۆکی کردم، زانیم کە ئەو کەسەی دەیانەوێ بیکوژن، شەمسی تەورێزییە.

هەر کە ڕۆیشتن، وازم لەوە هێنا کە خۆم بە نوستوو پیشان بدەم، ئیدی هەستامە سەرپێ، "خریستۆس، خێرا وەرە"، بە ترسەوە هاوارم کرد.

"ئەمجارە چی ڕووی داوە؟"، خریستۆس بەدەم قسەوە بە ڕاکردن بۆ لام هات، "ئەوە بۆ ئاوها خەمباریت؟".

بەڵام نەمتوانی شتەکە بە کەس بڵێم، تەنانەت بە خریستۆسیش. لەپڕ هەموان کەوتنە گومانەوە. ئەی ئەگەر خەڵکێکی زۆرتر لەم پیلانەی بۆ شمس دانراوە بەشداربن؟ بۆیە دەبوو بێدەنگ بم و وریابم.

گوتم: "هیچ نییە! تەنها ئەوەیە کە برسیمە، تکایە شۆربام بۆ بێنە و بڕێکی زۆر سیری تێبکە، گەرەکە بەئاگاوە بمێنمەوە".

خریستۆس بە سەرسوڕمانەوە تەماشای کردم، بەڵام پرسیاری تری لێ نەکردم، چونکە لەگەڵ سەرودڵی دەمدەمیمدا ڕاهاتبوو. دوای چەند چرکەیەک پڕ قاپێ فەخفووری گۆشتاوی ڕیخۆڵەی بزنی بۆ هێنام کە بەهاراتی تیژی

تێکرابوو. به پەلە خواردم و زمانمی سووتاندەوە. دوای ئەوەی بایی ئەوە هاتمەوە سەرخۆم، بەرەو شەقامەکە تەکانم دا تا شەمس ئاگادار بکەمەوە.

سەرەتا ڕووم کردە ماڵی ڕۆمی و لەوێ شەمسم نەبینی، ئینجا لە مزگەوتەکە منەیم کرد، ئینجا لە سوختەخانەکە و قاوەخانەکە و نانەواخانەکە و گەرماوەکە لێی گەڕام... لەهەموو کۆگاکان و ژێرزەمینەکانی شەقامی پیشەوەرەکان بۆی گەڕام، تەنانەت لەخێوەتی پێرەژنە قەرەجەکەی نێو کەلاوەکانیش منەیم کرد، بەڵکو ئێ بۆ هەڵکێشانی کاکیلەیەکی ئێشاو بۆ ئەوێ چووبێت تا لە ئازاری ناخۆشی ڕزگار بێت. لە هەموو شوێنێک بۆی گەڕام، خولەک دوای خولەک پتر پەژارە دەبووم. خەریک بوو ترسم لێ دەنیشت. نەکا کارلەکار ترزابێت؟ ئەی ئەگەر کوشتبێتیان؟

دوای چەند سەعاتێ، ئیدی نەمدەزانی لە کوێ بۆی بگەڕێم، بە خەمباری و شەکەتییەوە بۆ مەیخانەکە گەڕامەوە، لێ وەک ئەفسوونێک، بینیم بە دووری چەند هەنگاوێک لە بەردەرگای مەیخانەکە وەستاوە.

"سلێمان سلاو. تۆ خەیاڵت مژوولە"، شەمس بە زەردەخەنەوە وای پێوتم.

"ئەی خودایە! تۆ هێشتا لەژیاندا ماویت!"، هاوارم کرد و ڕامکرد تا لەئامێزی بگرم.

کە باوەشم لە شەمس دا، تەماشای کردم و خۆشحاڵ دیاربوو، ئینجا وتی: "بێگومان من زیندووم! ئایا لە بەرچاوت وەک شەبەنگ دیارم؟".

زەردەم هاتێ، بەڵام زۆر نا. سەرم زۆر ژانی دەکرد و بە خواردنەوەی چەند قاپێک هێورم کردەوە تا خێرا سەرخۆش بم و خەوم لێ بکەوێت.

"هاوڕێم، چی بووە؟ ئایا هەموو شتێ لە شوێنی خۆیدایە؟"، شەمس بە گومانەوە پرسیی.

بە زەحمەت تفەکەم بۆ قووت درایەوە. ئەی ئەگەر باسی پیلانەکەی بۆ بکەم و باوەڕنەکات؟ ئەی ئەگەر وای بۆچوو کە من بەوای مەیەکەوە هەڵدەبزڕکێنم؟ ڕەنگە هەر واش بووبم، ناتوانم لەوە دڵنیابم.

پێم وت: "ئەوان دەیانەوێ بتکوژن. نازانم کێن. نەمتوانی دەموچاویان ببینم. ئاخر من خەوتبووم، بەڵام خەونم نەدەبینی. مەبەستم ئەوەیە بڵێم

خەونم دەبینی، بەڵام نەک خەونێکی ئاوها. زۆرم نەخواردبووەوە. بە هەرحاڵ، چەند پەرداخێکم خواردبووەوە، بەڵام سەرخۆش نەبووم".

شەمس دەستی خستە سەرشانم و گوتی: "هاوڕێم خۆت هێور بکەوە. تێگەیشتم".

"بەڕاستیتە؟".

"بەڵێ. ئێستا بۆ مەیخانەکە بگەڕێوە و بۆ من نیگەران مەبە".

"نا، نا! بۆ هیچ شوێنێ ناڕۆم، هەروەها تۆش"، بە ناقایلییەوە وتم، "ئەو کەسانە ئەوە دەکەن و بەڕاستیانە. دەبێ وریابیت، نابێت بۆ ماڵی ڕۆمی بگەڕێیتەوە، چونکە یەکەم شوێن لەوێ لێت دەگەڕێن".

شەمس بێدەنگ بوو و گوێی بە ترسەکەم نەدا.

" دەروێش، گوێ بگرە، ماڵەکەی من هەرچەندە بچووکە، لێ شتی زۆری تێدایە. خۆ ئەگەر ئەوەت بەلاوە گرینگ نەبێت، ئەوە دەتوانیت بە ئارەزووی خۆت لە ماڵەکەمدا بمێنیتەوە".

"سوپاست دەکەم کە بۆ من پەرۆشیت"، شەمس ورەورێکی کرد، "بەڵام ئەوەی خودا لە چارەمانی نەنووسی بێت تووشمان نابێت، ئەمەش ڕێسایەکی دیکەیە: **ئەم دنیایە لەسەر میتۆدی ئاڵوگۆڕ دروست بووە، هەر مرۆڤێک بەرانبەر هەر گەریلەیەکی ئەو چاکەیەی کە دەیکات پاداشتی دەدرێتێ، بەرانبەر هەر گەردیلەیەکی خراپەش کە دەیکات سزادەدرێ. لەو پیلان و مەکر و تەڵانە مەترسە کە کەسانی تر دەینێنەوە، لە یادت بێت گەر یەکێک تەڵەی بۆ نایەتەوە، ڕەنگە ئەوە ویستی خودا بێت. ئاخر ئەو خۆی پلاندانەری هەرەگەورەیە، چونکە بەبێ ئاگاداریی ئەو گەڵای درەختێک نابزوێت. بە سادەیی و بە شێوەیەکی تەواو بڕوا بەوە بهێنە. ئاخر هەر شتێ خودا بیکات بە شێوەیەکی جوان دەیکات**".

شەمس کە ئەمەی وت، زەردەخەنەیەکی بە ڕووومدا دا و دوعاخوازیی لێکردم. هەرچەندە ئاگادارم کردبووەوە، چاوم لێی بوو بە پەلە بە کۆڵانە قوڕاوییەکاندا بەرەو ماڵی ڕۆمی ڕێی گرتەبەر.

# بکوژەکە

## قۆنیا، ئاداری ١٢٤٨

بێمێشکینە! گێلینە! ئاخر داوام لێکردن لەگەڵمدا نەیەن. بۆم ڕوونکردنەوە کە من بەردەوام خۆم بە تەنیا کاردەکەم و ڕقم لە چارەی ئەو بەکرێگیراوانەیە کە دەست دەخەنە کارەکانمەوە، بەڵام پێیان داگرت، چونکە پێیان وا بوو کە دەروێشەکە هێزێکی لە ڕادەبەدەری هەیە و دەبێ بە چاوی خۆیان بە مردوویی بیبینن.

بە هەرحاڵ، لە کۆتاییدا بۆ داواکەیان ملم دا، "بەڵام تا هەموو شتێ کۆتایی دێت، لێم نزیک مەکەونەوە".

قایل بوون. ئێستا سێ پیاو هاتبوون. ئەو دوو پیاوەی کە پێشتر بینیبوومن، پیاوێکی تریشیان لەگەڵدا بوو وا دەردەکەوت وەک دوانەکەی تر لاوێکی شلەژاوبێت، وەک ئەوەی من بەڕاستی گوێ بدەمە ئەوەی بزانم کە ئەوان کێن، هەموویان دەموچاوی خۆیان بە پەڕۆیەکی ڕەش هەڵپێچابوو.

دوای نیوەشەو، من لە دەرەوەی ماڵی ڕۆمی وەستابووم. بەسەر دیوارە وشکەکەڵەکەکەدا بۆ ناو حەوشەکە بازم دا و لە پشت بیرێکەوە خۆم شاردەوە، ئەوەبوو کرێگرتەکان دڵنیایان کردبوومەوە کە شەمسی تەورێزی هەموو شەوێک پێش یان دوای دەستنوێژهەڵگرتن ماوەیەک لە حەوشەکە بەسەر دەبات و ڕادەمێنێت. ئیتر هەموو ئەوەی لەسەر من بوو چاوەڕێکردن بوو.

شەوێکی تۆف و زریان بوو، بەچاو ئەم کاتەی ساڵەوە بە شێوەیەکی نائاسایی دنیا ساردبوو. شمشێرەکە لەناو لەپمدا قورس و سارد بوو، لەژێر پەنجەکانمدا هەستم بە دوو میرووە مەرجانییەکەی کرد کە دەسکە

قورسەکەیان ڕازاندبووەوە. خۆزگەی ئەوەم خواست کە خەنجەرێکی بچووکم بە کێلانەوە لەگەڵ خۆمدا هێنابا.

خەرمانەیەکی شینی زەردباو دەوری مانگی دابوو، لە دوور گوێم لە لوورەیەکی زۆری گیاندارانی شەو بوو، هەناسەیەکی خۆشی بۆنی گوڵ بەسەرمدا هات کە بایەکە لەنێو درەختەکانەوە دەیهێنا. بۆنەکە بە شێوەیەکی سەیر وای لێکردم هەست بە شڵەژان بکەم، پێش ئەوەی بگەمە ئەم شوێنەش سەرودڵم خۆش نەبوو، بەڵام ئێستا خراپتر بووم. کە لەوێ وەستابووم و ئەو بۆنە خۆشە پڕی کردبووم، ویستێکی بەهێز هانی دام دەست لە پیلانەکە هەڵبگرم و دەسبەجێ ئەم شوێنە ترسناکە جێ بهێڵم.

بەڵام ئەو بەڵێنەی دابووم لێی پاشگەز نەبوومەوە. نەمزانی کات چەند تێپەڕیوە، هەستم دەکرد پێڵووەکانم قورسن و بەبێ دەستی خۆم باوێشکم دەدا. کە تووڕەیی بایەکە تاوی سەند، بەوای شتێکەوە کە نەمزانی چییە، دەربارەی ئەو کەسانەی کە کوشتبوومن خەیاڵم بیرەوەری تەڵخ و پرووکێنەری زیندوو دەکردەوە. سەرم سوڕما کە دەترسێم. ئاخر هەر جارێ ڕابردووم دەهاتەوە یاد، دەشڵەژام. ڕەنگە لە بیرکردنەوەدا زۆر ڕۆچووبم و دۆشدامابم، بەڵکو ناوبەناو ئاڵۆزیش دەبووم، بەڵام نەدەلەرزیم.

بۆ بەرزکردنەوەی ورەم، لەسەر ڕیتمی چەند سترانێک دەستم بە فیکەفیک کرد. کە ئەوەش دادی نەدام، چاوم بڕییە دەرگای پشتەوەی ماڵەکە و بە چپە وتم، "دەی شەمس، وام لێ مەکە زۆر چاوەڕێ بکەم، دەی بۆ حەوشەکە وەرە دەرەوە".

نە دەنگێک، نە جووڵەیەک، نە هیچ شتێک.

لەناکاو باران تێی کرد، لەو شوێنەی کە لێی وەستابووم، دەمتوانی لەسەر دیوارە لارەوەبووەکەی حەوشەکەوە شت ببینم. زۆری نەبرد بوو بە شەستەباران و لە شەقامەکان لافاو هەستا و تا سەر ئێسقان تەڕبووم.

گوتم: "نەفرەتی خودای لێ بێت. نەفرەت! نەفرەت!".

خەریک بووم بیرم لەوە دەکردەوە کە ئەمشەو واز لە پیلانەکە بهێنم. ئەوەبوو گوێم لە دەنگێکی تیژبوو، بارانیش بەسەر سەربانەکان و کۆڵانەکاندا هەر دەباری. یەکێ لەناو حەوشەکە بوو.

ئەوە شەمسی تەوریزی بوو. فانۆسێکی بە دەستەوە بوو و بەرەو لای من دەهات، لە دووری چەند هەنگاوێک لەولای ئەو بارستە خۆڵەوە کە من لە پشتەوەی خۆم حەشاردابوو، وەستا.

"شەوێکی لەبارە، وا نییە؟"، پرسیی.

نەمتوانی شڵەژانەکەم بەرزەوت بکەم و دەستم بە هەناسەبڕکێ کرد. ئایا کەسی دیکەی لەگەڵدایە، یان لەبەرخۆوە قسان دەکات؟ ئایا دەزانێت کە من لێرەم؟ تۆ بڵێیت هەستی پێکردبم؟ سەرم لە پرسیار جمەی دەهات.

بیرۆکەیەکی دیکەم بە خەیاڵدا هات، چۆن دەکرێ بەم ڕەشەبا و شەستەبارانە فانۆسەکە هەر وا بە دایساوی بە دەستییەوە بمێنێتەوە؟ هەر کە ئەم پرسیارەم بە خەیاڵدا هات تەزوویەکی سارد بە جەستەمدا هات.

ئەو قسەوباسانەم هاتنەوە یاد کە دەربارەی شەمس بڵاوبووبوونەوە. دەڵێن گوایا جادووی ڕەش دەکات، تەنانەت دەتوانێت هەر کەسێک بکات بە نێرەکەرێک و بزەرێت، یان بیکات بە شەمشەمەکوێرەیەک، هەروەها لەتوانایدایە بەدەم خوێندنەوەی دوعای چاوەزارەوە دەزوویەک بە جلوبەرگی هەر کەسێکەوە ببەستێت. هەرچەندە بڕوام بەم شتە توورەهاتانە نەبوو و ئێستاش نامەوێ بڕوای پێ بکەم، کەچی وەستابووم و چاوم لە فانۆسەکەی دەستی شەمس بوو کە لەبەر ئەو شەستەبارانەدا گڕەکەی پرتەپرتی بوو، موچڕکێکم پێدا هات.

"چەند ساڵێ لەمەبەر لە تەورێز مامۆستایەکم هەبوو"، شەمس بەدەم قسەوە فانۆسەکەی لەسەر زەوییەکە دانا، ئیدی ئەوم نەدەبینی، "فێری کردم کە هەموو شتێ کاتی خۆی هەیە. ئەمە بنەمایەکە لە بنەماکان".

باسی کام بنەما دەکات؟ ئەم قسە ئاڵۆزە چییە؟ گەر پێویستە هەر ئێستا لە پشت ئەم بارستە خۆڵەوە دەربچم، گەرەکە بڕیارێکی بەلەز بدەم، یان چاوەڕێ بکەم تا پشتم تێدەکات، بەڵام ئەوەی هەر نەکرد. ئەگەر زانیبێتی من لێرەم، ئیتر پێویست بە خۆشاردنەوە ناکات، خۆ ئەگەر نەیشی زانیبێت، ئەوە کاتێ دەردەچم دەبێ زات وەبەرخۆ بنێم.

پاشان وەک ئەوەی پتر شڵەژابم، تەماشای سێ پیاوەکەم کرد کە لە پشت دیواری حەوشەکە خۆیان مت کردبوو. بێگومان دەپرسن بۆچی بۆ کوشتنی دەروێشەکە ناجووڵێم.

ئینجا شەمس لەسەر قسەکەی ڕۆیشت: "ڕێسای سیوحەوتەمین دەڵێت: **خودا کاتگرەوەیەکی وردە. بە ڕادەیەک وردە کە ڕیزبەندی و ڕێکخستنەکەی لەسەر زەویدا وا لە هەموو شتێک دەکەن کە لە کاتی خۆیدا ڕووبدات، ئیدی نە خولەکێک پێش دەکەوێت و نە خولەکێک دوادەکەوێت. سەعاتەکە بۆ هەموان بەبێ جیاوازی یەکجار بە وردی دەڕوات. هەر کەسێک کاتێکی بۆ عەشق هەیە و کاتێکیش بۆ مردن".**

لەوساتەدا تێگەیشتم کە لەگەڵ مندا قسەدەکات. ئاخر دەیزانی کە من لێرەم، تەنانەت بەرلەوەی بۆ ناو حەوشەکە دەربچێت، ئەوەی زانی بوو. دڵم خەریکبوو بە توندی لێی دەدا، هەستم کرد کە هەوا لە دەوروبەرمدا نەما، ئیدی خۆحەشاردان دادی نەدەدام، هەستام و لە پشت بارستەخۆڵی چاڵەکە دەرچووم. لەپڕ بارانەکە وەک چۆن تێی کردبوو، لێی کردەوە و بێدەنگییەکی لاڵ باڵی کێشا. ڕووبەڕووی یەکتر وەستاین، بکوژ و قوربانی. سەرباری دۆخە سەیرەکە، هەموو شتێ ئاسایی دیاربوو، بگرە هێمنیش بوو.

شمشێرەکەم هەڵکێشا و بۆیم داوەشاند. دەروێش زۆر بە خێرایی خۆی لێ لادا، لەو باوەڕەدا نەبووم پیاوێکی وا ئەمەی لێ بوەشێتەوە. لەوەدابوو بۆ جاری دووەم بۆی داوەشێنمەوە، لەپڕ لەنێو تاریکییەکەوە جووڵەیەکی خێرا پەیدا بوو و شەش پیاو دەرکەوتن و بە دار و ڕمەوە هێرشیان کردە سەر دەروێش. دیاربوو سێ پیاوەکە برادەرەکانی خۆیان هێنابوو. شەڕەکە گەرم بوو و هەموو پیاوەکان کەوتنە سەر زەوی. گلۆردەبوونەوە و هەڵدەستانەوە و دووبارە دەکەوتنەوە، ئیدی ڕم لەدوای ڕم دەشکان و پارچەپارچە دەبوون.

وەستام و بە سەرسوڕمان و تووڕەییەوە تەماشای شەڕەکەم دەکرد. ئاخر قەت ڕووی نەدابوو کە بۆ تاوانێکی کوشتن ڕاسپێردرابێتم و تەنیا تەماشاکەر بم. لە بێچاوڕوویی سێ لاوەکە دەهری بووم، تەنانەت ویستم واز لە دەروێشەکە بهێنم و بەگژ ئەواندا بچم.

بەڵام ئەوەندەی نەبرد، یەکێ لە پیاوەکان شێتانە دەستی بە هاوارکردن کرد، "هۆو سەرچەقەڵ، هاوارە فریامان بکەوە! خەریکە دەمانکوژێت".

وەک بروسکە، شمشێرەکەم فڕێ دا و خەنجەرەکەی* بەرپشتێنەکەم هەڵکێشا و بەرەو پێشەوە تەکانم دا. ئیدی بە هەرحەوتمان دەروێشەکەمان بە زەویدا دا و بە جووڵەیەکی خێرا لەسەر دڵیم دا. هاوارێکی گڕ لە دەمییەوە دەرچوو. ئیدی لە جووڵە کەوت و هەناسەی لەبەر بڕا.

لاشەکەیمان هەڵگرت کە بە شێوەیەکی سەیر سووک بوو، ئەوەبوو فڕێمان دایە نێو بیرەکەوە. هەموومان هەناسەبڕکێمان بوو و خواخوای هەوای زیاترمان بوو. کشاینە دواوە و چاوەڕێمان کرد تا شڵپەی لاشەکەی لەناو ئاوەکە ببیستین.

بەڵام گوێمان لە شڵپەی کەوتنەکەی نەبوو.

"توبی دۆزەخ، ئەوە لێرە چی ڕوودەدات!؟"، یەکێ لە پیاوەکان ئەمەی وت، ئایا هێشتا نەکەوتووەتە خوارەوە؟".

"بێگومان کەوتووەتە خوارەوە"، یەکێکی تریان وەڵامی دایەوە، "چۆن ناکەوێتە خوارەوە؟".

ترسێک لەوان و لە منیش نیشت.

"ڕەنگە لە سنگێکی قەد دیواری بیرەکە گیربووبێت"، سێیەم پیاو وای وت و بۆچوونێکی لەگوێن بوو.

ئیدی لە چەندوچوون و دەحکە حەساندینییەوە و باوەڕمان پێی کرد، هەرچەندە دەمانیشزانی لەسەر دیواری بیر سنگ نییە.

نازانم لەوێ چەندێ چاوەڕێمان کرد، هەریەکەمان خۆی لە نیگای ئەوی تر لادەدا. لە حەوشەکەدا شنەیەکی فێنک هەڵیکرد و هەندێ گەڵای زەردباوی دارقەڵەمتۆزەکە بە دەوروبەری پێماندا پەرت بوون، بەڵام لە ئاسۆوە بەیانیی شین و تاریک خەریکبوو سوور هەڵدەگەڕا. خۆ ئەگەر دەرگای پشتەوەی

---

* هەر لەم بەشەدا بکوژەکە کە پێی دەڵێن (سەرچەقەڵ) لەوکاتەدا بۆ کوشتنی شەمسی تەورێزی لە بۆسەدایە و شمشێری پێیە و ئاواتەخواز بووە کە خەنجەرێکی بچووکیشی پێ بوایە، کەچی لێرەدا دەڵێت: (خەنجەرەکەی بەر پشتێنەکەم هەڵکێشا). هەست دەکەم غافڵبوونێک دروست بووە، چونکە سەرەتا خەنجەری پێ نییە و لە کاتی کوشتنەکدا پێیەتیی، بۆیە لێرەدا غافڵبوونێک دروست بووە. (و. کوردی)

ماڵەکە نەکرایەتەوە و پیاوێک نەهاتایەتە دەرەوە، ڕەنگە زۆرتر بمایناتەوە. دەسبەجێ ناسیمەوە. ئەوە مەولانایە.

"تۆ لە کوێیت؟"، بە دەنگێکی بارگاوی بە پەژارە هاواری کرد، "شەمس، ئەرێ تۆ لێرەیت؟".

هەرئەوەندە ناوی هێنا، هەرحەوتمان پشتمان تێی کرد. شەش پیاوەکە بەسەر دیواری حەوشەکەدا هەڵگژان و لەنێو تاریکیی شەوەکەدا ون بوون. هەروا وەستابووم و لە خەنجەرەکەم دەگەڕام کە لە دواییدا دۆزیمەوە و قوڕاوی بووبوو. دەمزانی دەبێ چرکەیەکیش لێرە نەمێنمەوە، بەڵام نەمتوانی حەزی ئاوڕدانەوە بەرزەوت بکەم و بۆ دواوەم ئاوڕنەدەمەوە، کە ئاوڕم دایەوە، ڕۆمیم بینی بە لارەلار بەرەو حەوشەکە دەهات، ئینجا وەک ئەوەی پێی وترابێت بەرەو چەپ ڕووەو بیرەکە بە لارەلار ڕۆیشت.

بەرەو پێشەوە نوشتایەوە و سەیری خوارەوەی کرد و ئاوها ساتێک وەستا تا بەر چاوی لە نیمچە تاریکیی ناو بیرەکە ڕوون ببێتەوە. ئینجا گەڕایەوە و چۆکی دادا و سینگی خۆی کوتا و هاوارێکی ترسناکی کرد.

"کوشتیان! شەمسیان کوشت".

بە قەڵەمبازێک بەسەر دیوارەکەدا سەرکەوتم، خەنجەرەکەم جێهێشت کە بە خوێنی دەروێشەکە خوێناوی بووبوو، بە جۆرێ ڕامکرد، لەوەپێش قەت ئاوها ڕام نەکردبوو.

# ئێلا

## نۆرتامپتۆن، ١٢ی ئابی ٢٠٠٨

بەیانی زوو ئێلا لە خەو هەستا و قاوەڵتیی بۆ شووەکەی و منداڵەکانی ئامادەکرد. ڕۆژێک بوو وەک هەموو ڕۆژەکانی تر. ئێلا بەیانی زوو لە خەو هەستا و قاوەڵتیی بۆ شووەکەی و منداڵەکانی ئامادە کرد، چاوی لێ بوو بۆ کار و یانەی یاریی تەنس و شەترەنج دەرۆیشتن، ئینجا بەرەو ناندینەکەی گەڕایەوە و کتێبی ئامادەکردنی خواردنی کردەوە و بۆ ئەمڕۆ خواردنێکی هەڵبژارد:

شۆربای سپێناخ بە قارچکی هەنجراوەوە.

گوێچکەماسی لەگەڵ ڕەشکە و مایۆنیز.

گوێچکەماسیی برژاو لەگەڵ تەرخوون.

زەڵاتە بە تووی کێوییەوە.

شلەی کولەکە لەگەڵ برنج.

کولێرە بە کریمی ڤانیلا.

دواینیوەڕۆکەی بە تەواوی بۆ ئامادەکردنی ئەم خواردنانە تەرخان کرد. کە کارەکەی تەواوکرد، باشترین قاپی فەخفووریی دەرهێنا و خوانەکەی ڕێکخست و سەرکۆشەکانی لوول کرد و گوڵەکانی لە شوێنی خۆیان دانا، ئینجا فرنەکەی بۆ ماوەی چل خولەک نایەوە، تا شلەی کولەکەکە بۆ سەعات حەوت بە گەرمی بمێنێتەوە، هەروەها چەند پارچە نانێکی ئامادەکرد و گیراوەی تەماتە و بەهاراتی بە تێروتەسەلی بەسەر زەڵاتەکەدا کرد، چونکە ئافی حەزی لێدەکرد. بە خەیاڵیدا هات مۆمەکان دابگیرسێنێت، لێ

بۆچوونەکەی گۆڕی. پێی باش بوو خوانەکە وەک وێنەیەکی بێگەرد و بێ هیچ زیادە دەستکارییەک وەک خۆی جێ بهێڵێت.

ئینجا ئەو جانتایەی هەڵگرت کە پێشتر ئامادەی کردبوو، ئاوها ماڵەکەی جێهێشت. کە چووە دەرەوە ڕێسایەک لە ڕێساکانی شەمسی لەبەر خۆیەوە گوتەوە: هیچ درەنگ نییە تا لە خۆت بپرسیت، ئایا من ئامادەم ژیانی ئێستام بگۆڕم؟ ئایا من ئامادەم لە ناوەوە خۆم بگۆڕم؟

**"تەنانەت گەر تاقە ڕۆژێک لە ژیانتدا مابێت هەر وەک دوێنێیە و مایەی شینگێڕانە. لە هەر چرکەیەکدا و لەگەڵ هەر هەناسەیەکی تازەدا گەرەکە نوێ ببیتەوە و دووبارە نوێ ببیتەوە. لەوە زیاتر هیچ ڕێگەیەک نییە بۆ ئەوەی مرۆڤ لە ژیانێکی تازەدا لەدایک ببێتەوە، ئەویش ئەوەیە کە پێش مردن بمرێت".**

# عەلائەدین

## قۆنیا، نیسانی ١٢٤٨

بەسەر مردنی شەمسدا سێ هەفتە تێپەری بوو، تا دەهات نەمدەزانی چۆن لەگەڵ کەسانی تردا ڕەفتار بکەم، ئینجا زاتم وەبەر خۆم نا تا لەگەڵ باوکمدا قسە بکەم، کە بە تەنیا و وەک پەیکەرێکی بەردین لە ژووری کتێبخانەکەدا لە شوێنەکەی خۆی وشک دانیشتبوو و سێبەرێک بەسەر دەموچاویدا بازرقەی دەدا.

لێم پرسی: "باوکە، ئایا دەتوانم قسەت لەگەڵدا بکەم؟".

وەک ئەوەی لە دەریای زیندەخەوندا بە مەلە بەرەو کەنار گەڕابێتەوە، لەسەرخۆ و بە ئالۆزی تەماشای کردم و ورتەی لێوە نەهات.

"باوکە، دەزانم تۆ پێت وایە کە من لە کوشتنی شەمسدا تێوەگلاوم، بەڵام ڕێگەم بدە با دڵنیات بکەمەوە".

لەپڕ باوکم پەنجەی بەرزکردەوە و قسەکەی پێ بڕیم و گوتی: "کوڕەکەم، لە نێوان من و تۆدا وشە چکی کرد، بۆیە نامهەوێ هیچ شتێکت لێ بژنەوم، بۆ وەڵامی ئەوەش هیچم پێ نییە پێتی بڵێم".

"تکات لێدەکەم وا مەڵێ. ڕێگەم بدە با بۆت ڕوون بکەمەوە"، بە پاڕانەوەوە پێم وت و دەنگم دەلەرزی، "سوێند بە خودا. من نەبووم. دەزانم کێ ئەوەی کرد، بەڵام من نیم".

"کوڕم"، دووبارە قسەکەی پێ بڕیم و خەمی لێ دەچۆڕایەوە، ئینجا بە هێمنییەکی ترسناکی کەسێک کە لە کۆتاییدا ڕاستییە تاڵەکە قەبووڵ بکات، ئارامییەکی لێ دەرکەوت، "تۆ دەڵێیت کە ئەوەت نەکردووە، کەچی پەڵەی خوێن بە دامێنی کراسەکەتەوەیە".

بێـدەنگ بـووم و یەکـسـەر تەماشــای دامێنــی کراســەکەم کـرد و لێـی وردبوومەوە. تۆ بڵێیت ئەمە ڕاست بێت؟ ئایا هێشتا خوێنی ئەو ئێوارەیەی پێـوە مـاوە؟ بە وردی تەماشـای داوێنـی کراســەکەم کـرد، ئینجـا سـەرقۆڵی کراسەکەم پشکنی، ئینجا دەستەکانم و نینۆکەکانم. هەمووی پاک بوون. دوای ئەوەی دووبـارە سـەرم هەڵبڕی، چاوەکـانم لەگەڵ چـاوانی باوکمـدا یەکـانگیر بوون، ئیدی تێگەیشتم چی تەڵەیەکی بۆ ناومەتەوە.

کاتێ داوێنی کراسەکەم دەپشکنی، ددانم بە تاوانەکەمدا نابوو.

* * *

بەڵێ، ئەو ئێوارەیە لە مەیخانەکە دەستم لەگەڵیاندا تێکەڵ کرد، ئەوە من بووم بە بکوژەکەم وت کە شەمس هەموو شەوێک لە حەوشەکە دادەنیشێت و رادەمێنێـت. هەر لەو شـەوەدا کـاتێ شــەمس لەبەر ڕێـژنەی بـارانەکە لەگەڵ بکـوژەکەی قسەی دەکـرد، مـن یەکێـک بـووم لەو شـەش پیـاوەی کە لە بـن دیــواری بــاخەکە گوێمــان بــۆی هەڵخــستبوو. کە بکــوژە کرێگـرتەکە لە جێبەجێکردنـی ئەوەی لەسـەری ڕێککەوتبـووین، دەسـتی بە خاوەخـاو کـرد، بڕیارمان دا هێرش بکەینە سەری، چونکە ئیدی نەدەکرا پاشەکشە بکەین. ئەوە بوو ڕێگەی حەوشەی ماڵەکەمـانم پیشان دان، بەڵام هەمـوو شتەکە ئەوە بـوو مـن لەوێ وەسـتام و بەشـداریی شـەڕەکەیان نەبـووم. پێپـرس پەلامـاری دا و ئیرشاد و ئەوانی دیکە یارمەتییان دا، کاتێکیش ترسیان لێ نیشت، سـەرچەقەڵ پاشماوەی ئەرکەکەی جێبەجێ کرد.

لەو سـاتەدا چەنـدین جـار لەگەڵ خۆمـدا ڕاوێـژم کـرد و نەمـدەزانی کـامە ڕاستییە و کامە خەیاڵە. جارێ یان دووجـار دیمەنـی شەمـسم هێنـایە بەرچـاوم کە لە بن دەستماندا هەڵدەپلکا، ئینجا هەڵدەهات تا لەنێو تاریکەشەوەکەدا خۆی ون بکات. دیمەنەکە بە جۆرێ ڕوون بوو، هەر ئەوەتا باوەڕم پێدەکرد.

هەرچەندە خۆی نەماوە، بەڵام دەوسی لە هەموو شوێنێ بە ئاشکرا دیارە. ئەوەتـا سـەما و شـیعر و مۆسـیقا و هەمـوو ئەو شـتانەی کە پـێم وا بـوو بەنەمـانی ئەو دەتـوێنەوە، کەچـی هەرهەموویـان بە مەحکەمـی لە ژیانمانـدا

ماونەتەوە و باوکمیش بوو بە شاعیر. شەمس ڕاستی دەکرد، هەرکاتێ یەکێ لە دوو گۆزەکە شکا، ئەوا گۆزەکەی دیکەش دەشکێت.

باوکم پیاوێک بوو لێوانلێو لە خۆشەویستی، لە هەموو مەزەب و ئایینەکان خەڵکی لەخۆ دەگرت. خۆ هەر بەرانبەر موسڵمانان دڵنەرم نەبوو، بەڵکو بەرانبەر کریستیانەکان و جوولەکەکان و بگرە بەرانبەر بتپەرستەکانیش هەر وا بوو. دوای ئەوەی شەمس هاتە نێو ژیانییەوە، بازنەی خۆشەویستی لای ئەو فراوانتر بووەوە و ئەو کەسانەیشی گرتەوە کە سووک و ڕیسواترین کەسانی نێو کۆمەڵ بوون، لەشفرۆشان و مەیخۆران و سواڵکەران، واتا خڵتەی خڵتەکان.

وام بە خەیاڵدا دێت کە لەگوینە ئەو کەسانەیشی خۆش بوێ کە شەمسیان کوشت، بەڵام ئەو کەسەی کە ناشێ خۆشی بوێ: ئەوە کوڕەکەی خۆیەتی.

# سوڵتان وەلەد

## قۆنیا، ئەیلوولی ١٢٤٨

باوکم هەرچی زێڕوزیوی هەیە بەسەر تاوانبارەکاندا دابەشی دەکات، دەرۆزەکەرەکان و سەرخۆشەکان و بێ دایک و باوکەکان و دزەکان و.. لەو شەوە شوومەوە ئیدی باوکم وەک جاران نەما. هەموو خەڵکی دەڵێن کە خەم باڵی بەسەردا کێشاوە. کە یەکێ لێی دەپرسێت خەریکی چییە، ئەویش چیرۆکی ئیمروئولقەیسی پاشای عەرەبی بۆ دەگێڕێتەوە، کە پیاوێکی خۆشەویست و دەوڵەمەند و قۆز بووە، بەڵام ڕۆژێکیان کتوپڕ و بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو دەستی لەو ژیانە نموونەییەی خۆی هەڵگرت و جلی دەروێشی پۆشی و دەستی لە هەموو سامانەکەی هەڵگرت و لەم شوێنەوە بۆ ئەو شوێن دەستی بە گەڕیدەیی کرد.

"لەدەستدانی خۆشەویست ئەوەت بەسەر دێنێت"، باوکم وا دەڵێت، "ئاخر تۆیەک مینا پاشایەک نەفسی خۆت بخەیتە ژێر پێوە تا ببیتە خۆڵ و خاشاک و خۆت وەک دەروێشێک پیشان بدەیت، بەڵام دوای ئەوەی شەمس بۆ هەتاهەتایە کۆچی کرد، منیش کۆچم کرد، ئیدی نە زانام و نە وتاربێژ. من بە نرخی نەبووم . ئێرە نەمانمە.. ئێرە مانەوەمە".

چەند ڕۆژێ لەمەوبەر، بازرگانێکی قژسوور لەدەرگای ماڵەکەمانی دا، دیابوو درۆزنترین کەسی سەر زەمین بوو. ئەوە بوو گوتی گوایا ساڵانێک لەمەوبەر لە بەغدا شەمسی تەورێزیی ناسیوە، ئینجا دەنگی نزم کردەوە تا بوو بە چپەیەکی ڕازئاسا و سوێندی خوارد کە شەمسی دیوە و تەندروستیی باشە، هەروەها وتی لە شوێنێک دوور لە چاوی خەڵک لە ئەشرەم لە هندستان نیشتەجێ بووە و چاوەڕێی کاتێکی گونجاوە تا دەربکەوێتەوە.

که ئەوەی وت هیچ نیشانەیەکی ڕاستگۆیی بە ڕوخسارییەوە دیار نەبوو، بەڵام باوکم دەستی بە وڕێنە کرد و لە پیاوەکەی پرسی بەرانبەر ئەم هەواڵە مەزنە چیی دەوێ. بازرگانەکە بێ هیچ شەرمکردنێک وتی گوایا کە منداڵ بووە ویستوویەتی ببێتە دەروێش، لێ لەبەر ئەوەی ژیان بەرەو ئاراستەیەکی دیکە بردی، بۆیە بەلانی کەمەوە دەیهەوێ کراسێکی ئاودامانی پیاوێکی ئاینیی بەناوبانگی وەک ڕۆمیی دەست بکەوێت. ئیدی ڕۆمی کراسە ئاودامانە مەخمەڵییەکەی لە بەر خۆی داکەند و پێشکەشی کرد.

"بەڵام باوکە، بۆچی کراسە بەنرخەکەی خۆت بەو پیاوە دا، کەچی دەتزانی درۆدەکات؟"، کە پیاوەک ڕۆیشت ئەمەم لێی پرسی.

باوکم وتی: "پێت وایە کە نرخی کراسەکە یەکسانە بە نرخی درۆکەی؟ بەڵام ڕۆڵەی ئازیزم، ئەوە بێنە بەرچاوت، گەر ئەو ڕاست بکات کە شەمس هێشتا زیندووە، ئامادەبووم لەپای ئەودا ژیانی خۆمی پێشکەش بکەم".

# ڕۆمی

## قۆنیا، ٣١ی تشرینی یەکەم ١٢٦٠

بەە تێپەڕینی ڕۆژگار ئازار بۆ خەم دەگۆڕێت و خەم دەبێتە بێدەنگی و بێدەنگیش دەگۆڕێت و دەبێتە یەکەیەکی گەورە و فراوانی وەک ئۆقیانووسە تاریکەکان. ئەمڕۆ ڕێکەوتی شانزەهەمین بیرەوەریی دیدارمە لەگەڵ شەمسدا لە بەردەم خانی بازرگانانی شەکر. وام لێهاتووە لەگەڵ نەفسی خۆمدا دەکەومە خەڵوەتەوە کە ڕۆژبەڕۆژ قورستر دەبێت، لە دواهەمین ڕۆژەکانی مانگی تشرینی یەکەمی هەموو ساڵێکدا بۆ ماوەی چل ڕۆژ لەگەڵیدا خەڵوەت دەگرم و لە هەر چل ڕێساکە ورد دەبمەوە. هەریەکێ لە ڕێساکان بیر خۆم دەخەمەوە و پێیدا دەچمەوە، بەڵام لە هیچ لێوارێکی دووری ئاوەزمدا جگە لە درەوشانەوەی شەمسی تەوریزی، هیچ شتێکی دیکە نییە.

وات بە خەیاڵدا دێت کە ئیدی لە تواناتدا نییە لە ژیاندا بەردەوام بیت، بە خەیاڵتدا دێت کە ئیدی ڕووناکیی ڕۆحت کوژاوەتەوە و هەتاهەتایە لە تاریکیدا دەژیت، بەڵام کاتێ ئەم تاریکییە ئەنگوستەچاوە قووتت دەدات، کاتێ چاوەکانت بەسەر دنیادا دادەخەیت، لە دڵتدا چاوی سێیەم دەپشکوێت. ئەوسا تێدەگەیت کە بینین لەگەڵ زانیاریی ناوەوە دژیەکە، ئاخر لەتوانای هیچ چاوێکدا نییە وەک چاوی عەشق بە ڕوونی و بە تیژی ببینێت. لە دوای خەم وەرزێکی تر و دۆڵێکی تر و تۆیەکی تر دێن. دەست بە بینینی ئەو خۆشەویستە دەکەیت کە مەحاڵە لە هیچ شوێنێک بیدۆزیتەوە، لێ لە هەموو شوێنێک دەیبینیت.

ئیدی لەو دڵۆپە ئاوەدا دەیبینیت کە دەکەوێتە ناو ئۆقیانووسەوە، لە هەڵچوونی ئاوی دەریا دەیبینیت کە دوای دەرکەتنی مانگ ڕوودەدات، یان لە

شنەی بەیانیدا دەیبینیت کە بۆنە بێگەرد و تازەکەی بڵاودەکاتەوە، لەو هێما و شێوانەدا دەیبینیت کە لەسەر لم دروست دەبن، لە گەردیلە بچووکەکانی تاشەبەردێکدا دەیبینیت کە لەژێر تیشکی ڕۆژدا دەدرەوشێنەوە، لە زەردەخەنەی شیرەخۆرەیەکی تازە لەدایکبوو، یان لە یەکێ لە دەمارە خوێنبەرەکانتدا دەیبینیت. ئاخر چۆن دەکرێ بوترێ کە شەمس ڕۆیشتووە و نەماوە، لە کاتێکدا لە هەموو شوێنێک و لە هەموو شتێکدا هەیە.

لە هەموو ڕۆژێک و هەموو خولەکێکدا لەگەڵ شەمسدام. سینگم ئەشکەوتێکە و شەمس لەناویدا بە ئاسوودەیی خۆی حەشارداوە. هەروەک چۆن چیاکان لەناو خۆیاندا دەنگدانەوە دەپارێزن، دەنگی شەمسیش لە ناوەوەی مندا پارێزراوە. ئەو زانا و وتاربێژەی جاران لە مندا نەماون، تەنانەت بچووکترین خاڵیش نەماوە. ئیدی عەشق هەموو هەڵسوکەوت و ڕەفتارەکانمی ڕاماڵی و لەبری ئەوە لێوانلێوی کردم لە شیعر. لەگەڵ ئەوەی هیچ پەیڤێک نییە تا ئەو گەشتەی ناوەوەم دەرببڕن، لێ من بڕوام بە پەیڤان هەیە و من بڕواداری پەیڤانم.

لە ڕۆژە سەختەکانمدا دوو کەس کۆمەکیان کرم: کوڕە نۆبەرەکەم و کارسازەکەم کە ناوی سەلاحەدینە و زێڕنگەرە. کاتێ لە دوکانە بچووکەکەی کاری دەکرد و گوێم لێدەگرت، پارچە زێڕی دەکوتایەوە و دەیکەیاندە پلەی بەرکەماڵی، لە دواپڕۆڤەی سەمای دەروێشەکاندا نایابترین سرووشی پێ بەخشیم، چونکە ئەو ڕیتمەی کە لە دوکانەکەی سەلاحەدینەوە هەڵدەقوڵا لە لێدانی دڵی گەردوون دەچوو، ئەو ڕیتمە خوداییەی کە شەمس باسی دەکرد و زۆر بایەخم پێی دەدا.

دوای ماوەیەک، کوڕە گەورەکەم فاتمەی کچی سەلاحەدینی خواست، کە لە زیرەکی و زانیاری و دۆستایەتیدا کیمیای بیردەخستمەوە. فێری خوێندنەوەی قورئانم کرد، ئەوەندە لە لام ئازیز بوو بە چاوی ڕاستەی خۆمم دادەنا و هەدیەی خوشکیشی بە چاوی چەپم، ئەمەش کیمیای زێدەبەهادارم سەلماندبووی: کە کچان گەر باشتر نەبن مینا کوڕان دەبنە فەقێی سەنگین، بۆ ئافرەتان دەستم بە ڕێکخستنی سەمای سۆفییانە کرد و ئامۆژگاریی خوشکە سۆفیەکانم دەکرد لە پەیڕەوکردنیدا بەردەوام بن.

پـێش چـوار سـاڵ دەسـتم بە دانـانی (مەسـنەوی) کـرد. ئەوەبـوو لە بەرەبەیانی ڕۆژێکدا لە هیچەوە دێڕی یەکەمی بە خەیاڵمدا هات. لە کاتێکدا چاوم بڕیبـووە ڕووناکیی خـۆر کە تـاریکی لەتـلەت دەکرد. ئیدی لەوسـاوە چامەکـان لە نێـوان لێوەکـانمەوە لەخـۆڕا هەڵـدەقوڵان. نەم دەنووسـینەوە، سەلاحەدین هەر زوو ئەرکی نووسینەوەی ئەو چامانەی گرتە ئەستۆی خۆی و کـوڕەکەم هەموویـانی کـۆپی دەکـرد. لەسـایەی ئەوەوە ئەم چامـانە ژیـان، چونکە ئەمڕۆ گەر داوام لێ بکرایە هەر چامەیەکیانم بیر بێتەوە، نەمدەتوانی بیری خۆمیان بێنمەوە. ئیدی پەیڤەکان بە پەخشان یان بە شیعر بوونـایە، بە پۆل بەسـەرمدا کەپرۆکەیـان دەکرد، ئینجـا وەک باڵندەی کۆچەری بە هەمـان ئەو خێراییەی کە بۆم دەهـاتن، ئاوهـاش جێیـان دەهێشتم. من لەو بەربەسـتە ئـاوە پتـر نـیم کە لە ڕێـگەی ڕەوتـی بەرەو نـاوچە هەرەگەرمەکـان ئـاوەکە ڕادەگرێت و پشوویەک دەدات.

کـاتێ دەسـتم بە چـامەیەک دەکـرد، پێشتر نەمـدەزانی چـی دەڵـێم، پلانـی ئەوەشم دانەدەنا ئایا چامەکە درێژ دەبێت یان کورت. کە چامەکە تەواودەبوو، جارێکی دی هێمنی باڵی بەسـەرمدا دەکێشا و ئیدی لەگەڵ بێدەنگیدا دەژیـام. وشـەی بێـدەنگ، یـان (خـامۆش)، یەکـێ لەو دوو واژۆیە بـوون کە لەسـەر غەزەلەکـانم واژۆم دەکـردن، بەڵام واژۆی دووەم نـاوی شەمـسی تەورێـزی بوو.

دنیـا بە خێـراییەک دەبزوێـت و دەگۆڕێـت، ئـێمەی بنیـادەم نـاتوانین دەسـەڵاتمان بەسـەریدا هەبێـت، یـان لێـی تێـبگەین. ئەوەبـوو سـاڵی ١٢٥٨ مەغۆلەکـان بەغدایان داگیرکـرد. ئیدی ئەو شـارەی شـانازی بە خـۆڕاگری و ئازایەتی و جوانی و نایابیی خۆیەوە دەکرد، تووشـی تێکشکان بوو. هەر لەو ساڵەدا سەلاحەدین مرد و من و دەروێشەکانم ئاهەنگێکی مەزنمان بۆ گێڕا، بە دەفلێـدان و دووزەلەژەنیـنەوە بە شـەقامەکاندا گەڕایـن و بە خۆشـییەوە سەمامان دەکرد و گۆرانیمـان دەچڕی تـا پیشانی بدەین کە پیاوچاکان ئاوهـا دەنێژرێن.

سـاڵی ١٢٦٠ مەغۆلەکـان بەدەسـتی مەمـالیکە میسرییەکان تێکـشکان و سـەرکەوتووانی دوێنـێ بـوون بە تێکـشکاوی ئەمـڕۆ، ئیـدی هەمـوو

سەرکەوتوویەک پێی وایە کە هەتاهەتایە هەر سەرکەوتوو دەبێت و هەموو تێکشکاوێکیش پێی وایە کە هەتاهەتایە هەر تێکشکاو دەبێت، بەڵام هەردووکیان لەبەر هەمان هۆ هەڵەن: هەموو شتێک دەگۆڕێت تەنها خودا ناگۆڕێت.

دوای مردنی سەلاحەدین، حوسامەدین یارمەتیی دەدام، ئەو مریدەی بەخێرایی و لەسەر ڕێچکەی ڕۆحی پێگەیشت، کە هەموان لە تۆمارکردنی شیعرەکانمدا بە حوسام چەلەبی ناویان دەبرد، ئەو بوو کە هەموو کتێبی (مەسنەوی)م بۆ خوێندەوە. خاکەڕا و بەخشندە بوو، گەر پرسیاری لێ بکرایە کە ئەو کێیە یان چ کارەیە، بەبێ دوودڵی وەڵامی دەدایەوە: "من مریدێکم لە مریدەخاکەراکانی شەمسی تەورێزی. من تەنها ئەمەم".

وردەوردە تەمەنی مرۆڤ دەگاتە چل، ئینجا پەنجا، ئینجا شەستساڵی، لەگەڵ تێپەڕبوونی هەر دەیەیەکدا، وا دەردەکەوێت کە زیاتر کامڵ بووە و گەرەکە لە ڕەوتەکە بەردەوام بێت. هەرچەندە خاڵێکی دیاریکراو نییە کە بتوانیت پێی بگەیت. گەردوون بە جێگیری و بەردەوامی دەسووڕێتەوە، هەروەها زەوی و مانگیش بە هەمان جۆر، وەلێ ئەوەی وای لێدەکات کە بجووڵێت، ئەو نهێنییەیە کە لە ناوەوەی ئێمەی بنیادەمدایە. بەم تێگەیشتنەوە ئێمەی دەروێش بە شێوازی خۆمان لەمیانەی خۆشەویستی و خەمەوە سەمادەکەین، جا با کەسیش تێنەگات کە ئێمە چی دەکەین. لە گەرمەی کێشەکاندا یان لە ناوجەرگەی جەنگدا بە تەنیا و پێکەوە، بە هێواشی و خێراییەوە، وەک هەڵقوڵینی ئاو بە خۆشی و شادییەوە بەسەر برینەکانمان و خەمەکانماندا سەمادەکەین، بەسەر خوێنماندا سەمادەکەین. هەموو ئەو شتانەی لە گەردووندا هەن و هەموو ئەوەی تێیدایە، گونجانێکی تەواو و هاوسەنگییەکی ورد هەیە. خاڵەکان بەردەوام دەگۆڕێن و یەکێکیان جێگەی ئەوی تر دەگرێتەوە، بەڵام بازنەکە هەر وەک خۆی دەمێنێتەوە، ئەمەش ڕێسای سیونۆهەمینە: **لەگەڵ ئەوەی پاژەکان دەگۆڕێن، لێ گشتەکە هەر وەک خۆی دەمێنێتەوە، چونکە کاتێ دزێک ئەم دنیایە جێدەهێڵێت، دزێکی تازە لەدایک دەبێت، کاتێ کەسێکی ئابڕوومەند دەمرێت، کەسێکی ئابڕوومەندی**

**دیکە جێی دەگرێتەوە. بەم ئاوهایە هیچ شتێک بەبێ گۆڕان نامێنێتەوە، بەڵکو تەنها شتێک هەیە قەت ناگۆڕێت.**

ئایینەکەمان ئایینی عەشقە، تێکڕای مرۆڤ بە زنجیرە دڵێک پێکەوە بەستراون. ئەگەر حەڵقەیەکی لێ ترازا، حەڵقەیەکی دیکە لە شوێنێکی دیکە جێگەی دەگرێتەوە، لەگەڵ مەرگی هەر شەمسی تەورێزییەکدا، شەمسێکی نوێ لە سەردەمێکی جیا و بە ناوێکی جیاوە دەردەکەوێت.

ناوەکان دەگۆڕێن، دێن و دەڕۆن، بەڵام گەوهەر وەک خۆی دەمێنێتەوە.

# ئێلا

## قۆنیا، ٧ی ئەیلوولی ٢٠٠٩

بە تەنیشت جێخەوەکەیەوە لەسەر کورسییەکی نایلۆن ئێلا نوستبوو. کاتێ لەناکاو چاوەکانی کردەوە دەنگێکی چاوەڕواننەکراوی ژنەوت. یەکێک وشەگەلێکی لە تاریکیدا دەوت پێشتر لە تاریکیدا نەیبیستبوو، ئینجا زانیی کە ئەوە دەنگی بانگە و لە دەرەوە دێت و بۆ نوێژی بەیانی بانگی خەڵک دەکات. خەریک بوو ڕۆژێکی نوێ دەست پێبکات، وەلێ هەستێکی واش دایگرت کە کۆتایی شتێکە.

لە هەر کەسێک بپرسیت کە بۆ یەکەم جار گوێی لە دەنگی بانگ بووبێت کە داوای نوێژی بەیانی دەکات، هەر هەمان شتت پێدەڵێت: ئای لەو هەستە ئاڵۆز و دەوڵەمەند و جوانە، هاوکات هەستێکی سەیرت لا دروست دەبێت کە لە ترسەوە نزیکە. ئەوە تەواو وەک عەشقە.

لە کپیی شەوەکەدا، ئێلا بەو دەنگە وەئاگاهات. لەو تاریکییەدا چەند جارێ چاوەکانی هەڵگلۆفی تا توانیی هەست بەو دەنگە نێرینەیە بکات کە لە پەنجەرە کراوەکانەوە ژوورەکەی پڕکرد. خولەکێکی تەواوی خایاند تا بیری هاتەوە کە ئەو لە ماساشۆستس نییە، ئێرەش ئەو ماڵە فراوانە نییە کە لەگەڵ شووەکەی و سێ منداڵەکەیدا تێیدا دەژی. هەموو ئەوانە هی ڕۆژگارێکی تر بوون – ڕۆژگارێکی دوور و زۆر ئاڵۆز، تا ئەو ڕادەیەی هەستی کرد کە لەنێو یەکێ لە چیرۆکەکانی جنۆکاندا دەژی کە لە ڕابردووی خۆی ناچێت.

نەخێر، ئەو لە ماساشۆستس نییە، بەڵکو لە شوێنێکی تری شوێنەکانی دنیایە، لە نەخۆشخانەیەکە لە شاری قۆنیا لە تورکیا، ئەو پیاوەش کە ئێستا گوێی لێی بوو بە نەفەسێکی ڕێک و قووڵ، بە دەنگێکی نزم و ناسک بانگی

بەیانیی دەدا، مێردەکەی خۆی نییە کە بیست ساڵ لەمەوبەر شووی پێ کردووە، بەڵکو دۆستەکەیەتی کە لەپێناویدا لە ڕۆژێکی خۆرەتاوی هاوینی ڕابردوو وازی لە مێردەکەی خۆی هێنا.

"ئایا لەپێناو پیاوێکی بێ بانەڕۆژ دەست لە مێردەکەت هەڵدەگریت؟"، هاوڕێکانی و دراوسێکانی بەردەوام ئەم پرسیارەیان لێدەکرد، "ئەی منداڵەکانت؟ تۆ پێت وایە لێت خۆش دەبن؟".

ئێلا وا تێگەیشتبوو کە لە گۆشەنیگای کۆمەڵەوە گەر ئافرەتێک لەپێناو پیاوێکی تردا شتێکی لەوە خراپتر هەبێت وازهێنانە لە مێردەکەی خۆی و لەپای ئێستایدا واز لە بانەڕۆژ بهێنێت.

گڵۆپی سەرمێزەکەی هەڵکرد و دیقەتی تیشکە عەنبەرییە هێمنەکەی دا و وەک ئەوەی بیەوێ دڵنیا بێت کە لەو چەند سەعاتە کەمەی خەوی لێکەوتبوو هیچ شتێ نەگۆڕاوە. هەرچەندە لە ژیانیدا زۆر نەخۆشخانەی نەدی بوو، بەڵام لە ژیانیدا ئەوە بچووکترین ژووری نەخۆشخانە بوو کە بینیبووی. قەرەوێڵەکە ڕووبەرێکی زۆری ژوورەکەی داگیرکردبوو، ئیدی هەموو شتەکانی تر بەگوێرەی شوێنی قەرەوێڵەکە دانرابوون، دۆلابێکی دار، مێزێکی چوارگۆشەی بچووک، کورسییەکی زیاد، گوڵدانێکی بەتاڵ، سینییەک کە جۆرەها حەبی ڕەنگ جیاوازی تێدا بوو، بە تەنیشتییەوە کتێبی (من و ڕۆمی) بوو، کە عەزیز لە سەرەتای ئەم گەشتەوە دەیخوێندەوە.

حەوت ڕۆژ بوو گەیشتبوونە قۆنیا، سەرەتا وەک هەموو ئەو گەشتیارانەی کە سەردانی شارەکە دەکەن، چەند ڕۆژێکیان بە سەردانی - شوێنەوارەکان و مۆزەخانەکان و ئەو شوێنانەی شوێنەواریان تێدایە- بەسەربرد و خواردنی خۆماڵییان خوارد و هەر شتێکی نوێیان بەرچاو کەوتبا وێنەیان دەگرت، جا شتەکە ئاسایی بوایە یان تووڕەهات. هەموو شتێ بە ڕێکی دەڕۆیشت، تا دوێنێ کە لە یەکێ لە چێشتخانەکان فراوینیان دەخوارد، عەزیز بەلادا هات و کەوتە سەر زەوی، ئەوەبوو بۆ نزیکترین نەخۆشخانە بردرا. ئیدی لەوساوە بە تەنیشت قەرەوێڵەکەیەوە چاوەڕێ دەکات و نازانێت چی ڕوودەدات. سەیری کرد ئەمە پێچەوانەی ئاواتەکەیەتی و لە هەمان کاتدا

به بێدەنگی لەگەڵ خودادا بەشەڕ دێت، چونکە زوو ئەو دۆستەی لێ سەندەوە کە لە کاتێکی درەنگی ژیانیدا پێی بەخشی بوو.

"ئازیزم، ئایا تۆ نوستوویت"، ئێلا لێی پرسی. خۆ نەیدەویست بێزاری بکات، بەڵام دەیەویست بەئاگا بێت.

جگە لە گاڤۆکەیەکی ڕەوتەنی و هێمنی ڕیتمی هەناسەی، کە بریتی بوو لە زنجیرەیەک ڕیتمی ونبوو، هیچی تری نەبیست.

"ئایا تۆ بەئاگایت؟"، بە چپە پرسیی، ئینجا دەنگی هەڵبڕی، "دەی ئێستا بێدار بەرەوە".

عەزیز بە هێواشی وتی: "چی بووە، ئەوە نەنوستوویت؟".

"نوێژی بەیانی..."، وەک ئەوەی ئەمە هەموو شتێک شی بکاتەوە، ئێلا وای وت و وەستا: تێکچوونی باری تەندروستی، زێدەترسی لەوەی کە لەدەستی بدات، ئەو گەمژەییە لە ڕادەبەدەرەی کە عەشق لە خۆی دەگرێت – هەموو شتێک ئەم سێ پەیڤە دەیپێچێتەوە.

عەزیز خۆی ڕاستکردەوە و دانیشت، بێ ئەوەی چاوە سەوزەکانی بپرووکێنێت، لەبەر تیشکی گڵۆپەکە بە سەرچەفی سپی دەورە درابوو، بە شێوەیەکی خەمین دەموچاوە جوانەکەی زەرد هەڵگەڕابوو، بەڵام شتێکی بەهێزیشی تێدا بوو کە بریتی بوو لە نەمری.

"نوێژی بەیانی تایبەتمەندیی خۆی هەیە"، ورەوڕێکی کرد و وتی، "ئایا دەزانیت لەنێو هەر پێنج نوێژەکەدا کە هەموو ڕۆژێ لەسەر موسڵمانان بووە بە ئەرک، دەوترێ نوێژی بەیانی پیرۆزترە، بەڵام لە هەموویان زیاتر بۆ تاقیکردنەوەیە".

"بۆچی وایە؟".

"پێم وایە لەبەر ئەوەیە کە لە خەونەکانمان بێدارمان دەکاتەوە، ئێمەش حەزمان لەوە نییە، بەڵکو پێمان خۆشە هەر بنوین، بۆیە لە بانگی بەیانیدا ڕستەیەک هەیە کە لە بانگی نوێژەکانی تردا نییە کە ئەمەیە: نوێژکردن لە نوستن باشترە".

ئێلا بە خۆی وت، بەڵام ڕەنگە نوستن بۆ هەردووکمان باشتر بوویێت. ئای چەند حەزم دەکرد پێکەوە بنوین. تامەزرۆی خەوێکی هێمن و ئاسان بوو

کە لە ئەفسوونی خەوی جوانێکی نوستوو کەمتر نەبێت، خەوێکی هێمنی سەد ساڵە تا تاوی ئەم ئازارە سووک بکات.

دوای کەمێــک بــانگەکە تەواو بــوو و دەنگــدانەوەکەی مینــا شــەپۆل دوورکەوتەوە. کە دوادەنگ توایەوە، بە شێوەیەکی سـەیر دنیا کپ بوو، بەڵام تاقەتپڕووکێن بوو. ساڵێک بەسـەر بەیەکگەیشتنەکەیاندا ڕابردبوو، سـاڵێک لە عەشـق و وشـیاربوونەوە. زۆربەی ئەو کاتـانە تەندروسـتیی باشـی عەزیـز یارمەتیـدەر بـوو تـا لەگەڵ ئـێلادا درێـژە بە سـەفەرەکە بـدات، بەڵام لە دوو هەفتەی ڕابردوودا، تەندروستیی تا دەهات تێکدەچوو.

کە دووبارە نوستەوە، ئێلا چاوی بەسـەرییەوە بوو. دەموچاوی هێمن و ئازیز بوو. ئاوەزی لێوانلێو بوو لە غایلە، بە قووڵی هەناسەیەکی هەڵکێشا و لە ژوورەکە دەرچوو. بە ڕاڕەوەکاندا ڕۆیشت کە دیوارەکانی بە ڕەنگی سـەوزی سێبەرئاسـا بـۆیە کرابـوون، سـەری لە چەنـد بەشـێک دا کە نەخۆشـی ژن و پیاوی بەساڵداچوو و گەنجیان تێدا بوو، هەندێکیان لە چاکبوونەوەدا بوون و هەنـدێکی دیکەیـان نەخۆشـی پـرزەی لـێ بـڕی بـوون. هەوڵـی دا گـوێ بە تەماشاکردنی کەسانی خۆتێهەڵقورتێنەر نەدات، بەڵام قژە زەردەکەی و چاوە شینەکانی بە ئاشکرا لایدەیی ئەوەیان دەردەخست، ئیدی هەستی نەکرد کە لە شوێنێکی نەگونجاوە، چونکە ئێلا ئەوەندە گەشت و سەفەری نەکردبوو.

دوای چەند چرکەیەک بینیی وا لە نزیک حەوزێک لەناو باخچە بچووک و قـنجەکەی نەخۆشــخانەکە دانیـشتووە. لە ناوەڕاسـتی حەوزەکەدا پەیـکەری فریـشتەیەکی بچـووک قیـت کرابـووەوە و لە بنـی حەوزەکەش چەنـد پـارچە دراوێکـی زیـو دەدرەوشـانەوە و هەریەکەیـان ڕازی کەسـێکی هەڵگرتبـوو. لە گیرفانەکانی دەستی گێڕا و لە پارچە دراوێکی کانزا گەڕا، بەڵام جگە لە چەند پارچە کاغەزێک کە هەندێ وشە و هەندێ هێڵی خوار و خێچی لەسەر بوو، هیچ شتێکی تری نەدۆزییەوە، هەرئەوەندە چاوەکانی کەوتنە سـەر باخچەکە، هەنــدێ وردە بەردی ڕەش و درەوشــاوەی بینــی. دانەیەکــی هەڵگــرت و چاوەکــانی نوقانــد و فڕێــی دایە نێــو حەوزەکەوە، لە نێــوان لێوەکــانییەوە ورتەورتێکی نیازمەنـدانەی کـرد و دەیزانـی نـایەتە دی. بەردەکە بەر دیـواری

حەوزەکە کەوت و هەڵــبەزایەوە، ئینجــا کەوتە ئــامێزی فریــشتە لە بەرد دروستکراوەکەوە.

ئێلا بە خۆی گوت، گەر عەزیز لێرە بوایە، نیشانەیەکی تێدا دەبینی.

دوای نــزیکەی نیوســەعات گەڕایەوە، لە ژوورەکەدا پزیــشکێک و کــچە پەرستارێکی گەنجی بینی کە کاپێکی لەسەر بوو، بە سەرچەفی قەرەوێڵکە دەموچاوی عەزیز داپۆشرابوو.

مرد.

* * *

عەزیز وەک شوێنکەوتوویەکی ڕۆمیی خۆشەویستی، لە قۆنیا نێژرا.

ئێلا هەمـوو ئامادەکارییەکی کـرد و هەوڵـی دا هەمـوو وردەکارییەکـان جێبەجێ بکات، بەڵام بڕوایشی بەوە هەبوو کە ئەو شتانەی ناتوانێت بیانکات، خودا یارمەتیی دەدات. سەرەتا پارچەیەک زەوی لەژێر درەختێکی مانۆلیای گەورە لە گۆڕستانێکی کـۆنی موسـڵمانان ئامـادەکرد، ئینجـا دوو ژەنیـاری سۆفیی پەیـداکرد و قایـل بـوون کە لە مـاوەی ڕێوڕەسـمی ناشـتنەکەدا نـای بژەنن، هەروەها نامەی ئەلیکترۆنی بۆ هەمـوو شـوێنێک بـۆ هاوڕێیانی عەزیـز نارد و داوای لێکردن تـا لە ناشـتنەکەیدا ئامـادەبن. زۆر شـادمان بـوو، چونکە ژمــارەیەکی زۆریــان لە شــوێنانی دوورەوە هــاتن، لە کیــپ تــاون، لە ســان پترسبۆرگەوە، لە مورشیدئابادەوە، لە ساوباولۆوە. لە نێویاندا وێنەگرانی وەک خۆی و زانایان و ڕۆژنامەنووسان و نووسەران و سەماکەران و پەیکەرتاش و پیــاوانی کــارگوزار و جوتیــار و کابــانی ماڵیــان تێــدابوو، هەروەهــا ئەو منداڵانەش کە عەزیز هەڵیگرتبوونەوە.

ڕێوڕەسمی ناشـتنەکە بە گەرموگـوڕی بەڕێوەچـوو و خەڵکـانی سـەر بە هەموو بیروباوەڕەکان ئامادەی بوون و وەک خۆی دەیویست بۆ مـردنەکەی ئاهەنگیان گێڕا، منداڵان بە شـادمانییەوە وازییـان کرد و شـاعیرێکی مەکسیکی (نــانی مــردووان)ی دابەش کــرد. یەکــێ لە بــرادەرە دێرینەکــانی عەزیــز کە کەسێکی ئوسکوتلەندی بوو، تەڵەگوڵی درێژی بەسەر هەمواندا پەخش کرد و

بەسەر هەمواندا بڵاوبوونەوە، هەر تەڵەگوڵێک لە ڕەنگێک و گەواهیدەری ئەوە بوون کە مردن شتێکە دەبێت مرۆڤ لێی نەترسێت. یەکێ لە دانیشتوانی قۆنیا، کە پیرەمێردێکی موسڵمانی پشتچەماوە بوو، بە زەردەخەنە و دووچاوی تیژەوە دیقەتی دیمەنەکەی دەدا، وتی لە مێژووی قۆنیادا ڕێوڕەسمی ناشتنی مەولانای پێش چەند سەدەیەکی لێ بترازێ، ڕێوڕەسمی ناشتنی وەک ئەمە بەڕێوە نەچووە.

دوای دوو ڕۆژ لە ڕێوڕەسمی ناشتنەکە، دوای ئەوەی لە کۆتاییدا ئێلا گەڕایەوە سەر تەنهاییەکەی خۆی، بە هەموو شارەکەدا دەستی بە سووڕانەوە کرد، دیقەتی ئەو خێزانانەی دەدا کە بە لایدا تێدەپەڕین، سەیری بازرگانەکانی دەکرد کە لەناو دوکانەکانیان بوون، سەیری ئەو فرۆشیارە دەستگێڕانەی دەکرد کە زۆریان لێدەکرد تا شتێکیان لێ بکڕێت. خەڵکەکە تەماشای ئەم ئافرەتە ئەمریکاییەیان دەکرد کە بە دوو چاوی گریاناوی و ئاوساوەوە بەناویاندا تێدەپەڕی. لێرە تەواو نامۆبوو، بگرە لە هەموو شوێنێک نامۆبوو.

ئێلا بەرەو هۆتیل گەڕایەوە، پێش ئەوەی پارەی ئوتێلەکە بدات و بەرەو فڕۆکەخانە بڕوات، چاکەتەکەی داکەند و بلووزێکی ڕەنگ قۆخیی خوریی ئەنقەرەی لە بەر کرد. بە خۆی گوت بۆ ئافرەتێک هەوڵبدات ئاوها نەبێت، ئەمە ڕەنگێکی سەلارانە و ناسکە، ئینجا پەیوەندیی بە جانێتەوە کرد، ئاخر کە ئەو بڕیاری دا دوای ئارەزووی دڵی بکەوێت، لەنێو هەرسێ منداڵەکەیدا تەنها جانێت پشتی گرت، ئۆرلی و ئافی سووربوون لەسەر ئەوەی کە قسە لەگەڵ دایکیاندا نەکەن.

"دایکە! چۆنیت؟"، جانێت بە دەنگە گەموگوڕەکەی لێی پرسی.

ئێلا زەردەخەنەی هاتێ و وەک ئەوەی کچەکەی بەرانبەری وەستابێت، خۆی بەرەو پێش لارکردەوە، ئینجا بە دەنگێک هەر ئەوەتا دەبیسترا وتی، "عەزیز مرد".

"وای دایکە! تەمەنی درێژ بۆ تۆ بمێنێتەوە".

کاتێ بیریان کردەوە کە دوای ئەوە چی بڵێن، چەند ساتێ خامۆشی باڵی کێشا. یەکەم جار جانێت بێدەنگییەکەی شڵەقاند و وتی: "دایکە، ئایا ئێستا بەرەو ماڵ دەگەڕێیتەوە؟".

ئێلا سەری بەردایەوە و دەستی بە بیرکردنەوە کرد. لە پرسیاری کچەکەیدا پرسیارێکی دیکەی بیست کە بە خەیاڵیدا نەهاتبوو. ئایا بۆ نۆرتامپتۆن بۆ لای شووەکەی بگەڕێتەوە و مەسەلەی لەیەکتر جیابوونەوەکەیان ڕابگرێت کە ناخۆشیی نێوانیان و یەکتر تۆمەتبارکردنەکەیان گەیشتبووە بنبەست؟ ئەی ئێستا چی بکات؟ ئاخر ئەو نە پارەی هەیە و نە کارێکیشی بەدەستەوەیە، بەڵام دەتوانێت وانەی تایبەتی زمانی ئینگلیزی بڵێتەوە، یان لە یەکێک لە گۆڤارەکان کار بکات، یان کێ دەزانێت، ڕەنگە ڕۆژێک بێت ببێتە نووسەرێکی باشی کاروباری ئەدەبیی گرینگ.

ئێلا بۆ چەند چرکەیەک چاوەکانی لێکنا و بەلەخۆڕادیتن و شادمانییەوە بۆ خۆی پێشبینیی ئەو شتانەی دەکرد کە ڕۆژانی داهاتوو دەیانهێنایە ڕێگەی. هەرچەندە جاران بەم جۆرەی ئێستای تەنها نەبوو، لە ڕاستیشدا هەستی بە تەنیایی نەدەکرد.

وتی: "خۆشەویستم بیرت دەکەم، بیری برا و خوشکەکەتیش دەکەم. ئایا دێن سەرم لێ بدەن؟".

"دایکە بێگومان — دێین — بەڵام ئێستا چی دەکەیت؟ ئایا تۆ دڵنیایت کە ناگەڕێیتەوە؟".

ئێلا گوتی: "بۆ ئەمستردام دەڕۆم، لەوێ شوقەی بچووک و جوان هەن و بەسەر جۆگەلەکاندا دەڕوانن. خۆشەویستم.. نازانم، پلانم دانەناوە. هەوڵدەدەم بژیم و بزانم ڕۆژێک دڵم چیم پێدەڵێت، ئەمە ڕێسایەکە لە ڕێساکان، ئێ وا نییە؟".

"دایکە، کام ڕێسا؟ تۆ باسی چی دەکەیت؟".

ئێلا چووە نزیک پەنجەرەکە و بە هەموو لایەکی ئاسمانی شیندا هەڵیڕوانی و هەر لەخۆوە وەک دەروێشێک بە دەوری خۆیدا بخولێتەوە، بە

خێرایی خولایەوە و ڕووبەڕووی گریمانەیەکی زۆر بوو و لە عەدەمدا ون بوو و توایەوە.

ئینجا لەسەرخۆ گوتی: "ڕێسای چلەمین دەڵێت: **بەبێ عەشق ژیان نرخێکی نییە. لە خۆت مەپرسە چ جۆرە عەشقێکت دەوێ، ڕۆحی یان ماددی، خودایی یان دنیایی، ڕۆژئاوایی یان ڕۆژهەڵاتی، چونکە دابەشبوونەکان جگە لە دابەشبوونی زیاتر چ ئەنجامێکیان نابێت. عەشق نە ناوێکی هەیە و نە نیشانە و نە پێناسەیەک. ئەو هەر ئەوەیە کە هەیە، بێگەرد و سادەیە.**"

"عەشق ئاوی ژیانە. دولبەریش ڕۆحێکە لە ئاگر!

کاتێ ئاگر عەشقی ئاو دەبێت، گەردوونیش دەبێتە گەردوونێکی تر".

**وەرگێڕانی ئەم ڕۆمانە:**
**لە ٦ -٥ -٢٠١٤وە**
**تا یەکەم ڕۆژی پایزی ٢٠١٤ی خایاندووە.**

# ئەلیف شەفەق



نووسەری ئەم ڕۆمانە "ئەلیف شەفەق" بە ڕەگەز تورکە و ساڵی ١٩٧١ لە ستراسبۆرگ لە فەڕەنسا لەدایک بووە. چەندین خەڵاتی ئەدەبی وەرگرتووە و بە یەکێک لەو ڕۆماننووسانە دادەنرێ کە لە تورکیا زۆرترین خوێنەری هەیە. یەکێ لە ڕەخنەگرەکان ناوی ناوە (یەکێکە لە دەنگە هەرەجیاوازەکانی ئەدەبی تورکی و ئەدەبی هاوچەرخی جیهانی). بەرهەمەکانی بۆ زیاتر لە سی زمان وەرگێڕدراون، نیشانەی فەخری شۆڕەسواری هەڵکەتووی هونەر و ئەدەبیاتی پێ بەخشراوە.

ئەلیف شەفەق یانزە کتێبی داناوە و هەشتیان ڕۆمانن. ڕۆمانی بە هەردوو زمانی تورکی و ئینگلیزی نووسیوە و دابونەریتە ڕۆژاوایی و ڕۆژهەڵاتییەکان تێکەڵ دەکات، باسی ئافرەت و کەمینەکان و ئاوارەکان دەکات، هەروەها باسی ڕۆشنبیری و کولتووره لاوەکییەکان و لاوان و ڕۆحە جیهانییەکان دەکات. لە ڕۆمانەکانیدا سوود لە ڕۆشنبیری و دابە ئەدەبییە جیاوازەکان وەردەگرێت. بە ئارەزووییەکی قووڵەوە دەڕوانێتە مێژوو و فەلسەفە و سۆفیگەری و ڕۆشنبیریی میللی و سیاسەتی ڕۆشنبیری. شەفەق بەوەش بەناوبانگە بە چاوێکی تیژەوە دەڕوانێتە کۆمیدیای ڕەش.

ڕۆمانی (چل ڕێساکەی عەشق) باسی عەشق و خۆشەویستی نێوان ڕۆژاوا و ڕۆژهەڵات و ڕابردوو و ئێستا و عەشقی ڕۆحی و دنیایی دەکات. هەموو ئەمانەش لە میانەی چیرۆکی نێوان جەلالەدینی ڕۆمی و شەمسی تەوریزی دەگێڕێتەوە. ئەم ڕۆمانە زیاتر لە ٦٠٠٠٠٠ دانەی لێ فرۆشراوە.

خالید الجبیلي ئەم ڕۆمانەی لە ئینگلیزییەوە بۆ عەرەبی وەرگێراوە.

## زنجیرەی کتێبە چاپکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ٢٠١٥

| | ناوی کتێب | نووسینی | وەرگێڕانی |
|---|---|---|---|
| ٧٣٢ | چل ڕێساکەی عەشق | ئەلیف شەفەق | جەلیل کاکەوەیس |
| ٧٣٣ | نووسینەوەی ئاسمان | کاوە محەمەد | |
| | | | |

# Elif Şafak

# THE FORTY RULES OF LOVE

T: Jalil Kakaways



ئەم ڕۆمانە...

پێکەوەگرێدانی کولتوورە جیاوازەکانە، بە تایبەت کولتووری ڕۆژئاوایی و ڕۆژهەلاتی، بەلام هەریەکەو لە دیدگا و کەشی خۆیەوە دەگەڕێتەوە سەر بنەوانی ڕۆحی مرۆڤ و پاکبوونەوەی لەو خلتەی مەتریالییەی کە لە هەموو سەردەمەکاندا مرۆڤی شەکەت و ماندوو کردووە. خەیاڵی داهێنەرانەی (ئەلیف شەفەق) ڕووداوەکانی دوو سەدەی لەیەکتر دوورمان بۆ هاوشان دەکات، سەدەی دوانزەهەم و سەدەی بیستویەکەمی ئێستامان کە بە دوو سەدەی ململانێی ئایینی و توندوتیژیی مەزهەبگەرایی دەناسرێن، ئەمیش لە میانی ڕۆمانێکەوە دەربارەی پەیوەندیی ڕۆحیی نێوان دوو سۆفیی وەک (جەلالەدینی ڕۆمی و شەمسی تەورێزی) کە کاریگەرییان دوای نزیکەی هەشتسەد ساڵ کەوتووەتە سەر ڕۆماننووسێکی ڕۆژاوایی بە ناوی عەزیز. ز. زاهارا...




دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

Sardam Printing & Publishing House

2015